چاپی یەکەم
٣١٠٢

# دوایین شای ئێران



## نهێنی گەلێك لە ژیان و ڕۆژگاری محمد ڕەزاشای پەهلەوی



نوسینی: محمود طلوعی

وەرگێڕانی: ئەرکان ئەحمەد جاف

# دوایین شای ئێران

## نهێنی گەلێك لە ژیان و ڕۆژگاری محمد رەزاشای پەهلەوی

نوسینی: محمود طلوعی

وەرگێڕانی لە فارسیەوە: ئەرکان ئەحمەد جاف

چاپی یەکەم
٢٠١٣

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە: ٣٩٨

0000000000






**ناسنامەی کتێب**

**دوایین شای ئێران**

- بابەت: لێکۆڵینەوەی مێژوویی
- ناوی نووسەر: محمود طلوعی
- ناوی وەرگێڕ: ئەرکان ئەحمەد جاف
- تایپ: ئەرکان ئەحمەد جاف
- نەخشەسازیی و بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- شوێنی چاپ: چاپەمەنی گەنج
- ساڵی چاپ: ٢٠١٣
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە: (٢٦٥٧)ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.

---

ناونیشان

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



## ناوەرۆك

# پێڕست:

باڵوێزخانەی ئینگلیز...!, ئەمریکا و هاوکاری شا, سیخوڕە ئ-ڵمانیەکان لە وەك ڕۆڵی بەکرێگیراوانی ئینگلیز!, پیاوان و ئەفسەرانی ئێرانی لە زیندانی هاوپەیمانانـدا, هەلێکی ئاڵتونی بۆ شا, مەرجی سەیری دوکتۆر موسەددەق بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری.....

٧- مەترسیەك کە بەسەر ئێراندا تێپەڕی:

پیلان بۆ جیابوونەوەی ئازەربایجان, بیانوی پێکەنیناوی ستالین بۆ خۆ بواردن لە چۆڵکردنی ئێران, پێشنیاری دابەشکردنی ئێران بۆ چەند ناوچەیەکی دەسەلاتداری, ژەهرەکانی باڵوێزی نەفرینی ئینگلیز لە ئێران, شا و دوکتۆر موسەددەق هاو ئاواز دەبن, ڕێکەوتننامەی ڕوسەکان و ئینگلیزەکان بۆ جودا کردنەوەی خوزستان لە بەرامبەر جودا بوونەوەی ئازەربایجان!, نهێنی گەلێك لە دەورانی حکومەتی قەوام سەڵتەنە کە بۆ یەکەم جار ئاشکرا دەبێت, قەوام سەڵتەنە لە بیری دەرکردنی شاو سەرۆك وەزیرانی ئێران بوو.

٨- مەتەڵۆکەی فەوزییە:

بۆچی فەوزیە بەتۆراوی لە ئێران ڕۆیشت, ڕۆڵی ئەشرەفی خوشکی شا لە جیابوونەوەی شا و فەوزیەدا, فەوزیە دەترسا کە دەرمانخواردی بکەن, نامەی پاڕانەوەی حەمە ڕەزاشا بۆ مەلیك فاروقی میسر بۆ گەڕاندنەوەی فەوزیە, باڵوێزی شا لە میسر تۆمەتی خیانەت دەداتە پاڵ فەوزیە!, مەتەڵێك کە تەنها ئەشرەف دەتوانێت هەڵیبهێنێت!.

٩- ساڵانی قەیراناوی:

حەمە ڕەزاشا زیاتر لە جاران دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەشرەفی خوشکیەوە, باندی حکومەتی ئەشرەف بەسەر ئێرانەوە, دەستپێکردنی ڕوداوەکانی نەوت, نهێنی گەلێك لە بارەی یەکەمین هەوڵی کوشتنی حەمە ڕەزا شا, یەکەمین دەرەنجامەکانی سەفەری شا بۆ ئەمریکا, بە بۆچونی ئەمریکیەکان محەمەد شا بۆ ولاتێکی ڕۆژهەلاتی تەواو ڕۆژئاوایی بوو!, بەڵگەنامەی نوێ دەربارەی چۆنیەتی سەپاندنی ڕەزم ئارا بە سەر شادا, ئینگلیزەکان محەمەد شا بە هۆکاری شکستی ڕەزم ئارا دەزانن, نهێنیەکانی کوشتنی ڕەزم ئارا.

١٠- محەمەد ڕەزا شا و دوکتۆرموسەددەق:

پیلانێك كه بوویه بلّقی سەر ئاو, پیلانێکی نهێنی ئامێز له هەڵبژاردنی دوکتۆر موسەددەق بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران, محەمەدڕەزاشا دان دەنێت به دەسەلات و خۆشەویستی دوکتۆر موسەددەق له نێو خەڵکدا, دەستلەکار کێشانەوەی دوکتۆر موسەددەق و دوباره گەڕانەی ئەو بۆ دەسەلات, دوکتۆر موسەددەق شاژنی دایك و خوشك و براکانی محەمەدڕەزاشا له ئێران دەردەکات, دوکتۆر موسەددەق چۆن چۆنی زەمینه سازی ڕوخانی حکومەتەکەی خۆی کرد؟.

١١- سورەییا و یاداشتەکانی:

عەشقه ئەمریکیەکەی شا, هەڵبژێردراوەکانی دیکه بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ (شا) دا, سورەییا چۆنیەتی ئاشنایی و هاوسەرگیریەکەی لەگەڵ (شا) دا باس دەکات, دەربارێکی ژنانه!, تایبەتمەندیەکانی ڕەوشتی (شا) له زمانی سورەییا وە, هەژاری و بێ پارەیی شا له سەردەمی حکومەتی موسەددەق دا!, سورەییا تەنها عەشقی ڕاستەقینەی شا بوو, پەیوەندی شا و سورەییا دووای لێك جودابوونەوەیان...,

١٢- دیکتاتۆری شاهانه......!

شای بێ دەسەلات.....! ئەمریکیەکان پشکی خۆیان له نەوتی ئێران دەوێت, شا چۆن چۆنی پێویستیەکانی لادانی (زاهیدی) له پۆستی سەرۆك وەزیرانی فەراهەم دێنێت؟ ڕووداوی عەشق وعاشقی (شەهنان) و (ئەردەشێری زاهیدی) نامەی تایبەتی (شا) بۆ (جمال عبدالناصر) , هەموار کردنەوەی دەستورو سەرەتاکانی حکومەتی ڕەهای (شا) , پێکهێنانی حیزبی چاودێر و نمایشی دیموکراسی....

١٣- عەشقه شاهانەییەکان:

نوێ بوونەوەی یاداشتی سورەییا, شا عاشقی شازاده خانمێکی ئیتالّی دەبێت, دیداری (پاپا) بەمەبەستی وەرگرتنی ڕەزامەندی بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو شازادەخانمه ئیتالییەدا, داستانی ڕاستەقینەی ئاشنایی و هاوسەرگیری (شا) لەگەڵ (فەرەح) دا, پێشینەی تودەیی بوونی فەرەح, فەرەح جێ پێی خۆی بەهێز دەکات, ناکۆکیەکانی شا و فەرەح, فەرەح هەڕەشەی جیابوونەوه له شا دەکات, بۆچی شا له کۆتاییەکانی سەڵتەنەکەیدا له فەرەح دەترسا...؟!!.

١٤- شۆڕشی شاهانه.....!!!!.

چۆن کەندی ئەمینی دەسەپێنێت بە سەر (شا) دا!, کەنەدی و شۆڕشی سپی شاهانە, سەرۆك وەزیرانی ئەسەدوولآی عەلەم, دەستپێکردنی ململانێ ئایەتولآ خومەینی لەگەڵ حەمەڕەزاشا دا, ژنان لە پەڕلەمان, دەستگیر کردن و دوور خستنەوەی ئایەتولآ خومەینی, کوشتنی مەنسور و سەرۆك وەزیرانی ئەمیر عەباسی هوەیدا, نهێنی مانەوەی هوەیدا, دوووەمین هەوڵی کوشتنی شا, دیداری نهێنی شا و ئەو گەنجەی کە دەیویست بیکوژێت, شا و فراماسونری, داستانی نەوت و پێشەکیەکانی ڕوخانی ڕژێمی پەهلەوی......,

١٥- ڕووخانی ڕژێمی شاهنشاهی ئێران.....!!.

سالآنی گەشەسەندن و پەشێوی, گەلآڵەی کودەتایەکی ئەمریکی بەسەر (شا) دا, نهێنی مەرگی ئەرتەشبەند (خاتەمی), ڕاپۆرتی نهێنی (سی ئای ئەی) دەربارەی بنەماڵەی سەڵتەنەتی, حکومەتی ئاموزگار و (ڕەوشی کرانەوەی سیاسی), ڕۆڵی ئەمیر عەبباسی هوەیدا لە داگیرساندنی ئاگری شۆڕش دا, بۆچی (شا) شەریف ئیمامی هەڵبژارد بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران....؟, فەرەح داوای دەستلەکار کێشانەوە لە (شا) دەکات,,,,!, ڕوداوەکانی شۆڕش و ڕوخانی ڕژێم..,,.

١٦- دەربەدەری و مەرگ..........!!.

تەنها ئینگلیزەکان ئاگایان لە نەخۆشی سەرەتانی (شا) هەیە.!, مەلیك حەسەن بە تەماحی سەرمایە ئەفسانەییەکەی (شا) ئەوی بۆ مەراکیش دەعوەت کرد, شکاندنی بەڵێنی کارتەر و تاچر, لە باهاماوە تا مەکسیك, پێشبینی سەرسوڕهێنەری کارتەر, دەردەدڵیەکانی (شا) بۆ نێردراوەکەی کارتەر, پیلان لە پەنەما, کارتەر بە مەرجی دەستلەکار کێشانەوەی (شا) لە پۆستی سەڵتەنەت داری ئێران ڕازی دەبێت بە پەنا دانی لەئەمریکا دا.!!, کۆتا چاوپێکەوتنی (شا) و دەربڕینی پەشیمای کە بۆچی دەستی نەدایە کوشتنی نەیارانی.!, دوایین ڕۆژەکانی ژیانی (شا).........,

# پێشەکی وەرگێڕ:

محەمەد ڕەزاشا دوایین شای وڵاتی ئێران بوو, لە سایەی سیستمی میراتی و پشتاوپشتی شاهنشاهی دا,  کە تیایدا لێهاتووی و شارەزایی کەمتر بایەخی پێ دەدرێت, لە ماوەی ساڵانی جەنگی دووەمی جیهانی یەوە هەتا ساڵی (١٩٧٩) لەسەر تەختی پاشایەتی ئێران دانیشت, ئەو تەختەی کە هەمیشە شانازی بە فراوانی دەسەڵاتی و قووڵییە مێژوییەکەی دەکردەوە, بەڵام بێ ئاگا لەوەی کە لەسەر دەستی خۆیدا کۆتایی پێ دێت.

محەمەد ڕەزاشا لە ماوەی تەمەنی منداڵی دا, وەك سرشتی هەمیشەیی سیستمی میراتی بنەماڵەو پادشایان, هەموو پێداویستیەکی بۆ دابین کراوە و تەنانەت نێردراوەتە دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن و پەروەردە بوون, ئاخر دیکتاتۆرەکانی دونیا خۆیان لە هەموو کەس باشتر ئەوە دەزانن کە خزمەتێکی وە هایان نەکردووە بە گەل و وڵاتیان, هەتا شانازی پێوە بکەن و منداڵانی خۆیان لەو خزمەت و پێشکەوتنەی خۆیان بەهرەمەند بکەن, هەربۆیە ڕەزاشای باوك کوڕەکەی دەنێرێتە وڵاتە بیانیەکان بەمەبەستی خوێندن و پەروەردە بوون, دواتر ئەم جۆرە کەسانە بە کەشخەیی و بێ دیتنی هیچ سەختیەکی ژیانی کۆمەڵگەکەی خۆیان دەگەڕێنەوە وڵاتەکانی خۆیان و دەبن بە بەرپرس و پادشای وڵات, ئیدی شتێکی سروشتیە کە ئەم کەسانە بەردەوام سەرقاڵی خۆشگوزەرانیەکانی خۆیان بن و ئەوەی لایان بێ بایەخ بێت خزمەتکردنی گەل و وڵات بێت, تەنانەت هیچ مرۆڤێکی ژیر و هوشیاریش نابێت لە ژێر سایەی ئەو پادشایانەدا چارەڕێی خزمەت و پێشکەوتنی وڵات بکات, وە ئەم بەرپرسانە هەمیشە هەوڵ دەدەن بە پشت بەستن بە وڵاتە زلهێزەکان و بەڵێ قوربان گیان کردن بۆیان بەردەوامی بە دەسەڵاتی خۆیان بدەن, ئەوەش کە تێبینی دەکرێت محەمەدڕەزاشا هەر

بەو شێوەیە بووە و بە دەگمەن نەبێت بە بیٚ پرسی ئەمریکا یان بەریتانیا وە هەندێك جاریش سۆڤیەت, نەیتوانیووە کەسێك بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران دیاری بکات.

ماوەی سەڵتەنەتی محەمەدڕەزاشا پڕیەتی لە هەوراز و نشێو بۆ گەلانی ئێران, کە لەو ماوەیەدا دەتوانین بڵێین جگە لە هەندێك خزمەتی سادە و سەرەتایی, ئەویش لە شارە گەورەکان دا, شتێك بۆ گەلانی ئێران نەکراوە, ئەمەلە کاتێکدایە کە وەك شاژنە فەرەح باسی دەکات بە دەیان هەزار دۆلاری دەبەخشی بە دەرهێنەری فیلمە بیانیەکان بە تایبەت فەڕەنسیەکان وەك دیاری یان هەندێك جار کە زەرەریان دەکرد وەك هاوکاری پێی دەدان, ئەوەش ڕاست نیە کە بڵێین سەرجەم کۆمەڵگەی ئێرانی لە چەرمەسەری دا ژیاوە,چونکە بە سروشتی ژیان هەندێك کەس بە هۆی کارو پیشەی خۆیانەوە تا ڕادەیەك دەتوانن ژیانی خۆیان دابین بکەن, وە هەمیشە کەسانێکیش هەن کە لە دەوروبەری بەرپرسان دا خەریکی کاسەلێسین و بە خۆشی ڕادەبوێرن, کە کاری ئەمانە هەر ئەشهەدو کردنە بۆ ئاغاکانیان و بەردەوام خەریکن پیایان دا هەڵدەدەن, ئەوەش ئاشکرایە کە بەرپرسان و کاربەدەستانی دەوڵەتیش لە ڕەوشێکی باشدان, بەڵام ئێمە مەبەستمان لە ژیانی گشتی کۆمەڵگە و دەرەوەی شار نشینەکانە کە لە کەمترین خزمەتگوزاری بێبەش بوون, بنەماڵەی پەهلەویش لەباتی ئەوەی لە بیری خزمەتی وڵات دا بن, بەگشتی سەرقاڵی بازرگانی کردن و خۆشگوزەرانیەکانی خۆیان بوون, تەنانەت باس لەوەش دەکرێت کە بازرگانی کردن بە مادە سڕکەرەکانیشەوە هەر کاری ئەوان بوو, هەرچەندە جارجارێك بە ڕوکەش و لە ژێر فشاری دەرەوە و ناوەوە دا و بۆ چەواشە کردنی خەڵك, بانگەشەی پێشکەوتن و خزمەت کردنی وڵاتیان دەکرد, بەڵام چونکە ویست وئیرادەی لەگەڵ نەبوو, سەرجەمیان بیٚ ئەنجام دەمانەوە, دیارترینی ئەو بانگەشانەش (شۆڕشی سپی) شا بوو, ئەویش بە ئاڵۆزتر بوونی کۆمەڵگە کۆتایی هات, هەر بۆ خزمەتکردنی زیاتری خەڵك وەك خۆیان باسیان لێوە دەکرد, چەندین ڕێکخراوی خێرخوازییان دروست کردبوو کە ئامانجیان هاوکاری کردنی خاوەن پێداویستیە تایبەتەکان و منداڵان و هەژاران بوو, بەڵام تادەهات هەژاری و کەسانی بیٚ لانە لە نێو کۆمەڵگەدا زیادی دەکرد, ئەم دەزگا خێرخوازیانە وایان لیٚ هاتبوو تەنانەت هاوسەرەکانی (شا) دەزگای تایبەت بە خۆیان دروست

کردبوو, بەلاّم ئەی سەرچاوەی دارایی ئەم ڕێکخراو و دەزگایانە لە کوێ وە دابین دەکرا...؟, ئەمە ئەو مەتەڵەیە کە وەلاّمەکەی لای هەمووان ئاشکرا بوو.

خۆشگوزەرانی بەرپرس و دەرباریەکان و بنەماڵەی پەهلەوی لە لایەك و هەژاری و بێ دەرەتانی خەڵك لەلایەکی دیکەوە, مەودایەکی زۆری لە نێوان شەقامی ئێرانی و بەرپرسە بالاّکان دا دروست کردبوو, ئەمەش بوبویە هۆی ئەوەی کە شەقامێکی توڕەو نەیاری بەرپرس و سەڵتەنەتی پەهلەوی دروست بو بوو کە بەردەوام چاوەڕێی کارەکتەرێکیان دەکرد کە بتوانێت پێشەنگییان بکات بۆ ڕزگار بوون لەو ڕەوشەی کە تێی کەوتبوون, بۆیە دەتوانین ئاماژە بە دوو هەوڵی کوشتنی (شا) و هەردوو بزوتنەوەکەی (د. موسەددەق و ئایەتولاّ خومەینی) بکەین, کە لە هەردوو بزوتنەوەکەدا (شا) ناچار کرا کە لە ولاّت هەڵبێت, جاری یەکەم بە هاوکاری ولاّتە بیانیەکان بە تایبەت ئەمریکا و بەریتانیا توانی بگەڕێتە وە و سەڵتەنەتی ئێران بگرێتەوە دەست, بەلاّم لە جاری دووەم دا نەك لە ئێران ڕێگەی نەبوو, بەڵکو بە زەحمەت توانی لەسەر ئەم زەویە فراوانەدا شوێنێکی دەست بکەوێت تا تیایدا بمرێت.

مێژووی هاوچەرخی ئێران بە تایبەتی سەردەمی دووەمی پەهلەوی کە ناوەڕۆکی ئەم کتێبە پێك دەهێنێت, مێژوویەکی پڕ لە ڕوداو و پەند و ئامۆژگاریی یە, وە بەهۆی پێگەی گرنگی جوگرافی ئەو ولاّتەشەوە کاریگەری هەبووە لە سەر ولاّتانی دیکە, تەنانەت هەندێك لە پسپۆڕان شۆڕشی گەلانی ئێران لە ساڵی (١٩٧٩) دا بە ڕێبەرایەتی (ئایەتولاّ خومەینی) و کۆتایی هێنان بە ڕژێمی(٢٥٠٠) ساڵەی شاهنشایی لە ئێران دا, بە ئیلهام بەخشی شۆڕشەکانی ئەم دواییەی ولاّتانی عەرەبی کە بە بەهاری عەرەبی ناسراوە, دەزانن, کە سەرجەمیان پەند و ئامۆژگارین بۆ ئەو سەرکردانەی کە بیانەوێت وەك ئەوان بکەن, چونکە مێژوو هەمیشە ئامادەیە لە کات و شوێنی جیاوازدا خۆی دووبارە بکاتەوە و دەسەلاّتە ستەمکارو میراتیەکان کۆتایی پێ بهێنێت.

مەحمود طلوعی نوسەری ئەم کتێبە بەهۆی ئەوەی کە خۆی کەسێکی ڕۆژنامەنووس بووە و لە کاتی نوسینی ئەم کتیبەدا نزیکەی (٤٠) ساڵ ئەزمونی کاری ڕۆژنامەنووسی هەبووە چەندین بەرهەمی لە بارەی مێژووی هاوچەرخی ئێرانەوە

نوسیووه و چەندینیشی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی و ئاشنایی لەگەڵ زۆرێك لە بەرپرسان دا هەبووە و خۆشی لەو سەردەمی ڕوداوەکان دا بووە, زیاتر ڕوداوەکانیشی لە نزیکترینی کەسەکانی نێو ڕوداوەکەوە وەرگرتووە و پاشان بۆچوونی کەسانی دیکەشی خستووەتە ڕوو, ئەمجا بۆخۆشی بۆچوونی خۆی لە بارەیەوە دەربڕیوە, بۆیە کتێبەکەی بە یەکێك لە سەرچاوە گرنگەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێران (سەردەمی دووەمی پەهلەوی) دادەنرێت, ئەمەش وای کرد کە وەرگێڕ لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا بڕیار بدات ئەگەر خودای گەورە مۆڵەتی پێ ببەخشێت وەریگێڕێتە سەر زمانی شیرینی کوردی.

لە بنەڕەت دا ناونیشانی ئەم کتێبە بە زمانی فارسی بریتیە لە (پدر و پسر, ناگفتهای از زندگی و روزگار پهلویها / باوك و کوڕ, نهێنی گەلێك لە ژیان و ڕۆژگاری پەهلەویەکان), کە باس لە هەردوو سەردەمی پەهلەوی دەکات, واتە سەردەمی (ڕەزاشا و محەمەدڕەزاشا), بەڵام بەهۆی ئەوەی کە پێشتر وەرگێڕ کتێبێکی دیکەی بە نێوی (ڕەزاشای پەهلەوی) وەرگێڕاوە و خراوەتە بەر دیدی خوێنەران, لە ئێستادا وای بە باش زانی کە بەشی دووەمی ئەم کتێبە واتە سەردەمی (محەمەد ڕەزاشا) وەربگێڕێت, انشاالله ئەگەر خودای گەورە مۆڵەت بدات لە کاتێکی دیکە دا کار لەسەر بەشەکەی دیکەشی دەکرێت.

لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی ئەوەی کە نووسەری کتێبەکە کەسێکی ئێرانییە, زۆربەی بەرواری ڕوداوەکانی بە ڕۆژ ژمێری هەتاوی دیاری کردووە, کە گۆڕینیان بۆ ساڵی زایینی کارێکی ئاسان نییە, بۆیە لێرەدا بە باشمان زانی کە ناوی مانگاکانی ساڵی ئێرانی بخەینە بەر دیدی خوێنەران, مانگەکان بە پێی وەرزەکانی ساڵ بریتین لە: أ- وەرزی بەهار: (فەروەردین, ئۆردیبەهەشت, خورداد). ب- وەرزی هاوین: (تیر, مورداد, شەهریوەر). ج- ورزی پاییز: (میهر, ئابان, ئازەر). د- وەرزی زستان: (دەی, بەهمەن, ئەسفەند).

وەهەروەها نووسەر لەگەڵ ناو هێنانی زۆرێك لە کەسایەتیەکان دا پلە سەربازیەکەشی لەگەڵ دا بەکار هێناوە, هەربۆیە وا بە باش زانرا کە پلە سەربازیەکان وە خۆی بنوسرێنەوە, وەك:, سەرگورد, سەرهەنگ, سپەهبەد, تیمسار... هتد.

جێگای خۆیەتی لێرەدا وەرگێڕ ئاماژە بەوە بکات کە هیچ کارێك بێ هەڵەو کەم و کوڕی نییە, خوێنەری بەڕێزیش لەوە دڵنیا دەکاتەوە کە هەر هەڵەیەك کرابێت بە دەستی ئەنقەست نەبووە, لێبوردنیش هەمیشە لای گەورەکانە, لە هەمان کاتیشدا داوا لە خوێنەری بەر ێز دەکات کە دەتوانن لە هەر کەم و کوڕییەك ئاگادارمان بکەنەوە بۆ ئەوەی لە چاپەکانی دواتر دا ڕەچاوی تێبینیەکانیان بکرێت.

لە کۆتایشدا بە پێویستی دەزانم سوپاسی سەرجەم ئەو بەڕێزانە بکەم کە ئەگەر بە وشەیەکیش بێت لە پێشکەشکردنی هاوکاری, کەمتەرخەمییان نەکردووە.

هاوکاری و بەرەکەتی تەمەن لە یەزدانی مەزنەوەیە...........

ئەرکان ئەحمەد جاف

٨/ ٦/ ٢٠١٢

هەڵەبجەی شەهید

# پێشەکی نووسەر:

حەز و ئارەزوی خەڵك بۆ شارەزا بوون لە مێژووی هاوچەرخی ئێران, بە تایبەتی ئەوەی لە سەردەمی سەڵتەنەتی پەهلەوی دا بە سەر ئێران دا هاتووە, لەم ساڵانەی دواییدا بووەتە هۆی چاپکردنی چەندین کتێب و توێژینەوە لەم زەمینەیەی مێژووی ئێران, کە بەشێکی زۆریان بەنرخ و گرنگن, بەڵام بەو پەڕی داخەوە هەندێکیشیان ئەفساناوی و گومڕاکەرن, هەندێك لە ناوەندە شۆڕشگێڕیەکان و دامەزراوە فەرهەنگیە لێکۆڵینەوەییەکان کە بەڵگەنامەی گرنگ و بڕوا پێکراویان لەبەر دەست دایە, بە بڵاو کردنەوەی ئەو بەڵگەنامانە لە بوارە جۆراوجۆرەکان دا, هاوکارییەکی گەورەیان کردووە بۆ ڕونکردنەوەی لایەنە تاریك و هەستیار و ناڕونەکانی مێژووی وڵاتەکەمان, کە بە هۆی سروشتی خۆی خوێنەری دیاریکراوی خۆی هەیە, بەڵام ئەو توێژینەوانەی کە لەم زەمینەیەدا بەسود وەرگرتن لە سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی ناو خۆو دەرەوە ئەنجام دەدرێن, وە وەرگێڕانی ئەو توێژینەوە بەنرخانەی کە دەربارەی مێژووی هاوچەرخی ئێران لە دەروەی وڵات کراون, بە دڵنیاییەوە خوێنەری زیاتر بەرەو خۆی کەمەنکێش دەکات.

بەڵام لەگەڵ ئەو بەرهەمە بە نرخانەی کە ئاماژەیان بۆ کرا, لەم ساڵانەی دوایی دا چەند کتێبێك بە شێوەی ئەفسانەو ڕۆمان, بەڵام وەك سەرچاوەیەکی مێژووی بڵاو کراونەتەوە, کە هەرچەندە پێدەچێت بۆ خوێنەر سەرنج ڕاکێش و سەرگەرم کەر بێت, بەڵام پڕن لە هەڵەی مێژووی و گومڕاکەرانە, نوسەرانی ئەم بەرهەمانە, ئەگەر بەرهەمەکانی خۆیان بە ناوی ڕۆمانی مێژوویی بڵاو بکردایەتەوە کێشەی نەبوو, بەڵام کێشەی کارەکە لەوەدایە کە ئەم نوسینانە لە شێوەی بەڵگەنامەی مێژوویی دا خراونەتە بەر دیدیی خوێنەران, لە کاتێکدا کە بە پێچەوانەی بەرهەمی مێژوویی لەم نوسینانەدا سەرچاوەی گرنگ و باوەڕ پێکراو بەدی ناکرێت, نوسەر مۆڵەت بە خۆی دەدات ڕوداوە مێژووییەکان یان تەنانەت ئەو بابەتانەی کە لە کەسێکەوە وەری

دەگرێت, بە بێ ئاماژە دان بە سەرچاوەی ئەو نوسینەی کە دەیخاتە سەر ڕوپەڕی کتێبەکان و خوێنەریش هیچ چارەیەکی جگە لە وەرگرتنی ئەو بابەتانە, نییە.

چەندین نمونەی دیکە لەم جۆرە (بەرهەمی مێژوویی) کۆکردنەوە و تێکەڵکردنی بەرهەمی کەسانی دیکەیە, ئەویش بە شێوەیەکی سادە و بە بێ ڕەچاو کردنی پێش و دواخستنی کاتی ڕوداوەکان و بەستنەوەی بابەتەکان پێکەوە, بە وتەی ئاغای (کەریم ئیمامی), نوسەر دەبێت ئەو شێوە نوسینانە بە (تێڕوانینی مێژوویی بە مۆنتاژکراوی) ناو ببرێن, لەم شێوە کتێبانەدا ڕەچاوی زاراوە مێژوویەکان و ڕاست و چەوتی ئەو بابەتانەی کە وەردەگیردرێن و ڕەسەنایەتی ئەو سەرچاوانەی کە سودیان لێ وەردەگیرێت, ناکرێت, بابەتەکان زیاتر لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ڕابردوو وەرگیراون, کە هیچکامیان وەك بەڵگەنامەی مێژوویی باوەڕ پێکراو نین, لە یەکێك لەم جۆرە کتێبانەدا بینیم کە تەنانەت دێڕی یەکەم دەربارەی مێژووی لەدایك بوونی پاڵەوانی کتێبەکە بە هەڵە نوسرابوو.

دەبێت ئەوەش بڵێم کە ئەم هەڵانە لە نوسینی ڕوداوە مێژووییەکان دا یان شیکردنەوەی ڕوداوەکانی مێژوی هاوچەرخی ئێران, تایبەت نیە بە نوسەرە ئێرانیەکانەوە, بەداخەوە لە لە نێو خەڵکی ئێمەدا ئەو بۆچوونە هەڵەیە برەوی سەندووە کە هەر شتێك نوسەر و توێژەرە بیانیەکان دەربارەی ڕوداوەکانی ئێران دەینوسن, ڕاستە و شیاوی پشت پێ بەستنە, هەر بۆیە بەرهەمی نوسەرە بیانیەکان دەربارەی ئێران, هەرچەندە ڕوکەش و دوژمنکارانەش بێت, وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی فارسی و بڵاو دەکرێتەوە, لە کاتێکدا کە هەندێك لەم نوسینانە هەرگیز شیاوی وەرگێڕان نین, وە زۆرێکی دیکەیان هەڵەی وەهای تێدایە کە ئەگەر لە پێشەکی یان پەراوێز دا, بابەتەکە ڕون نەکرێتەوە دەبێتە هۆی سەرلێشێوانی خوێنەر, تەنانەت نوسەر و لێکۆڵەرانی دیاری وەك (ڕیچارد کاتم) و (جیمزبیل)یش کە خۆیان بە شارەزا دەزانن لە کاروباری ئێران دا, لە شیکردنەوەی ڕوداوەکانی ئێران دا دوچاری چەندین هەڵەی جۆراوجۆر بوون, لەسەروبەندی شۆڕشی ئێران دا بە پێش بینیە هەڵەکانی خۆیان دەربارەی پێشهاتەکانی ئەم شۆڕشە سەریان لە بەرپرسانی دەوڵەتی ئەمریکا شێواند, چ جای نوسەرە خەیاڵ بڵاوەکانی وەك (محەمەد حەسەنەین هەیکەل)ی

نوسەری میسری, کە نوسینەکانی دەربارەی ئێران لێوان لێوە  لە دەقی مێژووی هەڵە کە بە بڕوای بەندە هەرگیز شیاوی وەرگێران نین بۆ سەر زمانی فارسی.

بە بڕوای نوسەر, لە وەرگێڕانی بەرهەمی نوسەرە بیانیەکان دا بۆ سەر زمانی فارسی, بە تایبەت دەربارەی بەرپرسان و دیبلۆماتکارە بیانیەکان کە یاداشتی کارەکانی خۆیانیان بە شێوەیەکی ئازادانە نووسیوە, ناساندنی کەسەکە (نوسەرەکە) و ئامانج و مەبەستەکانی لە نوسینی بابەتەکەی و هەروەها خستنە ڕووی هەڵە و داوەرییە ناڕاستەکانی ئەو نوسەرە, کارێکی پێویستە, لەجۆری ئەم کتێبانە کە لەم دواییانەدا بلاْو کراوەتەوە و لە نوسینی ئەم کتێبەش دا سودی لێ وەرگیراوە, کتێبی (نامەهایی از تهران / نامەگەلێك لە تارانەوە)یە کە بە نێونیشانی (نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانە سر ریدر بولارد سفیر کبیر انگلستان در تهران / نامە تایبەتی و ڕاپۆرتە نهێنیەکانی سر ریدر بولارد ی باڵوێزی بەرتانیا لە تاران) بلاْو کراوەتەوە, کە لە لایەن ئاغای (غولاْمحسەین میرزا سالْح)ەوە وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی فارسی, ئەو کتێبە لە ڕوانگەی ئاشکرا کردنی سیاسەتی ڕۆژانەی بەریتانیا لە ئێران دا بایەخێکی گەورەی هەیە و شیاوی پشت پێ بەستنە, بەلاْم دەبوو کە ئاغای (غولاْمحسەین)ی بەڕێزیش پێشەکیەکی بۆ ئەم کتێبە بنوسیایە و تیایدا ئەم باڵوێزە نەفرەتی و خراپەکارەی بەریتانیای لە ئێران دا, بە نوسەران و خوێنەرانی ئێرانی بناساندایە, لە کاتێکدا کە (چەرچڵ)ی سەرۆك وەزیرانی بەریتانیاش بەو هەموو دوژمنکاریانەی کە بەرامبەر بە ئێران هەیبوو, دەربارەی ئەو دەنووسێت: (سر ریدر بولارد کینەی بەرامبەر بە هەموو ئێرانیەکان هەیە, کە بە دڵنیاییەوە زیان بە لێهاتوویی خۆی و بەرژەوەندیەکانی ئێمە دەگەیەنێت..)[١], بۆ ئەوەی ئێرانیەکان بە نوسینە کیناویەکانی ئەو بەرامبەر بە ئێران و خەڵکی ئێران گومڕا نەبن و هەڵنەخەڵەتێن.

ئەوەی شیاوی باسە هەڵەکاری و کینە لە دڵی بەرامبەر ئێرانیەکان تەنها لەلایەن نوسەرە بیانیەکانەوە نییە, بەڵکو هەندێك لە نوسەرەئێرانیەکانی نیشتەجێی دەرەوەش, لەگەڵ ئەوەی کە هەستی ناسیۆنالیستی و ئێرانی بونیان لەسەریان

---

[1] سر ریدر بولارد: نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانە سر ریدر بولارد: ت, غلامحسین میرزا صالح, انتشارات طرح نو, ص٤٠٢.

پێویست دەکات، کە بە ویژدانەوە دەربارەی ئێران و ڕوداوەکانی داوەری بکەن و زانیاری هەڵە بە خوێنەرانی خۆیان نەدەن، ڕاستییە مێژووییەکان تێکەڵ بە کینەی خۆیان نەکەن و سەرەوژوری نەکەنەوە، یەکێك لە نوسەرە ئێرانیەکانی دانیشتووی دەرەوەی ئێران بەڕێز ئاغای (ئەمیر تاهیری)یە، کە لە دوایین کتێبی دا بە نێونیشانی (زندگی ناشناختە شا / ژیانی نەناسراوی شا) سەرباری دوبارە کردنەوەی هەڵەکانی لە نوسینی ڕوداوە مێژوییەکانی ئێران دا، عەیبەیە دەربارەی هەندێك بابەتی پەیوەست بە مێژوویی ئەم چەند ساڵەی دوایی ئێرانیشەوە هەڵەی کردووە، بۆ نمونە دەنووسێت: کۆنفرانسی (گوادلۆپ) بە ئامادە بوونی سەرانی حەوت وڵاتە پیشەسازیەکەی دونیا بەسترا، وە ئاماژەی بە وتەکانی سەرۆك وەزیرانی (یابان و کەنەدا)ش کردووە کە بە گومانی ئەو لەو کۆنفرانسەدا بەشدارییان کردووە، ئەمەش درۆیەکی ئاشکرایە، لەبەر ئەوەی لە کۆنفرانسی (گوادلۆپ) دا، کە بەڕێزیان ئەوی بە کۆنفرانسی ساڵانەی حەوت وڵاتە پیشەسازیەکەی جیهان ناو بردووە، تەنها بە ئامادە بوونی ڕێبەرانی چوار وڵات کە ئەوانیش (ئەمریکا، بەریتانیا، فەڕەنسا، ئەڵمانیا) بوون، بەستراوە، ئەم کۆنفرانسە لەگەڵ گەرمەی شۆڕشی ئێران و لە سەر بانگێشتی (ژیسکار دستن)ی سەرۆك کۆماری ئەوکاتی فەڕەنسا بەسترا و بابەتی سەرکی کۆنفرانسەکەش پرسەکانی تایبەت بە وڵاتی ئێران بوو.

** ** **

کتێبی (پدر و پسر / باوك و کوڕ) سەرگوزەشتەیەکی بەڵگەدارە لە ژیان و دەورانی پەهلەویەکان، کە نوسەر بەگەڕانەوە بۆ سەرچاوە بڕواپێکراوە ناوخۆیی و دەرەکیەکان و ئەو زانیاریانەی لە لە ماوەی زیاتر لە چل ساڵ کاری ڕۆژنامە نوسی دا کۆی کردوونەتەوە، دەستی کردووە بە نوسین و ڕێکخستنی ئەم بەرهەمە، پاڵنەری ڕاستەقینەی نوسینی ئەم کتێبە، بینینی ئەو ئارەزومەندییەی خەڵك بۆ زانیاری پەیدا کردن دەربارەی مێژووی هاوچەرخی وڵاتەکەمان و برەو سەندنی بازاڕی ئەو بەرهەمانەی کە لەم بارەیەوە دەنوسران، کە بەو نوسینانەی لە ڕابردودا باسکران نەك خاڵە نادیارەکانی پەیوەست بە ڕابردووی نزیکی وڵاتەکەمان ڕوون ناکاتەوە، بەڵکو لە هەندێك لایەنیشەوە خوێنەر گومڕا دەکەن، هەربۆیە چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی بەرهەمێکی دوکیۆمێنتدار لەم کاتەدا کارێکی پێویستە.

ڕەوشی نوسینی ئەم کتێبە، وەك بەرهەمێکی دیکەی نوسەر لەبارەی مێژووی هاوچەرخی ئێرانەوە بە ناونیشانی (داستان انقلاب) لە ساڵی ١٩٧٠ دا بلاَو کرایەوە، پشت ئەستورە بە گرنگترینی ئەو سەرچاوانەی کە لە ناوخۆ و دەرەوە دا لەم بوارەدا نوسراون، وە ڕێکخستن و پێکەوە بەستنی ئەم بابەتانە بە زانیاری و شیکردنەوەکانی خودی خۆمەوەیە لە ڕونکردنەوەی بابەتەکان دا، ئەو سەرچاوانەی کە لەم نوسینەدا سودیان لێ وەرگیراوە لە کۆتایی کتێبەکەدا ناویان هاتووە، نوسەر لە سەرجەم بابەتەکان دا هەوڵی داوە پشت بە گرنگترین و بڕواپێکراترینی ئەو سەرچاوانە ببەستێت.

هەر بەو شێوەیەی کە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، دەربارەی مێژووی هاوچەرخی ئێران و بە تایبەتی باسەکانی نێو ئەم کتێبە، بابەتگەلێکی زۆر بلاَو کراونەتەوە، بەلاَم ئەوەی کە لەم کتێبەدا دەخرێتە بەر دیدی خوێنەران، پڕیەتی لە سەدان بابەتی نوێ و نەوتراو، کە هەندێکیان زانیاری و شیکردنەوەی تایبەتی خودی نوسەرە، کە بۆ یەکەمێن جارە دەخرێتە سەر ڕوپەڕی بلاَوکراوەکان و هەندێکیش وەرگێڕانە کە لە سەرچاوە بڕواپێکراوە بیانیەکانەوە وەرگیراوە، کە ئەوانیش بۆ یەکەمین جارە لە ئێران دا بلاَو دەکرێنەوە، لە باسی ڕوداوەکانی سەردەمی پەهلەوی، کە نزیکەی شەست ساڵ لە مێژووی هاوچەرخی ئێران دەگرێت، وە هەروەها بۆ دورکەوتنەوە لە زۆر درێژەپێدانی بابەتەکان، بەندە خۆمم بواردووە لە نوسینی هەندێك لەو بابەت و ڕوداوانەی کە لە ڕوی گرنگیەوە لە پلەی دووەم دان، بەلاَم هیچ ڕوداوێکی گرنگ لە پێنوسەکەم جێ نەماوە، ئەو ڕوداوانەی کە تایبەتە بە ڕوداوەکانی سەڵتەنەتی پەهلەوی و زۆر لە سەردەمی ئێمەوە نزیکە، خودی نوسەر لە کتێبی (داستان انقلاب) دا بە تێروتەسەلی باسی لێوە کردووە و لێرەدا پوختە کراوەتەوە، هەوڵی نوسەر لەم بەشەشدا بە شێوەیەك بووە کە لە نێو باسکردنی گشتی ئەو ڕوداوانەی کە لە کۆتاییەکانی سەڵتەنەتی پەهلەوی دا لە ئێران ڕویان داوە، بابەتی نوێ و نەوتراو بخرێتە بەر دیدی خوێنەران.

هەندێك لە هاوڕێیان، کاتێك لەمەبەستی من بۆ نوسینی وەها کتێبێك ئاگادار بوون، وتیان: ئەمڕۆ کاتی نوسینی ئەم کتێبە نیە، لەبەر ئەوە لە وەها ڕەوشێکدا هەرگیز ناتوانرێت داوەرییەکی ڕاست و دروست و بێلایەنانە دەربارەی کارو کردەوەی

پەهلەویەکان بکرێت، کاتی نوسینی کتێبی (داستان انقلاب)یش هەندێك بۆچوونی لەم بابەتەم لەلایەن هەندێك لە دۆستانمەوە پێگەیشت، بەڵام وەڵامی من بۆ ئەو کەسانەی کە بەو جۆرە داوەری دەکەن ئەوەیە کە: ئەگەر نوسەرێکی وڵاتانی جیهانی سێ دانیشێت و چاوەڕوانی هەل و مەرجێك بیێت کە بتوانێت تەوای ڕاستیەکان بڵێت، لەوانەیە هەرگیز نەگات بە نوسینی هیچ شتێك، لێرەشدا ئەو ڕستەیەی کە لە پێشەکی کتێبی (داستان انقلاب) دا نوسیووە، دووبارەی دەکەمەوە: (بەبۆچوونی من پەیامی نوسەر ئەوەیە کە لە هەموو هەل و مەرجێك دا، ئەوەی کە دەتوانێت دەبێت بینوسێت، بەمەرجی ئەوەی کە ڕاستیەکان نەشارێتەوە...).

ئەو کەسانەی کە کتێبی (داستان انقلاب)یان خوێندووەتەوە دانیان بەوەدا ناوە کە جگە لە ڕاستیەکان هیچ شتێکی دیکە نەنوسراوە، نوسەر بەو پەڕی توانایەوە هەوڵی داوە کە لە نوسینی ئەم کتێبەش دا لە شەقامی ڕاستی لانەدات و جگە لە ڕاستیەکان هیچ شتێك بە پێنوسەکەی نەنوسرێت، لەگەڵ ئەوەش دا دەگونجێت هەندێك ڕستە یان هەندێك بابەت نوسرابێت کە لە بەرژەوەندی یان زیانی کەسێك یان زیاتر خۆی بنوێنێت، نوسەر جگە لەو بابەتانەی کە لە کەسێك یان سەرچاوەیەکی دیکەوە وەریگرتووە کە ڕاست و دروستیەکەی لە ئۆباڵی ئەوان دایە، (هەرچەندە نوسەر هەوڵی تەواوی داوە لەو بابەتانەش دا ڕاست و دروست ترین یان هەڵبژێرێت...) لە ڕاستی و دروستی بابەتەکان دڵنیایە، بەڵام خۆم بە کەسێکی بێ هەڵە نازانم و ئەگەر خوێنەران لە کاتی خوێندنەوەی کتێبەکەدا ڕوبەڕوی هەڵەیەك یان چەند هەڵەیەك بوونەوە، یان ڕونکرنەوەی زیاتری هەندێك بابەتیان بە پێویست دەزانی، بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە لە چاپەکانی دواتر دا ڕەچاوی ڕونکرنەوەکانیان دەکرێت، تەنها داوای نوسەریش لەو خوێنەرە بەڕێزانەی کە لەم بارەیەوە سەربەرزمان دەکەن ئەوەیە، کە لە ڕونکردنەوە و چاکسازی داواکاریەکانی خۆیان دا ئاماژە بە سەرچاوەی زانیاریەکانی خۆیان بکەن، بۆ ئەوەی لە کاتی چاك کردن و ڕونکردنەوەکان دا ئاماژە بە سەرچاوەی دیاریکراو بکرێت.

لەگەڵ ئەم پێشەکیەدا، پێش خوێندنەوەی ئەم کتێبە، وەبیر هێنانەوەی چەند خاڵێك بە پێویست دەزانم:

١- ئەو سەرچاوە بیانیانەی کە بۆ نوسینی ئەم کتێبە سودی لێ وەرگیراوە, ناونیشانی تەواوی لە کۆتایی کتێبەکەدا نوسراوە, لە هەموان زیاتر کتێبی نوسەرێکی فەرەنسیە بە نێوی (ژراو دو ویلیە / Gerard De Villiers) دەربارەی ژیانی (شا), سودی لێ وەرگیراوە,جێگای وەبیر هێنانەوەیە کە نوسەری ئەو کتێبەی کە لە ساڵی ١٩٧٥ دا لە پاریس بە ناونیشانی (صعود مقاومت ناپذیر محمد رضا شاه)[1] چاپ و بڵاو کراوەتەوە, یەکێکە لە نوسەرە دیارەکانی فەرەنسا کە لە لوتکەی دەسەڵات و هێزی شا دا بۆ نوسینی کتێبێك دەربارەی پەهلەویەکان (باوك و کوڕ / ڕەزا شا و محەمەد ڕەزا شا) دەعوەتی ئێران کرا, دوای ماوەیەك مانەوەی و پێشوازی لێکردنی شاهانەیی لە تاران و دەستکەوتنی سەرجەم سەرچاوەکان و ئەنجام دانی چەندین چاو پێکەوتن لەگەڵ شا و بەرپرسە دەوڵەتیەکان و دەربارییەکان, گەڕایەوە بۆ پاریس, بەڵام ئەو کتێبەی کە بە پێنوسی ئەم نوسەرە فەرەنسیە دەربارەی شا و بنەماڵەی سەڵتەنەتی بڵاوکرایەوە, هاتنە ناوەوەی بۆ ئێران لە ڕژێمی ڕابردوودا یاساغ کرا, لەبەر ئەوەی ئەو بابەتانەی کە دەربارەی ژیانی تایبەتی شا و گەندەڵی دەربارییەکان لەم کتێبە دا نوسرابوو, بابەتەگونجاوەکانی دیکەی کتێبەکەی خستبوویە ژێر کاریگەری خۆیەوە, بەندە لە سەرەتای بڵاو بوونەوەی ئەم کتێبەدا لە پاریس دانەیەکم کڕی و لای هاوڕێیەکم بە ئەمانەت دام نا, ئێستا دوای تێپەڕینی نزیکەی هەژدە ساڵ توانیم سود لە بابەتەکانی ئەو کتێبە وەربگرم, ئەو سەرچاوە بیانیانەی دیکە, کە لە سەرچاوەکانی دیکە زیاتر سودی لێ وەرگیراوە, دەبێت ئاماژە بە هەندێکیان بکەین (اندیشەهای یك پادشا / ئەندێشەکانی پادشایەك)[2], کە کۆمەڵە چاوپێکەوتنێکی (کارانجیا)ی ڕۆژنامە نوسی هیندییە لەگەڵ (حەمەڕەزاشا) دا ئەنجامی داوە, (همە سقوط می کنند / هەموان دەڕوخێن)[3] لە نوسینی (گاری سیك)ی

[1] Lirresistible Ascension De Mohammad Raza Shah d, Iran. Poln, Paris. 1975.

[2] Karanjina. R. K. The Mind of a Monarch. London. Allen and Unwin. 1977.

[3] Sick, Gary: All Fall Down. Penguin Books. London 1986.

ئەندامی پێشوی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا, (بحران / قەیران)[1] لە نوسینی (هاملتۆن جۆردن)ی سەرۆکی گاردی کۆشکی سپی لە سەردەمی سەرۆکایەتی (کارتەر) دا, وە چاپی ئینگلیزی کتێبی (خاطرات ثریا / یاداشتەکانی سورەییا) بە سەرچاوەی سەرەکی بەشی تایبەت بە حەوت ساڵی ژیانی ئەو لە دەرباری پەهلەوی دا دادەنرێت.

٢- لە بەشێکی زۆری سەرچاوە ناوخۆیی و بیانیەکان دا کە دەربارەی پەهلەویەکان و سەردەمی پەهلەوی بڵاو کراوەتەوە, هەڵە گەلێك بەرچاو دەکەوێت, هەربۆیە نوسەر خۆی بواردووە لە وەرگرتنی ئەو بابەتانەی کە هەڵەیە, بۆ ئەوەی جارێکی دیکە هەڵەکان دووبارە نەبنەوە, وە لەو بابەتانەشی کە لە ڕاست و دروستیەکەی دڵنیا نە بووە, بەوپەڕی بە ئاگاییەوە لەو کتێبانە وەرگیراون, لە هەندێك لەو سەرچاوانەشی کە لە بەرپرسانی ڕژێمەوە بەجێ ماوە و بە مەبەستی بەرگری کردن لە خۆیان نوسیویانە و زیاتر وتەی کەسانێکە کە ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن, هەرگیز سودیان لێ وەر نەگیراوە.

٣- وەرگێڕران و وەرگرتنی هەندێك لە سەرچاوە یەکەمینەکان, وەك بەڵگەنامە نهێنیەکانی وەزارەتی دەروەی ئەمریکا دەربارەی ڕوداوەکانی ئازەربایجان کە بۆ یەکەم جارە لە ئێران دا بڵاو دەکرێتەوە, یان ئەوەی کە لە زمانی خودی (شا) وە دەربارەی ڕوداوەکانی ژیانی ئەوە وە وەرگیراوە, هۆکاری بڕوا بوون پشت ڕاستکردنەوەی ئەو بابەتانە نیە لەلایەن خودی نوسەرەوە, بەڵکو لەو بابەتانەیە کە دەبێت بە ئاگاییەوە باس بکرێن و لە پێشترەوە بەرچاو ڕونی دراوە.

٤- لە بارەی ئەو بابەتانەی کە لە سەرچاوە فارسیەکان دا وەرگیراون, لە ڕوی لەبەرچاو گرتنی ئەمانەت پارێزییەوە, گۆڕانکاری لە دەقەکان دا نەکراوە, هەربۆیە ئەگەر لە ڕوی ڕێزمانی یان چۆنیەتی نوسینی بابەتەکە هەڵە هەبێت, ئەوا لە دەقە ڕاستەقینەکەیدا هەر بەو شێوەیە بووە و هەڵە لە نووسەرەوە نییە.

---

1 Jordan, Hamilton: Crisis. The Last Year of the Carter Presidency. New York. 1982.

٥- له باسی ڕوداوەکانی ژیان و سەردەمی پەهلەویەکان, سەرنجی نووسەر زیاتر لە سەر ڕوداوە سیاسیەکان چۆنیەتی فەرمانڕەوایی کردنیان و پەیوەندی (باوك و کوڕ) بووە لەگەڵ هێزە بیانیەکان دا, لەگەڵ ئەمانەش دا بابەتی تایبەت لەبارەی ژیانی تایبەتی پەهلەویەکان پشت گوێ نەخراوە و لە بەشەکانی پەیوەست بە هاوسەرەکانیانەوە بابەتی نوێ و نەوتراو خراوەتە ڕوو.

٦- وەرگرتنی بابەتگەلێك لە نوسینەکانی (ڕەزاشا یان محەمەد ڕەزاشا) لە هەندێك شوێن دا پێویست بووە, ئەمەش بە واتای بەڕاست زانین و پشت ڕاستکردنەوە نوسینەکان یان بانگەشەکانی (باوك و کوڕ) نییە, خوێنەران لەوە تێدەگەن کە بەیان نامە و وتە پڕ گڕوفڕەکانی ڕەزاشا, نوسینی خودی ئەو نین, لەبەر ئەوە هیچکەس لاری لە نەخوێندەواری یان کەم خوێندەواری ڕەزاشا نییە, هەربۆیە نمونەی دەست نوسەکانی ئەو هەڵەی ئاشکرای ڕێنوسی تێدایە, لەوانەیە نێوەڕۆکی ئەو بەیان نامە و نوسینانە لەلایەن خۆیەوە ئامادە کرابێت, بەڵام کەسانی دیکە نوسیبێتیانەوە, وەك دەقی بەیاننامە و وتار و سەرجەم نوسینەکانی ڕەزاشا لە (سفرنامە خوزستان / سەفەرنامەی خوزستان) دا, خەڵکانی دیکە (بەزۆری دەبیر ئەعزەم (بەهرامی)) بۆی نوسیووە, پێدەچێت نوسینەکانی (محەمەدڕەزاشا)یش ڕاپۆرتی ئەو بێت بەڵام کەسانی دیکە بۆیان نوسیبێت.

٧- هەندێك لە ڕودوە گرنگەکانی پەیوەست بە سەردەمی ژیان و سەڵتەنەتی پەهلەوی, بە شاراوەیی ماوەتەوە و بڕیاری یەکلاکەرەوە دەربارەوی ئەو ڕوداوانە هەرگیز گونجاو نیە, لە نمونەی ئەو ڕوداوانە لە سەردەمی ڕەزاشا دا ڕوداوی (تەیمورتاش) و پیلانی کودەتاکەی سەرهەنگ (پولادین)ە, کە لە هەر بابەتێکیان دا گەڕاوینەتەوە بۆ باوڕپێکراوترین سەرچاوە و لە گۆشەنیگای جیاوازەوە و لە ڕوانگەی چاودێرانی ئاگادار و نزیك لە ڕوداوەکەوە بە دواداچونی بۆ کراوە, لە ڕوداوە شاراوەکانی سەردەمی سەڵتەنەتی (محەمەدڕەزاشا)یش کە بە شاراوەیی ماوەتەوە, دەتوانین ئاماژە بە دوو هەوڵی کوشتنی خودی حەمەڕەزا شا بدەین لە ساڵانی (١٣٢٧, ١٣٤٤)هەتاوی, وە هەروەها دوو پیلانی کودەتا لەلایەن سپەهبەد (ڕەزم ئارا) لە ساڵی (١٣٢٩)هەتاوی و ئەرتەشبەند (خاتەمی) لە ساڵی (١٣٥٤)هەتاوی بکەین, ئەوەی کە لەم کتێبەدا بە پشت بەستن بە سەرچاوە ناوخۆیی و بیانیەکان دەربارەی

ئەم ڕوداوانە نوسراوە, تا ڕادەیەکی باش هاوکاری ڕەواندنەوە و ئاشکرا کردنی لایەنە شاراوەکانی ئەو ڕوداوانە دەکات.

٨- خوێنەرانی بەڕێز سەرنجی ئەوەیان داوە کە ئەم کتێبە زیاتر (ژیان نامە)یە نەك (کارنامە)و باسکردنی هەموو ئەو کارانەی کە لە سەردەمی سەڵتەنەتی پەهلەوی دا لە ئێران دا ئەنجام دراوە, کە ئەو بابەتە خۆی دەتوانێت ببێتە کتێبێکی سەربەخۆ, سەرباری ئەوەی زۆرێك لەو کارە بە ڕوکەش بەسود و باشانەش کە لە سەردەمی پەهلەوی دا هەنگاویان بۆ هەڵهێنرا, لە ئێستادا لە ژێر پرسیاردان و ناتوانرێت بە ڕاست و دروستی لە بارەیانەوە داوەری بکرێت, تەنانەت گەورەترین کاری ئاوەدانکاری سەردەمی (ڕەزاشا) واتە دروستکردنی ڕێگای ئاسنی سەرانسەری ئێران, لەلایەن هەندێك لە پیاوەناودار و بەرجەستەکانی ئێرانەوە وەك (د. موسەددەق) بە خیانەت و ناپاکی هەژماریان کردووە, وە داگیر کردنی ئێران لە جەنگی دووەمی جیهانی دا بە دەرەنجامی دروستکردنی ئەم پرۆژە ستراتیژییە دەزانن, گەورەترین شانازی (حەمەڕەزاشا)یش, ئەنجام دانی (شۆڕشی سپی) بوو, کە ئەویش ئەمڕۆ لە ژێر پرسیاردایەو داوەری لە بارەی (چاك یان خراپ)ی ئەو کارە دەبێت بسپێرێت بە مێژوو, پێودانگی داوەری کردنی مێژووش دەرەنجامی کارەکەیە و نیەتی کەسەکە و نەگونجاندنی کاتی ئەنجام دانی کارەکە, ناتوانێت هەڵەی کەسەکە و ڕاکێشانی گەل بەرەو گێژاوی تیاچوون قەرەبو بکاتەوە.

٩- نوسەر لە کاتی دەربڕینی بۆچونێکی باش یان خراپ دەربارەی هەرکەسایەتی و پیاوێکی دەوڵەت کە لەم کتێبەدا ناوی هاتووە, هیچ دەمارگیرییەکی نییە, ئەو بۆچونانەش بە پێی ئەو زانیاری و بەڵگەنامانەیە کە لەبەردەستی نوسەردان, وە ئەگەریش خوێنەران زانیاری و بەڵگەی بەهێزتریان بۆ ڕەت کردنەوەی ئەو بۆچونانە هەیە, ئەوا بەبێ هیچ جۆرە دەمارگیرییەك لە چاپەکانی دواتر دا بۆچوونەکان پێچەوانە دەکەینەوە, لەبەر ئەوە تەنها ئامانج ڕونکردنەوەی لایەنە تاریك و شاراوەکانی مێژووی هاوچەرخی ئێرانە, بۆ نمونە توێژینەوەکانی نوسەر لە بارەی (قەوام سەڵتەنە)وە شتانێکی تێدایە کە ئەو پێچەوانەی ئەو شتانە ناوبانگی دەرکردووە, لە پرسی ئازەر بایجان دا مەبەستی سازشی هەبووە لەگەڵ سۆڤیەت دا و ئەفسانەی فریودانی (ستالین) لەلایەن (قەوام)ەوە دورە لە ڕاستییەوە, ئەم بۆچوونەش

پشت ئەستورە بە بەڵگەنامەی نهێنی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە ماوەیەك پێشتر بڵاو کراوەتەوە, نوسەر بە شیکردنەوەی کارەکانی چوار کابینەی (قەوام) کە سایەتییەکی بە تەواوەتی جیاواز لەوەی کە لە (قەوام) دروست کراوە دەخاتە ڕوو, بۆچوونەکانی نووسەر دەربارەی هەندێکی دیکە لە پیاوانی دەوڵەتی دەورانی سەڵتەنەتی پەهلەوی لەوانەیە جیاواز بێت لە بۆچوونی گشتی دەربارەی ئەو کەسایەتییانە, بەڵام لە هەموو بابەتێکدا بەلانی کەمەوە پشت بەستراوە بەو سەرچاوە و بەڵگەنامانەی کە لە بەردەستی نوسەردا هەیەو بە بۆچونی نوسەریش ئەو سەرچاوە و بەڵگەنامانە شیاوی پشت پێبەستنن.

لە کۆتایی دا بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم لە ناخی دڵەوە سوپاسی هاوڕێ و دۆستانی خۆشەویستم (د. حسەین بەهمەنیار, جەعفەر تەوەکولی, عەلی ئەسغەر سەعیدی, ئەحمەد سەمیعی, حوسامەدین غەفاری, ئەکبەر قاسمی, حسەین مەکی, عەبدولڕەزاهۆشەنگ مەهدەوی, ئەحمەد نەفیسی) بکەم, کە لە ئامادە کردنی سەرچاوەکانی و وێنەکانی نێو ئەم کتێبەدا هاوکاری نوسەریانکردووە.

محمود طلوعی

١٤ فەروەردین ١٣٧٢

# دەورانی منداڵی و لاوی محەمەد ڕەزاشا

دژواریەکانی ژیان لە (کۆشکی تەنهایی)دا, خەیاڵاوی دەورانی منداڵی و بانگەشەی به ئیمامانەوە!, سەردەمی خوێندن لە سویسرا, دۆستایەتیەکی سەیر, عیشق بازی لە قوتابخانە!, گەڕانەوە بۆ ئێران و زۆرانبازی لەگەڵ باوکیدا!, محەمەدڕەزا هاوڕێ سویسریەکەی خۆی دێنێت بۆ تاران.

محەمەد ڕەزا پەهلەوی لە کتێبێکیدا بە ناوی ( ماموريت براى وطنم ), کە لە ساڵی ( ١٣٤٠هەتاوی, ) دا, وە هاوکات بوو لەگەڵ بیستەمین ساڵیادی سەڵتەنەتی دا بڵاو کرایەوە, دەنووسێت: ( من لە ٤ ی ئابانی ١٢٩٨) هەتاوی لە خانویەکی بچوك و سادەی یەکێك لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری تاراندا چاوم بە دونیا هەڵ هێناوە, لە ئەو کاتەدا هێشتا شاری تاران شورای هەبوو, لە دەورو بەریشیدا خەندەق هەڵکەندرابو, شار چەند دەروازەیەکی هاتوچۆی هەبوو کە لە شەواندا بۆ پارێزگاری لە شار, لە ترسی دزو چەتەکان دادەخران, لە سەردەمی سەڵتەنەتی باوکمدا کە هەمیشە ئارەزوی ئاوەدانکردنەوە و نوێکردنەوەی ئێرانی هەبوو, ڕوخێنران )[1].

محەمەد ڕەزاشا لە چاوپێکەوتنێکدا لەگەڵ ( ژرار دو ویلیه )ی نوسەری فەرەنسی, ئەم بابەتەی ڕاست کردوەتەوە و دەڵێت ئەو و ئەشرەفی خوشکی کە دوانەن و چەند دەقەیەك دوای ئەو لە دایك بووە, لە تاکە نەخۆشخانەی ئەو کاتی تاراندا کە نەخۆشخانەی ( ئەحمەدیە ) یە لە دایك بوون, کۆڵانە کۆنەکەیشی کە

[1] محمد رزاشا: ماموريت براى وطنم, شركت سهامى كتابهاى جيبى, چاپ سوم, ١٣٥٠, ص٦٣.

حەمەڕەزاشا لە کتێبەکەیدا ناوی نەهێناوە دەروازەی قەزوین بووە, کە لە کاتی بڵاو کردنەوەی کتێبەکەیدا نێوچەیەکی خراچی تارانی تێدا بوو وە حەمەڕەزاشایش نەیدەویست بە خوێنەرانی کتێبەکەی بڵێت کە ماڵی باوکی لە کاتی لە دایک بوونی ئەودا لە وەها شوێنێکدا بووە[1].

لە کتێبێکدا کە لە بارەی بنەماڵەی پەهلەوی کە لە ساڵی ( ١٣٠٥هەتاوی ) لەلایەن ( مؤسسة ا طلاعات ) بڵاو کراوەتەوە, هاتوە کە محەمەد ڕەزا دەورانی منداڵی خۆی لە خانویەکی بچوکی کرێدا لە ( گەڕەکی روغنیها ) لەسەر جادەی (جەلیل ئابادی) پێشوو دەست پێکردووە, بەڵام پاش ماوەیەك لە دوای لە دایك بوونیەوە, کە ئیدی ئەو خانوەی (گەڕەکی روغنیها) بۆ خێزانێکی پێنج کەسە کەم بوو, ڕەزاخان لە گەڕەکی حەسەن ئاوا خانویەکی دیکەی بە کرێ گرت کە کەمێك لە خانوەکەی پێشو فراوانتر بوو, تا ئەو کاتەی کە ڕەزاخان بوو بە فەرماندەی فەوج و لەگەڵ فەوجەکەیدا لە دەرەوەی دەروازەی شار لە باخێکدا کە فەوجەکە بە کرێی گرتبوو خانویان دروستکرد, لەوکاتەدا موچەی مانگانەی ڕەزاخان دەگەیشتە ١٠٠ تمەن, تاج ملوکی خێزانی هەندێکی لێ دەخستە لاوە, بە جۆرێك کە پاش ماوەیەك لەم خستنە لاوەوە ٣٠٠ تمەن پاشەکەوت کرا, ڕەزاخانیش لە ئەنجامی ئەو چالاکیە جۆر بەجۆرانەی کە لە کاتی جەنگەکاندا دەینواند ٣٠٠ تمەن پاداشتی وەرگرتبوو, کە بە هەردوکیانەوە دەیکردە ٦٠٠ تمەن, بەمەش زەوییەکی تا ڕادەیەك فراوانیان لە چوار رای (ئەمیریە) دا کە ناوچەیەکی شێوە کاروانسەرا بوو کڕی, خانویەکی بچوکی بۆ نیشتەجێ بوونی خێزانەکەی تێدا دروستکرد[2].

محەمەدڕەزا لە چاو خوشکەکانی ( شەمس و ئەشرەف ) و برا تاقانەکەی ( عەلیڕەزا ) کە دو ساڵ دوای ئەو لە دایك بوو کەسێکی لەڕ و بوونیە لاواز بوو, باوکی کە ١٦ مانگ دوای لە دایك بوونی محەمەد دەستی دایە کودەتا و بوویە وەزیری جەنگ و پاشان بوو بە سەرۆك وەزیرانی ئێران, زۆر بە کەمی هەلی بینینی منداڵەکانی

[1] Gerard de Villiers; L,irresistible Ascension de Mohammad Reza shah D,Iran, paris, Plon 1997, p, 37

[2] از کورش تا اریا مهر. نشریه مؤسسه اطلاعات, ١٣٥٠, ص١٦٧.

هەبوو, محەمەد تا تەمەنی شەش ساڵی لە ژێر چاودێری دایکیدا گەورە بوو, لە مانگی ئازەری ١٣٠٤هەتاوی, دا کە ڕەزاخان دوای بنبڕکردنی دەسەلأتی قاجاری و پێکهێنانی پەڕلەمان سەڵتەنەتی ئێرانی گرتە دەست, محەمەدی شەش ساڵەش بوو بەشازادە و چەند مانگێك دواتر لە ڕێوڕەسمی تاجگوزاریدا بۆ یەکەم جار پۆشاکی سەربازی پۆشی.

ڕەزاشا دوای تەواو بوونی ڕێوڕەسمی تاج لە سەرنان, شازادەی لە دایك و برا و خوشکەکانی جیا کردەوە تا بە وتەی خۆی ( محەمەد لە کەش و هەوایەکی ژنانەدا دەر بهێنێت و لە کەش و هەوایەکی پیاوانەدا پەروەردەی بکات ), هەروەها قوتابخانەیەکی سەرەتایی سەربازیشی بە ناوی ( دبستان نظام ) دامەزراند, کە مەبەستی سەرەکی پەروەردە کردنیشازادە بوو لە ڕەوشێکی سەربازیدا, لە هەندێك سەرچاوەدا لەوانە کتێبەکەی ژرار دو ویلیەی فەرەنسی کە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە و کتێبەکەی ماروین زونیس ی لێکۆڵەری ئەمریکی بە ناوی ( شکست شاهانه )[1] کە لە ساڵی ١٩٩١ز دا لەمریکا چاپکراوە, هاتوە کە ئەم ماوەی ژیانی محەمەد بە دەستپێکی کۆمەڵێك گرێی دەرونی لە ئەودا دێتە هەژمار, لە بەر ئەوە کە منداڵێکی شەش ساڵە لە ناکاو لە باوەشی گەرمی دایك و ڕەوشی خێزان جودا دەکرێتەوە و لە ڕەوشێکی تەواو سەربازی و (کاخ تنهایی/ کۆشکی تەنیایی )دا زیندانی دەکرێت, بیگومان دوچاری لێشاوێك کێشەی دەرونی دەبێتەوە کە لە دەورانی گەشەی دواتریشیدا کاریگەری خراپی لە سەر بەجێ دەهێڵێت, لە ڕواڵەتدا وا دەر دەکەوێت کە لە دوای هاوسەرگیری ڕەزاشا لەگەڵ دو ژنی دیکەداو زۆر گرنگی دان بە ( عسمەت ) هاوسەرە تازەو جوان و لاوەکەی, ڕەزاشا ڕوبەڕوی کرداری ناشیرین و هەڵچوونی دایکی محەمەد دەبێتەوە, ئەمیش هەم وەك تۆڵەیەك هەمیش بۆ ڕێگرتن لە پەروەردەیەکی محەمەد لە دژی خۆی, بڕیاری جیاکردنەوەی کوڕ و دایکی لە یەکتری دا و بە ئەنجام دانی ئەم کارەش هیچ گوێی بە ڕۆحیەتی منداڵە بچوکەکەی خۆی نەدا.

---

[1] marvin zonis; Majestic failure . Cicago and London, The University of Chicago press 1991.

محەمەد ڕەزا کە لە ژینگەی خێزان و میهرو خۆشەویستی دایکایەتی بێبەش بوو هاوڕێ و هاوپۆلێکی تەمەنی خۆی نەبوو, بێگومان لە گەڵ قوتابخانەی سەربازی و هاوڕێیانی قوتابخانەکەیدا ئاشنایەتی پەیدا کرد, هاوپۆلەکانی زیاتر منداڵانی بەرپرسانی لەشکر و بەرپرسە باڵاکانی دەڵەت بوون, تەنها کەسێك لە خێزانەکانی خوارەوە بە هۆی ئەوەی کە منداڵێکی زیرەك و سەرەڕۆ بوو لە ئەو قوتابخانەیەدا بوو, ئەو کوڕەش محەمەدڕەزاشا لە یاداشتەکانی خۆیدا بە هاوڕێی گیانی بەگیانی خۆی لە سەردەمی لاویدا ناوی دەبات و هەر لە بەر ئەو سەرەڕۆییەی دڵی حەمەڕەزاشای بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە, ئەویش حسەین فیردۆست بوو کە لە ژیانی محەمەد دا ڕۆڵێکی بینی, فیردۆست لە باسی ژیانی خۆی لە قوتابخانەی سەربازی چۆنیەتی ئاشنا بوونی لەگەڵشازادەدا تاڕادەیەك ڕاست دەکات, کە هێنانی هەندێك وتەی لێرەدا هەم لە بارەی ئاشنا بوون بەو قوتابخانە یەی کەشازادە وانەی تێدا دەخوێند وە هەم لە بارەی ڕۆحییەتی خودی فیردۆست و گرێ دەرونیەکانیەوە بەسود بێت, فیردۆست دوای باسکردنی ژیانی هەژارانەی خێزانەکەی دەڵێت: ( ئەم بابەتی هەژاریە لە قوتابخانەی سەربازیدا دەبووە هۆی بێتاقەتییەکی تایبەتی لە مندا, دواتر کە چومە پۆلە تایبەتیەکەیشازادەوە, کەمترین کەسێك لەدوای من لە ڕوی پێگەی کۆمەڵایەتیەوە کە باوکم پلەی ستوان سێ ی هەبوو کوڕی سەرتیپێك بوو, کە لە ئەو کاتەدا ژمارەی سەرتیپ و سەر لەشکرەکان لە پەنجەکانی دەست زیاتر نەبوون, بۆ خۆی پێگەیەکی هەبوو, دایکم هەنێك برنجی دەکردە قابلەمەیەکەوە و بە جۆرێك تێی دەکرد کە زۆر دەربکەوێت, منی قابلەمە بە دەست بە پێ دەڕۆیشتم بۆ قوتابخانە و قوتابییەکانی دیکەش بە گالیسکە یا لەگەڵ خزمەتکارەکانیاندا دەهاتن بۆ قوتابخانە, کاتێك کە کاتی نای نیوەڕۆ دەهات خزمەتکارەکان بە قابلەمەی چەند قاتەوە بۆ ئاغازادەکان دەهاتن بۆ ژوری نان خواردن, دەوڵەمەندو پلەدارەکانی کە لە قوتابخانەی سەربازی بوون هەمیشە گاڵتەیان پێ دەکردم و دەیانوت ( ئادەی لە قابلەمەکەتدا چی هەیە. . . ! ), ڕەفتاریان بە جۆرێك بوو کە من هان بدەن خواردنی زۆرتر لەگەڵ خۆمدا بهێنم, چونکە خواردنە زیادەکانی کە لە قوتابیەکان دەمایەوە بۆ ئەوان دەبوو, منیش لەگەڵ ئەوەی کە هەمیشە خواردنەکەم کەم بو بەڵام هەوڵم دەدا کە چەند کەوچکێکی تێدا بهێڵمەوە, ئەم بابەتەش هەر لە ئەوکاتەوە وای لە من کرد کە بەردەوام خۆم بە کەم

بزانم و پێدەچێت هەر ئەمەش وایکردبێت کە ببمە جێگەی سەرنجی ڕەزاخان وشازادەیش.

لە تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵدا من یەکەمی پۆلە تایبەتەکەبووم, شازادەیان نەخستبووە نێو ڕیزبەندی پۆلەوە, لە ساڵی دووەمدا پۆلە تایبەتەکەیان گواستەوە بۆ نێو کۆشکی گوڵستان, پۆلەکەشیان لە بینایەکدا دانا کە بە ( خوابگاه / بەشی ناوخۆیی ) دەناسرا و دەگەڕایەوە بۆ دەورانی (ناسرەدین) شای قاجار, دواتر دەرکەوت کە گواستنەوەی پۆل بۆ کۆشکی گوڵستان بە بڕیاری ڕەزاشا بووە بۆ ئەوەی کە پۆلەکەی شازادەی جێنشین نزیك بێت لەماڵەکەیەوە, ڕۆژێك سەرقاڵی وانە خوێندن بووین لە ناکاو ڕەزاشا هاتە نێو پۆلەکە, من کە لە ژێرەوە سەیرم دەکرد بینیم کە سەرۆکی پۆلە تایبەتەکە ( سەرهەنگ محەمەد باقر خان ) ئیشارەتێکی بۆ من کردو ڕەزاشا هات و لە کەناری منەوە وەستا, هەڵبەتە من لەو کاتی تەمەنمدا دەترسام و دەلەرزیم و بە ئەو شانو شەوکەتەی و ئەو سۆندەیەی کە بە شانیەوە بوو ئارەزوی ئەوەم دەکرد کە زوتر بە لامدا تێپەڕێت و بڕوات, بەڵام ئەو ڕاوەستاو پێی وتم ( تۆ هەر لەمڕۆوە دوای کۆتایی هاتنی وانەکەتان دەچیت بۆ ماڵەکەیشازادەو پێکەوە وانەکانتان ئامادە دەکەن هەتاشازادە خەوی لێ دەکەوێت, ئەمەش کاری هەموو ڕۆژێکت دەبێت, وە ڕۆژانی هەینی و پشوەکانیش دەبێت سەردانی شازادە بکەیت. . ! ), منیش لە ئەو کاتەدا هەستم کرد کە پێدەچێت ئەم کارە پەیوەندی بە یەکەم بوونمەوە هەبێت, چونکە شا جەختی لە سەر ئامادە کردنی وانەکان دەکردەوە, دواتر تێگەیشتم کە بەڵێ هەر ئەوە بوو, بە هەرحاڵ دوای تەواو بوونی وانەکەمان بە دوای شازادەی جێنشیندا ڕۆیشتم بۆ خانوەکەی و لە ئەو کاتەش بە دواوە لە پۆلیشدا لە لای ئەوەوە دادەنیشتم. . . . )[1].

ئەمە سەرەتای ئاشنایەتی محەمەدڕەزا بوو لەگەڵ حسەین فیردۆست کە تا کۆتایی قۆناغی سەرەتایی سەربازی بەردەوام بوو, وە ڕەزاشا بڕیاری دا فیردۆست لەگەڵشازادەدا بنێرێت بۆ سویسرا بۆ تەواو کردنی خوێندن, محەمەدڕەزا دەربارەی

---

[1] حسين فردوست: ظهور و سقوط سلطنت پهلوى ( خاطرات ارتشبد سابق حسين فردوست ), مؤسسة مطالعات و پژوهشهاى سياسى, جلد اول, ص٢٣-٢٦.

ئەم دوورە لە ژیانی خۆی ( ٦ تا ١٢ ساڵی ) لە کتێبەکەیدا ( ماموریت برای وطنم ) نوسیویەتی, لەبەرئەوەی پەروەردە کردنی کەسایەتی ئەو مایەی گرنگی پێدانێکی زۆرە و زیاتر نوسەر و لێکۆڵەرە بیانیەکانیش بە سەرنجدان لە ئەو بابەتە باس لە کەسایەتی ئەو دەکەن, هەربۆیە نوسین لە بارەی ئەو کاتەی پێش ڕۆیشتنی بۆ سویسرا بە گرنگ دەزانێت, لە یاداشتەکانی خۆیدا لە بارەی ماوەی خوێندن لە قوتابخانەی سەربازی سەرەتایی دەنووسێت: ( من هەتا کاتی بوونم بەشازادە لەگەڵ دایك و براو خوشکەکانمدا ژیانم بە سەر دەبرد, بەڵام دوای تاجگوزاری بە فەرمانی باوکم لە ئەوان جیا بوومەوە, باوکم بڕیاری دا کە بە شێوەیەکی تایبەتی پەروەردە بکرێم کە ئەو بە پەروەردەی پیاوانەی ناو دەبرد و بۆ بەرپرسیارێتیەکانی داهاتو ئامادە بکرێم, هەر لە ئەو کاتەدا ناوم لە قوتابخانەی سەربازی سەرەتایدا نوسرا, لە ڕاستیدا ئەو قوتابخانەیە لەبەر خاتری من و چوار برای دیکەم دامەزرا و من لە پۆلێکدا کە(٢١) قوتابی تێدابو کە سەرجەمیان منداڵانی بەرپرسانی دەوڵەتی و ئەفسەرانی سوپا بوون بەوپەڕی وردەکارییەوە وەرگیرابون, سەرقاڵی خوێندن بووم و براکانی دیکەم کە لە من بچوکتر بوون چونە پۆلەکانی خوارترەوە, قوتابیانی ئەم قوتابخانەیە پۆشاکی سەربازیان لەبەر دەکرد و سیستەمێکی خوێندنی تەواو سەختی هەبوو, بێگومان ژیانی منداڵی منیش لە ژینگەیەکی سەربازی واتە بە خوێندن و تەمرینە سەربازیەکانەوە تێپەڕیوە, بەدەر لە خوێندنی قوتابخانەش باوکم مامۆستایەکی فەرەنسی بۆ گرتبووم تا چاودێری ژیانم و فێری زمانی فەڕەنسیشم بکات, بە هەوڵو تێکۆشانی توانیم وەك زمانی دایك فێری زمانی فەرەنسی ببم و دەریچەیەك بۆ تێگەیشتن لە بیرو بۆچونەکانی ڕۆژئاوا لە بەردممدا ئاوەلابو.

لە دەورانی شازادەیمدا ڕۆژانە باوکم یەك دو کاتژمێر لە کاتی خۆی لەگەڵ مندا بەسەر دەبرد, وە لە تەمەنی ٩ ساڵیدا نانی نیوەڕۆم لەگەڵ ئەودا دەخوارد, مەبەستی ئەویش لەم کارانەی ئەوە بوو کە خودی خۆی یە شیوەیەکی باش ئاگاداری ڕەوشی ژیانی من بێت, وە منیش لە ئەو ڕوداوانە ئاگادار بکاتەوە کە لە ولاّتدا دەگوزەرێت, کەمێك لە پاش تاج لە سەرنانی باوکم دوچاری نەخۆشی گرانەتا بووم و چەند هەفتەیەك لەگەڵ مەرگدا دەستەویەخە بووم, ئەم نەخۆشیەش بوویە هۆی ئازاردان و بێتاقەتی باوکی میهرەبانم, لە ماوەی ئەو نەخۆشیە توندە دا پێم نایە دونیایەکی

تایبەتی ڕۆحییەوە[1], کە تا ئەمڕۆش ئەوەم ئاشکرا نەکردووە, لە شەوێکی توندی نەخۆشیەکەمدا ئیمامی عەلیم لە خەودا بینی, لە کاتێکدا کە شمشێرە ناسراوەکەی خۆیی ( ذوالفقار ) بە کەمەرەوە بوو لە کەنارم دا دانیشت و جامێکی پیٚ بوو فەرمانی پێکردم کە ئەوەی لە جامەکەدایە بینۆشم, منیش بە گوێیم کردو بە یانی ئەو ڕۆژە ئیدی تاکەم نەما و بە خێرایی باری تەندروستیم باش بوو, لە ئەو کاتەدا کە زیاتر لە (٧) ساڵ نەدەبووم بیرم دەکردەوە کە پێدەچێت لە نێوان ئەو خەو بینینەو ئەو چارەسەرە بە پەلەیەی من هیچ پەیوەندیەك نەبێت, بەڵام هەر لە ماوەی هەمان ساڵدا دو ڕوداوی دیکە بۆ من ڕویاندا, کە لە ژیانی مەعنەوی مندا کاریگەرییەکی قوڵیان بە جێهێشت.

لە سەردەمی منداڵیم دا تاڕادەیەك هەمو هاوینێك لەگەڵ خیزانەکەماندا سەردانی ئیمامزادە داود کە یەکێکە لە ناوچە سروشت جوان و ئاووهەوا خۆشەکانی دامێنی کێوی ئەلبوورز دەکرد, لە بۆ گەیشتن بە ئەو ناوچەیە ناچار دەبووین کە ڕێگەیەکی پێچاوپێچ و هەورازونشێو بە پیٚ یان بە ئەسپ ببڕین, لە یەکێك لە ئەو سەفەرانەدا من لە بەردەمی کەسێك لە نزیکەکانی خۆمان کە ئەفسەر بوو لە سەر ئەسپێك دانیشتبووم لە ناکاو پێی ئەسپ خزاو هەردوکمان کەوتین, من کە سوکتر بووم کەوتم و بەتوندی سەرم کێشای بە بەردێکدا و لە هۆش خۆم چوبووم, کاتێك کە هۆشم هێنایەوە و دوچاری هیچ شتێکی ناڕەحەت نەبووبووم هەموان سەریان سوڕما, بەناچاری بۆیانم ئاشکرا کرد کە لە کاتی کەوتنمدا حەزرەتی ( ابوالفضل ) علیەالسلام کوڕی ئیمامی عەلی هاتە بەر چاوم و لە کاتی کەوتنمدا گرتمی و لە هەر جۆرە ناڕەحەتی و شکانێك پاراستمی, کاتێك کە ئەم ڕوداوە ڕویدا باوکم لە ئەویٚ نەبوو بەڵام کاتێك کە دواتر ئەم ڕوداوەم بۆ گێڕایەوە ئەو گوێی پیٚ نەدا, منیش بە لەبەرچاو گرتنی ڕۆحییەتی ئەو نەمویست بکەومە موناقەشە لەگەڵیدا, بەڵام خۆم هەرگیز بچوکترین دوڵیم لە دیاریکردنی ئەوەی کە بە سەرتدا دێت و خەو بینینی حەزرەتی (عەباسی کوڕی عەلی) علیەالسلام نەبووەوە, , ,! .

---

[1] مێژووی نوسینی ئەم بابەتە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٤٠ هەتاوی, دوای ئەوە شا چەندین جار لای ڕۆژنامە نوسان ئەم بانگەشەیەی دووبارە کردووەتەوە.

ڕوداوی سێیەم کە زیاتر لە جاران سەرنجی منی بۆ لای دونیای مەعنەوی کەمەنکێشکرد ڕۆژێك ڕویدا کە لەگەڵ چاودێرەکەمدا لە دەوروبەری کۆشکی سەڵتەنەتی (سەعدئاباد) دا لە کۆڵانێکدا کە بەرد ڕێژ کرابو پیاسەمان دەکرد, لەو کاتەدا لە ناکاو پیاوێکم بە ڕوخسارێکی مەلەکوتیەوە بینی, کە گەڕایەوە ڕومەتی خەرمانێك نور بوو, وەك ئەو دەم و چاوەی کە شێوەکارە ڕۆژئاواییەکان بۆ حەزرەتی مەریەمی دروست دەکەن, لە ئەو کاتەدا ئیلهامم بۆ کرا کە تۆ لەگەڵ کۆتا ئیمامی پاك حەزرەتی ئیمامی قائیم ڕوبەڕویت, پێکەوە بوونی من لەگەڵ ئیمامی ئاخیر زەمان زۆر درێژەی نەکێشا کە لە بەرچاو ون بوو منی لە گێژی و سەرسوڕماندا بە جیٚ هێشت, لە ئەو کاتەدا بە ئەوپەڕی موشتاقیەوە پرسیارم لە چاودێرەکەم کرد: ئەوەت بینی؟. .

بە سەر سوڕمانەوە وەلامی دایەوە, (چ کەسێکم بینی؟ خۆ لێرەدا کەس نیە. . . . . ), بەلأم من لە ئەو کاتەدا ئەو شتەی کە دیبووم ئەوەندە دڵنیا بووم کە وەلأمەکەی چاودێرە بە ساڵدا چووەکەم بچوکترین کاریگەری لەسەر بیرو باوەڕی من نەبوو.

ئەمڕۆ کە ئەم ڕوداوانە بەیان دەکەم لەوانەیە هەندێك کەس بە تایبەتی ڕۆژئاواییەکان وا گومان ببەن کە من کەسێکی خەیالأویم یان ئەوەی کە دیومە حاڵەتێکی سادەی دەرونییە, بەلأم دەبێت ئەوەمان لە یاد بێت کە باوەڕ بوون بە دونیای ڕۆحی و ئەو دەرکەوتانەی کە بە مادە بەراورد ناکرێت لە تایبەتمەندیەکانی کەسایەتی ڕۆژهەلأتییە, وە هەروەها دواتریش زانیم کە بەشێکی زۆری خەڵکانی ڕۆژئاواش هەمان بیروباوەڕیان هەیە, وە من لە ئەو کاتەدا هیچ هۆکارێکم بۆ گێڕانەوە و بەیان کردنی ئەو بابەتە بۆ چاودێرەکەی خۆم نەبوو و ئێستەش هیچ سودێك بەم لاف لێدانەوە نابەم و تا ئێستاش جگە لە هەندێك لە نزیکەکانی خۆم کەس ئاگای لە ئەو بابەتانە نیە, تەنانەت باوکیشم کە هەمیشە خۆمم بە کەسێکی زۆر نزیك و دڵسۆزی دەزانی هەرگیز لەم بارەیەوە بچوکترین ئاگاداری نەبووە[1].

کاتێك کە کتێبەکەی حەمەڕەزاشا لە ساڵی (١٣٤٠هەتاوی )دا بلأو بوویەوە, بانگەشەکانی ئەو لە بارەی ئاشکراکردنی بینینی ئیمامەکانەوە بەم شێوەیە لێك

---

[1] ماموریت برای وطنم, چاپ سوم ص٦٤-٦٨.

درایەوە, کە شا بۆ بەدەست هێنانی دڵ و سەرنجی خەڵکە کە زۆربەیان خاوەنی بیرو باوەڕی مەزهەبین, ئەم داستانانەی دروست کردووە, بەڵام شا دوای ڕووبەڕو بوونەوەشی لەگەڵ پیاوانی ئاینی دا لە ساڵی ١٣٤١ وازی لەم بانگەشانەی خۆی نەهێنا, چەندین جار لەگەڵ ڕۆژنامە بەناوبانگە بیانیەکانی وەکو ( ئوریانا, فالاچی ) ئەم بانگەشانەی دوبارە دەکردەوە, هەندێك شتی دیکەشی دەوت وەك ڕزگار بوونی پەڕجو ئاسای خۆی لە چەندین پیلانی کوشتنی دا, کە گوایا ( وا هەستی کردووە ) کە خودای گەورە بەرنامەیەکی گەورەی خستوەتە ئەستۆو هەمیشە لە سێبەری خۆیدا دەیپارێزیت.

حەمەڕەزاشا لە یاداشتەکەی خۆیدا جگە لە یەك جار ئەویش بەڕستەیەکی کورت کە دەڵێت: کاتێك ڕزگاربوونی خۆمم بە هۆی حەزرەتی ابوالفضل بۆ باوکم باس کرد زۆر گوێی پێ نەدا, ئامازە بە بەرپەرچدانەوەی ڕەزاشا لە بەرامبەر ئەو خەیاڵاتە ناکات, بەڵام لە گفتوگۆیەکیدا لەگەڵ ( ژرار دو ویلیە ) ی فەرنسی دا دانی بەوەدا ناوە کە کاتێك بۆ دوەم جار چۆنیەتی ئەو بینین و ڕزگار کردنانەم بۆ باوکم باس کرد, بە توندی پێمدا هەڵشاخا و ووتی: ( تۆشازادەی ئەم مەملەکەتەی دەبێت ڕۆژێك لە سەر تەخت و تاج دانیشی, ئەم خەو بینین و خەیاڵاتە ژنانەیە بخە لاوە. . . . !), محەمەد دوای ئەم پێدا هەڵشاخانەی باوکی کە چاوەڕوانی نەدەکرد دەست بە گریان دەکات و ئیدی چیرۆکەکانی دواتری بۆ باوکی باس ناکات.[1]

** ** **

حەمەڕەزاشا لە شەهریوەری ١٣١٠ دا کە هێشتا ١٢ ساڵی تەواو نەبوو بۆ تەواو کردنی خوێندن ڕۆیشت بۆ سویسرا, سەرەتا بڕیار بوو بچێتە فەرنسا, بەڵام لەبەر ئەوەی کە باوکی ژینگەی فەرەنسای بۆ خوێندنی کوڕەکەی بە گونجاو نەدەزانی و دوای لێکۆڵینەوەی زیاتر, سویسرای بۆ هەڵبژارد.

خودی حەمەڕەزاشا لە بارەی هۆکاری هەڵبژاردنی سویسرا بۆ تەواو کردنی خوێندنی و چۆنیەتی دیاری کردنی هاوڕێکانی لەم سەفەرەدا دەنووسێت: ( باوکم بۆ

[1] Gerard de Villiers, p 55

هەڵبژاردنی وڵاتێك بۆ ئەوەی کە من خوێندنی تێدا تەواو بکەم ماوەیەکی زۆر بیری دەکردەوە, سەرباری ئەوەی کە بە چاوێکی باشەوە سەیری شارستانی و پێشکەوتنەکانی ڕۆژئاوای دەکرد بە لاّم بە شێوەیەکی گشتی بڕوای بە بێگانەکان نەبوو, سەرەنجام دوای ماوەیەك لێکۆڵینەوە بڕیاری دا من بنێرێت بۆ سویسرا, بە بۆچونی من ئەم هەڵبژاردنە لە ئەو ڕوانگەیەوە بوو کە باوکم دەیویست خوێندنی من لە وڵاتێکدا بێت کە لە ڕەنگ و پەیوەندی داری سیاسی دور بێت, وە لەبەر ئەوەی کە سویسرا وڵاتێکی بچوك بوو وە هەمیشە لە کێشە سیاسیەکانی ئەوروپادا بێلایەن بوو لەلای باوکم لە هەموان باشتر بوو, ڕاوێژکارەکانیشی وڵاتی سویسرایان دیاری کرد بۆ کەسێك کە بەڕاستی بیەوێت بەدوای وانە خوێندنەوە بێت.

من لە مانگی ئۆردیبەهەشتی ١٣١٠هەتاوی, دا سەرتایی سەربازیم تەواو کرد و لە مانگی شەهریوەری هەمان ساڵدا دوای تێپەڕ بوونی پشوی هاوین ئامادەی ڕۆیشتن بووم بۆ سویسرا, بە فەرمانی باوکم یەکێك لە دوکتۆرە بەناوبانگەکان بە ناوی ( دکتۆر موئەدەب نەفیسی ) کە لە منداڵیدا زیاتر نەخۆشیە توندەکانی منی دەرماندەکرد بە ناوی چاودێرو سەرپەرشتی من دیاری کرا, بڕیار درا کە سەرجەم کاروبارەکانی خوێندن و تایبەتیەکانی من لە سویسرا لە ژێر چاودێری ئەودا بێت, بڕیار درا ( ئاغای مستەشار ) یش کە پێشوتر مامۆستای ئەدەبیاتی فارسیم بوو لەگەڵمدا بێت بۆ سویسرا بۆ ئەوەی لە ئەوێ وانەم پێ بڵێت, باوکم وای پێ باش بوو کە براکەم و دو هاوڕێی سەرەتایی سەربازیشم لەگەڵمدا بێن بۆ سویسرا, هەڵبژاردنی ئەو دو هاوڕێیەش درایە دەست خۆم, منیش یەکەم حسەین فیردۆست و دوەمیش میهر پور تەیمورتاش کوڕی وەزیری دەرباری باوکمم پێشنیار کرد, دوای ئەوەی کە پەسەند کران پێکەوە بەڕێکەوتین )[1].

ئەو ڕۆژانە نزیکترین ڕێگای سەفەر کردن بۆ ئەوروپا لە ڕێگەی سۆڤیەتەوە بوو, تەیمور تاش کە بڕیار وابو لەگەڵ شازادەی جێنشیندا هەتا ئەوروپا بڕوات ئەوەی ڕێکخستبوو کە دەوڵەتی سۆڤیەت لە ڕێگەی سەفەرەکەیاندا بۆ ئەوروپا پێشوازییەکی شیاویان لێ بکات, کەشتیەکی جەنگی ڕوسی بە گاردی پێشوازی تایبەتی (کرملن)ەوە

1 ماموريت براى وطنم, ص٧٤-٧٣.

نێردرا بۆ بەندەری پەهلەوی ( ئەنزەلی ) بۆ بردنی شازادەی جێنشین و شاندەکەی، شاندەکەش بە ڕێوڕەسمێکی ڕێزداریی تایبەتی بەرەو ( بادکوبە ) بەڕێکەوتن، گاردی پێشوازی کە دوو ژەنەڕاڵی ڕوسیشیان تێدا بوو لە بادکوبە وە تا سنوری (لوهستان) هاوڕێی ئەو شاندە بوون، فیردۆست لە یاداشتەکەی خۆیدا لە بارەی ئەم سەفەرەوە زیاتر باس لە بادەنۆشی و مەستی و سەرنج دانی تەیمورتاش بۆ خانمە جوانەکانی ژەنەڕاڵەکان دەکات. . !.

سەفەرکردن بە شەمەندەفەر لە نێو ڕوسیادا سێ شەووڕۆژ درێژەی کێشا، لە سنوری لوهستان شەمەندەفەرەکان گۆڕدران و سەفەر کردن لە ڕێگەی لوهستان و ئەڵمان تا وڵاتی سویسرا بەردەوام بوو، ئەو قوتابخانەیەی کە لە سویسرا لە بەرچاوگیرابو بۆ خوێندنی شازادەی جێنشین، قوتابخانەیەکی ئەشرافزادە بوو بە ناوی ( لوروزە/le rosey ) کە لە نێوان شارەکانی جنێف و لۆزان دا بوو، کە خوێندکارەکانی زیاتر بیانیەکان بوون، بەڵام پێش دەست پێکردنیان بە خوێندن لەم قوتابخانەیەدا، شازادەی جێنشین و هاوڕێکانی بۆ بەهێز کردنی زمانی فەڕەنسییان لە قوتابخانەیەکی شاری لۆزاندا ناویان نوسی.

حەمەڕەزاشا لە یاداشتەکانی کاتی خوێندنی لە قوتابخانەی لوروزەی سویسرادا زیاتر شکات لە سەختگیریەکانی دوکتۆر موئەددەب نەفیسی سەرپەرشتی دەکات و دەنووسێت: ( لە کاتێکدا کە کوڕە هاوتەمەنەکانی من هەمو ئازادیەکیان هەبوو وە ئازادانە دەچونە کۆڕی سەماکەران و شەونشینان، ڕەوشی منیش وەکو زیندانیەك بوو جگە لە هەنێك کاتی تایبەتی نەبێت ئەویش لەگەڵ سەرپەرشتیارەکەمدا نەبوایە نەمدەتوانی بڕۆمە دەرەوەی ژینگەی قوتابخانەکەم، بە بۆچونی من ئەم کارە ڕاست نەبوو، لە ئێستاشدا کاریگەری ئەو دورە پەرێزیە لە دەرونی مندا هەر ماوە )[1]، حەمەڕەزاشا لە نوسینەکەیدا وا پیشان دەدات کە ئەم سەرگیریوبەرگیریە زیاتر کاری دوکتۆر موئەدەب نەفیسی بووبێت و باوەڕ ناکات کە باوکی ئەوەندە خستبێتیە ژێر فشارەوە، بەڵام ئەحمەد نەفیسی سەرۆکی شارەوانی تاران و برازای د. موئەدەب نەفیسی بە ( مەحمود طلوعی ) نوسەری ئەم کتێبەی وتوە

1 ماموريت براى وطنم، ص٧٦-٧٧.

که خۆی ئەو نامانەی دیوە کە ڕەزاشا بۆ مامی ناردووە, لە سەرجەمی نامەکاندا سەرباری سوپاس کردنی د. موئەدەبی مامی لەلایەن ڕەزا شاوە لێیشی دوبارە کردووەتەوە کە ( لە هەر جۆرە سەرگیری و بەرگیریەك لە بارەیشازادەوە کەمتەر خەمی نەکەیت, چونکە تۆ پادشای داهاتو پەروەردە دەکەیت و بەر پرسیارێتیەکی گەورەو قورست لەم بارەیەوە هەیە ).

حەمەڕەزاشا لە سەرەتای خوێندنی دا لە قوتابخانەی لوروزە لەگەڵ خوێندکارانی دیکەدا هەندێك ناکۆکی بۆ دروست بوو تەنانەت جارێکیان لەگەڵ ئەمریکیەك دا گەیشتنە لیژنەی چاکسازی قوتابخانە, بەڵام دواتر هێمن بوویەوە و زیاتر کاتەکانی لە ژورەکەی خۆیدا بە گوێگرتن لە ڕادیۆ بەسەر دەبرد یان هەنێك هاوڕێی قوتابخانەی کە دەهاتن بۆ لای لەگەڵیان دادەنیشت, بەڵام لە بارەی وانەکانەوە, لە وانەی بیرکاری دا لاواز بوو کە فیردۆستی هاوڕێی دەهات و سەعی پێدەکرد, وە لە بابەتەکانی دیکەدا مام ناوەند و لە هەندێکیاندا باش بوو, سەرباری وانەکانی قوتابخانەیشی دەبووایە هەمو ڕۆژێك دو کاتژمێر وانەی فارسی بخوێندایە, ناچاریش کرابو کە لە ڕۆژی دیاریکراوی هەفتەدا نامەیەك بۆ باوکی بنوسێت و باس لە پێشکەوتنەکانی خۆیی بۆ بکات, هەڵبەتە دوکتۆر موئەدەبیش هەمو هەفتەیەك ڕاپۆرتی گشتی دەنارد بۆ تاران و ڕەزا شا هەردو نامەکەی پێکەوە بەراورد دەکرد.

لە ڕوداوە سەرنج ڕاکێشەکانی کاتی خوێندنی شازادەی جێنشین لە سویسرا ئاشنا بوونی بوو لەگەڵ کوڕە لاوێکی سویسرایی کە ناوی ( ئەرنست پرون ) بوو, دەربارەی پرون کە دواتر لەگەڵ شازادەی جێنشیندا هات بۆ تاران و هەتا کۆتایی تەمەنی لە دەربار‌دا بوو هەواڵی زۆر بڵاو بووەتەوە, هەندێك بە سیخوڕی ئینگلیزەکانی دەزانن لە دەرباردا, هەندێکیش پەیوەندی ئەو لەگەڵ شازادەی جێنشیندا بە پەیوەندیەکی جنسی ( هاوڕەگەزبازی ) دەزانن, هەر لە بارەی (ئەرنست پرون)ە وە, (ژرار دو ویلیە)ی فەڕەنسی کە لە تاران ئاشنایەتی لەگەڵدا پەیدا کردوە دەنووسێت: پەیوەندی و نزیکی محەمەد ڕەزای پەهلەوی لەگەڵ ئەرنست پرون دا هاوڕێیەتی و دۆستییەکی سەرسوڕ هێنەر و لە ڕادە بەدەرە, لە کاتێکدا کە پرون کوڕی کارگوزارێکی قوتابخانەی لوروزە بوو لە کاروبارەکانی قوتابخانەدا لە ڕوی پاککردنەوە و باخەوانیەوە هاوکاری باوکی دەکرد, ئەرنست لاوێکی جوان و زەعیف

بوو هەندیك جار خوێندکارەکان تورەیان دەکرد, محەمەدڕەزا چەند جارێك کە خوێندکارەکانی دیکە ئازاریان دەدا هاوکاری دەکرد, ئەمەش بوویە هۆی ئەوەی کە پرون خۆشەویستی شازادەی جێنشینی بچێتە دڵەوە و چەند جارێك مەبەستی پاککردنەوە و ڕیك وپێك کردنی ژورەکەی شازادەی جێنشین دەچویە ژورەکەی, سەرەڕای ئەوەی کە پرون (١٠)ساڵ لە حەمەڕەزاشا گەورەتربوو لەڕوی ئەو پێگە کۆمەلاٌیەتیەیشی کە هەیبوو نەیدەتوانی ببێتە هاوڕێی شازادەی جێنشین, بەلاٌم بە ئەو جوانییەی و تواناى هۆنراوە خوێندن و زانیارییەی کە لە زمانی فەڕەنسی دا هەیبوو زۆر بە خێرایی سەرنجی شازادەی جێنشینی بۆلای خۆی ڕاکێشا, وردەوردە نەك بۆ پاککردنەوەی ژور بەڵکو بۆ خوێندنەوەی هۆنراوە و ڕۆمان و لێکۆڵینەوە ئەدەبیەکان سەردانی شازادەی جێنشینی دەکرد و هێواش هێواش بوویە باشترین هاودەمی.[1]

بە ئەو پەیوەندی و هاوڕێیەتیەی کە لە نێوان پرون و شازادەی جێنشیندا دروست بوو, بێگومان هاوڕێیەتی لە گەڵ فیردۆست دا کاڵ بوویەوە و ئیدی فیردۆست نەیدەتوانی وەکو ڕابردو بە ئازادی بچێتە ژورەکەی و سود لە ئەو کەرەستە خۆشگوزەرانیانە وەر بگرێت کە لەلای شازادەی جێنشینبوون, ئەم کاڵ بوونەوەی هاوڕێیەتیە کە فیردۆست دەیخستە ئەستۆی پرون وای لە فیردۆست کردبوو کە ڕقێکی زۆری لە پرون بێت, کە بە باشی لە یاداشتەکانی فیردۆست دا ڕەنگی داوەتەوە, فیردۆست پرونی بە سیخوڕو بەکرێگیراوی ئینگلیزی دەزانی کە بە وتەی ئەو لە بەرگی خزمەتکار و پاککەرەوەدا لە دەوروبەری ژورەکەی شازادەی جێنشیندا سەوز بووبوو دەنا ئەو زانیاریانەی کە ئەو هەیبوو هەرگیز لەگەڵ کەسێکی خزمەتکارو پاککەرەوەدا پێك نەدەهاتەوە, هەڵبەتە بەڵگەیەکمان بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم بۆچونە نیە, بەلاٌم لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێت کە پرون زیاتر لە ڕێگەی ڕۆڵ بینینی پەیوەندی نێوان شازادەی جێنشینو ئەو کچ و ژنە لاوانەی کە لە قوتابخانەکەدا کاریان دەکرد و مایەی ئارەزومەندی جنسی گەنجێکی تازە پێگەیشتو بوون, سەرنجی شازادەی جێنشینی بەلای خۆیدا کەمەنکێش کردبووو, خودی فیردۆستیش لە یاداشتەکەیدا بە

---

[1] Gerard de Villiers, p, 71 .

شیوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بەم بابەتە داوە کە پرون چەندین مەعشوقەی بۆ دکتۆر موئەدەبی سەرپەرشتی شازادەی جێنشین فەراهەم دەهێنا[1].

فیردۆست لە بەشێکی دیکەی یاداشتەکەیدا باس لە پەیوەندی نێوان شازادەی جێنشین دەکات لەگەڵ یەکێك لە کچە کارگوزارەکانی قوتابخانەی لوروزە کە وا دەردەکەوێت کچەکە حامیلە بووبێت و دەڵێت: محەمەدڕەزا بە بەخشینی (٥٠٠٠) فرانکی سویسری بە ئەو کچە ڕازی کرد, بەڵام نەزانرا کە ئایا بەڕاستی حامیلە بووە, یان لەبەر وەرگرتنی ئەو بڕە پارەیە کە موچەی سێ ساڵی بوو ئەو بانگەشەیەی کردبێت, چونکە دوای وەرگرتنی پارەکە ئیدی ئەو قوتابخانەیە بە جێ دەهێلێت و بە لای شازادەی جێنشیندا نەهات. . !, ئەگەر ئەم بانگەشەیەی فیردۆست ڕاستی هەبێت, دو خاڵی شاراوەی تێدا بەدی دەکرێت:

یەکەمیان: بە ئەو کۆنتڕۆڵە توندەی کە دوکتۆر موئەدەب نەفیسی لە سەر کارو کردەوەکانی شازادەی جێنشین دایناب‌و, چۆن وەها ڕوداوێك ڕوو دەدات. . . !,

دوەم: ئەو بڕە پارەیە (٥٠٠٠) فرانکی سویسری کە لەو کاتەدا بڕێکی کەم نەبووە, شازادەی جێنشین لە کوێی هێناوە و داویەتی بەو کیژۆڵەیە؟

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا, ئەگەر بانگەشەکەی پێشوی فیردۆست پەسەند بکەین کە (پرون) دەلاڵی خودی دکتۆر موئەدەبیش بووبێت, دەتوانین بڵێین کە دوکتۆر موئەدەب, پرونی کردووەتە چاودێری کارەکانی شازادەی جێنشین لە قوتابخانەدا, (پرون)یش ئەو هەلەی قۆستوەتەوە دەلاڵیشی بۆ شازادەی جێنشینیش کردووە و کارەکانیشی بۆ دوکتۆر باس نەکردوە, فیردۆست وەڵامی پرسیاری دووەمیش بەم شێوەیە دەداتەوە, شازادەی جێنشین وەکو پیشەی هەمیشەیی خۆی منی کردوە بە دەفعی بەلا لە سەر خۆی و دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە کێشەیەکی خێزانی لە تاراندا بۆ فیردۆست هاتۆتە پێش پێویستم بەو بڕە پارەیە هەیە و بە ئەو بیانوەوە (٥٠٠٠) فرانك لە دوکتۆر موئەدەب وەردەگرێت[2], بە سەرنج دانێك لە کەسێتی ڕەزاشا و بە کۆنتڕۆڵی وردی لە سەر خەرجیەکانی خوێندنی شازادەی جێنشین ئەم کارە

---

[1] خاطرات فردوست, ص٤٨.

[2] خاطرات فردوست, ص٤٩ –٥٠.

هەندێك دورە لە ئاوەزەوە, سەرباری ئەوەش ئەگەر بە ئەو جۆرەش بێت کە فیردۆست باسی دەکات ئەم پارەیە بە ئاگاداری ڕەزاشا وەرگیراوە, بۆچی ئەم پارەیە کە پەیوەندی بە خێزانەکەی فردۆستەوە هەیە لە تاران, بە فرانك دەنێردرێت بۆ سویسرا ئەی بۆچی ڕەزاشا خۆی بە پارەی ئێرانی لە تاراندا پێی نەداوون؟!.

لە کارە جێ سەرنجەکانی ژیانی محەمەدڕەزاشا لە سەردەمی خوێندنیدا, ئارەزو نەبوونی بوو بۆ بینین و سەردان کردنی عەلیڕەزای برای کە لەگەڵ ئەودا نێردرابو بۆ سویسرا بۆ خوێندن, وە هەروەها لەگەڵ دوبراکەی دیکەیشی دا غولامڕەزا و عبدولڕەزا کەساڵی دواتر نێردران بۆ سویسرا هات و چۆی زۆری نەبوو, دوای ئەوەی کە لەگەڵ ئەرنست پرون یشدا ئاشنایی پەیدا کرد نێوانیشی لەگەڵ فیردۆست و میهر پوری کوڕی تەیمورتاشیشدا کەم بوویەوە, (میهر پور) دوای مردنی باوکی گەڕێنرایەوە بۆ تاران, بەڵام محەمەد ڕەزا ئەوکاتە بە هۆکاری ئەو گەڕانەوەیەی نەزانی, لە ئەو کاتەدا حەمەڕەزاشا چەند هاوڕێیەکی سویسری و ئەمریکی هەبوو, بەڵام داستانی هاوڕێیەتی لەگەڵ ( ریچارد هلمز ) کە دواتر بوویە سەرۆکی ( سی, ئای, ئەی ) و دواتر لە کۆتاییەکانی سەڵتەنەتی محەمەدڕەزاشا دا بوویە باڵوێزی ئەمریکا لە ئێراندا ڕاست نییە, هەڵبەت ریچارد لە کاتی خوێندنی حەمەڕەزاشا لە سویسرا ئەویش هەر لەوێ دەیخوێند بەڵام بە هۆی ئەوەی کە ئەو لە پۆلەکانی سەروتر بوو زیاتری خوێندبوو پەیوەندی لەگەڵ محەمەدڕەزا دا نەبووو.

لە ساڵی ( ١٩٣٤ز, ١٣١٣هەتاوی ) حەمەڕەزاشا کە زۆر هەستی بە دڵتەنگی دەکرد داوای لە باوکی کرد کە ڕێگەی بدات بۆ ئەو پشوی هاوینە بێتەوە بۆ تاران, بەڵام باوکی ڕازی نەبوو دایکی و ئەشرەف و شەمسی خوشکی نارد بۆ لای بۆ سویسرا, ئەشرەف دەیویست لە سویسرا دا بمێنێتەوە, داوای لە باوکی کرد کە ئەویش لە قوتابخانەیەکی کچانەدا کە ماوەیەکی کەم لە قوتابخانەی لوروزە وە دوور بوو ناو بنوسێت, بەڵام ڕەزاشا ڕێگەی نەدا و ئەویش ناچار بوو لەگەڵ دایکی و خوشکە گەورەکەیدا بگەڕێتەوە بۆ تاران.

محەمەدڕەزا لە ماوەی مانەوەی لە سویسرادا لە ڕوی جەستەییەوە گەشەیەکی زۆری کرد, لەوکاتەی کە گەیشتە خوێندنی ناوەندی لە وانەی وەرزش دا نمرەی بەرزی بەدەست دەهێنا و لە پێشبڕکێ وەرزشیەکانی نێوان قوتابیاندا زۆربەی کات

سەردەکەوت, لە سالّی کۆتایی خوێندنی دا ڕەزاشا تەواو دەوڵەمەند بو بوو, لە بارەی خەرجی خوێندنی منداڵەکانیشیەوە دەست و دلّی باش بو بوو, هەربۆیە فەرمانی بە دوکتۆر موئەدەب نەفیسی دا کە بە بۆنەی سالّی لەدایك بوونی شازادەی جێنشینەوە سەیارەیەکی بۆ بکڕێت, لەو کاتەدا نزیکترین دۆستی حەمەڕەزاشا هەر ئەو ئەرنست پرونە یە کە زۆربەی کاتە بەتاڵەکانی ژیانی پڕ دەکردەوە, هەرچەندە فیردۆست مەجلیسی میوانییەکان و ئاهەنگە تایبەتیەکانی بۆ ئامادە دەکرد بەلاّم نەدەچووە ژورەوە.

ژرار دو ویلیە دەنووسێت: ڕەزاشا لە بەهاری سالّی ( ١٩٣٦ز, ١٣١٥هەتاوی ) سێ هەفتە پێش دەست پێکردنی وەرزی تاقیکردنەوەکانی کۆتایی سالّی قوتابخانەی لوروزە, فەرمانی گەڕانەوەی حەمەڕەزاشا ی دا و پێش ئەوەی بتوانێت بڕوانامەی دیبلۆم لە قوتابخانە سویسریەکەدا وەربگرێت گەڕایەوە ئێران[1], بەلاّم خودی حەمەڕەزاشا دەنووسێت: ( لە بەهاری ١٣١٥ دا بڕوانامەی دیبلۆمم بەدەست هێنا و کاتی گەڕانەوەم بۆ ولاّتەکەم هات, خێزانەکەمان لە بەندەری پەهلەوی ( ئەنزەلی ) کە لە ئەوێوە ڕەوانەیان کردم, بۆ پێشوازی کوڕێك هاتبوون کە لە ماوەی چەند سالّێکدا وەها گۆڕانکاری بە سەردا هاتبوو کە تەنانەت بۆ باوکیشی ناسینەوەی لە وەها ڕەوشێکدا دژوار بوو)[2], ژرار دو ویلیە لە زمانی (عەلی ئیزدی)ەوە کە دواتر بوویە بەرپرسی دیوانی شازادەی جێنشین دەنووسێت: دوایکۆتایی هاتنی ڕێوڕەسمی پێشوازی شازادەی جێنشین و عەلیڕەزای برای کە لەگەڵیدا گەڕابویەوە بۆ ئێران, بە مەبەستی پشودان ڕێنوێنی کران بۆ بینایەك لە کەناری دەریای خەزەردا کە بۆیان ئامادە کرابو, لە ناوەندی هۆڵی بیناکەدا ڕەزاشا بە محەمەدی وت: لە نامەیەکدا بۆت نوسیبووم کە لە پێشبڕکێی زۆرانبازی قوتابخانەکەتاندا یەکەم بوویت, وایە؟ محەمەد وتی بەڵێ باوکە, ڕەزاشا وتی: دەی وەرە لەگەڵ پیرە مێردێکی وەکو مندا زۆران بگرە بزانم زۆری کاممان زیاترە, دوای ماوەیەك دەستیان پێکردو ڕەزاشا لە چاو تروکانێکدا شازادەی جێنشینی لەسەر دەستی بەرز کردەوە و نزیکەی دەقیقەیەك

---

[1] Gerard de Villiers, p, 78

[2] ماموریت برای وطنم, ص٧٩

وەستاندی و پاشان دای بە زەوی داو لە ژێر باڵی ڕاستیدا گیری دا، ڕوی کردە عەلیڕەزا و ووتی نۆرەی تۆیە! لە کاتێکدا کەشازادەی لە بن دەستی ڕاستیدا بوو، عەلیڕەزایشی خڵەپاندەوە و خستیە ژێر باڵی چەپی!.

دوای ئەم زۆرانبازییە سەر سوڕهێنەرە ڕەزاشا منداڵەکانی بەرداو ووتی: ( هێشتا زۆرتان ماوە ببن بە پیاو، دەورەی گەڕان و سەما و سەیران تێپەڕی، من دەبێت وەکو سەربازێك پەروەردەتان بکەم )[1]!.

لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بۆ تاران ڕەزاشا بە هەردو منداڵەکەی وت، تاکۆتایی پشوی هاوینە دەتوانن گەشت و سەیرانی خۆتان بکەن بەڵام دوای ئەوە دەچنە کۆلێژی سەربازییەوە، ڕەزاشا دوبارە دوکتۆر موئەدەب نەفیسی بۆ پێشکاری شازادە دیاری کرد، محەمەدڕەزا تێگەیشت بە پێچەوانەی ئەوەی کە چاوەڕێی دەکرد لە تارانیشدا ئازادی کارو کردەوەی نیە، تەنها داواکاری محەمەد لە باوکی ئەوە بوو کە ڕێگە بدات هاوڕێ سویسریەکەی ئەرنست پرون بێتە تاران، ڕەزاشا لەم داواکاریە سەری سوڕماو داوای ڕونکردنەوەی زیاتری کرد، محەمەد ووتی: کە پرون لەماوەی خوێندنیدا لە بەرەو پێش چونی فێربوونی زمان و وانەکانیدا هاوکاری زۆری کردووە، سەرباری ئەوەش پیاوێکی ڕاستگۆو خزمەتکارە و دەتوانێت هاوکارو ڕێنیشاندەرێکی باشی ئەو بێت لە داهاتودا، ڕەزاشا پێدەچێت پاش ڕاوێژ کردن لەگەڵ دوکتۆر نەفیسی دا، داواکاریەکەی شازادەی پەسەند کرد و پرون چەند هەفتەیەك دواتر لە کۆشکی تایبەتی جەنابیشازادەدا نیشتەجێ بوو.

---

[1] Gerard, p, 79.

# هاوسەرگیری سیاسی

دوودڵیەکانی ڕەزاشا دەربارەی لێهاتویی و تواناکانی شازادەی جێنشین بۆ سەڵتەنەتداری، ڕەزاشا دەیەوێت عەلیڕەزا دیاری بکات بۆ جێگری!، حەمەڕەزا لە گەنجی دا کەسێکی هەرزە و ژنانی بوو، بۆچی فەوزیە هەڵبژێردرا بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ حەمەڕەزا دا؟، فەرمانی باوك بۆ کوڕ: خێرا دەست بەکار بەو کوڕێك دروست بکە!، شانۆی پیکدادانی ژن و مێرد و تۆرانی درێژخایەنی فەوزیە.

حەمەڕەزا پەهلەوی لە مانگی شەهریوەری ساڵی (١٣١٥هەتاوی) لە کۆلیژی سەربازی وەرگیرا، وە لە گروپێکی تایبەتی دا بوو کە بەرپرسیارێتی لە ئەستۆی ئەفسەرێکی زبر و توڕەدا بوو بە ناوی (سەروان مەحمود ئەمینی، برای دوکتۆر عەلی ئەمینی) بوو دەستی بە خزمەت کرد و سەرقاڵی خوێندن بوو، ڕەزاشا بە تایبەت ئاگاداری کردبوونەوە کە بڕیارە سەختەکانی کۆلێژ بەبێ جیاوازی و وەکو سەرجەم قوتابیەکانی دیکە بەسەر ئەمیشدا جێبەجێ بکرێت، سەرباری هەبوونی ئەو ئەفسەرو سەرۆکی کۆلێژەکە جارناجار ڕەچاوی ڕەوشی ئەویان دەکرد و ڕەفتاریشیان لەگەڵ قوتابیانی ئەو پۆلە تایبەتەی کە شازادەی جێنشین (حەمەڕەزا ڕەزا)ی تێدا بوو لەگەڵ سەرجەم پۆلەکانی دیکەدا جیاواز بوو، حەمەڕەزا دوواتر لە گفتوگۆیەکی دا لەگەڵ (کارانجیا)ی ڕۆژنامەنوسی هیندی دا ئەم وتەیەی پشت ڕاست کردەوە و ووتی: باوکم بە وردی ڕەوشی خوێندن و وانەو نمرەکانمی لە سەرۆکی کۆلێژەکە دەپرسی، بەڵام دەیبینی کە نمرەکانی من زۆرباشن لە نێوان (١٨ - ١٩)دان، سەرۆکی ئەوکاتی

کۆلێژەکەش ئەفسەرەکانی دەگۆڕی دەیوت نەکا ئەم نمرانەی لەبەر خاتری ئەوەی کە ئەو جێگری شای وڵاتە پێ بدەن.[1]

. شازادەی جێنشین دووای تەواو کردنی دووو ساڵی کۆلێژی سەربازی وەکو سەرجەم هاوڕێیانی بە پلەی (ستوان دوو) بڕوانامەی وەرگرت, فیردۆستیش لە هەمان ئەو پۆلە تایبەتە دەخوێند و بە پلەی (ستوان دوو) لە لەشکردا کەوتە خزمەت کردن, بەڵام بە وتەی فیردۆست شازادەی جێنشین لە هەمان دەورەی خوێندن لە کۆلێژدا ڕادەسپێردرا وەك پشکنەرو دەچو بۆ بەشە جیاوازەکانی لەشکر و مەودای نێوان پلەی ستوانی دوو وە (سەروان)ی بە خێرایی بڕی, لە کاتێکدا کە هاو دەورەکانی ئەو لە پۆلەکانی دیکەدا پلەی (ستوان یەك) بوون, جێگر بە پلەی سەروان و ناونیشانی پشکنەری هەمو لەشکری هەبوو, وە لە تەدریب و چالاکیە سەربازییەکاندا بەشداری دەکردوو بۆچونی هەبوو وە فەرمانی دەکرد.[2]

خودی حەمەڕەزاشا لە بارەی ئەم دەورەیەی ژیانیەوە دەنووسێت: (لە بەهاری ١٣١٧هەتاوی) بە پلەی ستوانی دووەم خوێندنم تەواو کرد, دەست بەجێ بە ناونیشانی پشکنەر لە لەشکری شاهنشاهی دا دەستم بە خزمەت کرد, لە ئەنجامی ئەم کارەدا ڕۆژی دووو جار (بەیانیان و عەسران) بۆ لێپرسینەوەی ڕەوشی سەربازەکان و یەکەکانی لەشکر بە دامەزراندن و سەرپەرشتی کردنی سوپا سەرکێشیم دەکرد و لە مانۆڕەکاندا بەشداریم دەکرد, چاودێری ڕاستەوخۆی چالاکی یەکە یەکەی سەربازەکانم دەکرد, تەنانەت چاودێری مەشقەکانیشیانم دەکرد و هەندێك لە شەوانیش بۆ مانۆڕە سەربازیەکان دەچوم, سەرباری ئەو ئەرکە سەربازییەی کە ڕۆژانە هەمبوو ناچاریش بووم کە هەموڕۆژێك سەردانی باوکم بکەم, ئەم سەردانانەش هەندێك جار بەیانیان و زۆربەی جاریش نیو سەعات پێش نیوەڕۆ بوو, لە کاتی نان خواردنی نیوەڕۆدا لە خزمەتیدا دەبووم, هەندێك جاریش ڕوداوێك ڕوی دەدا کە دەبوو دووای نیوەڕوانیش بۆ بەشێك لە ڕاسپاردەکان ئامادە دەبووم, لە

---

[1] R.K. Karanjina: The Mind of Monarch, London, Allen and Unwin,1977, p 50.

[2] خاطرات فردووست, ص٥٦.

سەرجەمی ئەم چاوپێکەوتنە ڕۆژانەییە لە بارەی ڕەوشی سیاسەتی ناوخۆو دەرەوەی وڵات قسەمان دەکرد, لەو سەفەرانەی کە باوکم دەیکردن بۆ ناوچە جیاوازەکانی ئێرانیش لەگەڵیدا دەبووم, لەبەرئەوەی کە باوکم ئارەزومەند بوو کە من ببات بۆ ناوچە جیاوازەکانی ئێران و ئاشنام بکات بە ڕەوشی گشتی دانیشتوان و پێگەی جوگرافیای وڵات و پرسە پەیوەندی دارەکانی سەرجەم ناوچەکان, لە کاتی ئەم سەفەرانەشدا لە بارەی وردەکاریەکانی بەرپرسیارێتی گفتوگۆی لەگەڵدا دەکردم, دەبێت ئەوەش بزانین کە وشەی گفتوگۆ بە واتای تەواوی خۆی بەکار نایەت, لەبەر ئەوەی کە سەرجەم بەرپرسەکانی دەوڵەت و پلە دارەکانی وڵات لە کاتی گفتوگۆ کردندا بە جۆرێك لێی دەترسان و ڕەچاوی ڕێزو ئەدەبیان دەکرد کە هەلی گفتوگۆ بە واتا ڕاستیەکەی خۆی نەدەڕەخسا, زۆربەی جارەکان منیش بە ئاماژە بۆ کردن و بە کورتی بیرو باوەڕی خۆمم بەبێ ئەوەی کە شوێنی گفتوگۆو قسەکردنیش بێت دەدا بە گوێیدا, ئەوەی مایەی سەر سوڕمان بوو کە ئەو هەمیشە بە ئارەزووەوە گوێی بۆ بیروباوەڕو بۆچونەکانی من دەگرت و کەمتر پێشنیارەکانمی پەسەند نەدەکرد.[١]

بەڵام ئەو وێنەیەی کە (ژرار دوو ویلیە) ی نوسەری فەرەنسی لە بارەی ڕۆژگارانی لاویەتی حەمەڕەزا وە دەیخاتە ڕو بە تەواوی جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کە حەمەڕەزا خۆی باسی دەکات, ژرار دەنووسێت: ڕەزاشا دووای گەڕانەوەی شازادەی جێنشین لەورروپاوە بێ ئومێد بوو, وە پەشیمانیش بوو لەوەی کە ناردوویەتی بۆ ئەورروپا و بۆ خوێندن و لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی خۆیدا نەبووە, ناردنی شازادەی جێنشین بۆ کۆلێژی سەربازی جێبەجێکردنی بڕیارە سەختەکانی کۆلێژیش بە سەریدا لایەنە لاوازە ڕۆحیەکانی ئەوی چارەسەر نەکرد, ڕەزاشا لەوەی کە کوڕەکەی ئیرادەی بە خۆی نیە کەسێکی خۆپارێزە خەفەتی دەخوارد, خودی ڕەزاشا کە بە تێکۆشان و چالاکی بەهێز و زبری لەکارەکانیدا لە کاتی پێویستدا گەیشتبووە دەسەلات, باوەڕیشی وابوو کە لە کاروباری دەوڵەتدا لێبووردەیی و چاوپۆشی کردن لە بەرامبەر دووژمندا ئەنجامی کەمتر لە کاردا دەدات بە دەستەوە, پێشی وابوو کە دەبێت لەکاتی هەست کردن بە مەترسی دەبێت پێشتر گورزی خۆت بووەشێنیت, ئەو

---

[1] ماموریت برای وطنم, ص 80-٨١.

میهرەبانی لە کاتی بون بە دەسەلآتدار بە مەترسی دەزانی و بڕوای وابوو کە دەبێت پێشەوا لە بەرامبەر هەمو کاریگەریەکاندا دڵی ببەستێت.

ڕەزاشا کە ئەم تایبەتمەندییانەی لە کوڕەکەیدا نەدەبینی، هەوڵی دەدا بە دووبارەکردنەوەی ئەم وتانە کاریگەری لەسەر دروست بکات، ئەو هەمیشە دووبارەی دەکردەوە کە دەبێت هێڵێکی ڕاستی نەگۆڕ لە حکومەتدا دیاری بکرێت و لێی لانەدرێت، هەرگیز نابێت ئەو بڕیارەی کە داوتە لێی پاشگەز ببیتەوە و سەرباری ئەوەش نابێت بە شێوەیەکی تەواو متمانەت بە کەس هەبێت، شازادەی جێنشینیش گوێی لە وتەکانی دەگرت و سەری بۆ دەلەقاند، بەلآم ڕەزاشا وا هەستی دەکرد کە ئەم سەر لەقاندنەی لە ترسدایە و کوڕەکەی خەیاڵێکی دیکەی لە مێشکدایە و لە ژێر کاریگەری پەروەردە کردنەکەی سویسرا دایە و گۆڕدراوە بۆ کەسێکی کەمتەرخەم و لاواز، خۆشباوەڕ هەموان بە پاك زانین، لەو ڕەوشەی کە ڕەزاشا بە باشی دەیناسی پایەکانی حکومەت لاواز دەکات، ئەو کابووسەش هەرگیز ڕەزاشای بەر نەدەدا کە: (ئایا دووای مردنی من حەمەڕەزا توانای دەوڵەتداری هەیە، یان دووای چەند ساڵێك ئەوەی کە من دروستم کردوووە خاپوری دەکات.. ؟).

ژرار دوو ویلیە درێژەی دەداتێ و دەنووسێت: ئەو دڵگرانیە بە ڕادەیەك ڕەزاشای بە خۆیەوە سەرقاڵ کردبوو کە هەندێ جار دەکەوتە بیری هەموار کردنەوەی دەستور و دانانی کوڕی دووەمی (عەلیڕەزا) بە جێنشینی خۆی، لەبەر ئەوەی کە عەلیڕەزا نەکەوتۆتە ژێر کاریگەری پەروەردە کردنەکەی ئەوروپا و هەروەکو خۆی زبر و بێڕەحمە، لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆی ئەو خۆشەویستیە نهێنیەی کە بۆ حەمەڕەزای کوڕی هەیبوو جێبەجێکردنی ئەو بڕیارەی دووا دەخست، تا ئەوەی کە بەڵکو بە هۆی ئەو شتانەی کە پێی دەسپارد ڕێنوێنی بکرێت و ڕێوڕەسمی حکومەتداری لەوەوە فێر ببێت.[1]

** ** **

بەشێکی دیکەی کتێبەکەی ژرار تایبەت کراوە بۆ نیگەرانیەکانی ڕەزاشا لە سەرکێشیە سێکسیەکانی شازادەی جێنشین و بەشداریکردنی لە ئاهەنگەکانی

---

[1] Gerard de Villiers, p 81-82

شەوانە دا, هەربۆیە بڕیار دەدات کە لە تەمەنی (١٩)ساڵیدا ژنی بۆ بهێنێت, ئەو نوسەرە فەرەنسیە لە ماوەیەکی دوورو درێژی ژیانیدا لە شاری تاران دا لەگەڵ زۆرێك لە پلەدار و کەسە دیارەکاندا گفتوگۆی ئەنجام داوە, یەکێك لەوانە (عەلی ئیزدی) سەرۆکی دیوانی پێشوی شازادەی جێنشینە و دەنووسێت: حەمەڕەزا دووای تەواو کردنی کۆلێژی سەربازی گۆڕدرابوو بۆ لاوێکی قەشمەر و ئارەزوباز, دووای تەواو بوونی کارە سەربازیەکانی ڕۆژانەی, تەواوی شەویش بە دووای ڕاوکردنی ژن و کچە لاوەکانەوە بوو, ڕەزاشا لەم کارانەی بێئاگا نەبوو, بەلاّم بەوپەڕی نیگەرانی لەم کارانەی کوڕەکەی لەوەش دەترسا کە فشار خستنە سەری لەم تەمەنەدا لاوازیە دەرونیەکانی توندتر بکات دووچاری گۆشەگیری بکات, تەنها چارەسەرێك کە بە بیریدا هات ئەوەبوو کە ژنێکی بۆ بێنێت و دوواتر ژیانێکی ڕێك و پێکی بۆ فەراهەم بێنێت.

ڕەزاشا لە بیری هاوسەرگیریەکی سیاسی یان سەڵتەنەتیدا بوو, کە هەم لەو ڕێگەیەوە پەیوەندییە سیاسیەکانی وڵاتەکەی لەگەڵ وڵاتێکی دراوسێدا بەهێز بکات و هەمیش هێنانی بووکێك لە بنەماڵەیەکی سەڵتەنەتی پێگەیەکی نوێ بۆ زنجیرەی سەڵتەنەتداریی بنیاتنراوی خۆی دروست دەکات, گفتوگۆ لە بارەی خێزانە سەڵتەنەتدارەکانی وڵاتە موسوڵمانەکان دەستی پێکرد, سەرەتا باس لە کچی خێزانە سەڵتەنەتیەکانی وڵاتانی عێراق و ئەفغانستان بوو تەنانەت باس لە دیاریکردنی کچێك لە بنەماڵەی خەلیفەکانی پێشوی دەوڵەتی عوسمانی هاتە نێو باسان, بەلاّم سەرەنجام کچێکی جوان لە بنەماڵەی سەڵتەنەتی میسر دیاریکرا, (فەوزیە) کچی مەلیك فوادی یەکەمی پادشای میسر و خوشکی مەلیك فاروق, حەمەڕەزا پەهلەوی تا ئەو کاتەی کە ڕەزامەندی بنەماڵەی سەڵتەنەتی میسر وەرنەگیرا ئاگای لەم بەرنامەیەی باوکی نەبوو, وە کاتێك ڕەزامەندی میسر بەم هاوسەرگیریە وەرگیرا ڕەزاشا وێنەیەکی فەوزیەی نیشانی شازادەی جێنشین داو وتی: ئەمە هاوسەری ئایندەی تۆیە و تا چەند ڕۆژێکی دیکە دەبێت بۆ ژن هێنان سەفەری قاهیرەی پایتەختی میسر بکەیت.[1]

[1] Gerard de Villiers, p85-86.

خودی حەمەڕەزا بە شێوەیەکی ڕەخنە ئامێز باس لە زەماوەندی خۆی لەگەڵ فوزیەدا دەکات و لە ئاماژەدان بە بڕیاری باوکی لە بارەی هاوسەرگیری لەگەڵ کچێکدا کە ئەو هەرگیز نەیدیوە بە توانج و گاڵتەی دەزانێت، حەمەڕەزا باسی ئەم ڕوداوە بە پێشەکیەك دەکات و دەنووسێت: (من دەزانم کەس ڕەخنەم لێ ناگرێت کە بڵێم بە قەدەر ئەوەی کە دێهاتیەك مافی ئەوەی هەیە لە ژیانی تایبەتی خۆی و خێزانەکەیدا ئازادی هەبێت، پادشاش دەبێت لەم مافە سەرەتاییەی هەبێت، هەمو خوێنەرانیش وڵاتانێك دەناسن کە مافی ژیانی تایبەتی ژن و مێردی بۆ هیچ کەس نیە، بەڵام خۆشبەختانە لە وڵاتە خاوەن شارستانیەتەکاندا پەیوەندی تایبەتی خێزانی بە پیرۆز دەزانرێت و هیچ جۆرە دەست وەردانێکیش لەم پەیوەندیە ڕەوا نابینن، منیش دەم ویست هەر لە سەرەتاوە لە ژیانی تایبەتی مندا ڕەچاو بکرێت).

کاتێك کە لە وڵاتی سویسرا سەرقاڵی خوێندن بووم، بەڕێکەوت هەلێکم پەیدا دەکرد کە لەگەڵ کچێکدا ئاشنا ببم، بەڵام سەرپەرشتیار و چاودێرم یا بە باوەڕو سەلیقەی تایبەتی خۆی یان بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی باوکم ڕێگەی لە ئاشنابوونم دەگرت لەگەڵ ئەو خانمانەدا، دووای گەڕانەوەم لەورووپا و لە کۆتاییەکانی خوێندنی کۆلێژی سەربازیم، خاوەن شکۆی کۆچکردوو کەوتە بیری دۆزینەوەی هاوسەرێکی شایستە بۆم، بە بۆچونی من باوکم لەم کارەی دوو مەبەستی هەبوو،

یەکەم/ دەیویست کە هاوسەری من شازادە خانمێکی ڕسەن و لە بنەماڵەیەکی نەجیب بێت.

دووەم/ بۆئەوەی کە ئارەزومەند بوو دەرباری شاهنشاهی ئێران لەگەڵ بنەماڵەیەکی سەڵتەنەتی دیکەدا خزمایەتی پەیدا بکات و پەیوەندیەکانی ئێران لەگەڵ یەکێك لە دەوڵەتە دۆست و نزیکەکاندا بەهێزتر ببێت.

وادەر دەکەوێت کە باوکم وێنەی شازادە فوزیە خانی دیوە بە ڕاشکاوی بەردەوام بۆچونی هەبوو (پێدەچێت ئەم تایبەتمەندیە بۆ ڕێکخستنی کاری هونەری و ئەندازیاری گونجاوتربێت تا بۆ کاری دڵ و هەستەکان) بە نهێنی ڕەوشی ئەم شازادە خانمە جوانەی هەڵسەنگاندبوو، سەرەتا لێکۆڵینەوەی ڕەچەڵەك و هەستی کردبوو، دوواتر فەرمانی بە باڵوێزەکەی خۆی لە قاهیرە کردبوو کە لەگەڵ پلەدارە دەوڵەتیەکاندا گفتوگۆ بکات و دەوڵتی میسریش لەگەڵ بنەماڵەی سەڵتەنەتیدا

بکەوێتە گفتوگۆوە, بەڕەسمی داوای لێ بکەن کە ئایا هاوسەرگیری شازادە فەوزیەخان لەگەڵ حەمەڕەزای کوڕی ڕەزاشا دا ئاساییە؟ ئەم کارە بەخێرایی و بەسەرکەوتویی ئەنجام درا, بەڵام یەکەم ئاگاداری لەو ڕوداوە کە بە من درا هەواڵی دەستگیرانداری من لە ساڵی (١٣١٧هەتاوی)دا بڵاو بوویەوە.

تائەوکاتەش من ڕوخساری هاوسەری ئایندەی خۆمم نەدیبوو, وە هەر لەو بارەیەوە سەفەری من بۆ میسر ڕێکخرابوو, لە ماوەی دوووهەفتەی مانەوەمدا لەو وڵاتە لەگەڵ فەزیەخاندا ئاشنا ببم, لەو ماوەیەشدا پرسە جۆراوجۆرە یاساییەکانی پەیوەست بەو هاوسەرگیریەش جێبەجێکران, هاوسەرگیری ئێمە بە شێوەیەکی ڕەسمی لە تاران و قاهیرە ئەنجام درا, لە بەر ئەوەی بە پێی دەستور دەبوو دایك و باوکی جێگری داهاتو ئێرانی ڕەسەن بن, باوکم ئەم کێشەیەشی چارەسەرکرد و لە پەڕلەمانی ئێراندا پڕۆژە یاسایەکی تێپەڕاند کە بە پێی ئەو یاسایە شازادە فەوزیە بوویە ئێرانی تەواو. ڕێو ڕەسمی مارە بڕینی ئێمە لە قاهیرە بە هۆی پیاوێکی ئاینی بەڕێزەوە ئەنجامدرا, لە خێزانەکەی من کەس لەو مەجلیسەدا ئامادە نەبوو بەڵام چەند کەسێکە بنەماڵەی بووکەخان و چەند بەرپرسێکی ئێرانی ئامادەی ئەو مارە بڕینە بوون, دووای ئەنجام دانی ئەو ڕێو ڕەسمە بووکم لەگەڵ خۆمدا هێنا بۆ ئێران, ئاهەنگی تەواوی ئێمە لە تاراندا ئەنجام درا, لەگەڵ ئەوەی بەوپەڕی شکۆمەندیەوە ساز کرا بەڵام لە ڕوی ڕۆحی و ئامادەیی خۆشیەوە لەگەڵ ئەو ئاهەنگانەی کە لە گوندەکانی ئێراندا بۆ ئەم مەبەستە ساز دەکرا جیاوازی نەبوو, جگە لەوەی بە هۆی گرفتاریەکانی ڕۆژگاری نوێوە کە لە هەموشوێنێك و تەنانەت لە وڵاتەکەی منیشدا یەخەی خەڵکی گرتووە, کەمێك بە خێرایی ئەنجام درا.

زۆری نەخایاند کە تارمایی جەنگی دووەمی جیهانی وڵاتی ئێمەشی گرتەوە و پێویست بە بیرخستنەوە ناکات کە لەو کاتەدا هەلێك بۆ تێپەڕاندنی خۆشی ژیان بەبێ دووودڵی خێزانی بۆ من نەڕەخسا, ڕەوشی تاران بە جۆرێك نەبوو کە هیچ کەس خەیاڵی سەفەری خۆشی و ڕابواردن بە مێشکیدا بێت).[١]

---

[1] ماموريت براى وطنم, ص٢٩٧-٣٠٠.

خوا لێخۆشبوو دوکتۆر قاسم غەنی کە لەگەڵ شازادەی جێنشین دا ڕۆیشتبوو بۆ قاهیرە بۆ ئەنجامدانی ساز کردنی ڕێوڕەسمی مارە بڕین و هێنانەوەی بوکەخان بۆ ئێران, لە بارەی ئەم ڕوداوەوە دەنووسێت: ڕۆژی(١٥ ی مارسی ١٩٣٩ز) , (هاوکات بە ٢٤ ی ئەسفەند ڕۆژی لە دایك بوونی ڕەزاشا), لە شاری قاهیرە لە کۆشکی عابیدین دا شازادە (فەوزییەخان) لە ڕێزدار شازادەی جێنشینی شاهنشاهی ئێران (حەمەڕەزا ڕەزا پەهلەوی) مارە کرا, دەمژمێر ١١ ی بە یانی بوو, زەوی و ئاسمان جەژنیان دەگێڕا, تەواوی قاهیرە نوقمی گوڵ بووبوو, تەواوی مەملەکەت لەو جەژنەدا بەشدارییان کرد, لەو ڕۆژەدا شازادەی جێنشین بروسکەیەکی بۆ ئێران ناردەوە کە ناوەڕۆکەکەی ئەوە بوو (من لە بۆنەی هاوسەرگیری و هەڵبژاردنی هاوسەردا بە تەواوی واتا بە ئاواتی خۆم گەیشتوم, وە داخوازی ڕاستەقینەو سەرجەم داواکاریەکانی خۆمم دەستکەوت), بەهۆی ئەوەی کە بروسکە کە ئاشکرا دەکەن و بە ڕەزاشای دەدەن, (ئاغای جەم) کە لەو کاتەدا سەرۆك وەزیران بوو بۆی گێڕامەوە کە ڕەزاشا دەستی بە گریان کرد, واتە گریانی خۆشی.

فەوزییە کچێك بوو لەو کاتەدا (١٧ یان ١٨) ساڵە بوو, جوان, دەوڵەمەند, کچی خوالێخۆشبوو مەلیك فواد, خوشکی مەلیك فاروق, ڕوخسار فریشتەو قیافە مەعسوم.., ئیدی هەر سەرێك سەودایەکی هەیە, خەڵکێك ئەم هاوسەر گیریەی بە هۆکاری یەکخستنی دووو وڵاتی بەهێزی ئیسلامی شیعەو سوننە دەزانی, خەڵکێك بیرو باوەڕی وابوو کە تەخت و تاجی ئەم دووو وڵاتە بەهۆی ئەم هاوسەرگیریەوە بەهێز دەبێت, خەڵکێکیش خەوی ئاهەنگی زانستی و واتایی دەبینی, خەڵکێکی تریش یەکێتی وڵاتانی ئیسلامی بە سامانێ و هەمیشەیی گریمانە دەکرد, ئەم کارەشیان بە شاکاری ڕەزاشا دەزانی, تەواوی وڵاتانی ڕۆژ هەلاتی و ئیسلامی نوقمی ئاهەنگ گێڕان و خۆشەویستی بووبوون, نزیکەی ناوەڕاستی مانگی ئەپرێلی ١٩٣٩ز (کۆتاییەکانی فەروەردینی ١٣١٨هەتاوی) بە کەشتی حەمەڕەزا عەلی کەبیر دەجولاین, هاوسەفەرەکانی شازادەی جێنشین و شازادە فەوزیە بریتی بوون لە: شازادە نازلی (دایکی فەوزیە) و سێ کچی (فائیزە, فەتحیە, فائیقە), یوسف زولفقار پاشا باڵوێزی گەورەی میسر لە تاران و ژن و کوڕەکەی, موحسین موراد پاشا چاودێری تایبەتی مەلیك و سەرپەرشتیاری موڵکە تایبەتیەکان, حسەین سەبری پاشا برای شاژنە نازلی,

عەبوود پاشا خاوەنی کەشتی حەمەڕەزاعەلی کەبیر، حەمزە پاشا ئەمیری دەریا، چەند کەسێك لە پلەدارەکانی لەشکر، مۆسیقارە تایبەتیە سەربازیەکانی میسر و گرووپی مۆسیقارەکان، پەیام نێری ڕۆژنامەکان، خزمەتکارەکان، بەردەستەکان، وێنەگرەکان، ڕەشەکان، سپیەکان، مەشخەڵ بەدەستەکان. وەئێرانیەکانیش بریتی بوون لە: خوالێخۆشبوو حەسەن ئەسفەندیاری (موحتەشەمولسەلتەنە سەرۆکی پەرلەمان)، دوکتۆر مەتین دەفتەری وەزیری داد، حەمەڕەزا عەلی مەتین، سێ کەس لە ڕاوێژکارانی سەربازی شا: (سەرهەنگ موعتەزیدی، یاوەر قەدیمی، یاوەر ئەسفەندیاری)، ئیزدی سەرۆکی دیوانی شازادەی جێنشین، مەجید موقر بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی ایران، مەسعودی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی اطلاعات، دوکتۆر موئەدەب نەفیسی (چاودێر و پێشکاری شازادەی جێنشین)، ڕەشید یاسمی، دوکتۆر حەمەڕەزا حسەین ئەدیب، ژمارەیەك لە کاربەدەستانی ئاسایشی تاران، خزمەتکار و بەردەستەکان، بە شکۆیەکی غەریبەوە گەیشتینە ئێران، لە ئەهواز پێشوازیەکی گەرم کراین، لە هەمو لایەك بەرپرسەکانی لەشکر ڕێکخران و ئامادە بوون، هەمولایەك نوقمی سەرباز و پێشوازی کەران و قوتابیانی قوتابخانەکان بووبوو، یەکێك لە شوێنی وەستانەکانی ڕێگای ئاسن بە ناوی وەستێنگای فەوزیيە لە ڕێگەکەماندا بوو، بە هەر حاڵ گەیشتینە تاران، ڕەزاشا بۆپیشوازی هاتبوویە شوێنی وەستانی شەمەندەفەرەکە، ئاهەنگ سازکرا، کاتی سەرکەوتنەکان بوو، نوێنەرانی تەواوی وڵاتانی دوونیا هاتن، دیاریەکانی سەڵتەنەتدارەکان و سەرۆك کۆمارەکان گەیشت، تا کۆتایی هەمویمان بینی.[1]

فەوزییە کچێکی زۆر جوان و خاوەن بڕوانامەو کەسایەتی بوو، بە پێچەوانەی ئەوەی کە حەمەڕەزا دووای چەند ساڵێك لە جیابوونەوەیان لە یاداشتەکەیدا باسیکردبوو، لە سەرەتادا وەها ژنێکی بووەتە نسیب لە خۆشحاڵیدا لە پێستەکەیدا خۆی بۆ نەدەگیرا، وە لە تەلگرافی دووای یەکەم بینینی فەوزیە کە لە قاهیرەوە بۆ باوکی ناردبوویەوە دەڵێت: (بەتەواوی ئاوات و ئارەزوەکانی خۆم گەیشتوم، وە تەواوی داواکاریەکانی خۆمم دەستکەوتوە)، نەك لە بەر شەرم یان وەکو ئەنجامدانی کارێکی سەرشانی، بەڵکو لە ناخی دڵەوە ڕاستگۆیانە بوو، ئەوان بە زمانی فەرەنسی

---

[1] خاطرات دكتر قاسم غني: انتشارات كاوش،١٣٦١، ص٢٧٣.

(کە وەکو زمانی دایکی قسەیان پێ دەکرد) بەو زمانە شیرین و خۆشە (کە پێدەچێت باشترین زمان بێت بۆ دەربڕینی هەستی عاشقانە) هەستە دەرونیەکانی خۆیانیان بۆ یەکتری باس دەکرد, فەوزیە کچێکی شەرمن و لەسەرخۆ بوو, بەڵام زۆر خێرا هۆگری حەمەڕەزا ڕەزا بوو, ژیانیان لە دەستپێکدا ژیانێکی عاشقانەبوو, حەمەڕەزاش هەر وەکو ئەوەی کە باوکی چاوەڕوانی دەکرد لە دەستپێکی ژیانی ژن و مێردایەتیدا وازی لە ئارەزوبازیەکانی خۆی هێنا و تەواوی کاتە بەتاڵەکانی لە کەناری هاوسەرە جوانەکەیدا بەسەر دەبرد, هەڵبەتە فەوزیەخان لەو ڕەوشە غەریبەی کە هاتبووە ناوی و دووری لە بنەماڵەکەی خۆی هەستی بە دڵتەنگی دەکرد, لە نێو ئەندامانی خێزانی سەڵتەنەتی دا جگە لە ئەشرەفی خوشکی حەمەڕەزا ئەویش کەم لەگەڵ هیچ کەسدا تێکەڵاوی نەبوو, ڕەوشی تاران و کۆشکەکانی بە بەراورد بە شاری گەورەی قاهیرەی ناوەندی گەشتیاری و گڵۆپی شەوانەکانی و کۆشکە گەورەکانی سەڵتەنەتی میسر زۆر هەژارانە بوو, کەلتوری ژنانی دەربار بەتایبەت تاج ملوکی خەسوی و دەوروبەرەکەی بە بۆچونی شازادە فەوزیەی خاوەن بڕوانامەی میسری زۆر هەڕەمەکیانەو دیهاتیانە بوو, فەوزیە لەم بارودۆخەدا بە تەواوی گۆشەگیر بووبوو, جگە بۆ بەشداری کردن لە میوانیەکانی دەرباری شاهنشاهی دا ئەویش بە ناچاری لە کۆشکی تایبەتی خۆیدا نەدەهاتە دەرەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا تا ئەو کاتەی کە حەمەڕەزا مێردێکی باش بوو وە کاتە تەنیاییەکانی بۆ پڕ دەکردەوە, فەوزیە لە ژیانی خۆی زۆر ناڕازی نەبوو, لە کۆتاییەکانی مانگی یەکەمی هاوسەرداریێتیەکەیدا نیشانەکانی حامیلەیی لە فەوزیە دیاری دا, بنەماڵی سەڵتەنەتیش بە تایبەتی خودی ڕەزاشا کە چاوەڕوانی کوڕەزاکەی یان جێگرێکی کوڕەکەی بوو, بێ ئارامانە چاوەڕێی لە دایک بوونی یەکەمین کوڕی نەوەی خۆی بوو, پاشماوەی داستانەکە لە زمانی (ژرار دوو ویلیە)ەوە دەبیستین:

شەوی ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٤٠ز (٤ی ئابانی ١٣١٩.هـ)دا, هەواڵیان بەڕەزاشا دا کە ژانی فەوزیەی بووکی دەستی پێکردووەو لە دایک بوون نزیکە, ڕەزاشا کە تازە جێگەی خەویان بۆ داخستبوو لە خۆشیدا دەستی بە گۆرانی وتن کرد, چواری ئابان ڕۆژی لەدایک بوونی حەمەڕەزا ڕەزا بوو, ڕەزاشا ئەم ڕێك کەوتنی لەدایك بوونەی بەم شێوەیە لێك دایەوە, دەیوت: بە دڵنیاییەوە کوڕە, لە دایك بوونی جێگرێك بۆ

شازادەی جێنشین ئەویش لە هەمان ساڵرۆژی لە دایك بوونی خۆیدا, بەبۆچونی ئەو زۆر گرنگ بوو وە باسی لە بەردەوامی سەڵتەنەتەکەی دەکرد لە بنەماڵەکەیدا.

ڕەزاشا درەنگتر لە کاتی هەمیشەیی خۆی خەوت بۆ ئەوەی پێش خەوتنی ئەو هەواڵە خۆشەی گویٚ لیٚ بێت, بەلاٚم هەواڵێك نەبوو ژانیش هەر بەردەوام بوو, ڕەزاشا خەوت بەلاٚم حەمەڕەزا تا ڕۆژ بوویەوە کە ژنەکەی منداڵەکەی بوو نەخەوت, ماوەیەك دووای لەدایك بوونەکە ئەو پزیشکەی کە سەرپەرشتی منداڵ بوونەکەی دەکرد لە ژوری منداڵ بوون هاتە دەرەوە و بە بیٚ دەربڕینی هیچ جۆرە خۆشحاڵیەك ووتی: (سوپاس بۆ خودا هەردووکیان سەلامەتن, منداڵەکەش کچە!).

حەمەڕەزا لە ناخی دڵەوە خۆشحاڵ بوو, چونکە خۆی زیاتر کچی خۆشدەویست و بیریشی لەوە دەکردەوە بۆ ئەوەی کە جێگرەوەیەك بێتە دوونیا هێشتا زۆری ماوە, بەهۆی ئەوەیشی کە دەیزانی باوکی بە چ ئارەزوویەکەوە چاوەڕێی منداڵێکی کوڕی دەکرد دەترسا لەوەی کە ئەم هەواڵە بە باوکی بدات!, ترسەکەشی لە خۆیەوە نەبوو, لەبەر ئەوەی کە هەواڵیان بەڕەزاشا دا کە منداڵەکە کچە نەیتوانی توڕەیی خۆی کۆنترۆڵ بکات و بە گۆچانەکەی دەستی هەرچیەك کە لە سەر مێزەکەی بەردەمیدا بوو خستیە خوارەوە و ئەو ڕۆژەش ئامادەی بینینی هیچ کەس نەبوو.

ڕەزاشا بیرو باوەڕی ئاینی بەهێز نەبوو, بەلاٚم کەمێك خورافاوی بوو, لەدایك بوونی یەکەم منداڵی کچی لە بنەماڵەی سەڵتەنەتیدا بە پێقومی شەڕ دەزانی, لە مێژودا خوێندبوویەوە (یان پێیان وتبوو) کە ئەوەی لە نێو سەڵتەنەتی قاجاریدا یەکەم منداڵی کچ بوویێت یان کوژراوە یان لەو شوێنەی کە بۆی دوور خراوەتەوە مردووەوە.

بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە ڕەزاشا بە بیٚ ئەوەی کە پیرۆزبایی لە دایك بوونی نەوەکەی لە کوڕەکەی بکات ووتی: (هەرچی زوترە دەست بەکار بەو کوڕێك دروست بکە, ئەمە گرنگترین کاری تۆیە), حەمەڕەزا وەکو هەمیشە ووتی گوێڕایەڵی فەرمانی بەڕێزتانم......, بەلاٚم جێبەجێکردنی ئەم فەرمانەی باوك وەکو فەرمانەکانی دیکە ئاسان نەبوو...!.

فەوزیە دووای لە دایك بوونی کچەکەی کە ناویان نا (شەهناز) هەستی دەکرد کە ڕەزاشا و ئەندامەکانی دیکەی بنەماڵەی سەڵتەنەتی بە تایبەتی دایك و

خوشکەکانی مێردەکەی بە چاوێکی دیکەوە سەیری دەکەن, وەکو ئەوەی لە بە دوونیا هێنانی کچێك دووچاری گوناهێکی گەورە بووە, تەنانەت هەستی گۆڕانکاریشی دەکرد لە ڕەفتارەکانی مێردەکەشی دا کە لە ڕواڵەتدا بە لەدایك بوونی کچەکەیان خۆشحاڵ بوو, هەندێك شەوان درەنگتر لە جاران دەهاتەوە و ئارەزوی ژن و مێردایەتی وەکو پێشو نەبوو, فەوزیە هێشتا نەیدەتوانی هۆکاری ساردی و بێ ئارەزویی مێردەکەی هەست پێ بکات, تا ئەوەی کە شەوێك لە کۆبوونەوەیەکی میوانیدا کە لە کۆشکی تایبەتی شەمس ی خوشکە گەورەی حەمەڕەزا دا ڕێکخرابوو, بۆ یەکەم جار فەوزیە لەگەڵ چەندین ژن و کچی جوان دا کە ئەندامی بنەماڵەی سەڵتەنەتی نەبوون ڕوبەڕو بوویەوە, شەمس و ئەشرەفی خوشکی ئەم ژن و کچە جوانانەیان بە شازادەی جێنشین دەناساند و ئەویش یەك لە دووای یەك لەگەڵیاندا سەمای دەکرد و بەوپەڕی شەهوەتبازییەوە و لە بەرچاوی فەوزیەدا لە باوەشی دەگرتن, فەوزیەی تووڕەو سوکایەتی پێکراو بە بیانوی سەر ئێشەوە میوانیەکەی بە جێ هێشت, شازادەی جێنشینیش بۆ ڕێگرتن لە ڕۆیشتنی بە دووایدا ڕۆشت و دوواتر بەدەست لێی دا.

ئەو شەوە حەمەڕەزا تانزیکەی بەیانی لە کۆبوونەوەی میوانی خوشکەکەیدا مایەوە و سەرقاڵی سەما وڕابواردن بوو, کاتێك کە گەڕایەوە کۆشکی تایبەتی خۆی بینی کە فەوزیە لە ژوری خەوەکەی خۆیدا نیە, (شەهنان)یش لە جۆلانەکەیدا نەبوو, حەمەڕەزا کە نغرۆمی مەستی بووبوو بە دیتنی ئەم ڕەوشە بەژورەکاندا گەڕا و لە ژورێکدا نوسراوێکی بچوکی لە سەر مێزەکە بینی کە فەوزیە بە زمانی فەڕەنسی نوسیبووی: (بۆ ئەوەی کە هەستێکی ئارام پەیدا بکەم ڕۆیشتم بۆ ئاپارتمانی تایبەتی خۆم).

ئاپارتمانی تایبەتی فەوزیە لە بەشی باکوری کۆشکەوە بوو کە زۆر سودی لێ وەر نەدەگرت, حەمەڕەزا بە خێرایی بەرەو ئەو ئاپارتمانە ڕۆیشت و سەرەتا هێواش و دوواتر بەهێزتر لە دەرگای دا, بەڵام وەڵامێکی دەست نەکەوت و ناچار گەڕایەوە بۆ ژوری خەوەکەی خۆی, حەمەڕەزا تا خۆرکەوتن بە خەبەر بوو پاشان چێشتەنگا دووبارە ڕۆشتەوە بۆ ئاپارتمانەکەی فەوزیەو لە دەرگای دا, چەند ساتێك دوواتر فەوزیە دەرگای کردەوە بەڵام لە لایەکی دەرگاکەوە وەستا بە بێ ئەوەی کە ڕێگە بە حەمەڕەزا بدات بچێتە ژورەکەی و پێی وت: (من بڕیارم داوە کە لە ئێستە بەدوواوە

ژیانێکی سەربەخۆم هەبێت, من ئیتر ئامادە نیم سوکایەتی و گاڵتەم پێ بکرێت, تۆ دووێنێ سوکایەتیت بە من کرد ئیدی نابێت چاوەڕێی عیشق و خۆشەویستیم لێ بکەیت, هەڵبەتە لەو ڕێوڕەسم و پێشوازیانەی کە بوونی من پێویست بێت بەشداری دەکەم, بەڵام ئیتر پەیوەندیەك لە نێوانماندا نیە, من لە ئاپارتمانەکەی خۆمدا ژیان بەسەر دەبەم و ئێوەش ژیانی خۆتان بەسەر بەرن, خوداحافین).

فەوزیە تەنانەت چاوەڕێی وەڵامی حەمەڕەزای نەکرد و توند دەرگاکەی بە سەری دا داخست, حەمەڕەزا تا ماوەیەك لە بەردەم دەرگاکەدا تاسا و تەنها چارەیەك کە بە مێشکی دا هات ئەوە بوو کە ئەشرەفی خوشکی بنێرێت بۆ لای بەمەبەستی ئاشتی, فەوزیە بە ساردییەکەوە پێشوازی لە ئەشرەف کردوو پێی ووت: بەهیچ جۆرێك ئامادە نیە کە لە بڕیارەکەی خۆی پاشگەز بێتەوە, ئەشرەف دووای ئەوەی کە بە نەرم و نیانی و قسەی خۆش ئەنجامێکی باشی بەدەست نەهێنا کەوتە بەکارهێنانی زمانی زبر و هەڕەشە, بەڵام فەوزیە بەتوندی وەڵامی دایەوە و ووتی: (ئەگەر زۆر فشارم بۆ بێنیت دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەی خۆم و وەها ئابڕوتان دەبەم کە لە کارەکەتان پەشیمان ببنەوە)..

ئەشرەفی سوکایەتی پێکراو و شکست خواردوو گەڕایەوە بۆلای براکەی و لەباتی ئەوەی کە دڵخۆشی بکات, ووتی کە بکەوێتەبیری پشت گوێ خستنی هاوسەرەکەی, داوای لێکرد کە خۆی لێ بەدووربگرێت و لەگەڵ ئەو کچ و ژنە جوانانەی کە بۆی پەیدا دەکات بە خۆشی ڕابووێرێت!, خوی هەوەسبازی حەمەڕەزاش ئامادەیـەکی هەبوو بۆ پێشوازی کردن لەو (ئامۆژگاری خوشکانە!)یەی کە کرابوو, فەوزیەش کە هەرگیزئامادە نەبوو لەخۆبایی بوونی خۆی بشکێنێت و بگەڕێتەوە بۆلای مێردەکەی ئیدی لەگەڵیدا نەخەوت, ڕەزاشاش هێشتا چاوەڕێی حامیلە بونی بووکەکەیی و لەدایك بونی کوڕێك بوو بەڵام نەیدەزانی کە ئیدی هەلی گونجاندنی وەها کارێك لە بەردەم کوڕەکەیدا نییە!.

فەوزیەلەوە بەدووا کەمتر لە ئاپارتمانەکەی دەچویە دەرەوە و زیاتر کاتەکانی خۆی بە خوێندنەوەو یاری کردن لەگەڵ شەهنازی کچی و خزمەتکارە میسریەکەیدا دەگوزەراند, ئیتر نەك تەنها لەگەڵ مێردەکەی بەڵکو لەگەڵ تەواوی ئەندامانی خێزانی سەڵتەنەتیش بە تایبەتی تاج ملوکی دایك و شەمس و ئەشرەف خوشکەکانی

مێردەکەیدا پەیوەندی بچڕاندبوو, وە لەهیچ میواندارییەکی تایبەتی دەرباریشدائامادە نەدەبوو, ئیدی لە نێو بنەماڵەی سەڵتەنەتیشدا بە گاڵتە پێکردن و نازناوی (میسری) ناویان دەبرد.[1]

وادەردەکەوێت کە ڕەزاشا ئاگای لەم ناکۆکی و پەیوەندی نەمانەی کوڕەکی و بووکەکەی نەبوو, وە ئامادە نەبوونە فەوزیەشی لە کۆبوونەوە تایبەتیەکانی بنەماڵەی سەڵتەنەتیدا دەگەڕاندەوە بۆ ناکۆکی نێوان فەوزیە لەگەڵ دایك و خوشکەکانی شازادەی جێنشیندا و ئارەزوی دەست وەردانی لەم بابەتە (بابەتی ژنانە) نەبوو, سەرباری ئەوەش کاتی جەنگی دووەمی جیهانی بوو مەترسیەکان هەڕەشەیان لە تەخت و تاجەکەی ئەویش دەکرد, هەلی بیرکردنەوەی لەو بارەیەوە بۆ نەدەڕەخسا تەنها ئەوەندە نەبێت یەك دوو جارێك لە کوڕەکەی پرسی کە بۆچی ژنەکەت حامیلە نابێت؟ ئەوەیش لە وەڵامدا دەیوت: نازانم, سەرەنجام ڕەزاشا وتی: بیبەن بیشانی دوکتۆری تایبەتی بدەن, دەڵێن ئەم کارە ئەنجامدرا و هیچ کەم و کوڕیەك لە فەوزیەدا دەر نەکەوت, بەڵام حەمەڕەزا لە یاداشتەکەی خۆیدا بە جۆرێك داپۆشیوە و لە بارەی ژیانی خۆی لەگەڵ ژنی یەکەمی دا دەنووسێت: (تەنها خاڵی ڕۆشن و دڵخۆشکەر کە شوێنەواری هاوسەرگیری من و فەوزییە هاتنە دوونیای شەهناز کچی خۆشەویستمە کە لە ساڵی ١٣١٩هەتاوی چاوی بە دوونیا هەڵ هێناوە, وە بەداخیشەوە بە هۆی هۆکارێکەوە کە هێشتا لای دوکتۆرەکانیش نەزانراوە لە شازادە فەوزیەخان منداڵی نێر نایەتە دوونیا...), دوواتر حەمەڕەزا لە بارەیئەو هەنگاوانەی کە بوویە هۆی لێك جیا بوونەوەی لەگەڵ فەوزیەدا دەنووسێت: (بە پێی دەستوری ئێران سەڵتەنەت ڕاستوخۆ دەگوازرێتەوە بۆ منداڵی نێری شاهنشا, وە بەم پێیەش نەك تەنها کچەکەم بەڵکو سێ خوشکیشم لەم مافە بێبەش کراون, هەروەها دەستوری ناوبراو ئەو منداڵانەشی لەو مافە بێبەش کردبوو کە دایکیان لە بنەماڵەی قاجارەکان بێت, لەم بارەیەشەوە برا باوکیەکانم کە دایکیان لە ڕەگەزی قاجار بوو لەم مافە بێبەش بوون, بەوپەڕی داخەوە تاکە برا هاوپشتەکەیشم لە ساڵی ١٣٢٣هەتاوی دا بە هۆی

[1] Gerard de Villiers. P, 87-89.

کارەساتێکی هەواییەوە گیانی لە دەست دا[1]، لەگەڵ ئەم کۆتوبەندانەی دەستوردا ڕاوێژکارەکانم گرنگی زۆریان بەوە دەدا کە ژنەکەم کوڕێکی ببێت، لەوانەش بوو بتوانرایە گۆڕانکارییەك لە دەستوردا بکرایە بەڵام بیروڕای گشتی شەقامی ئێرانی بۆ گۆڕانکاری دەستوری لە بارەی جێگریەوە هەرگیز مایەی ڕەزامەندی نەبووەو ناشبێت، لە دەستوریش بگەڕێین، هەر پیاوێکی گەنجی وەکو من ئارەزوی هەبوونی چەند منداڵێکی هەیە، لەگەڵ هەوڵی لە ڕادە بەدەری دوکتۆرەکانیشدا لەم بارەیەوە ئەنجامێکی دڵخۆشکەر دەست نەکەوت، دووای گەڕانەوەی شازادە فەوزیەخان بڕیاری جیابوونەوەمان دا[2]. هەڵبەت داستانی تەڵاق دانی فەوزییە کە حەمەڕەزا بەو سادەییەو بە ڕستەیەك دوایی پێ هێناوە داستانێکی دووورودرێژی هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی تایبەتە بە سەرەتاکانی سەڵتەنەتی حەمەڕەزاشاوە لە جێگای خۆیدا ئاماژەی پێ دەکەین، بەڵام ئەوەی کە پێویستە لێرەدا بە بیری بهێنینەوە ئەوەیە کە بە پێی بەڵگە نامەکان کە لە بەشەکانی دوواتردا خراونەتە بەردەست، حەمەڕەزا تا کۆتاساتەکانیش ئارەزومەندی گەڕانەوەی فەوزییە بووە بۆ ئێران، ئەو بانگەشەیەشی کە ئیدی فەوزیە نەیدەتوانی منداڵی ببێت بڕیاری تەڵاق دانی داوە، درۆیەکی شاخدارە.

---

[1] ئەوەی جێگای سەرنج دانە کە حەمەڕەزا بۆ تێکدانی تەڵاق دانی فەوزیە لە ساڵی ١٣٢٦ دا باس لە مردنی براکەی دەکات لە ساڵی ١٣٣٢دا، واتە چەند ساڵێك پێش ئەوەی براکەی بمرێت ئەو فەوزییەی تەڵاق داوە.

[2] ماموریت برای وطنم، ص٢٠٠-٢٠١.

# تەخت و تاجی لەرزۆك

تكای شازادەی جێنشین بۆ دوكتۆر موسەددەق, ڕەزاشا پرون لە كوڕەكەی دوور دەخاتەوە, ئایا ڕەزاشا پێش جەنگ مەبەستی گواستنەوەی سەڵتەنەتی هەبوو بۆ كوڕەكەی؟, ئینگلیزەكان بە هۆی فیردۆستەوە ئاگداری وردەكاریەكانی كارەكانی شازادەی جێنشین دەبن!, دەستپێكردنی سەڵتەنەتی محەمەدڕەزاشا, شوشەی تەمەنی سەڵتەنەتی محەمەدڕەزاشا لە دەستی فەڕوغ دا بوو, هێرشی پەڕلەمانتاران و چاپكراوەكان بۆ سەر ڕژێم.....

مەحمود جەم سەرۆك وەزیران و وەزیری دەرەباری ڕەزاشا لە یاداشتەكانی خۆیدا دەربارەی دەورانی خزمەتی خۆی لە دەرباری پەهلەوی دا دەنووسێت: (كاتێك كە پۆستی وەزارەتی دەربارم لە ئەستۆدا بوو, بێگومان پەیوەندی من لەگەڵ ڕەزاشا دا زیاتر بوو لە كاتی سەرۆك وەزیرانیم, ڕۆژی دووجار دەچومە خزمەتی و لە بەیانیەوە تا دەمژمێر(٧) ی دوای نیوەڕۆ سەرقاڵی كار بووم, چاك لە بیرمە ڕۆژێك ڕەزاشا بانگی كردم, لە دیوانی كاری خۆیدا دانیشتبوو, لە دەریای بیركردنەوەدا ڕۆچوبوو, بیری لە ئایندەی خۆی و ئێران دەكردەوە, چومە ژورەوە, ڕێزم لێگرت و شایش نەفەسێكی لە جگەرەكەی دا, جگەرەكەی ئیدارەی تایبەتی دووخانیات لە توتنی تایبەتی دروستی دەكرد كە تایبەت بوو بۆ هەندێك كەس, بەنیگایەك سەیری كردم و فەرمووی: فلاَنی گەیشتومەتە ئەو باوەڕەی كە شازادەی جێنشین تەمەنی گەیشتە (٢٠)ساڵ سەڵتەنەتی پێ بسپێرم و من و تۆش ڕێگەی مازندەران بگرینە بەر و بڕۆین لە نێو ئەو

شاخ و دۆل و جەنگەڵی سەر سەوزو جوانیەدا پشویەك بدەین...... بە ئومێدی ئەو ڕۆژە.

ڕەزاشا بە دڵ گەرمیەکی زۆرەوە ئەو ڕستەیەی لە دەم هاتە دەرەوە، وە لەو ڕونکردنەوانەی کە لە چوارچێوەی ئەو ڕستەیەدا بە منی وت مەبەستی ناخی خۆی بە تەواوی ڕۆشن کردەوە، جەختی لە سەر ئەوە دەکردەوە کە تەواوی ئارەزووی ئەو ئەوەیە کە کە شازادەی جێنشین بگاتە (٢٠)ساڵ و بیکات بە سەڵتەنەت داری ئێران و بە چاوی خۆی چۆنیەتی مەملەکەتداری شازادەی جێنشین تەماشا بکات.

ئەو ڕۆژە تێپەڕی، جارێکی دیکە ڕەزاشا ئارەزووی ناخی خۆیی بۆ بەیان کردم و فەمووی: هیچ ئارەزویەکی جگە لە واز هێنان لە تەخت و تاج و گواستنەوەی بۆ کوڕەکەی نیە، هەڵبەت لەو کاتەدا ئێران لە کەیف و خۆشگوزەرانیدا بوو، هەرچەندە جەنگی جیهانی دووەم تازە دەستی پێکردبوو، بەڵام ڕەزاشا بێلایەنی ئێرانی پاراست و هەموانیش بە چاوی ڕێزەوە دەیانڕوانیە ئەو بێلایەنیەی ئێران، سەرجەم دەوڵەتەکان چ دەوڵەتانی میحوەر چ دەوڵەتانی هاوپەیمانان بە ئازادی لە ئێراندا کاری خۆیانیان دەکرد، بازرگانی ئێمە لەگەڵ هەمو دەوڵەتەکاندا بەهێز و بەردەوام بوو، پەیوەندی سیاسی توندوو تۆڵیشمان هەبوو لەگەڵ دەوڵەتانی ئەڵمان و بەریتانیا و سۆڤیەتیشدا.[1]

دەربڕینەکانی ڕەزاشا بۆ وەزیری دەربارەکەی کە لەساڵی (١٣١٨هەتاوی) بەدواوە موعتەسیدی ئەم پۆستەی گرتە ئەستۆ، بەرپەرچ دانەوەی نیگەرانیەکانی ڕەزاشایە لە بارەی بێ توانایی کوڕەکەی لە گرتنە ئەستۆی سەڵتەنەتداری ئێراندا، کە لە بەشی ڕابردوودا بە وەرگرتن لە (ژرار دوو ویلیە)ی نوسەری فەڕەنسی ئاماژەی بۆ کرابوو، وادەردەکەوت کە ڕەزاشا کەوتۆتە بیرکردنەوەی ئەوەی کە لە ژیانی خۆیدا واز لە سەڵتەنەتداری ئێران بهێنێت بۆ کوڕەکەی، تا لە ساڵەکانی سەرەتایی دەسەڵاتەکەیدا دەستی بگرێت و پێ بە پێ لەگەڵیدا بێت و ڕێوڕەسمی سەڵتەنەتداری فێر بکات، ڕەزاشا نیگەرانیەکانی خۆی لە تواناکانی شازادەی جێنشین بە خۆی و دیوانی کاروباری وڵات وتبوو، بەجۆرێك کە خودی محەمەدڕەزا لە یاداشتەکانیدا

---

[1] نقل از سالنامە دنیا.

ئاماژەی بۆ کردووە و دەنووسێت: ڕۆژێك لە ناوچەی کلاردەشت سەردانی باوکمم دەکرد, لە کاتی پشوودانەکاندا دەڕۆیشتین بۆ ئەو چادرەی کە بۆمان ئامادە کرابوو, کاتێك باوکم لە چادرەکەدا هەنگاوی دەنا وتی: (ئارەزومەندم دەزگا دەوڵەتیەکان بە جۆرێك چاك بکەم کە ئەگەر ڕۆژێك لە دوونیا دەرچووم, بەرپرسەکانی وڵات بەبێ چاودێری ڕاستەوخۆی پلە باڵاکانی سەرەوە کاروبارە ئاساییەکانی خۆیان ئەنجام بدەن).

ئەم وتەیەی باوکم بۆ من کە ئەوکاتە گەنجێکی هەستیار بووم نیگەرانکەر بوو ئەوەم بە سوکایەتی پێکردن وەرگرت, لەبەر ئەوە بیرم دەکردەوە کە مەبەستی ئەوە بووە کە لەدوای ئەو من توانای ئەنجام دانی ئەرکی سەرشانم نیە و بە باشی ناتوانم شوێنی ئەو بگرمەوە.[1]

تەنانەت لەبەر ئەو گومان و نیگەرانیەی ڕەزاشا لە شازادەی جێنشین وای کردبوو کە پێش ئەوەی ببێت بە (٢٠)ساڵ و بە پێی دەستور بتوانێت شوێنی بگرێتەوە, لە کاروبارەکاندا بەشداری پێدەکرد و لە پرسە جیاوازەکاندا ڕاوێژی پێدەکرد و هەندێك جاریش پێشنیارەکانی بە هەند وەردەگرت, بۆ ئەوەی کە کوڕەکەی وردە وردە لە کاروباری سەڵتەنەتداری دا ئەزمون پەیدا بکات, ئەم بەرنامەیەش دەست بەجێ دوای ئەوەی کە شازادەی جێنشین خوێندنی سەربازی تەواو کرد دەستی پێکرد, کاری سەرەکی شازادەی جێنشین لە پۆستی فەرمی پشکنەری هەمو لەشکردا کە ئەو پۆستەی پێدرابوو, لێکۆڵینەوە بوو لە ناوەندە سەربازیەکان و ڕاپۆرتی چالاکیەکانیان بوو بۆ ڕەزاشا, بەڵام ڕەزاشا بەمە وازی نەدەهێنا و لە تەمەنی (١٩)ساڵی شازادەی جێنشین دا, بڕیاری دا لە پرسە جیاوازەکانی وڵاتدا بەشداری پێ بکات و ناچاری بکات تا بیر بکاتەوە, ماوەیەك داوای لێکرد کە بیروڕای خۆی بە شێوەی ڕاپۆرت ئامادە بکات و لە دانیشتنەکانی داهاتوودا بیخاتە ڕوو.

محەمەدڕەزاشا لە یاداشتەکانی خۆیدا ئاماژەی بۆ ئەو بابەتەی کەباوکی لە تەمەنی (١٩)ساڵیدا لە کاروبارە جۆراوجۆرەکانی دەوڵەتدا بەشداری پێکردووە,

---

[1] ماموریت برای وطنم, ص٨١-٨٢.

سەرنجێکی تایبەتیشی لە بارەی بۆچون و پێشنیارەکانیەوە هەبووە, کردووە, بەڵام لە باتی ئەوەی کە ئاماژە بە یەك دوو پێشنیارو بۆچونی خۆی بکات, نمونەی بە تکاکردنی لەباوکی بۆ دوکتۆر موسەددەق کردووە, تا بەم هۆیەوە سپڵەیی دوکتۆر موسەددەق بخاتە ڕوو, لەم ڕوەوە محەمەدڕەزا دوای بەیانکردنی ئەو بابەتەی کە (زۆر جاران لە تەمەنی (١٩)ساڵیدا بەڕونی بیرو بۆچونی خۆمم لە پرسە جیاوازەکاندا بە باوکم دەوت, ئەوەی مایەی سەر سوڕمانە ئەوەیە کە ئەو هەمیشە بۆچون و بیروڕاکانمی بەوپەڕی گرنگیەوە گوێی بۆ دەگرت, وە پێشنیارەکانمی بە کەمی دەگەڕاندەوە), دەنووسێت: (بە هۆی جەخت کردنەوە و کاریگەری تکاکردنی منەوە زۆرێك لە زیندان سیاسیەکان ئازاد کران, لەوانەیە مایەی نیگەرانی بێت کە یەکێك لەوانە دوکتۆر موسەددەق بوو, کە دواتر لە سەردەمی سەرۆك وەزیرانی خۆیدا زۆری نەمابوو وڵات ئیفلاس پێ بکات ئەو بنەماڵەی کە باوکم پێکیهێنابوو لە ناو ببات, لەگەڵ ئەوەشدا کە دوکتۆر موسەددەق چەندین جار وتبووی کە من (محەمەدڕەزا) گیانی ئەوم لە مردن ڕزگار کردووە, هەموان دیتان کە ئەو قەرزەی بە چ ڕێگەیەکی سەرسوڕهێنەر دایەوە, چون لە بەرامبەر مندا سپڵەیی ئەنجام دا..!, باوکم موسەددەقی بە تۆمەتی هاوکاری کردن لەگەڵ دەوڵەتێکی بیانی و پیلان دانان دژی دەوڵەتی ئێران دەستگیر کردبوو, نازانم لە مێشکی باوکمدا چی تێدەپەڕی کە هەمیشە دژەکانی خۆی بە هاوکاری کردن دژی بێگانەو بە تایبەتیش ئینگلیزەکانی تاوانبار دەکرد, موسەددەق بۆ ناوچەیەکی دوورە دەست و کەش و هەوایەکی ناشاز دوور خرابوویەوە, لەبەر ئەوەی پیرو دەردەدار بوو بە گومانێکی بە هێزەوە بە سەلامەتی نەدەگەڕایەوە, بەڵام من تکام بۆ کردوو دوای چەند مانگێك ئازاد کرا).[1]

دوکتۆر موسەددەق لە ژیانی خۆیدا وەڵامێکی بۆ ئەم بانگەشەیەی حەمەڕەزاشا نوسیوە, کە لە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (خاطرات و تالمات مصدق) چاپ کراوە, دوکتۆر موسەددەق دوای هێنانی بابەتەکەی حەمەڕەزاشا, بە ناونیشانی (ڕاگەیاندنی وەڵام) دەنووسێت: (دوای کۆتایی هاتنی ماوەی یاسایی خولی شەشەم کە دەوڵەت دەستی وەردایە هەڵبژاردنەکانی تارانەوە, ئیدی من

---

[1] ماموريت براى وطنم, ص٨١.

نەچوومە پەرلەمان, ماوەی سیازدە ساڵم لە شاری تاران و گوندی ئەحمەدئاوا بە گۆشەگیری تێپەڕاند, کەسێکم نەبینی و تێکەڵیشم لەگەڵ کەسدا نەکرد, بەئەم شێوەی ژیانەوە نەمزانی بۆچی منیان دەستگیر کردووە و هێناومیان بۆ شارەوانی, باشترین شایەتیش پەروەندەکانی منە لە شارەوانیدا, پرسیارم کرد بە چ تاوانێك منتان هێناوەتە ئێرە؟ وتیان تاوانێکت نیە و دەبێت لێرە بمێنیتەوە, من و کەس و کارەکەشم هیچ داوایەکمان لە خاوەن شکۆی پایەدار شازادەی جێنشینی ئەوکاتە نەکردووە, ئەم داواکاریە لەلایەن (مسیو پرون)ی سویسری و یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی سەردەمی خوێندنی شازادەی جێنشینەوە, کە لە نەخۆشخانەی (نەجمییە) خەوێنرابوو ئەنجامدرا, بەم شێوەش هەرکاتێك هەلێکم لەبۆ ڕەخسابێت لە سوپاسگوزاری خۆمم نەبواردووە, تا کۆتا ڕۆژیشم کە لەسەر کار بووم هەنگاوێکم لە دژی شاهنشا هەڵنەهێناوە, وە تکاکردنی بۆ من لەلای باوکی تاجداری کاریگەریەکی دیکەیشی هەبوو, ئەویش ئەوەیە کە ڕەزاشای کۆچکردوو جینایەتێکی دیکەی نەبوو کە لەناو بردنی من بوو, بەڵام ئەوەش کە فەرموتانە ( , نازانم لە مێشکی باوکمدا چی تێدەپەڕی کە هەمیشە دژەکانی خۆی بە هاوکاری کردن دژی بێگانەو بە تایبەتیش ئینگلیزەکان تاوانبار دەکرد), شوێنی خۆیەتی کە لە خزمەتتاندا بڵێم: کافر هەموان بە ئاینی خۆی بژار دەکات.[1]

وەڵامەکەی دوکتۆر موسەددەق لەو ڕوانگەوە مایەی تێڕامانە کە پلەی دەسەڵاتی پرون لای شازادەی جێنشین لەو کاتەدا بە باشی دەخاتە ڕوو, بەڵام ئەوەی کە بۆچی پرون بۆ ئازاد کردنی دوکتۆر موسەددەق پەیوەندی دەکات بە شازادەی جێنشینەوە و داوای لێدەکات کە لای باوکی تکای ئازاد کردنی دوکتۆر موسەددەق بکات ڕوون نیە, وا دەردەکەوێت کە ڕەزاشا دوای ئەو ڕوداوە گومان لە پرون دەکات و بە بیانوی سەرپەرشتی کاروبارەکانی باخی کۆشکی سەڵتەنەتی لە ڕامسەر دەنێرێت بۆ باکور, ئەڵبەتە ورتەورتی نێو خەڵك لە سەر ئەم بابەتە کە گومانی زیاترە ئەویش ئەوەیە کە, ڕەزاشا پەی بە سەرکێشیە جنسی (هاوڕەگەزباز)ەکانی پرون دەبات و بۆ ئەوەی کە لە شازادەی جێنشینی دوور بخاتەوە دەینێرێت بۆ باکور!.

---

[1] د. محمد مصدق: خاطرات و تالمات مصدق, انتشارات علمی, چاپ اول, ١٣٦٨, ص٣٢٨-٣٢٩.

له ٤ی ئابان ی ١٣١٨هەتاوی دا کاتێك کە شازادەی جێنشین تەمەنی بوویە (٢٠) ساڵ، ڕەوشی سیاسی دوونیا بە جۆرێك ئاڵۆز بووبوو کە چیدی ڕەزاشا نەیدەتوانی لەو بارودۆخە هەستیارەدا سەڵتەنەت بداتە دەستی کوڕەکەی و خۆشی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ چاودێری سیاسەتی وڵات بکات، پێشکەوتنەکانی ئەڵمانیا لەوروپا و ئەو گورزانەی کە هیتلەر لە سوپای ئینگلیزی دەوەشاند، ڕەزاشای دڵگران نەدەکرد بە پێچەوانەشەوە هەلێکی بۆ ڕەخساند تا فشار بخاتە سەر کاروکردەوەکانی بەریتانیا و دوو ئەوەندەی جاران دەستهاتی نەوت لە بەریتانیا بسێنێت، ئەوەی کە زیاتر مایەی نیگەرانی ئەو بوو یەکیەتی هیتلەر و ستالین بوو، کە سەرەتا بە دابەشکردنی لوهستان لە نێوان ئەڵمانیا و سۆڤیەتدا دەستی پێکرد، وە دواتر وڵاتانی دەریای باڵتیك بە ئارەزووی ستالین بوو، هەواڵێکیش گەیشتبوویە گوێی ڕەزاشا کە گفتوگۆی دابەشکردنی دوونیا لە نێوان ئەڵمان و سۆڤیەت لە ئارادایە، ستالین لەم دابەشکردنەدا چاوی بڕیوەتە ئێران، بۆئەوەی کە لەلایەکەوە دەستی بگاتە ئاوەگەرمەکانی کەنداوی فارس و ئۆقیانوسی هیندی و لەلایەکی دیکەیشەوە سەرچاوە نەوتیەکانی باشوری ئێرانی چنگ بکەوێت.

ڕەزاشا بۆ لادانی ئەو مەترسیە، چارەیەکی نەبوو جگەلەوەی هەتا بۆی دەکرێت لە ئەڵمانەکان نزیك بێتەوە، لەبەر ئەوە تەنها لە ڕێگەی دڵنیا کردنەوەی هیتلەرەوە کە ئێران دۆستی ئەوە دەیتوانی ڕێگری لەڕوسیا بکات کە ئێرانی نەکەوێتە بەر دەست، سەرباری ئەوەی کە ڕەزاشا متمانەی بە بەریتانیەکان نەبوو، خۆ نزیك کردنەوەشی لێیان هیچ سودێکی پێ نەدەگەیاند، وە هەروەها بە دروستکردنی یەکیەتی ئێران و بەریتانیا، ئێرانی دەکرد بە هاوپەیمانی گەورەترین دووژمنی هیتلەر و ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی کە ئەڵمان و ڕوسیا بۆ جێبە جێکردنی بەرنامەکانیان سازشی زیاتر بۆ یەکتری بکەن.

ژرار دوو ویلیە ئاماژە بە سەردانی یەکێك لە پلەدارە ناسراوەکانی حیزبی نازی بە ناوی (بالدوور ڤۆن شیراخ، baldur von schirach) دەکات لەو کاتەدا بۆ ئێران، کە بە وتەی ئەو بەتەواوی ڕەزاشای خستۆتە ژێر کاریگەری وتەکانیەوە و دڵنیای دەکاتەوە کە ئەڵمانیا بە تەواوی هێزی خۆیەوە پارێزگاری لە سەربەخۆیی

ئێران دەكات[1], پێش ئەوەش ڕەزاشا بە ناردنی نامەیەكی تایبەتی بۆ هیتلەر لە ڕێگەی حاجی موحتەشەمولسەڵتەنە ئەسفەندیاری سەرۆكی پەرلەمانی ئێرانەوە لە بارەی دروستكردنی یەكیەتیەكی نهێنی لە نێوان ئێران و ئەڵماندا زەمینەی لەباری ڕەخساندبوو.

ئەم كارەی ڕەزاشا ڕیگر ی كرد لەو مامەڵەیەی ئەڵمان و ڕوسیا كە لەسەر ئێران دەیانكرد, بەڵام زەمینەی گومان خراپی لە نێویاندا چاند كە سەر ئەنجام بوویە هۆی هێرش كردنی ئەڵمانیا بۆ سەر سۆڤیەت لە ٢٢ی ژوئینی ١٩٤١ز (١ تیری ١٣٢٠هەتاوی) دا, هێرشی لە ناكاوی هێزەكانی ئەڵمانیای هیتلەری بۆ سەر سۆڤیەت بوویەهۆی هاوپەیمانێتی نێوان دوو دووژمنی دێرینەی ئێران واتە ئینگلستان و سۆڤیەت,(چەرچڵ) سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا سەرباری پەیوەندی نزیكی ئێران و ئەڵمانیا و مەترسی كرێكارە ئەڵمانیەكانی نێو ئێران لە سەر دامەزراوەی كۆمپانیای نەووتی ئێران-بەریتانی, لە كردارەكانی ڕەزاشا و فشارەكانی بۆ سەر كۆمپانیای نەووتی ئێران-بەریتانی و داواكردنی زیاد كردنی پشكی ئێران بە تەواوی تووڕە بووبوو, بۆیە بەرنامەی هێرش كردنە سەر ئێرانی بە هاوكاری ڕوسیا لە كاتی خۆیدا جێبەجێكرد.

ژرار دوو ویلیە پێش بڵاوكردنەوەی كتێبەكەی لە كۆتاییەكانی ساڵی ١٩٧٥ز دا, لە مانگی ژانویەی هەمان ساڵدا كە حەمەڕەزاشا بەپێی بەرنامەی ساڵانەی خۆی ڕۆیشتبوو بۆ سویسرا, بۆ كۆتا چاو پێكەوتنی لەگەڵ حەمەڕەزاشا دا سەردانی كرد, لە نێو ئەو پرسیارانەی كە لەو گفتوگۆیەدا پێشنیار كرابوو, هەڵویستی سیاسی ئەو بوو لە سەروبەندی هێرشەكانی ئینگلیز و سۆڤیەتی بۆ سەر ئێران, چونكە دواتر وترا كە ئەویش وەكو باوكی لایەنگری ئەڵمانەكان بووە وهەر ئەمەش بوو كە ئینگلیزەكان دەیانویست ڕێگری ئەو بكەن لە گرتنە دەستی سەڵتەنەتی ئێران, محەمەدڕەزا بانگەشە كۆنەكانی خۆی (ئەوە كە باوكی هیچ پەیوەندیەكی لەگەڵ هیتلەردا نەبووە) دووبارە كردەوە و ووتی: (باوكم هیچ پەیوەندی بە هیتلەرەوە نەبوو, ئاساییە دیكتاتۆرێك دیكتاتۆرێكی دیكەی خۆش نەوێت, بەڵام ئەو باوەڕی وابوو كە

[1] Gerard de Villiers, p98.

هەرکەسێك دووژمنی ئینگلیز و ڕوس بێت دۆستی ئێمەیە!, لە بارەی پسپۆڕە ئەڵمانەکانیش لە ئێراندا دەبێت ئەوە بڵێم کە لە ساڵی ١٩٤١ز دا ژمارەی پسپۆڕانی ئەڵمانی لە تورکیاشدا لە ئێران کەمتر نەبوو, جا بۆچی هاوپەیمانەکان ئەو بیانوەیان بۆ تورکیا نەبوو وە داگیریان نەکرد وەڵامەکە ڕوونە, ئەویش ئەوەیە کە تورکیا سوپایەکی بەهێزی هەبوو وە ئەگەر ئێمەش خاوەنی ئەو هێزە بووینایە لەوانەیە بۆ هێرش کردنە سەر ئێمەش زیاتر دانیان بە خۆیاندا بگرتایە).

محەمەدڕەزاشا دوای ئەوەی کە هەواڵی لایەنگری بوونی ئەڵمانیای بە بەرپەرچ داوەتەوە دەڵێت: نەك ئەوەی کە لایەنگری ئەڵمان نەبووم, بەڵکو پێش ئەوەی کە هێزەکانی ڕوس و بەریتانیا هێرش بکەنە سەر ئێران بە باوکمم وتوە کە بەرژەوەندی ئێران لەوەدایە کە واز لە بێلایەنی بهێنێت و وابەستەی هاوپەیمانان ببێت, بەلاّم باوکی گوێی بەم پێشنیارەی نەداوە![1], هەڵبەتە ڕونکردنەوەکانی حەمەڕەزاشا لەم بارەیەوە ڕاستگۆیانە دەرناکەوێت, لەبەر ئەوەی کە پێشتر لە ماوەی سی ساڵ کە لەو کاتەدا بەسەر کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانیدا تێدەپەڕی, هەرگیز بانگەشەیەکی لەم شێوەیەی نەکردبوو, وە لە کتێبی یاداشتەکانیشیدا لە هیچ شوێنێکدا باس لە جیاوازی بوونی خۆی لە سەروبەندی هێرشی ڕوس و ئینگلیزەکان بۆ سەر ئێران لەگەڵ باوکیدا نەکردووە.

محەمەدڕەزا لە کتێبەکەیدا (ماموریت برای وطنم) دا بە وردی باسێکی لەبارەی ڕوداوەکانی سەردەمی جەنگ و ئەو هۆکارانەی کە بوونە هۆی داگیرکردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە نوسیوە و تیایدا: (لەم دواییانەدا ئەو یاداشتە نارەزاییانەی کە هاوپەیمانان دابوویان بە دەوڵەتەکەی باوکم, بە وردی خوێندنمەوە و لێیان کۆڵیمەوە و تێگەیشتم کە زۆر منداڵانەیە و تایبەتە بە کاروبارە لاوەکیەکانەوە, پوختەی وتەی ئەمان تاڕادەیەك لە بارەی ئەڵمانیەکانەوە بوو لە وڵاتی ئێراندا, وەهیچ ئاماژەیەکی بۆ مەبەستە گرنگەکەیانی تێدا نەبوو لە چەشنی ئامادە سازی ڕێگاکان و ناردنی پێداویستی بۆ ڕوسیا و ڕێگری لە هێزەکانی ئەڵمانیا بۆ چونە نێو ناوچە گرنگە نەوتیەکانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست یان وڵاتی هیندستان.

[1] Gerard de Villiers, p98-99.

باوکم پیاوێکی هوشیارو شارەزا بوو لە جوولاندنی سوپادا, هەرکاتێك ڕوس و ئینگلیزەکان مەبەستە ڕاستیەکانی خۆیان بە ڕاشکاوی پێدەوت, ئەو پەی بە نێوەڕۆکی مەبستەکانیان دەبرد, بەلاٌم تەنها مەبەستی هاوپەیمانان کە دیاریان کردبوو دەرکردنی ئەلٌمانەکانی نێو ئێران بووە و ئەمەشیان چەندین جار دووبارە کردۆتەوە, هاوپەیمانان دەیانزانی کە باوکم لەم بارەیەوە زۆر هەستیارە, باوەڕیشم وایە کە یاداشتەکانی ئەوان بیٚ ڕیاکاری نەبوو, مەبەستی سەرەکیان لەباتی سازش کردن و جێبەجێکردنی فەرمانی ئەوان, هەبوونی بیانویەك بوو بۆ داگیر کردنی خاکی ئێران.

ڕەزاشا سەرەنجام تێگەیشت کە هاوپەیمانان مەبەستی خۆیان بە ڕاشکاوی ناخەنە بەردەست, وە لە ناکاو و بە پێچەوانەی پێگە و کاروباری سەلٌتەنەتیەوە لە لەندەنەوە داوایان لە بالٌوێزەکانیان کرد کە مەبەستی سەرەکی و پێداویستیەکانی هاوپەیمانان بخاتە ڕوو, بەلاٌم چیدی کار لە کار ترازابوو, باوکم بالٌوێزی ئەوکاتی ئەلٌمانی لە تاران ئاگادار کردەوە کە دەولٌەتی ئێران بڕیاری داوە کە ئەو ئەلٌمانیانەی کە لە ئێرانن لە ولاٌتەکەی دەربکات, ئامادەکاریەکانی دەرچوونی ئەوانیش لە ڕێگەی تورکیاوە فەراهەم هێنراوە, بەلاٌم جێبەجێکردنی ئەم هەنگاوە هاوکات بوو لەگەلٌ چالاکی شێتانەی هێزەکانی هاوپەیمانان بەرەو ئێران.

هاوپەیمانەکان نەك دەبوو لەگەلٌ باوکمدا بەڕاستگۆیانەو ڕاشکاوانە ڕەفتاریان بکردایە, بەلٌکو دەبوو پێشنیاری هاوپەیمانێتیەکی ڕێزدارانەیان پیٚ بدایا, لەوانەیە هەندیٚ کەس ئەم بۆچونە بەرپەرچ بدەنەوە و بلٌێن بیروباوەڕی سیاسی ڕەزاشا ڕێگری بەردەم وەها هاوپەیمانیەك بوو, بەلاٌم لەسەر هاوپەیمانان پێویست بوو پێش ئەوەی کە دە ست درێژی بکەنە سەر ماف و سەربەخۆیی ولاٌتەکەمان, بەلایەنی کەمەوە لەم بارەیەوە هەولٌێکیان بدایە و دلٌنیاشم کە ڕەزاشا یان بە پێشنیارەکەی هاوپەیمانان ڕازی دەبوو یان تەخت و تاجی دەسپارد بە من و ڕێگەی دەدا کە ئەو کارە بەدەستی من ئەنجام بدرێت.

لێرەدا بابەتێك ئاشکرا دەکەم لەوانەیە تا ئێستا هیچ کەس ئاگای لەوە نەبێت, ئەویش ئەوەیە کە باوکم چەند سالێك لەوە و پێش بە نیاز بوو کە دەست لەکار بکێشێتەوە و سەلٌتەنەت بۆ من بەجیٚ بهێلٌێت, هەلٌبەتە ئەو هیچکات لەم بارەیەوە

لەگەڵ من دا قسەی نەکردبوو, بەڵام دواتر یەکێك لە نهێنی پارێز و ڕاوێژکارەکانی لەو بارەیەوە منی ئاگادار کردەوە, ئەو بە نیاز بوو سەڵتەنەتداری بسپێرێت بە من و خۆیشی بە ناونیشانی سیاسەتمەداری شارەزا و ڕێ پیشاندەر, لەکاتی پێویستدا ئاگادارم بکاتەوە لە کارەکاندا و لە ئەزموونەکەی خۆی سودم پێ بگەیەنێت, بەڵام ڕازی بوون بەمەش هێشتا لای منیش جێی باوەڕ نیە, چونکە بۆ شاهنشایەك بەو دەسەڵاتەوە بە دوور دەزانرێت, کە لەگەڵ تەواوی ئەم بارودۆخەشدا بە بۆچونی من ئەو خەیاڵی وابوو کە لە نزیکەی ساڵی ١٩٤٠ز (١٣١٨-١٣١٩هەتاوی) یان کەمێك دواتر واز لە پۆستی سەڵتەنەتی بهێنێت.

من ناڵێم کە هاوپەیمانان دەبوو بەبۆچونی باوکم بووەستانایە, وتەی من ئەوەیە کە هاوپەیمانان پێش ئەوەی کە هیتلەر ئاسا هێرشیان بکەنە سەر خاکی ئێران, لەبەر هەمان ئەو قایمکاریانەی کە بۆ بردنەوەی ئەو جەنگە دەیانکرد دەبوو ئەوەشیان بکردایە, وە پێویست بوو لە سەریان کە هاوکارییان بکردایەو هاوپەیمانێتیەکی ڕێزدارانەیان لەگەڵ ڕەزاشادا پێکبهێنایە, بە هەرحاڵ لەبەرئەوەی کە چەند مانگێك دواتر ئەم یەکیەتیە دروست بوو, واباشتر بوو لە پێش ئەو ڕوداوە وە ئەم یەکێەتیە دروست کرابا بۆ ئەوەی خوێن نەڕژایا و لە نێوان خەڵکانی وڵاتەکەی من و ڕوس و ئینگلیزەکان رق و قین دروست نەبووایە.

با لەوە گەڕێین, هەرکاتێك کە هاوپەیمانان نیگەران بوون لە هاتنی هێزی ئەڵمانی بۆ ئێران, بۆچی بە هۆی پەیمانی یەکیەتی سەربازی یان سیاسی داوای هاوکاری سەربازیان لە ئێمە نەکرد؟ پێدەچێت هەندێك وا بیر بکەنەوە کە ئارەزو مەند بوونی ڕەزاشا بۆ بێلایەنی تەواوی ئێران لەو جەنگەدا, داواکاریەکی وەها هیچ ڕەواییەکی تێدا نیە, وەڵامی من لەم بارەیەوە ئەوەیە کە باوکم کەسێکی تێگەیشتو بە ویژدان بووە, گەشەسەندن و خۆشبەختی وڵات و خۆشگوزەرانی خەڵکی ئێرانی لە هەموشتێك لا گرنگتر بوو, ئەگەر هاوپەیمانان لە قسەی پشتی پەردە خۆیان ببووارادایە و بارودۆخی ڕاستەقینەی جوڵاندنی سوپایان بە ڕەچاو کردنی بەرژەوەندیەکانی ئێران بۆ ڕەزاشا ڕون بکردایەتەوە, بە بێ دوودڵی ئاگای لە کارەکانی ئەوان بووایە, هێشتا باوەڕی من ئەوەیە کە باوکم یان پێشنیاری هاوپەیمانانی پەسەند دەکرد یان ئەوەی کە خۆی دەستی لە کار دەکێشایەوە و

ئەنجامدانی ئەو کارەی دەخستە ئەستۆی من, ئیدی هاوپەیمانانیش پێویست نەبوو ئەو سوپایەی کە لە شوێنی دیکەدا پێویستیان پێی بوو بیگوازنەوە بۆ ئێران, وە ئێمەش دەستەوسان بین لە بەرامبەر ئەو هەرکەسەو بۆ خۆیەی کە بە هۆی داگیر کردنی ولاَتەوە پەیدا بووبوو, وە ئێمەش زوتر بەشداری ئەو نەبەردیە گشتیانەمان دەکرد دژی ستەمکاریەکانی هیتلەر).[1]

بەو شێوەیەی کە تێبینی کرا, محەمەدڕەزاشا لە نوسینەکەیدا بچوکترین ئاماژەی بە بیرو بۆچونەکانی خۆی لە بارەی ئەڵمانەکان و سیاسەتی داگیرکارانەی هیتلەر تا پێش شەهریوەری ۱۳۲۰هەتاوی و هێرشی هێزەکانی ڕوس و ئینگلیز بۆ سەر ئێران ناکات, تەنها دەڵێت کە ئەگەر هاوپەیمانان پێشنیاری یەکیەتی سەربازی و سیاسیان بۆ ئێمە بکردایە, (یان باوکم بە پێشنیاری هاوپەیمانان ڕازی دەبوو یان دەستی لە کار دەکێشایەوە و ئەو کارەی بەمن دەسپارد..) بەم شێوەیەش (ئیمەش زوتر بەشداری ئەو نەبەردیە گشتیانەمان دەکرد دژی ستەمکاریەکانی هیتلەر), بەلاَم فیردۆست لە یاداشتەکەی خۆیدا بانگەشەی ئەوە دەکات کە محەمەدڕەزا لە سەردەمی جێنشینی بوونیدا و پێش گەیشتن بە سەڵتەنەتداری, بە توندی لایەنگری هیتلەر بوو, لە بارەی چاوپێکەوتنی لەگەڵ سەرۆکی ئیتلاعاتی باڵوێزخانەی ئینگلیز لە تاراندا, بەناوی (مستەر ترات) کە نزیکەی ناوەڕاستی مانگی شەهریوەری ۱۳۲۰هەتاوی دا ئەنجامی دابوو, دەنووسێت: (ترات هەندێك قسەی کردو وتی کە: محەمەدڕەزا لایەنگری توندی ئەڵمانەکانە, ئێمە لە ناخی کۆشکەوە ئاگاداری ورد و بەڵگەی ڕاستمان لە بەر دەستدایە کە ئەو هەمیشە بە زمانەکانی ئینگلیزی و فەڕەنسی وفارسی گوێ بۆ ئەو ڕادیۆیانە دەگرێت کە تایبەتن بە جەنگەوە, نەخشەیەکی هەیە کە خوودی تۆش پێشڕەویەکانی ئەڵمانەکان لە بەرەکانی جەنگدا بە دەرزی دیاری دەکەیت..! من گەڕامەوە بۆ سەعدئاباد و ڕوداوەکەم بۆ محەمەدڕەزا گێڕایەوە, ئەو توشی شۆك بوو وە سەری سوڕما لەوەی کە لە کوێ دەزانن کە من گوێ لە ڕادیۆ دەگرم و نەخشەم هەیەو... هتد, منیش وتم بەڵێ ئەی ئەگەر ئەوانە نەزانن سودیان چیە؟ محەمەدڕەزا ووتی: (سبەی سەرەتای کار پەیوەندی بە ترات ەوە بکەو کاتی

[1] ماموریت برای وطنم, ص ۹۰-۹۲.

چاو پێکەوتنی لەگەڵدا دیاری بکەو پێی بڵێ کە هەمان شەو قسەم لەگەڵ محەمەدڕەزادا کردووەو وتویەتی: نەخشەکە لەناو دەبەم و چیدی گوێ بۆ ڕادیۆ ناگرم، مەگەر ئەو ڕادیۆیانەی کە خۆیان ڕێگە بدەن گوێیان بۆ بگرم).[1]

دواتر فیرۆست درێژەی دەداتێ کە محەمەدڕەزا هەمان شەو نەخشەکەی لە ژورەکەی خۆیدا لابردووە و گوێشی لە ڕادیۆ بیانیەکان نەدەگرت، و ئەوەشی بەباشی دەگەیاندە مستەر ترات، فیردۆست زیاتر ڕونی ناکاتەوە کە کێ هەواڵی نەخشەو گوێ گرتن لە ڕادیۆی شازادەی جێنشینی داوە بە ئینگلیزەکان..!!!.

دەربارەی ڕوداوەکانی شەهریوەری (١٣٢٠هەتاوی) و هێرشی هێزەکانی ئینگلیز و سۆڤیەت بۆ سەر ئێران، کە بە دەست لەکار کێشانەوەی ڕەزاشا لە سەڵتەنەتداری کۆتایی پێ هات و ڕۆژی (٢٥ی شەهریوەری ١٣٢٠هەتاوی) فەروغی دوای خوێندنەوەی دەقی بەیاننامەی دەست لەکار کێشانەوەی ڕەزاشا لە پەرلەماندا وتی: شازادەی جێنشینی دیاریکراو کاروبارەکان و پۆستی سەڵتەنەت دەگرێتە ئەستۆ، سبەی واتە (٢٦ی شەهریوەر) لە پەرلەماندا سوێندی یاسایی دەخوات، دواتر فەروغی لەلای خۆیەوە وتاریکی دەربارەی بۆچونی شای لاو پێشکەشکرد کە جەختکردنەوە بوو لە ڕیزگرتنی دەستور و بەدوادا چون بۆ ئەو سکاڵاو ستەمانەی کە لە ڕابردوو دا دەرهەق بە خەڵك کراون، کە دواتر هەمان بابەتی لە وتەکانی دەست پێکردنی محەمەدڕەزاشا دا سازاند، لە ڕاستیدا هەم دەقی وتاری دەست لەکار کێشانەوەکەی ڕەزاشا و هەمیش وتەکانی دەستپێکردنی محەمەدڕەزاشا دوای سوێند خواردنی یاسایی بە قەڵەمی خودی (محەمەدعەلی فەروغی) نوسرابوو.

دەربارەی ڕوداوی ئاینی سوێند خواردن و هۆکاری ئامادە نەبوونی شاندی نوێنەرانی سیاسی بیانی لەم ڕێوڕەسمەدا (اطلاعات در یکربع قرن) بەم شێوەیە دەنووسێت: (ڕۆژی ٢٦ی شەهریوەر، کاتژمێر ٤,٣٠ی دوای نیوەڕۆ، جەنابی ڕێزدار خاوەن شکۆ لە کەرنەڤاڵێکی فەرمیدا لە تەلاری پەرلەمان سوێندی یاسایی خوارد و واژۆی کرد، وە دواتر وتارێکی دا، کە جەختکردنەوە بوو لەسەر سەرنجدان لە بنەماکانی مەشروتیەت و لێك جودا کردنەوەی هێزەکان و پێویستی هاوکاری

---

[1] خاطرات فردووست، ص١٠١.

بەردەوامی نێوان دەوڵەت و پەرلەمان و گرنگی دان بە جێبەجێکردنی وردی یاسا و بەدەست خستنی سەربەخۆیی دادگا و چاکسازی تایبەت بە بوواری کۆمەلأیەتی و دارایی و ئابووری و هەموار کردنەوەی بڕیار و یاساکان بە جۆرێك کە لە ئاست پێویستیەکانی ئەمڕۆدابن, لە کۆتایدا وتی: (گرنگی تەواو بە کردار دەدەم کە بە هاوکاری نزیك و دۆستانە لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی کە بەرژەوەندیەکانمان پەیوەندیەکی تایبەتی بە بەرژەوەندیەکانی ئەوانەوە هەیە, ئەو کێشانەی کە بۆمان دروست بووە چارەسەر بکرێن).

لە مەراسیمی سوێند خواردندا بیانیەکان بەشداریان نەکرد, هۆکاری ئەوەش ئەوە بوو کە نوێنەرەکانی ئینگلیز و سۆڤیەت بە هۆی ئاینی سوێند خواردنەکەوە داوای مۆڵەتیان لە لەندەن و مۆسکۆ کرد بۆ بەشداریکردنیان, دەوڵەتی ئێرانیش سور بوو لەسەر ئەوەی کە دەست بەجێ دوای ڕۆیشتنی ڕەزاشا ڕێوڕەسمی سوێند خواردنی محەمەدڕەزاشا ئەنجام بدرێت, هەر بۆیە ناچار بوون داوای لێبووردن بکەن لە سەرجەم نوێنەرانی ولأتانی بیانی بۆ ئەوەی نەزانرێت کە ولأتانی سۆڤیەت و ئینگلیز بەشدارییان نەکردووە, ئەم ڕووداوە بوویە هۆی ورتەورتێکی زۆرو خەڵکی نیگەران کردبوو, بەلأم دوای ئەوەی کە ڕێوڕەسمەکە بە باشی ئەنجام درا لە ڕێوڕەسمی دواتر کە تایبەت بوو بە بەیەکگەیشتن و یەکتر ناسین ئامادە بوون.

شای نوێی ئێران لە نێو ئاپۆرایەکی بێوێنەی چەندین هەزار کەسی کە لە حەوشەی کۆشکی شاهانەدا بوون و چەپڵەیان لێدەداو هوتافیان دەکێشا پێشوازی لێکرا, لەکاتی گەڕانەوەدا قەرەباڵخی بەردەم کۆشکی شاهانە بە شێوەیەك بوو کە حەمەڕەزاشا ناچار بوو بێتە هەیوانی کۆشك و بە ئیشارەتی دەستو سەر سوپاسی ئامادەبووان بکات, ئەم پێشهاتە سروشتیەش هەمو ئەو بانگەشانەی کە بووبوونە هۆی ترس و دڵەڕاوکێی خەڵك پوچەڵکردەوە, لەبەرئەوە پێش ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی سوێند خواردن هیچکەس بڕوای نەدەکرد کە ئەم ڕوداوە ئابەو شێوەیە و بە سادەیی کۆتایی پێ بێت, لەوانە بوو ڕوداوی چاوەڕواننەکراو ڕوبدات, تەنانەت ئەوش بلأو

بووبوویەوە کە لەبەرئەوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکان ڕازی نابن ئەم ڕێوڕەسمە ئەنجام نادرێت.[1]

ڕاستی ئەم ڕوداوەش ئەوەیە کە لە ئەستۆگرتنی تاج و تەختی ئێران, تەنانەت دوای سوێند خواردنی محەمەدڕەزاشایش بە تەواوی ڕون نەبوو, وە ئەم هەمو پەلەپەلیەی فەڕغیش بۆ ئەنجامدانی ئەم ڕێوڕەسمە بۆ ئەوە بوو کە وڵاتانی داگیرکەریش ڕوبەڕوی کارێکی ئەنجامدراو بکاتەوە, هەڵبەتە ئەم پرسە لەگەڵ ئینگلیزەکاندا چارەسەرکرابوو وە دڵگرانی فەروغی زیاتر لە کاروبارەکانی ڕوسەکان بوو, کە هێشتا تێبینیان لە مانەوەی ڕژێمی سەڵتەنەتی ئێران هەبوو, بەم شێوەیە محەمەدڕەزاشا لە ڕۆژی یەکەمەوە لەسەر تەختێکی لەرزۆك دانیشت, کە هەتا چەند ساڵێکی دواتریش پێگەی خۆی بەهێز نەکردبوو.

** ** **

ڕەخنەو هێرش بۆ سەر ڕەزاشا لە هەمان یەکەم ڕۆژی سەڵتەنەتی کوڕەکەیەوە دەستی پێکرد, محەمەدڕەزاشایش لەو هێرش و ڕەخنانە بێبەش نەبوو, پێویستە ئەوە بە بیر بهێنینەوە کە هەڵبژاردنی خولی سیازدەیەم لە (هاوینی ساڵی ۱۳۲۰هەتاوی) دا ئەنجام درابوو, کە زۆرینەی پەرلەمانتارانی خولی دوازدەیەم (کە ماوەی یاسایی ئەو خولە ۹ی ئابانی ۱۳۲۰هەتاوی تەواو بووبوو), لە دواین هەڵبژاردنی سەردەمی ڕەزاشا دا دوبارە هەڵبژێردرابوونەوە بۆ خولی سیازدەیەمی پەرلەمان و لە دووبارە هەڵبژاردنەوەشیان نیگەران نەبوون, وە تەنها نیگەرانیان ئەوە بوو کە ناڕەزایی لەبارەی چۆنیەتی هەڵبژارنی خولی سیازدەی پەرلەمانەوە بوو کە گومانی هەڵوەشاندنەوەی ئەو خولەی پەرلەمانی لێدەکرا, بۆ نەهێشتنی ئەم مەترسیە و ڕزگار کردنی خولی سیازدە لە هەڵوەشاندنەوە, پەرلەمانتارانی خولی سیازدە کە لە خولی دوازدەشدا بوون, ڕوبەڕوی ئەوانە بوونەوە کە ڕەخنەیان لە کارەکانی ڕەزاشا دەگرت و بەم شێوەیە ڕێگریان کرد لە پوچەڵکردنەوەی هەڵبژاردنەکانی خولی سیازدەیەمی پەرلەمان...!.

---

[1] اطلاعات در یك ربع قرن, ص۱۹۶-۱۹۷.

بەپێی ئامادەکاری پێشو, دوای ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی سوێند خواردنی شای نوێ, دەوڵەت دەستی لەکار کێشایەوە بۆ ئەوەی شای نوێ دەستی کراوەبێت لە دیاریکردن و هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیردا, شتێکی ئاساییە کە فەڕوغی دەست بەجێ ڕاسپێردرا بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ, وە دەوڵەتە نوێیەکەش بە ئەنجامدانی هەندێك گۆڕانکاری لە دەوڵەتی پێشودا پێکهێنرا, لە دەوڵەتی نوێشدا دوو وەزارەتی تازە پێکهێنران کە بریتی بوون لە وەزارەتەکانی (چاکسازی و کشتوکاڵ), گرنگترین گۆڕانکاریش لە دەوڵەتدا دیاری کردنی دوکتۆر نەفیسی بوو بۆ وەزیری دارایی, فەروغی پێش ناساندنی کابینە نوێیەکەی بە پەڕلەمان, بۆ ڕاکێشانی سەرنجی گشتی و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی بەریتانی و ڕوسەکان چەند هەنگاوێکی دیکەی هەڵهێنا, وەك دەرکردنی بڕیاری لێبووردنی گشتی و ئازاد کردنی زیندانیانی سیاسی لە ڕۆژی ٢٨ی شەهریوەر و گۆڕینی هەندێك لە پلەدارەکانی لەشکری و دەوڵەتی وەك: سەرۆکی شارەوانی.

هەنگاوەکانی دیکەی فەڕوغی بۆ ڕاکێشانی ڕای گشتی بەلای خۆیداو بەستنی دەمی ئەو پەڕلەمانتارانەی کە بۆ خۆدەرخستنیان ڕەخنەیان دەگرت, محەمەدڕەزا شای نوێی ئێرانی هاندا بۆ ئەوەی کە موڵك و سەروەت و سامانی کە لە باوکیەوە بۆی مابوویەوە پێشکەشی دەوڵەت بکات, ڕەزاشا زیاتر لە (٥٠٠٠) موڵك و (٦٨)ملیۆن تمەنی نەقدی لە حسابی تایبەتی بانکی میلی دا هەبوو کە بە هۆی ڕێککەوتنێکەوە لە ئەسفەهان واژۆ کرابوو ئەوانەی دابوو بە محەمەدی کوڕی, فەڕوغیش دەیویست سەرجەمی ئەو ماڵ و موڵکە بگەڕێتەوە بۆ دەوڵەت, شوشەی تەمەنی سەڵتەنەتی بنەماڵەی پەهلەوی لەو ڕۆژە قەیراناویانەدا لە دەستی لەرزۆکی فەڕوغیدا بوو, شاهنشای نوێش بۆ ئەوەی کە لە سەڵتەنەتدا بمێنێتەوە هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو جگە لەوەی کە هەرچی فەرغی پێشنیاری دەکرد واژۆی بکات, لە دواین ڕۆژەکانی مانگی شەهریوەردا محەمەدڕەزاشا ئەو (بەخشین نامە)یەی واژۆ کرد کە نوسینی دەقەکەی و پاشان خوێندنەوەشی هەر لەلایەن فەڕوغیەوە بوو, ئەمەش دەقەکەیەتی:

*بەڕێز جەنابی سەرۆك وەزیران.*

*لەبەرئەوەی مەبەستی سەرەکی جەنابی خاوەن شکۆ و باوکی بەڕێزمان لە گواستنەوەی موڵك و ماڵی خۆی بۆ ئێمە ئەوەبوو کە لە پڕۆژەی خەیری دا*

*خەرج بکرێت, وە ئێمەش هەمیشە هەوڵمان داوە و بەردەوامیش لە هەوڵدا دەبین کە هۆکارەکانی ئاسایش و خۆشگوزەرانیی گشتی بە هەر شێوەیەك بێت فەراهەم بێنین, لەبەر ئەوە بڕیارمان دا سەرجەم ئەو ماڵو موڵکەی کە بە ئێمە گەیشتووە, بە مەبەستی پێشکەوتنی کشتوکاڵ و باشتر کردنی ڕەوشی جوتیاران و گەشەسەندنی شارەکان و پێشخستنی پیشەسازی وڵات و چاککردنی گوزەرانی کرێکارەکان و بەرەو پێشبردنی فەرهەنگ و چاکسازی, پێشکەش بە میللەت و دەوڵەتی بکەین, تا بە پێی یاسا و بۆ ئەنجامدانی کارو مەبەستە سەرەکییەکان ئەو موڵکە بفرۆشن یان بیپارێزن و بۆ مەبەستی ئاوەدانی وەك موڵکی دەوڵەت بەکاری بهێنن, وە بڕیاریش دەدەین کە ئەگەر کەسانێك هەبن سکاڵایان لە سەر ئەو موڵکانە هەبێت, دوای بەدوادا چونی سکاڵاکانیان بڕیاریاری گونجاویان لە بارەوە دەدرێت.*

بە پێشکەشکردنی ئەم پێشەکیە و سەرنج دان بەوەی کە سەرجەم یان زۆربەی پەرلەمانتارەکان هەڵبژێردراوی سەردەمی ڕەزاشان و وابەستەی ئەون, فەروغی وا گومانی دەبرد کە ڕوبەڕوی دژایەتی نابێتەوە و ئەگەریش قسانێك بکرێت لە بارەی کارەگشتیەکانەوە دەبێت و ڕەخنەکانیش زارەکین, لەڕۆژی ناساندنی کابینەکەیدا بە پەرلەمان, فەڕوغی بە هۆی نەخۆشیەوە ئامادە نەبوو (ئاهی) وەزیری داد بە ڕاسپێردراوی سەرۆك وەزیر کابینەکەی بە پەرلەمان ناساند, دوای ناساندنی کابینەکە, پەرلەمانتار (عەلی دەشتی) کە لە سەرسەخت ترین لایەنگرانی ڕەزاشا بوو لە پێش سەڵتەنەتداری و دوای سەڵتەنەتەکەیشیدا, وەك ناڕازیەك دەستی بە قسان کرد و دوای ئەوەی ووتی: (ڕەوشی جەنابی فەڕوغی و ئەو میزاجە ناجێگریەی, کە تەنانەت ناتوانێت بۆ ناساندنی کابینەکەشی بێتە پەرلەمان, ناتەبایە لەگەڵ ئەو ڕەوشە قەیراناوییەی کە دووچاریوڵات بووەتەوە), وە دواتریش هەندێك ڕەخنەی لە بەرنامەی کاری دەوڵەت گرت و درێژەی بە وتەکانیدا و ووتی: (لەو بڕیارەی کە دوێنێ بیستومە کە گوایا خاوەن شکۆ شاهنشای دەستلەکار کێشاوە دەڕوات و بڕیارنامەکەشی واژۆ کراوە, هەر لە سەرەتاوە کە جەنابی فەڕوغی دەقی یاداشتی دەستلەکار کێشانەوەکەی خاوەن شکۆی هێنایە پەرلەمان, هەم لە دانیشتنە تایبەتی و هەمیش لە دانیشتنی گشتیدا ئەوەم ڕاگەیاندبوو کە دەبێت لە بارەی

یەکلایکردنەوەی حساباتی ڕابردووەوە لێپرسینەوەی لەگەڵدا ئەنجام بدرێت, وە هەندێك لە پەرلەمانتارە بەرێزەکانیش چونە خزمەتی جەنابی سەرۆکی پەرلەمان و لەو بارەیەوە گفتوگۆیان لەگەڵدا ئەنجامدا, دواتر بڕیار درا لیژنەیەك لە پەرلەمان پێکبهێنرێت, بەندە تەنها ئەو پرسیارە لە دەولەت دەکەم کە ئایا ئەم لیژنەیەی کەلە پەرلەماندا پێکهێنراوە, کە نوێنەری دەوڵەتیشی تێدا دەبێت, ئەگەر ئاشکرایکرد کە هەندێك لە لە جەواهیراتەکانی سەڵتەنەتی دیار نیە, ئایا دەوڵەت لێپرسراویەتی ئەم کارە دەگرێتە ئەستۆ, وە ئایا دەوڵەت و جەنابی فەرۆغی و سەرجەم وەزیرە بەرێزەکان و جەنابی وەزیری دارایش بەڵێن دەدەن کە وەڵامی دیار نەمانی ئەو جەواهیراتانە بدەنەوە یان نا....؟

یەکێك لەو پرسانەی کە دەبێت دەوڵەت لە بەرنامەی کاری خۆیدا ئاماژەی پێبدات پرسی پاراستنی موڵکی خەڵکە لە ئێراندا, کە پرسێکی زۆر گرنگە, مافی موڵکداری یەکێکە لە ڕەواترین و کۆنترین مافەکانی کۆمەڵگەی شارستانی مرۆیی کە هەمیشە مایەی تێڕامانی گشتی بووە, وە سەرجەم دەوڵەتەکانی دوونیا بۆ ئەوە دروستکراون کە کە مافی خەڵکی بە فیڕۆنەڕوات, بەڵام لە ماوەی ئەم ٢٠) ساڵەدا بە شێوەیەك بە هەدەر دراوە کە سنورێکی بۆ دیاری ناکرێت, ڕاستە خاوەن شکۆی دەستلەکار کێشراوە سەرجەم موڵکەکانی خۆیی داوەتە جەنابی محەمەدڕەزاشای کوڕی, ئەویش ئەو موڵکانەی پێشکەشی دەوڵەت کردووە بۆ ئەوەی کە مافی خوراوی خەڵکی قەرەبوو بکرێتەوە, بەڵام دەوڵەت لەم بارەیەوە بە جۆرێك ڕونکردنەوەی داوە کە خەڵکی دڵنیا نەکردووەتەوە, هەڵبەتە دەبێت دەوڵەت لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە و بەڕونی کێشەی موڵکەکانی خەڵك دیاری بکات, بەڵام دەوڵەت بەوە وازی هێناوە کە ئەگەر کەسێك زیانی بەرکەوتوە قەرەبوو دەکرێتەوە, ئەم خەیاڵانە چیە؟ موڵکی خەڵکی بەزۆر لێیان زەوتکراوە و دەبێت بۆیان بگەڕێنرێتەوە.

لەم بابەتەشدا داواکاریەکی زۆر گرنگتر هەیە ئەویش ئەوەیە کە شا تەواوی پارەو موڵکە کانی بەخشیوە بەڵام لە پەرلەماندا دەوڵەت تەنها باسی موڵکەکانی کردووە, ئەو بڕیارەی کە بەندە بیستومە و لە نێو خەڵکیشدا بڵاوە کە جەنابی ڕەزاشا حەفتا هەشتا ملیۆن تمەنی دانراوی هەیە, بەڵام نزیکەی (٢٤) ملیون تمەن دراوە بە

خاوەن شکۆ شای ئێستا، باشترین حکومەت ئەو حکومەتەیە کە بتوانێت دادپەروەری جێبەجێ بکات، ئەو پارانەی کە لە دەرەوەی ئێرانن چیان بەسەر دێت؟ خۆ بانکەکانی ئەمریکا و لەندەن و ئەڵمان بەم بەخشین نامەیە پارە نادەن بە ئێوە.!).

عەلی دەشتی دواتر ئاماژەی بە بابەتی لێبووردنی گشتی بۆ زیندانیانی سیاسی کردوو وتی: (دوو ڕۆژ لەمەو پێش یەکێك لە هاوڕێیان باسی ئەوەی دەکرد کە هێشتا جەنابی دوکتۆر موسەدەق لە گوندەکەی خۆیدا ڕاگیراوە و دەست بەسەرە، ئەم ڕەوشە لەگەڵ ڕابردوودا چ جیاوازییەکی هەیە؟ هەر ئەمڕۆ نیوەڕۆ کە لە پەرلەمان دەڕۆشتینەوە بینیم کە لە بەردەم سندووقەکانی پۆستدا دوو پۆلیسیان بۆ دڵنیای داناوە، بەڕێزان ئێوە نەچونەتە زیندان، وە دەستی بێڕەحمی ستەمکار بە سەرتانەوە نەبووە، نازانن کە ئەو بەرکەوتە و بێچارەی و نارەحەتیەی کە مرۆڤ لە زینداندا دووچاری دەبێت چیە؟ ئازادی پیرۆزترین و ڕەواترین مافی مرۆڤەکانە، تەنانەت لە مافی موڵکداری بەڕێز ترو کاریگەرترە، بەدەلیلی ئەوەی کە خەڵکانێکیان زیندانی دەکرد و موڵکەکەشیان دەبرد، ئێمە لێشاوێك زیندانی جۆراوجۆرمان هەبوو، زیندانی هەبوو کە هەرگیز دادگایی نەکرابوو، وە چەند کەسێکیشمان هەبوو کەماوەی زیندانیەکەیان تەواوکردبوو بەڵام ئازاد نەکرابوون و سەرەنجام لە زینداندا مردن....)[1].

ئەمە تەنها بەشێك بوو لە وتەکانی عەلی دەشتی لە دانیشتنی (١ی میهری ١٣٢٠هەتاوی) پەرلەماندا، کە بەشێکی زۆری پەرلەمانتارانی پێشوی وابەستەی ڕەزاشا بە هاوار کردنی (ڕاستە، زۆرباشە) لایەنگری دەشتی یان دەکرد، یەکێك لە دەرەنجامەکانی ئەم وتەیە ئەوە بوو کە محەمەدڕەزاشا ناچار بوو کە (٦٨) ملیۆن تمەن پارەی نەقد و ئامادەی باوکی لە بانکی میللی دا بدات بە دەوڵەت، دوکتۆر سەجادی وەزیریڕێگەوبانی کابینەکەی فەروغی کە پێشتریش ڕاسپێردرابوو بە وەرگرتنی ڕێکەوتن نامەیەك لە ڕەزاشا، ئەم کارەشی پێ سپێردراو ئەنجامی دا، دوکتۆر سەجادی لە یاداشتەکەی خۆیدا لەبارەی ئەم بابەتەوە دەنووسێت: (باش لە بیرمە کە هەتا کاتژمێر یەکی دوای نیوەشەوی ٢ی میهری ١٣٢٠هەتاوی، لەگەڵ

---

[1] مذاکرات مجلس شورای ملی: جلسه سه شنبه، ١ میهر ١٣٢٠.

ئاغای ئینتیزام (سەرۆکی پێشوازیەکانی سەڵتەنەتی) لە خزمەتی خاوەن شکۆ حەمەڕەزاشا دا بووین, سەرەنجام (٦٨٠) ملیۆن ڕیاڵ تمەنمان دیاری کرد و دابەشمان کرد بەسەر تاران و شارەکانی دیکەدا بۆ دروستکردنی قوتابخانە و خوێندنگە و نەخۆشخانە و....هتد, بەڵام بەداخەوە نزیکەی (٥٠) ملیۆن ڕیاڵ تمەن کە بۆ ئازەربایجان دانرابوو بە زۆری هەرزە خۆر کرا و کەمتر لە (٦٠٠) هەزار تمەنی ئەو برە پارەیە خەرجکرا, خودی خۆم لە کاتی پارێزگاری ئازەربایجاندا بەسەر سوڕمانەوە لە سەر ئەم ڕوداوە ڕاوەستام و داخم هەڵکێشا بۆ ئەوەی کە لە وڵاتێکدا دەژین کە دزەکانی کۆمەڵگە, تەنانەت لە دیاری و پارەو بەخشینەکانی شایش خۆیان نابوێرن, وە ئەو پارەیەی کە بۆ دامەزراوە فەرهەنگی و خەیریەکان دیاریکراوە دەخورێن و هیچ کەسیش نیە کە ئەم گروپە دزە ڕادەستی دادگا و یاسا بکات).[1]

** ** **

هێرش و ڕەخنە لە ڕەزاشا و دەورانی سەڵتەنەتی ڕۆژبەڕۆژ زیادی دەکردوو توندت ردەبوو, ڕۆژنامە تازە ئازادبووەکان لە قەیدوو سانسۆر و پەڕلەمانتارانیش پێکەوە چاودێری ئەو هێرشانە بوون کە دەکرانە سەر ڕەزاشای دەستلەکار کێشراوە, لە نێوان پەڕلەمانتاراندا هەروەکو عەلی دەشتی کە ماوەیەکی کەم لە سەردەمی ڕەزاشا دا زیندانی کرابوو بێوچان بوو لە هێرش کردنە سەر ڕەزاشا, هەرەکو لە دانیشتنی ڕۆژی ١٤ی میهری ١٣٢٠هەتاوی ی پەڕلەماندا ووتی: (نزیکەی ٢٠ ساڵ بوو کە حکومەتێك لەم مەملکەتەدا دەسەلاّتی هەبوو, ئەم حکومەتە چەندین کاری کرد... هێرشکردن بۆ سەر ئازادی نیشتەجێبوون, ئازادی تاکە کەس, ماڵو دارایی خەڵك, لەم ساڵانەی دوایدا برەوێکی زۆری سەندبوو, هەر لە ڕۆژانی سەرەتایی کە ڕایەخی ٢٠ ساڵە کۆکرایەوە لە نێو پەڕلەمانتاراندا دڵسۆزی و ئارەزویەکی بەهێزی کارکردنی نامۆ پەیدا بوو, من نامەوێ بە هاوکارانی خۆمدا هەڵبدەم, بەڵام دەبێت بە ویژدان بین, لە نێو پەڕلەمانتاراندا ئەو بیروباوەڕە هەبوو کە لە دانیشتنێکی فەرمی پەڕلەماندا دەست بە پێشنیارکردنی پڕۆژە یاسا بکەین, زیندانیەکان کە بە بێ پاساو گرفتار کراون ئازاد بکرێن, دەوڵەت ناچار بکەن کە موڵکی داگیرکراوی خەڵکی بداتەوە, وە

[1] نقل از سالنامە دنیا.

چەندین پڕۆژە یاسا لەم بارەیەشەوە ئامادە کرا کە بەداخەوە دانیشتنی فەرمی ئەنجام نەدرا, دەوڵەت خۆی دەستی بە هەندێك لەو چاکسازییانە کرد لە پێدانەوەی موڵکی خەڵك و لێبووردنی تاوانباران (زیندانیان).

بەلام دەوڵەت تا چەند لە ئەنجامدانی ئەم کارانەدا تاچەند ڕاستگۆ و ئامادە بووە؟ لە ڕۆژنامەی (اطلاعات) دووجار نوسیویانە کە ڕەزاشا لە دەرەوە پارەی نیە وە لەگەڵ خۆشیدا هیچی نەبردووەتە دەرەوە, بەندە ئەو ڕۆژەی کە بەرنامەی دەوڵەت پێشنیار کرا پرسیارم کرد, ئەگەر هەرکاتێك شتێك لە شتە بەنرخەکانی وڵات برابوویە دەرەوەی وڵات و ئاشکرا بوو, ئایا دەوڵەت و ئاغای فەڕوغی بەرپرسیارێتی ئەو کارە دەگرنە ئەستۆ؟ لە هەشت نۆ کەس لە وەزیرەکان کە ئامادە بوون هیچکامیان وەڵامیان نەدایەوە, ئێستا کار لەوە خراپتر بووە, ئاغای فەڕوغی لە دانیشتنێکی تایبەتیدا وتی کە: دوای ڕۆیشتنی ڕەزاشای دەستلەکار کێشاوە لە ئەسفەهانەوە بۆ بەندەر عەباس لەلایەن لێپرسراوانی گومرگەوە لێکۆڵینەوە لە پێداویستە تایبەتەکانی کراوە و پشکنراوە کە ئەم کارەش لە پەرلەماندا ڕێکخراوە, ئەگەر تەنها تۆزێك گوێ بدەین بە دین و ویژدان, دەبێت بوترێت کە ئەم قسەیە زۆر پێکەنیناوییە, شای پێشو لە ئەسفەهاندا بە جۆرێك ڕەفتاری دەکرد کە تا دووری (٥٠٠) مەتریش بە دەوری ماڵەکەیدا ڕێگە بە کەس نەدەدرا کە تێپەڕ ببێت, لە ماوەی مانەوەی ڕەزاشا لە ئەسفەهاندا مسقاڵی ئاڵتون لە (٢٠) تمەنەوە گەیشتە (٤٥) تمەن, بەڕێزان ئێستا بە ویژدانەوە بڕیار بدەن کە چۆن کارمەندێکی موچە چل تمەنی گومرگی بەندەر عەباس دەوێرێت ڕەزاشا بپشکنێت؟ بۆچی دەبێت سەرۆکی دەوڵەت ئەو قسەیە بکات...؟

ئایا کارمەندانی بەندەرعەباس دەتوانن کەلوپەلە سەرەکیەکانی شا بپشکنن؟ لەو جانتایەی بکۆڵنەوە کە بەڵگەنامە گرنگەکانی پشکی نەوتی باشوری تێدایە و دەست لە کیفەکەی بدەن کە گوایا چوار پێنج پارچە زمروت و ئاڵتونی تێدایە؟ دوای دەستلەکار کێشانەوەی ڕەزاشا خەڵکی چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە کاروبارەکان بگەڕێنەوە بۆ ڕەوشی ئاسایی خۆیان و زەبروزەنگ بخرێتە لاوە, بەلام کارەکانی دەوڵەت بە جۆرێك گوماناویە کە خەڵکانی موڵك لەدەست چو هەرگیز دڵنیا نین........, تا ئێرە پێشەکی بوو, مەبەستی بنەڕەتی بەندە لە بارەی لێبووردنی تاوانبارانەوەیە, هەر پرسێك کە شا دەیبەخشێت شێخ عەلیخان نایبەخشێت و

ئەمەش بە تەواوی ئەمڕۆ پشت ڕاستکراوەتەوە, هەندێك لەو داماوانە هێشتا ئازاد نەکراون, تەنها ئەو کەسانەی کە (٨ تا ١٢) مانگیان ماوە ماوەی زیندانیان تەواو بکەن ئازاد کراون, بەڵام لە (٥٣) کەسی لەو شێوە (١١ تا٢٢) کەسیان لە زینداندان, ئەمانە زیندانیانی سیاسین و وەرن با بە پێی فەرمانی لێبووردنی گشتی ئازاد بکرێن.

ئیدی ئەو سیستمە ئابووریە هەڵەیەی کە دە دوازدە ساڵە خەڵکی بەرەو شکست و بەدبەختی بردووە لەم وڵاتەدا فەرمانڕەوا بووە, لە تەواوی ساتەکانی ژیانی کۆمەڵگەدا چەندین کاری هەڵەی فراوان هەیە, یەکێك لە فەرمانبەرانی ڕێگاوبان دەیگێڕایەوە دەیوت: دەبێت بۆ لابردنی هەر مەترێکی موکەعەبی خۆڵ لە کاتی چاك کردنی ڕێگاکاندا دەبێت پارە بدەیت بە فەرمانگەی تایبەتی تاپۆ, وە هەروەها بۆ ڕژاندنی هەمان مەتر موکەعەبی خۆڵەکە لە چەمەکاندا دەبێت دووبارە پارە بدەیتەوە...!, دەوڵەت دەبێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم بڕیارە هەڵەیە هەنگاو هەڵبگرێت, دەوڵەت نمونەیەکی نوسینێکی) ئەم بەخشین نامەیەی دروست کردووە, واتە دەیویست بە پێی ئەم نمونەیە موڵکە داگیرکراوەکان بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان, بەخشین نامەکە لە بارەی تەواوی پارەو موڵکە کانەوە بوو, بۆچی دەتانەوێت تەنها موڵکەکان بدەنەوە بە خاوەنەکانیان و لە بارەی پارەکانەوە هیچ ڕێگەیەکتان دیاری نەکردووە؟!).[1]

لەبەر زۆریان نوسینی وتارەکانی ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە لێرەدا ناکرێت, بەڵام تەنها هەندێك لە هۆنراوەی شاعیران کە لەو سەردەمەدا لە ڕۆژنامە و گۆڤارەمکاندا نوسراون ولەسەر زمانی خەڵك باو بوون دەخەینە ڕوو, دیارترین هۆنراوەش هۆنراوەیەکی دوکتۆر حەمیدی شیرازیە کە ڕو بە ڕەزاشا نوسیویەی و لێرەدا چەند بەیتێکی دەخەینە بەر دیدی خوێنەران:

شاه, ای شاه که وقتی رفتی و سلامت رفتی — خود بدین ملك نگه کن که چه زیروزبر است
این همه شورش و سرمستی و بیدادگری — ازتو دیوانه تر پرور بیدادگر است
شام تاریك بلا بوود شب شاهی تو — همه گفتند و نوشتند که گاه سحر است
شاه, ای شاه کنون دیدی قارون اسا — کان همه گنج تو امروز هبا و هدر است؟

[1] مذاکرات مجاس شورای ملی: جلسه یك شنبه ١٤ میهر ١٣٢٠.

شاه، ای شاه چو می رفتی با خود گفتی ناجوانمرد، امروز نه گاه سفر است؟

هۆنراوەیەکی دیکەش کە لە کتێبی (تاریخ بیست سالە)ی حسەینی مەکی دا چاپ کراوە، هۆنەرەکەی یەزدان بەخشی قارەمانە، کە لە وەڵامی وتارەکانی فەڕوغی کە زیاتر لایەنی پەند وئامۆژگاریە وتراوە:

اگر زنان شکم ادمی نباشد سیر حدیث و موعظة در وی نمی کند تاثیر

وطن بەباد فنا رفته است و هموطنان برهنه اند و پریشان، گرسنه اند و فقیر

برای ملت خود شعر خواجه می خواند غذای روح به ما می دهند نخست وزیر

بیا که صوفی ما ترك گوشه گیری کرد دووباره باز نموده است مکتب تزویر

چنان ریا و تظاهر نمود و شعبده کرد که پادشاه جوان شد مرید صوفی پیر

ریابس است و تظاهر بس است وخدعەبس است تو عارفی، نکند عارف این همه تقصیر

حسەینی مەکی دەنووسێت ئەم هۆنراوەیە بەر لەوەی کە لە گۆڤارەکاندا چاپ بکرێت کەوتە دەستی سادقی هیدایەت، ئەویش بردی بۆ ماڵی فەڕوغی و خستیە سندووقی پۆستەکەیەوە، ناوی شاعیرەکەی لە سەر نەنوسرابوو، فەڕوغی ئەو هۆنراوەیەی ئەوەندە بە سادە و ڕەوان و بەهێز کەوتە بەر چاو واهەستی کرد کە مەلیك شوعەرای بەهار نوسیویوتی، لەبەر ئەوە لە ڕێگەی عەلی ئەسغەر حیکمەتەوە نامەیەکی ناردووە بۆ بەهار و گلەیی لێکردووە، وتویەتی من چاوەڕێی ئەوەم لە ئێوە نەکردووە و تکاتان لێدەکەم پێتان لە پێڵاوی مندا بهێننە دەرەوە، بەهاریش لە وەڵامدا وتویەتی هەڵە دەکەیت نوسەری ئەو هۆنراوەیە من نیم[1].

---

[1] حسین مکی: تاریخ بیست ساله ایران. جلد هشتم، ص١٨٥.

# سالانی جەنگ

ڕێبازی سوککردن, هۆکارەکانی وابەستەیی حەمەڕەزا شا بە ئەشرەفی خوشکیەوە, پەیمانی سێلایەنە, ئینگلیزەکان ژێر پێی فەڕوغی گسك دەدەن, شازادەیەکی قاجار لە باڵوێزخانەی ئینگلیز...!, ئەمریکا و هاوکاری شا, سیخوڕە ئەڵمانیەکان لە وەك ڕۆڵی بەکرێگیراوانی ئینگلیز!, پیاوان و ئەفسەرانی ئێرانی لە زیندانی هاوپەیمانانندا, هەلێکی ئاڵتونی بۆ شا, مەرجی سەیری دوکتۆر موسەددەق بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری.....

نامەو ڕاپۆرتە نهێنیەکانی (سر ریدر پۆلارد)باڵوێزی سەردەمی جەنگی دووەمی جیهانی بەریتانیا لە ئێران, کە لەم دواییانەدا بڵاوکراونەتەوە, ئەوە دەر دەخات کە دەوڵەتی بەریتانیا تا چەند ڕۆژێکیش دوای سوێندی یاسای خواردنی حەمەڕەزا ڕەزاشا دوودڵ بووە لە بەفەڕمی ناساندنی سەڵتەنەتەکەیدا, تا ئەوەی کە سەرەنجام بە هەوڵ و کۆششی فەڕوغی بەڕیتانیا ڕەزامەندی لەسەر سەڵتەنەتەکەی حەمەڕەزاشا دەربڕی, لە تەلگرافێکدا لە ١٩ی سیبتێمبەر (٢٨ شەهریوەر ١٣٢٠هەتاوی)لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئینگلیزەوە بە ناونیشانی باڵوێزی ئینگلیز بۆ تاران نێردراوە, تێیدا هاتووە کە: (شازادەی جێنشین بە هۆی ئەوەی کە بە لایەنگری ئەڵمانیا ناسراوە, نابێت پەسەند بکرێت, ئێمە ناتوانین پاڵپشتی بکەین لە کەنارخستنی ڕەزاشا بەسودی ئەو, کە جگە لە فێڵێك بۆ ئاڵوگۆڕکردنی سیاسەت دژی هاوپەیمانان شتێکی

دیکه نیه, دەتوانرێت جێنشینەوەی ڕەزاشای دەستلەکار کێشراوە لاوێکی پەهلەوی دیکه بێت, یان گەڕاندنەوەی کەسێك بێت لە بنەماڵەی قاجارەکان ).[1]

باڵوێزی بەریتانیا دوای گەیشتنی ئەم تەلگرافە, دەست بەجێ دەچێتە لای فەڕوغی بۆ پەشیمان بوونەوە لەوەی کە لەگەڵ فەڕوغیدا ڕێککەوتبەن لە سەر ئەوەی کە شازادەی جێنشین دەتوانێت لەسەر تەختی ئێران دابنیشێت, بەڵام فەڕوغی وەڵامی دەداتەوە کە دوای تەواو بوونی ڕێوڕەسمی سوێند خواردن, لەلایەن شای نوێوە هیچ کارێك ئەنجام نادرێت, وە هەر گۆڕانکاریەکیش لە بڕیارەکەی پێشویدا دەبێتە هۆی دروست بوونی پەرێشانی و هەرکەو بۆخۆی, سر ریدر بۆلارد هەمان شەو وەڵامی تەلگرافەکەی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا دەداتەوە, باس لەوە دەکات کە فەڕوغی سەرۆك وەزیرانی ئێران داوادەکات کە هەلێك بە شای نوێ بدرێت, وە پاشان درێژەی دەداتێ و دەڵێت: (ئەگەر فشار بخەینە سەر ئەزمونی خەڵکانی دیکە ئەوا دەبێت لێپرسراویەتی نەهامەتیەکانیش لە ئەستۆی خۆمان بگرین ), سر ریدر پۆلارد لە تەلگرافەکەیدا جەختی لە سەر ئەو بۆچونەی فەڕوغی کردووەتەوە, کە پێشنیاری پرسی دیموکراسی و نوێکردنەوەی داواکاری دەستوری خوازی ڕەوشێکی تێکەڵ و پێکەڵ دێنێتە ئاراوە کە ناتوانرێت کۆنترۆڵ بکرێت.

بەهەرحاڵ سەرەنجام نوێنەرەکانی هەردوو دەوڵەتی داگیرکەر (سۆڤیەت و بەریتانیا) بە فەرمی دانیان نا بە سەڵتەنەتی شای نوێدا, وەفدەکانی نوێنەرانی سیاسی دانیشتوی ئێران ڕۆژی (٢٠ی شەهریوەری ١٣٢٠هەتاوی) بە سەردانێکی فەرمی بۆلای شای نوێ, پیرۆزبایی وەرگرتنی سەڵتەنەتیان لێکرد, پۆلارد دەربارەی یەکەمین دیدارەکانی حەمەڕەزا ڕەزاشا لەگەڵ وەفدە دیبلۆماسیەکاندا ڕاپۆرتێك بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا دەنێرێت و دەنووسێت: (شای نوێ لە ٢٢ی سێبتەمبەردا پێشوازی لە وەفدی دیبلۆماتکاران کرد, بەگشتی ئەوە دەرکەوت کە ئەو بەتەواوی جیاوازی هەیە لەگەڵ کەسێکی لە خۆبایی دا, کە باوکی هەمیشە هەوڵی دەدەا بە لەخۆبایی بوون ڕای بهێنێت و پەروەردەی بکات, ڕەفتارێکی دۆستانەی

---

[1] سر ریدر بولارد: نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانه سر ریدر پۆلارد, ت.غلامحسین میرزا صالح, طرح نو, ١٣٧١, ص١٩٣.

هەیە, تاڕادەیەك بە كەسێكی ترسنۆك دەهاتە پێش چاو, بەڵام ئاشكرا بوو كە وەك بڵێی توشی شۆك بوویێت ).[1]

ئاماژە بەوەی كە سێ ڕاپۆرتی پۆلارد بۆ وەزارەتی دەروەی بەریتانیا لە ماوەی مانگی میهری ١٣٢٠هەتاوی دا, واتە مانگی یەكەمی حەمەڕەزاڕەزاشاش ڕەوشی فەرمانڕەوایی لە پەیوەندیەكانی لەگەڵ باڵوێزانی ئینگلیز و ڕوس دا تا ڕادەیەك ڕۆشنە, باڵوێزی بەریتانیا لە ڕاپۆرتێكیدا لە بەرواری ٩ی ئۆكتۆبەر (١٧ی میهری ١٣٢٠هەتاوی) بە ناونیشانی ئەیدن وەزیری دەرەوەی بەریتانیا, دوای ئاماژەدانی بە دیدارە دوو كاتژمێریەكەی خۆی لەگەڵ شای نوێدا, بە ئاوازێكی گاڵتە ئامێزەوە ئاماژەی بە بۆچونەكانی شا كردەوە لە بارەی جەنگەوە, بە سەردێڕی (قسەی بێهودە كە دەگونجێت لەلایەن هەر كەسێكی لاوی بێ ئەزمونەوە بكرێت ), دەنووسێت و پاشان درێژەی دەداتێ: (چەند نیشانەیەك دەركەوتوە كە شا پەی بردووە بە پێویستی دوور خستنەوەی كەسانی بنەماڵەكەی لە دەربار, وەزیری دەروەش دڵنیای كردمەوە كە دەیەوێت دوو ئەندامی ماوە لە بنەماڵەی سەڵتەنەتی بنێرێتە دەرەوەی وڵات, واتە دایكی و ئەشرەفی خوشكی كە مێردی كردووە بە عەلی قەوام كوڕی قەوامولمولك و دەڵێن لە پەیدا كردنی كارێكە لە هاڵیود, كارێك كە جیاواز لە ڕواڵەت و گونجاندن و ئامادەیی, لە هەمو ڕویەكەوە شایستەی ئەوە).

لەڕاپۆرتێكی دیكەی پۆلارد دا لە ١٤ ئۆكتۆبەر (٢٢ میهر) كە ئەویش دوای دانیشتنێكی دووروودرێژ لەگەڵ حەمەڕەزاڕەزاشادا ناردوویەتی بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا, هاتووە كە ئەمجارەیان شا كاریگەری زۆری لێكردووە: (پرسیاری زۆری كرد, وتاری دوورو درێژی نەدا, ماقوڵ بوو لە وتەكانیدا هاوسەنگی بەدی دەكرا, حەمەڕەزا ڕەزا لە هەڵوێستی ئەو پەرلەمانتارانەی كەمكردەو ), كە لە بەرامبەر شای پێشودا كۆیلە و سەرشۆڕ بوون و ئێستا بە توندی ڕەخنەی لێدەگرن, لە نامەیەكی دیكەی بۆلارد دا كە دووڕۆژ دواتر بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیای ناردووە, هاتووە: (سەرەنجام من پەیامێكی نهێنی شام هەست پێكردووە, كە ئەویش ئەوەیە كە ئەو ئارەزومەندە كە زۆربەی كاتەكان بەتەنها و بە بێ ئاگاداری سیاسەتمەدارەكان

---

[1] نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانه سر ریدر پۆلارد, ص١٩٤.

ببینێت، ئەو ووتی هەست دەکات کە هەندێك لە وەزیرەکان ڕوداوەکان بەپێی بەرژەوەندی خۆیان دەگێڕنەوە )، بۆلارد ئەم داواکاریەی شای رەد کردووەتەوەو دەنووسێت: (بەخزمەت گەیشتنی بەبێ ئاگاداری حکومەتی ئێران و هاوتا ڕوسیەکەی مایەی ڕەزامەندی نیە ).[1]

کۆتا سەرنجی ڕاپۆرتەکەی باڵوێزی بەریتانیا کە مایەی هەڵوەستە لەسەر کردنە ئەوەیە کە شا ئارەزومەندی دەردەبڕێت کە پەیوەندیەکی تایبەتی و پشتی پەردە دروست بکات لەگەڵ بەریتانیادا، تەنهامانگێك دوای وەرگرتنی سەڵتەنەتەکەی داوادەکات، کە ئەو دەیەوێت باڵوێزی بەریتانیا بە شێوەیەکی تایبەتی و دووبەدوو بە بێ ئاگاداری باڵوێزی سۆڤیەت ببینێت، بەڵکو دەشیەوێت دەوڵەتیش ئاگای لەو کەین و بەینە نەبێت، لە ڕواڵەتدا وادەردەکەوێت کە مەبەستی لەم داواکاریە ئەوە بووە کە وردەوردە خۆی لە کۆتوبەندوو وابەستەیی سەرۆك وەزیران (فەڕوغی) ڕزگار بکات، خودی خۆی ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیەکاندا دروست بکات.

بە پێی ئاوازی ڕاپۆرتەکانی بۆلارد و بە بەراورد بەڕاپۆرتەکانی پێشوتری ئەوە دەخوێنرێتەوە کە شا لەماوەی یەك مانگی سەرتایی سەڵتەنەتەکیدا، تاڕادەیەك بەریتانیەکانی لە بەرامبەر خۆیدا نەرم کردووە و زەمینەی پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا فەراهەم هێناوە، بەڵام ڕوسەکان لێی بەگومانن، شایش دڵگرانە لە ڕاپۆرتەکانی سۆڤیەت کە دەست وەردەدەنە نێو کاروبارەکانی باکوری ئێران و تەنانەت شاری تارانیش، دیداری هاوبەشی باڵوێزانی سۆڤیەت و ئینگلیز لە ڕۆژی ٢٧ ئۆکتۆبەر (٥ ئابان ١٣٢٠) لەگەڵ حەمەڕەزاڕەزاشادا لە ڕەوشێکی پەیوەندی سارددائەنجام درا، ئاوازی قسەکانی باڵوێزی سۆڤیەت لەم دیدارەدا بە تەواوی توند بوو، لە ڕاپۆرتە بڵاوکراوەکاندا شتێك لە بارەی پۆلاردەوە ناوترێت، دیارە بڵاو کردنەوەی ڕاپۆرتەکەی بۆلارد لە بەرژەوەندیدا نەبووە.[2]

---

[1] نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانه سر ریدر پۆلارد، ص ٢٠٥ – ٢٠٧.

[2] بەڵگەنامە نهێنیەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیز بە تێپەڕینی کاتی جیاواز بڵاو دەکرێنەوە، بەڵام هەمو بەڵگەنامەکانیش بڵاو ناکەنەوە، وە هەندێکیشیان هەتا زیاتر لە کاتی خۆشی وە یان هەندێك جاریش بۆ هەتاهەتایە لە تۆماری بەڵگە نامە نهێنیەکاندا دەیپارێزن، بڵاوی ناکەنەوە.

له بەشێکی کتێبەکەی (ژرار دوو ویلیە) ی نوسەری فەرەنسی دا بە ناوی (مكتب تحقير)[1], ئاماژەی بە ئەم دیدارە کردووە و تێیدا هاتوە کە: (ڕۆژی ٢٧ ئۆکتۆبەری ١٩٤١ز حەمەڕەزاڕەزاشا بۆی دەرکەوت کە لە دیدگای هاوپەیمانانندا ئەو هیچ دەسەڵاتێکی لە ژێر دەستدا نیە, جگە لە شایەکی کارتۆنی و بێدەسەڵاتیش هیچی دیکە نیە, لەو ڕۆژەدا باڵوێزانی ڕوس و ئینگلیز (ئەسمیرنۆف و بۆلارد)بە ئاوازێکی ڕێزدارانە بەڵام توند, بە بیریان هێنایەوە کە خۆی ببوێرێت لە دەستوەردانە کاروباری سیاسی و سنوری خۆی کە شایەکی ژێردەستەو نا لێپرسراوە بناسێت.

حەمەڕەزاڕەزاشا شەوێك بەر لەو ڕوبەڕو بوونەوە هەڕەشە ئامێزە, جەژنی ساڵیادی لەدایك بوونی خۆیی لە ڕەوشێکی هەژارانەدا گێڕابوو, لە ئاهەنگی ساڵیادی ٢٢ ساڵەی لەدایك بوونیدا جگە لە دایکی و ئەشرەفی خوشکی کەسی دیکە ئامادەنەبوو, تەنانەت فەوزییەی هاوسەریشی ئامادە نەبوو لە ئاپارتمانە تایبەتیەکەی خۆیدا بێتە دەرو نانێکی سادەی ئێوارە لەگەڵ بنەماڵەی مێردەکەیدا بخوات.

حەمەڕەزاشا لەو ڕۆژە بەدواوە گۆشەگیری هەڵبژارد و پازدە ڕۆژ دیداریلەگەڵ کەسدا نەکرد, باڵوێزانی ڕوس و ئینگلیزیش ئیدی کارێکیان بەو نەبوو, سەرۆك وەزیرو وەزیرەکانیشی بەبێ ڕاوێژ و ئاگادار کردنەوەی ئەو کارەکانیان ئەنجام دەدا, دەربارەی ڕەوشی ولاتیشەوە هیچ ڕاپۆرتێکی پێنەدەدەرا, بەڵام لەملاوئەولاوە دەیبیست کە سۆڤیەت و بەریتانیا دەست وەردەدەنە سەرجەم کارەکان و تەنانەت وردەکاریەکانیش دەبێت بەدڵی ئەوان بێت, دەیانەوێت هاوشێوەی داگیرکاری کۆن خەڵکی ئێران و پلەدارانی دەوڵەت سوك و ڕیسوا بکەن.

لەئەم ڕۆژە سەختانەدا, حەمەڕەزاڕەزاشا تەنها پشتی بە یەك کەس دەبەست کە ئەویش (فەڕوغی) بوو , چون دەیزانی بە بێ فەڕوغی تەخت و تاجەکەی لەدەست دەردەچێ, دەردوو خەفەتی تەنهای شا لە نێو دڵی کۆشکەکەیدا, تەنها لەلایەن

[1] L'ecole de l' humiliation.

ئەشرەفی خوشکیەوە ئارام دەکرایەوە, وەوابەستەیی لە ڕادە بەدەری ئەو بە ئەشرەفەوە هەر لەو کاتانەوە دەستی پێکرد ).[1]

حەمەڕەزاڕەزاشا تەنها لەبەر ئەوە خەفەتی نەدەخوارد کە جگە لە شایەکی بووکەڵە زیاتر هیچی تر نیە, بەڵکو نیگەرانیەکانی ئەو زیاتر لە بەر ئەو هێرشانە بوو کە ڕۆژنامەکان دەیانکردە سەر بنەماڵەکەی و ئەو ڕەوشەی نێو پەرلەمان بوو کە کەوتبوونە دژایەتیکردنی ڕژێمەکەی, ژمارەیڕۆژنامەکان لە کۆتاییەکانی سەڵتەنەتی ڕەزاشا دا لە پەنجەکانی یەك دەست تێپەڕی نەدەکرد, بەڵام لە ناکاو لە سەد ڕۆژنامە تێپەڕی کرد دوای ئەوەی کە دەوڵەت مەرجە توندوو دیاریکراوەکانی سەر بڵاوکراوەکانی هەڵوەشاندەوە, هەرکەسێك کە بیویستایە تەنانەت بەبێ سەرنج دان لە توانای دارایی ئەو کەسە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار, مۆڵەتی بڵاوکردنەوەی گۆڤارو ڕۆژنامەیان پێدەدا, ئەوانیش بۆ ڕاکێشانی خوێنەرو موشتەری خۆیان پێشبڕکێیان دەکرد لە دەرخستنی گەندەڵیەکانی ڕەزاشا و سوکایەتی کردن بە خۆی و بنەماڵەکەیشی, تەنانەت خودی حەمەڕەزاڕەزاشایش لەو هێرشانە ڕزگاری نەدەبوو, هەرکاتێکیش سکاڵای دەگەیاندە لای فەڕوغی, ئەویش دڵی دەدایەوە بەوەی کە ئەم ڕەوشە تێدەپەڕێت, وە لە ئێستاشدا دەوڵەت لە بارودۆخێکدا نیە کە بتوانێت جڵەوی ڕەخنەی ڕۆژنامەکان بگرێت.

دەربارەی سیاسەتی هاوپەیمانان لەوکاتەدا لە ئێران و پێگەی حەمەڕەزاڕەزاشا و دەوڵەتی ئێران لە بەرامبەر هاوپەیمانااندا, کتێبی (تاریخ کمبریج) یزانکۆی ئینگلیز دەربارەی ئێران لێکۆڵینەوەیەکی گشتگیری کردووە, لە نێویدا دەنووسێت: (کاتێك کە ساڵی ١٩٤١ز کۆتایی پێهات, ئەوە ڕاستیەك بوو کە ئێران داگیر کرابوو, لەوەش گرنگتر دوورخستنەوەی سەڵتەنەتداری پێشو وە بە سەڵتەنەت گەیشتنی کوڕە ٢٢ ساڵەکەی ئەو بوو, یەکە سەربازیەکانی سۆڤیەت و ئینگلیز ئاسایشی ناوەندەکانی شارەکانیان پاراستبوو, بە مەبەستی بەرەو پێشبردنی هەوڵە جەنگیەکانیان ئاسایشی شەبەکەکانی پەیوەندیان پاراستبوو, هیچ یەك لەو سێ دەسەڵاتە هاوپەیمانە لە نێوخۆی ئەم وڵاتەدا بەژەوەندی هەنوکەییان نەبوو سەرقاڵی ئەوانە بە پلەی یەکم

[1] Gerard de Villiers, p119 – 120 .

ستراتیژی بوو: ڕێگرتن له هاتنه ناوەوەی ئەڵمانەکان, دەستەبەر کردنی ڕوداوەکانی نەوت و گەیاندنی کەلوپەلی جەنگی بۆ سۆڤیەت له ڕێگەی شاخ و بیابان و رێگەی ئاسن و جادەکانی ئێرانەوە, لەم بارودۆخەدا سیاساتمەدارانی ئێرانی بۆ بەدوادا چونی مەبەستەکانی خۆیان تا ڕادەیەکی باش هەستیان بە ئازادی دەکرد, تەنها ڕێگەیەك کە سنوری بۆ دادەنان, بەخشینی هاوپەیمانان بۆ پاراستنی ئاسایشی نێوخۆ بوو[1], ئەگەر چی لە تێڕوانین و بیروباوەڕی گشتی دا شەرمەزاری بوو کە چارەنوسی وڵات جارێکی دیکە وابەستە بووەتەوە بە هەواوهەوەسی باڵوێزانی بەریتانیا و ڕوسیاوە, ئەم بابەتەش یادئاوەری ڕەوشی وڵات بوو له سەردەمی کۆتا پاشاکانی قاجاردا, بەڵام ڕاستیەکەی شتێکی دیکە بوو, ئێران لە سەروبەندی ئەو دەیەی کە تێیکەوتبوو, دەستوری خوازان هاوتەریب لەگەڵ ململانێی گروپەکانی دیکەدا ئومێدی پشکوتنی شکۆفەکانی لێدەکرا, ئەمجارەش کە تایبەتمەندیەکی دیاری ململانێی دەسەڵات کە دەستی پێکردبوو, ململانێ بوو لە نێوان سیاسەتەکانی سیاسەتمەدارانی نوخبە, زەویداران و خاوەن پارەکان یان کرێکارەکانیان بوو, بەڵام ئەوەی مایەی سەرنج دان بوو ئەوە بوو کە جارێکی دیکە پەرلەمان و دانانی سەرۆك وەزیر گرنگیەکی پەیدا کرد, پارتەکان وەکو ئەوەی کە پێکهاتەو ڕێکخستنێکی بەهێزیان هەبێت, نەبوون, بەڵام دروشمی حیزبی و کوتلەی حیزبی بوونیان هەبوو, دەگونجێت بوترێت کە دیارترین ئاماژەی ئەم دووبارە بەهێزبەنەوەی ژیانەوەی سیاسی, شکۆفەکردنی چاپەمەنیکان بوو کە هەرچەندە تێکەڵە بوو, بەڵام تاڕادەیەك لە کۆت و بەند و سانسۆر خستنەسەر ئازاد بوون, تەمەنی زۆربەی ئەم ڕۆژنامەو بڵاوکراوانە دەورانێکی زۆر کەم بوو, (بەپێی لێکۆڵینەوەی یەکێك لە لێکۆڵەرەوەکان ژمارەی ڕۆژنامە چاپکراوەکان لە نێوان ساڵانی (١٩٤١ – ١٩٤٧ز , ١٣٢٠ – ١٣٢٦هەتاوی) دا (٤٦٤) ڕۆژنامەی جیاواز بووە, کە لە نێو ئەو ژمارەیەدا (٤٣٣)یان

---

[1] نوسەری (تاریخ کمبریج) دەستوەردانەکانی هاوپەیمانان لە کاروبارە نێوخۆییەکانی ئێران دا بە ناونیشانی (بەخشینی هاوپەیمانان بۆ پاراستنی کاروباری نێوخۆیی ئێران)دەخاتە ڕو.

به زمانی فارسی بلاّو کراونەتوە)[1], بەلاّم ژمارەیەك لەوانە باس لەوە دەکەن کە ولاّت لەو سالاّنەدا لە ڕوی سیاسیەوە جارێکی دیکە گیان دەگرێتەوە.

حەمەڕەزاڕەزاشا لەو کاتانەدا کەسێکی بیّ ئەزمون و لەرزۆك بوو, بەجارێك ئامادەیی بەهێزی باوکی لە نێو چوبوو, لەگەلّ ئەوەی کە لە ڕابردووی ولاّتەکەی شارەزا بوو, لەکاتی خوێندنەوەی دەقی وتارەکانی خۆی لە پەرلەماندا یان بە ئامادەبوونی بەرپرسانی بالّوێزخانەکانی ڕوس و ئینگلیز, پێدەچو خۆی هاوشێوەی ئەحمەدشا ی قاجار دەبینی لە کاتی ڕوداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا, وا لێکیش دەدرایەوە کە دەست پێکردنی بەو خۆشگوزەرانی و کامەرانیەی, بەرپەرچ دانەوە و هەلّوێست وەرگرتن بوو لە بەرامبەر ئەو ڕەوشە دا.

ئەو سیاسەتمەدارانەی کە لە ماوەی جەنگدا دەرکەوتن بەزۆری پەرلەمانتارانی بەتەمەن و نەوەیەك بوون کە پێش جەنگی جیهانی یەکەم پیگەیشتبوون, ئەوانە دەورانی حکومەتی ٢٠ سالّەی ڕەزاشا یان لە نێو پەردەی سەرکوتکردندا تێپەڕاندبوو,, کە وا باشترە بە بە فەرامۆشی بسپێردرێن, بەلاّم هەندێکیان ئەزمونێکی حکومەتداری سەربەخۆیان هەبوو کە یەکێك لەو کەسانە (قەوام سەلّتەنە) بوو, بەرژەوەند خوازی تایبەتی و ڕۆلّی دیاریان لە ڕابردوودا, وا پێویستی دەکرد کە ئەوانە زیاتر کەسانی گوماناوی و پیلان گێڕو چالاك لە ساختەکاریدابن نەك خاوەن تایبەتمەندی کەسێکی پێکهێنەری دەولّەت, بە هەرحالّ هەتا پێش ئەوەی کە هاوپەیمانان ولاّت بەجیّ بهێلّن, چالاکیەکانیان لە جۆری (پاراستنی ڕەوشی خۆیان) سنوردار کرابوو[2].

حەمەڕەزاڕەزاشا ڕۆژی (٢٢ ئابانی ١٣٢٠هەتاوی)خولی سیازدەیەمی پەرلەمانی کردەوە, لە وتاری کردنەوەکەیدا کە بە قەلّەمی فەڕوغی نوسرابوو, جەختی لە سەر پێکهێنانی حکومەتێکی دەستوری دیموکراسی دەکردەوە, بە پێی ئەو بەرنامەیەی کە ئامادە کرابوو دەستی لەکار کێشایەوە, وە دووبارە بە کۆی دەنگی ئەندامانی پەرلەمان هەلّبژێردرایەوە بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران, گرنگترین گۆڕانکاریەك کە لە

---

[1] Elweli – Sutton – (the Iranian press 1941-1947), p 65.

[2] تاریخ کمبریج (سلسله پهلوی و نیروهای مذهبی), ت. عباس مخبر, طرح نو, ص ٦١-٦٣.

کابینه نوێیەکەی فەرۆغیدا ئەنجام درا, دانانی سپەهبەد (ئەمیر ئەحمەدی) فەرماندەی سەربازی شاری تاران لە پۆستی وەزیری ناوخۆدا, لەلایەکی دیکەشەوە وەزیری ئەم جەنگی ئەم کابینەیە سەرلەشکر (ئەحمەد نەخجەوان)بوو, کە ڕەزاشا لە دوادوایی سەڵتەنەتەکەیدا زیندانی کرد, بەڵام دوای گەڕاندنەوەی ئابڕو ناموسی و لێسەندنەوەی پلە سەربازییەکانی, کەوتە پاڵاوتنی بەرپرسە سەربازیەکانی سەردەمی ڕەزاشا و ژمارەیەکی لێ خانەنشین کردن, لەم گۆڕانکاریەشدا شا هیچ ڕۆڵێکی نەبوو تەنانەت ڕاوێژیشی پێنەکرا.

حەمەڕەزاڕەزاشا لەبارەی ئەم سەردەمەی سەڵتەنەتیدا بابەتێکی لە کتێبەکەیدا نوسیوە کە لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێت, بۆ نمونە لە کتێبەکەیدا هاتووە: (ڕۆژێك کە لە تەمەنی ٢٢ ساڵیدا لێپرسراویەتی تەخت و تاجی وڵاتی ئێرانم گرتە ئەستۆ, خۆم لە بەرامبەر کێشە گەلێکدا دیتەوە, یەکەم هەنگاوی من دیاری کردنی سیاسەتی نوێی دەرەوەی ئێران بوو, لەبەرئەوەی کە سیاسەتی بێلایەنی کە باوکم بە فەرمی ڕایگەیاند, سەرەنجامێکی خراپی لێکەوتەوە و بە سیاسەتێکی شکستخواردوو دەهاتە هەژمار, من بەو پەڕی دڵنیاییەوە هەستم دەکرد کە هاوکاری لەگەڵ هاوپەیماناندا نەك تەنها لامان دەدات لێیان, بەڵکو ڕاگەیاندنی سیاسەتێکی لەو جۆرەش پێویستەو بە سودی وڵاتیش دەبێت, خۆشبەختانە سەرۆك وەزیرانەکەشم (حەمەڕەزاعەلی فەرۆغی) کە یەکێك بوو لە سیاسەتمەدار و دانا ناسراوەکانی ئێران لەگەڵ تەواوی بیرو بۆچونەکانی مندا بوو وە پەسەندی کرد, بە هەوڵ و تێکۆشانی ئەو پیاوە دانوستانەکان بە مەبەستی گەیشتن بە پەیماننامەیەکی سێلایەنە لە نێوان (ڕوسیا و بەریتانیا و ئێران)دا دەستی پێکرد, ئەم پەیماننامەیەش لە (٢٩ی ژانویەی ١٩٤٢ز , ٩ی بەهمەنی ١٣٢٠هەتاوی) دا لە نێوان هەر سێلایەنەکەدا واژۆ کرا, لەو پەیماننامەیەدا هەردوو دەوڵەتە هاوپەیمانەکە ئەوەیان ڕون کردەوە کە هەبوونی سەربازەکانیان لە خاکی وڵاتەکەماندا هەرگیز شێوەی سەربازی و داگیرکاری نیە, (هەرچەندە تەواوی ئێرانیەکان ئەم ڕەوشەیان بە داگیرکاری سەربازی دەزانی), ئەوان بەڵێنیشیان دا کە ڕێز لە تەواوی فەرمانڕەوایی و سەربەخۆیی وڵاتەکەان بگرن, شەش مانگ دوای تەواو بوونی جەنگیش لەگەڵ ئەڵمانەکاندا هێزەکانی خۆیان لە وڵاتی ئێران دەبەنە دەرەوە, وە بەڵێنیشیان دا کە قەرەبووی ئەو کێشە داراییەی ئێران

بکەنەوە کە لە ئەنجامی ئەو جەنگەدا دروست بووە, ئێمەش بە پێی توانای خۆمان بۆ تێپەڕینی هێزەکانی هاوپەیمانان و گەیاندتی کەلوپەلی جەنگی بۆ ڕوسیا لە ڕێگەی ڕێگاکانی گواستنەوەی ئێرانەوە, ئاسانکاریەکی زۆرمان بۆ فەراهەم هێنان ).[1]

پێویست بە بیرهێنانەوەیە کە کە حەمەڕەزاڕەزاشا لە تەواوی حکومەتەکەی فەڕوغیدا, کە هەتا مانگە ئەسفەندی ١٣٢٠ بەردەوام بوو, بچوکترین ڕۆڵی لە دیاریکردنی ڕێڕەوەی سیاسەتی دەرەوەی ولاّتدا نەبوو, وە تەواوی دانیشتنەکانی پەیوەست بە هاوکاری هاوپەیمانان و بەستنی پەیمانی سێلایەنە, بە جوانکاریەکانی خودی فەڕوغی و هەوڵەکانی وەزیری دەرەوەی کابینەکەی (عەلی سوهەیلی) ئەنجام درا, فەڕوغی تەنها شای لە ئەنجامی دانیشتنەکان و دەقی پەیماننامەکەی لە پێش واژۆکردندا ئاگادار کردەوە, وە شایش لە پێگەیکدا نەبوو کە بیوانێت بچوکترین گۆڕانکاری لە دەقی ڕێککەوتننامەکەدا بکات, تاکە داواکاری حەمەڕەزاڕەزاشا لە فەڕوغی ئەوە بوو کە لەکلتی واژۆکردنی پەیماننامەکەدا, ڕەزامەندی لە ئینگلیزەکان وەربگرێت بۆ گواستنەوەی باوکی لە دوورگەی مۆریسەوە بۆ ولاّتی کەنەدا, فەڕوغیش هەوڵیخۆی دا, بەلاّم ئینگلیزەکان لە جیاتی کەنەدا ڕەزاشایان گواستەوە بۆ ئەفریقای باشور, وە ئاسانکاری دیکەیان بۆ کرد لە بارەی فەراهەم هێنانی خۆشگوزەرانی زیاتری ڕەزاشا و پەیوەندی گرتنی لەگەڵ حەمەڕەزاشای کوڕیدا.

ڕێکەوتنە سێلایەنەکە بۆ پاراستنی خاك و سەربەخۆیی ئێران لە لایەن هاوپەیمانانەوە, وە مانەوەی سەربازو هێزەکانی بێگانە لە ئێراندا بە شێوەیەکی یاسایی هەتا شەش مانگ دوایکۆتایی هاتنی جەنگی جیهانی دووەم, ڕوبەڕوی دژایەتیەکی توندی پەڕلەمانتاران و چاپەمەنیەکان بوویەوە, بەلاّم سەرەنجام فەڕوغی توانی سەربکەوێت ودەنگی زۆرینەی پەڕلەمانی بۆ کۆبکاتەوە, کاتێك کە فەڕوغی لە پەڕلەمان لە بەردەم پەڕلەمانتاراندا ڕونکردنەوەی لە سەر پەیماننامەکە دەدا, یەکێك لە تەماشا کەران بەردێکی پێوەنیا و بەسوکی تەوێڵی برینداز کرد, ئەم ڕوداوە بوویە هۆی بلاّوبوونەوەی تورەیی و دانیشتنەکەی پەڕلەمان کۆتایی پێهێنرا, بەلاّم دوای ڕێکخستنەوەی دانیشتنێکی دیکە دووبارە فەروغی هاتەوە پەڕلەمان و بە ئەم ڕستەیە

---

[1] ماموريت براى وطنم, ص٩٦-٩٥.

**که (وتەکانی چەند ناڕازییەك قسەکانی پێ بڕیم، ئەڵبەتە مایەی نیگەرانیە بەڵام مایەی سەر سوڕمان نیە)درێژەی بە وتەکانی دا و ووتی: بەهۆی چەند هەڵەیەکەوە کە لەڕابردوو دا ئەنجام دراون ئێستا وڵات لەلایەن بێگانەکانەوە داگیر کراوە، لەبەر ئەوە بە ویست و ئیرادەو ئارەزوی ئێمە لێرە ناڕۆن، بە ئەم پێشەکیەوە فەڕوغی کەوتە لایەنگریکردن لە پەیماننامەکە سێلایەنیەکەو ووتی: ئەمە پێشهاتێکە و ڕویداوە، تەنها کارێك کە ئێمە دەتوانین ئەنجامی بدەین ئەوەیە کە چەندمان بۆ دەکرێت لە زیانەکانی کەم بکەینەوە، سەرەنجامی پوختەی وتەکانی فەڕوغی ئەوەبوو کە بە بەستنی ئەم پەیمانە ئەو نەنگیەی کە دووچاری سەربەخۆیی و فەرمانڕەوایی ئێران بووە، قەرەبوو دەکاتەوە، ئەو بێزاریەی ئەمڕۆ ئێمە هەمانە کە وڵاتەکەمان داگیر کراوی دەستی سوپای بێگانەیە، دەگۆڕێت، وە ئاماژەش بەوە کراوە کە لەدوای بەستنی ئەم پەیماننامەیەوە ئەو هێزەی کە لە وڵاتەکەماندا هەیە هێزی داگیرکەر نیە، بەڵکو لە ڕێگەی هاوپەیمانیەوە لێرەن و دەگەڕێنەوە.**

**دوای تێپەڕاندن و دەنگدان لە سەر پەیماننامە سێلایەنیەکە لەلایەن پەڕلەمانەوە و واژۆ کردنی لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئێران و باڵوێزانی روس و ئینگلیز، فەڕوغی ڕێگە چارەیەکی دیکەی دۆزیەوە و بۆ وەرگرتنی گرەنتیەك لەلایەن ئەمریکیەکانەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیە، دەقی یاداشتێکی بە نێوی (ڕۆزفێڵت سەرۆك وەزیرانی ئەمریکا)ئامادە کرد، ئەمەشی لە شێوەی تەلگرافێکدا لە (٣١ ژانویەی ١٩٤٢ز , ١١ بەهمەنی ١٣٢٠هەتاوی)نارد بۆ واشنگتۆن، کە ئەمە دەقەکەیەتی:**

***لە شای ئێرانەوە حەمەڕەزاڕەزاپەهلەوی بۆ سەرۆك ڕۆزفێڵت***

***تاران ٣١ ژانویە ١٩٤٢ز***

***لەگەڵ ئەوەی کە دڵنیام بەڕێزتان ڕوداوەکانی ئێستای ئێران بە وردی پێوشوێن دەگرن، خۆشحاڵم لەوە ئاگادارتان بکەمەوە کە دەوڵەتەکەم بەرەچاوکردنی یاساکانی ئەتلەنتیك، کە باوەڕم پێی هەیە و ئومێدەوارم کە بەپێی مەرجی هاوسەنگی وەکو وڵاتانی دیکە لە نێوەڕۆکەکەی بەهرەمەند بین، دەستپێشخەریمان کردووە بە واژۆکردنی پەیماننامەیەکی هاوپەیمانی لەگەڵ بەریتانیای مەزن و یەکیەتی سۆڤیەت دا، ئێمە بۆ گرەنتی واژۆکردنی***

*ئەم پەیماننامەیە، پشتمان بە نیەت پاکی جەنابتان و ئەو پەیوەندیە دۆستانەیەی کە ئەمریکا و ئێرانی پێکەوە پەیوەست کردووە، بەستوە، ئومێدەوارم کە هاوکاریمان بکەیت لە جێبەجێکردنی ئەم پەیماننامەیەو پاراستنی پێشکەوتنەکان و ژیانی ئاشتی لە دەرونی سنورەکانی ولأتەکەمدا........ حەمەڕەزاڕەزا پەهلەوی.*

هەفتەیەك دواتر ڕۆزفێلت وەڵامی تەلگرافەکەی حەمەڕەزاڕەزاشای دایەوە سەرباری دربڕینی خۆشحاڵی بۆ واژۆکردنی ئەوپەیماننامە سێلایەنە کە بە پێی ئەوە تەواوی خاکی ئێران و سەربەخۆییەکەی لەلایەن هاوپەیمانانەوە پارێزراوە، جەختیشی لە سەر دۆستایەتی دێرینی نێوان ئەمریکا و ئێران کردبوویەوە، بەریتانیەکان لەم تەلگرافەی شا بۆ ڕۆزفێلت، کە دەبێتە هۆی کردنەوەی پێی ئەمریکا بەرەو ئێران، خۆشیان نەهات، وە لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی دەستی فەڕوغی لەم کارەدا هەیە، دڵیان لەویش پیسکرد، تەلگرافی نهێنی پۆلارد بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیز لە ڕۆژی (٢ فەبریوەری ١٩٤٢ز , ١٣ بەهمەن ١٣٢٠هەتاوی)، واتە تەنها دوو ڕۆژ دوای ناردنی تەلگرافەکەی حەمەڕەزاڕەزاشا بۆ ڕۆزفێلت، ئەم ناڕەزاییەی بەڕونی تێدا دەردەکەوێت، لە بەرئەوە بۆلارد لەم تەلگرافەدا، سەرەڕای ئەوەی کە کە هیچ دەنگۆیەکی لادانی فەڕوغی لە ئارادا نیە، جێنشینەوەکانی دوای ئەو دەناسێنێت، لە نێوەڕۆکی ئەم ڕاپۆرتەدا هاتووە: (لە ڕاستیدا (تەقیزادە) باشترین جێنشینەوەی گونجاوە دوای فەڕوغی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران، (سوهەیلی) شایستەگی زۆری تێدایە بەڵام خۆشەویست نیە، سەرباری ئەوەش دەنگۆی ئەوە هەیە کە ئارەزوی وەرگرتنی ڕەشوە دەکات، کەسایەتیەکی دیاری دیکە جگە لە (حسەین عەلا) بوونی نیە، کە ئەویش دەبێت لە سەرهەمان ئەو پۆستەیدا کە بەڕیوەبەری بانکی میللی ئێرانە بمێنێتەوە، (حەسەن وسوق)یش کە زۆر ئارەزومەندی وەرگرتنی پۆستە ڕاستگۆ نیەو هاوکاری دارایی ڕۆژنامەیەك دەکات کە هێرش دەکاتە سەر پەیماننامە سێلایەنیەکە، (تەدین) لە ئێستادا لایەنگرانێکی هەیە، (سەید زیائەدین) شتێکی نیە

که له ئێستادا گەڕانەوەی ئەو ئاڕاستە بدات, واپێدەچێت که زۆرینەی ئێرانیەکان ئەویان له بیری خۆیان بردووەتەوە.[1]

کەمتر لەمانگێك دوای ناردنی یاداشتنامەکە, له ڕۆژی (١١ ئەسفەند ١٣٢٠هەتاوی) دا بەهۆی ئەو ناڕەزاییانەی که له پەڕلەماندا له دژی دەستی پێکرد, فەڕوغی دەستی لەکار کێشایەوە, سەرەڕای ئەوەی که زۆرینەی پەڕلەمانتاران دەنگیان پێدایەوە و داوایان لێکرد که دووبارە پۆستی سەرۆك وەزیران بگرێتەوە ئەستۆ, بەلاّم بە هۆی دژایەتی کەمینەوە له بەرامبەریدا, فەڕغی ئامادە نەبوو ئەو پۆستە وەربگرێتەوە, بەڵم پۆستی وەزارەتی دەرباری پەسەند کرد بۆ ئەوەی حەمەڕەزاڕەزاشای گەنج و هەتراسان و بیّ ئەزمون بەتەواوی و بیّ هاودەم بەجیّ نەهێڵێت, داواکاری سەرەکی وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران (قەوام سەڵتەنە) بوو, سەرەنجام پەڕلەمان دەنگی دا بۆ (عەلی سوهەیلی) وەزیری دەرەوەی کابینەی دەستلەکار کێشراوە, بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, (سر ریدر پۆلارد) له نامەیەکی تایبەتیدا که دوای ئەو گۆڕانکاریانە له (١٧ ئەسفەن ١٣٢٠هەتاوی) دا نوسیویەتی بە ئەم شێوەیە بۆچونی خۆی دەردەبڕێت: (زیاتر له هەفتەیەك تاران کایەکلێی قەیرانی سیاسی بووە و هیچ کارێك ئەنجام نادرێت, دەڵێم کایەکلیّ, چونکە هەڵسوکەووتی پەڕلەمانتاران بە تەواوی دوور بوو له لێپرسراویەتی, هەمویان دەستەنیەی ڕەزاشا بوون و ماوەی پازدە ساڵ هەرکاتێك ڕەزاشا فەرمانێکی دەربکردایە دەستیان بە سنگەوە دەگرت و دەیانوت (بەسەرچاوانمان!), بەلاّم چونکە ئێستا مەترسیەك له ئارادا نیە کاری هێز دەکەن و و وەك قارەمان خۆیان دەنوێنن, فەڕوغی سەرۆك وەزیر بە بێزاریەوە دەستی لەکار کێشایەوە, ئەوەیە قارەمانێکی نەناسراو, سوهەیلی وەزیری دەرەوە, توانی بە شێوەیەکی بیّ وێنە زیاتر له (١٠٠) دەنگی بەڵیّ بەدەست بهێنێت له بەرامبەر (٢) دەنگی نەخێردا, من باوەڕ ناکەم هیچ حکومەتێك بتوانێت لەگەڵ ئەم پەڕلەمانتارە نابەرپرس و چاوچنۆك و دەبەنگ و گەندەلاّنەدا, کار بکات, بەلاّم هیوای سەرکەوتن بۆ سوهەیلی دەخوازم, ئەو له مانگی ئوت بەدواوە (سەردەمی داگیرکردنی ئێران)تا ئێستا وەزیری دەرەوەی ئێران بووە,

---

[1] نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانه سر ریدر پۆلارد, ص٢٦٢ – ٢٦٣.

من سبەینێ تێدەگەم کە چ جۆرە کابینەیەکی پێکهێناوە, بەدەست بەجێ لە پەرلەوماندا هاواری پەرلەمانتارانێك وەك بڵێیت ژن براکەی لە پێنوس کەوتوە, یان ئەوانەی کە لەگەڵ ئەندامانی کابینەکەدا ناکۆکیەکی تایبەتیان هەیە, بەرز دەبێتەوە, ئەو پەرلەمانتارانەی کە کوتلەو کوتلەکلاریان دەکرد و ڕۆژانە بۆ ئەوەی کە کێ ببێتە ئەندامی کابینەکە بانگەوازیان دەکرد و ئاپۆرای جەماوەرییان بەڕێ دەخست, بێدەنگن لە بەرامبەر پرۆژەیاسای قۆرخکاری کە دەوڵەت پێشکەشی پەرلەمانی کردبوو بۆ گفتوگۆ لەسەر کردن, پێدەچێت ئەمەش بە هۆی ئەوە وە بێت کە زۆربەی پەرلەمانتاران خۆیان خاوەن زەوی و قۆرخکارن, من وردە وردە بیر دەکەمەوە کە بەرپرسێکی ئێرانی دزی دەکات, چونکە ئارەزوی لە دزی کردنە و واش بیردەکاتەوە کە ئەگەر بەرپرسێکی ئینگلیز دزی ناکات, تەنها هۆکاری ئەوەیە کە بە ئەندازەی ئێرانییەك زیرەك نیە! )[1].

ڕادەی بەدبینی و گومان خراپی باڵوێزەکەی بەریتانیا بەرامبەر بە ئێران و ئێرانیەکان لە نامەکەی سەرەوەدا بەڕونی دەردەکەوێت, هەڵبەتە لە نێو پەرلەمانتارانی خولی سیازدەیەمدا کەسانی چاوچنۆك و گەندەڵ و نابەرپرس هەبوو, بەڵام لە نامە تایبەتیەکەی بۆلارد دا نەك هەمو پەرلەمانتاران بەڵکو باس لە چاوچنۆکی و گەندەڵ و دەبەنگیی سەرجەم ئێرانیەکان دەکات, باڵوێزی بەریتانیا لە ڕاپۆرتە فەرمیەکانی (١٦ و٢٢ ی ئەسفەنددا) کە باردبووی بۆوەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا ئاوازێکی گونجاوتری تێدایە, ئاواتی سەرکەوتنی سوهەیلی دەخوازێت لە کارەکانیدا, بەڵام لە ڕاپۆرتێکیدا لە (٢٢ مارس ١٩٤٢ز , ١ فەروەردین ١٣٢١هەتاوی)دا کە زیاتر لە دوو هەفتە لە بەسەر ماوەی سەرۆك وەزیرانی سوهەیلی دا تێنەپەڕیبوو, گومانی هەبووە لە سەرکەوتنیدا و دەنووسێت: (مایەی دوودڵیە کە سوهەیلی بتوانێت سەرکەوتە ببێت, لە بەرامبەرئەمەشدا بە باوەڕە من پێویستە جارێکی دیکە هەوڵبدەین هاوکاری تەقیزادە بکەین بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, ئەو تەنها

---

[1] نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانه سر ریدر پۆلارد, ص٢٧٤-٢٧٥.

کەسێکە کە ئێمە، باڵوێزی سۆڤیەت، حەمەڕەزاڕەزاشا، سەرجەم خەڵکی ئێران، باوەڕمان بە لێهاتوییەکانی هەیە )[1].

گۆڕینی کابینەکانی حکومەت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پێگەی حەمەڕەزاشای لاوازتر دەکرد و دەست وەردانی بیانیەکان لە کاروبارە نێو خۆییەکانی ئێرانیشداپانتاییەکی فراوانتری داگیر دەکرد، سوهەیلی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ڕوسەکان بەلای خۆیدا (ساعد)ی باڵوێزی ئێران لە مۆسکۆی کرد بە وەزیری دەرەوەی کابینەکەی، بەلام ڕوسەکان بە پاڵپشتی کردنی ئاشکرای (حیزبی تودە) کە تازە دەستی بە چالاکیەکانی کردبوو بەردەوامیدا بە دەست وەردانەکانی لە کاروبارەکانی نێو خۆی ئێران دا، ئینگلیزەکانیش هیچ گوێیەکیان بە حەمەڕەزاشا نەدەدا و بە بانگهێشتکردنی (حەمید میرزا) کوڕی (حەمەڕەزا حەسەن میرزا)، ئاخرین جێنشینەوەی بنەماڵەی قاجارەکان بۆ تاران و پێشوازی لێکردنی لە باڵوێزخانەی بەریتانیادا، جارێکی دیکە ددانی خۆیان نیشانی حەمەڕەزاشا دا.

ژرار دوو ویلیە لە باسی سەردانیکردنی حەمیدمیرزاوە بۆ تاران دەنووسێت: لە ڕێوڕەسمی میوانداریدا کە بەخۆشی حەمید میرزاوە لە باڵوێزخانەی بەریتانیا لە تاراندا ئامادەکرابوو، مۆسیقای مارشی فەرمی قاجاریەکانیان دەژەند، وە ئارەزومەندیش بوون کە ئەم هەواڵە بگاتەوە بوو گوێی شا، بۆ ئەوەی حسابێك بۆ کارەکانی خۆی بکات و لەو سنورەی بۆی دیاریکراوە زیاتر پیێ ڕانەکێشیت[2]، ژرار ی نوسەری فەڕەنسی بەرواری ئەم سەردانەی حەمید میرزای دیاری نەکردووە، بەلاّم شا لە چاوپێکەوتنێکیدا لەگەڵ (کارانجیا)ی ڕۆژنامە نوسی هیندی ئەم هەواڵەی پشتڕاست کردووەتەوە و دەڵێت: ئینگلیزەکان تا ماوەیەکیش دوای وەرگرتنی سەڵتەنەتداریشم بیری کەنار حستنی منیان لە مێشکدا بوو، بابەتی وتنەوەی مارشی

---

[1] نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانه سر ریدر پولارد، ص۲۸۰-۲۸۰.

[2] Gerard de Villiers, p 125.

[2] The mind of a monarch, pp62,63.

فەرمی بنەماڵەی قاجارەکانیش لە میوانداریەکی باڵوێزخانەی بەریتانیا لە تاراندا ڕاستە[1].

لە سەروبەندی مانگی موردادی ١٣٢١هەتاوی دا دادگایی ئاشکرای پلەدارەکانی شارەوانی سەردەمی ڕەزاشا کە سەرپاس ڕوکنەدین موختاری سەرۆکی شارەوانی سەردەمی ڕەزاشا سەردەستەیان بوو, گورزێکی دیکە بوو کە درا لە ئابڕوی بنەماڵەی پەهلەوی, لەم ەداداگایەدا کە نزیکەی دوو مانگ درێژەی کێشا پلەدارانی شارەوانی سەردەمی ڕەزاشا بەهۆی بەشداری و دەست هەبوونیان لە کوشتنی زیندانیە سیاسیەکاندا تاوانبار کران, وە خودی ڕەزاشایش بە فەرماندەری ئەم کارانە ناسێنرا, لە کاتی ئەم دادگایکردنەدا کابینەکەی سوهەیلیش ڕوخا و قەوام سەڵتەنەش بە پێی زۆرینەی دەنگی پەرلەمانتاران ڕاسپێردرا بۆ پێکهێنانی کابینەیەکی نویٚ, خودی قەوام پۆستی وەزارەتی جەنگیشی لە ئەستو گرت, بە پەیوەستکردنی لەشکریش بە وەزارەتی جەنگەوە بە شێوەیەکی پراکتیکی فەرماندەیی سەرجەم هێزەکانی لە چنگی شا دا دەرهێنا, لە ڕۆژی (٥ ئازەری ١٣٢١هەتاوی)یشدا فەڕوغی کۆچی دوایی کردوو شا بە تەواوەتی بەبیٚ یارویاوەر مایەوە.

تەنها هۆکاریك کە لەو کاتە هەستیارەدا بە هانای حەمەڕەزاشا گەیشت, هاتنە ناوەوەی ڕاستەوخۆی ئەمرکیەکان بوو بۆ نێو کایەی سیاسی ئێران, دوای بڕیاردانی ئەمریکا بە بوونی بە فەرماندەی کەنداوی فارس, (٣٠) هەزار سەرباز و ئەفسەر و کارناس و تەکنۆکراتی ئەمریکی ڕۆشتنە نێو ئێرانەوە و ئێرانیش لە باتی دوو لەشکری بیانی بویە داگیرگەی سیٚ لەشکری وڵاتانی بێگانە, بە جێگیر بوونی هێزەکانی ئەمریکا لە ئێران دا پێگەی سیاسی ئەمریکا لە ئێرانیشدا بەرەو هەڵکشان دەڕۆشت, شایش بە دروستکردنی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئەمریکیەکاندا پێگەی لەرزۆکی خۆیی بە شێوەیەکی باش بتەو کرد.

حەمەڕەزا پڕاشا دەربارەی پێگەی خۆی و ڕەوشی ئێران لە سەروبەندی ساڵی دووەمی سەڵتەنەتەکەیدا, دەنووسێت: (داگیر کردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە

---

و ڕوخاندنی له ناکاوی ڕژێمه دیکتاتۆیەکەی باوکم, مەترسی و ئاڵۆزیەکی نوێی له کۆمەڵگای ئێرانیدا هێنابوویه بوون, له ڕواڵەتدا هاوپەیمانەکانیش سور بوون لەسەر ئەوەی که دەسەلآتی من لاواز بکەن, لەبەر ئەوه وا هەستیان دەکرد که بەو شێوەیه سەڵتەنەتداری خۆیان بەسەر ئێرانەوه ئاسانتر دەبێت, دەستوەردانی تاوناتاوی هاوپەیمانان له کاروباری سیاسی ئێراندا, بەتەواوی من و خەڵکی ئێرانیشی هەراسان کردبوو, بۆ ڕونکردنەوەی ئەم بابەتەش وەبیر هێنانەوەی ڕوداوێك وەکو نمونه خراپ نیه: بۆ خۆلادان لەو هەڵئاوسانی پارەیەی که لەو کاتەدا دروست بووبوو, هاوپەیمانان داوایان کرد که دەبێت ژمارەیەکی زۆروزەبەندی پارەی ئێران بۆ ساغکردنەوەو دابینکردنی پێداویستیەکانی هاوپەیمانان, وه بۆ پێدانی خەرجی هێزەکانیان له ئێراندا پەخش بکرێتەوه, لەبەر ئەوەی که ئەوداواکاریه پێچەوانەی دەستوری وڵات بوو, هاوپەیمانان داوایان له قەوام سەڵتەنەی سەرۆك وەزیرانی ئەوکات کرد که بەبێ ڕەچاو کردنی ماده یاساییەکان و بەهەرشێوەیەك بێت ئەم داواکاریەیان بۆ ئەنجام بدات, لەبەر ئەوەی که ئەو له وەڵامدا وتبووی هەرگیز وەها کارێك شیاو نیه و ناکرێت, فشاریان خستەسەری که پرۆژەیاسایەکی نوێ پێشکەشی پەرلەمان بکات و تێیپەڕێنێت, ئەویش له وەڵامدا ڕایگەیاندبوو که پێناچێت پەرلەمان دەنگ لەسەر وەها پرۆژه یاسایەك بدات, سەرەنجامی ئەم گفتوگۆیانه ڕۆژێك باڵوێزی ئینگلیز هاته لای من ووتی: که ئەو بەناوی دەوڵەتەکەی خۆی و یەکیەتی سۆڤیەت و ئەمریکاوه ئەوه ڕادەگەیەنێت که قەوام مایەی گرنگی پێدانی ئەوانه, بەلآم لەگەڵ ئەم پەرلەمانەی ئێستادا توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی نیه, هەر بۆیه داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەرلەمانەی له من کرد, ئەمه پێشنیارێکی سەرسوڕهێنەر بوو که نوێنەری وڵاتێکی بێگانه به منی دەدات, هەر بۆیه پێشنیاری ناوبراوم به توندی بەرپەرچ دایەوه و پێم وت ئەوه من و گەلی ئێرانه که دەبێت باوەڕمان بەدەوڵەت هەبێت نەك تۆ, هەرچەندەش که پێکەوه دۆست و هاوپەیمانین, بەلآم تەنها من و گەلی ئێران دەتوانین له بارەی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانەوه بڕیار بدەین, زۆری نەخایان که ژمارەیەك ئاژاوەگێڕ له تاراندا ئاژاوەیەکیان نایەوه, ئینگلیزەکانیش که هێزەکانی خۆیانیان له تاراندا بردبوویه دەرەوه به بیانوی کۆتایی پێهێنانی ئاژاوەکه هاتنه

پایتەختەوە, بەم شێوەیە هەڕەشەیان لە پەڕلەمان کرد کە ڕەزامەندی لەسەر داواکاریەکانیان نیشان بدات.[1]

ئامارژەی شا بۆ ڕوداوەکانی (١٧)ی ئازەر, کە دووبارە گەڕانەوەی بڕیارەکانی حکومەتی سەربازی لە تاران و داخستنی سەرجەم ڕۆژنامەکان ئەنجام درا, ماوەی زیاتر لە مانگێك لە تاران دا تەنها ڕۆژنامەیەکی دەوڵەتی بە ناوی (اخبار روز)چاپ و بلاۆ دەکرایەوە, تائەو کاتەی کە دەنگ لەسەر پڕۆژە یاسای نوێی چاپەمەنیەکان درا لە پەڕلەمان دا, چەند مەرج و کۆت و بەندێك بۆ دەرکردنی ڕۆژنامە و گۆڤار دانرا, تەنها ئەو کەسانە دەیانتوانی مۆڵەتی بلاۆکردنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤار وەر بگرن کە ئەو مەرجانەیان تێدا هەبوو, لەگەڵ ئەم ڕەوشەشدا دەوڵەتەکەی قەوام لە کۆتاییەکانی (بەهمەنی ١٣٢١هەتاوی)دا لە پەڕلەماندا دووچاری دژایەتیەکی زۆر بوویەوە و لە ڕۆژی (٢٤ی بەهمەن)دا دەستی لە کار کێشایەوە, پەڕلەمان دووبارە دەنگی دایەوە بە سوهەیلی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, ئەویش لە (٢٨ ی بەهمەن)دا کابینە نوێیەکەی بە پەڕلەمان ناساند, لەم کابینەیەدا هەندێك لە پۆستە وەزاریەکان بە ئەم شێوەیە دیاری کرابوون:

| | |
|---|---|
| سوهەیلی | سەرۆك وەزیر |
| ساعد | وەزیری دەرەوە |
| ئەلهیار سالح | وەزیری دارایی |
| سپەهبەد ئەمیر ئەحمەدی | وەزیری جەنگ |
| عەلی ئەسغەر حیکمەت | وەزیری داد |
| دوکتۆر سیاسی | وەزیری فەرهەنگ (ڕۆشنبیری) |
| عەبدورلحسەین هەژیر | وەزیری ڕێگاوبان |

سوهەیلی لەم کابینە نوێیەیدا پڕۆژە یاسایەکی پێشەکەشی پەڕلەمان کرد کە تیایدا دوکتۆر میلیسپو ی وەك بەڕێوەبەری سەرجەم دارایی ئێران دیاریکرابوو, دوای نزیکەی مانگێك خوێندەوە بۆ کردنی سەرەنجام لە پەڕلەماندا دەنگی لە سەردرا, دوای پەسەند کردنی پڕۆژەیاساکە (دوکتۆر میلیسپو) دەسەلاٚتێکی لە ڕادە بەدەری

---

[1] ماموریت برای وطنم, ص٩٦-٩٧.

پێدرا بۆ چاکسازی له بوواری دارایی ئێران دا, ئەویش ژمارەیەکی زۆری ڕاوێژکاری ئەمریکی له پله باڵاکانی دارایی و ئابووری وڵاتی ئێران دا دامەزراند, دامەزراندنی ڕاوێژکارانی دارایی و ئابووری ئەمریکایی لەگەڵ ڕاوێژکارانی سەربازی ئەمریکی دا یەکی گرت, سەرهەنگێکی ئەمریکی بەناوی ((شوارتسکف)) (کە دواتر بە پلەی ژەنەراڵی ڕۆڵێکی گرنکی بینی لە کودەتای ١٩ ئاب ١٩٥٣ز ,٢٨ مرداد ١٣٣٢هەتاوی)دا, بەناونیشانی ڕاوێژکاری ژاندار میری و ئەمرکیەکی دیکەی تریش بە ناوی ((تیمرمن)) بە ناوونیشانی ڕاوێژکاری شارەوانی دامەزران.

لە مانگی تیر ی ١٣٢٢هەتاوی دا, عەشایرەکانی فارس (شیراز) دەستیان بە شۆڕش کرد و لە سیمیرم گورزێکی توندیان دا لە کۆڵەکەی هێزی ڕەوانەکراوی ناوەند, هاوپەیمانان ئەم شۆڕشەیان بە چالاکی سیخوڕە ئەڵمانیەکانی نێو عەشارەکان لە قەڵم دا, ڕادیۆی لەندەن لەو بارەیەوە ووتی: لەکاتی گرتنی ئێران لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە ژمارەیەك لە سیخوڕە ئەڵمانیەکان خۆیان شاردەوە و ئێستا لە نێو عەشایرەکانی باشوری ئێراندا سەرگەرمی ئەنجامدانی چالاکین, ڕادیۆ لەندەن وەك زەمینەسازییەك بۆ هەڵوێستەکانی دواتری هاوپەیمانان ووتی: ئەنجامدانی کاری تێکدەرانە لە دامەزراوە نەوتیەکانی باشور و ڕێگاکانی ئاسن دا, لەلایەن ئەم سیخوڕانەوە بەدوور نازانرێت.

ژرار دوو ویلیە ئاماژە بە چالاکیەکانی دوو سیخوڕی ئەڵمانی دەکات لە ئێراندا, دوای داگیر کردنی ئێران لەلایەن هاوپەیمانانەوە و دەنووسێت: (یەکێك لە چالاکترین سیخوڕەکانی ئەڵمان لەئێراندا ناوی (شوڵتز) بوو, کە لە پێش هێرشکردنی هێزەکانی ڕوس و ئینگلیز بۆ سەر ئێران لە ئەبرێز سەرقاڵی چالاکی بوو, (پێدەچو کە لێپرسراوی تاوەوەی سۆڤیەت بوو لە ڕێگەی سنورەکانی ئازەربایجانەوە), پێش ئەوەی کە هێزەکانی سۆڤیەت بچنە نێو شاری تەبرێزەوە لەو شارە هەڵهات و ڕۆشتە شاری تاران, لەوێش خۆی نەگرتەوەو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەڕیکەوتن بۆ ئەفغانستان, بەڵام لەگەڵ هاوسەرەکەیدا لە سنوری ئەفغانستان دەستگیر کران و گەڕێنرانەوە بۆ شاری تاران, (شولتز) سەرکەوت لە هەڵهاتنی لە دەستی چاودێرەکانی و ئەمجارە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەرەو باشور کەوتنەڕێ, لەوێ ڕۆشتنە نێو هۆزی (قەشقائی) و پاش ماوەیەك سیخوڕێکی دیکەی ئەڵمانی کەناوی (فرانتز مایر) بوو,

پەیوەست بوو پێیە وە )، ژرار دەنووسێت: ئینگلیزەکان بە تەواوەتی چالاکیەکانی ئەم دوو کەسەیان خستبوویە ژێر چاودێریەوە، چونکە دەیانزانی کە ئەم دوانە دەیانەوێت شۆڕشێك لە نێو هۆزەکانی باشوردا دروست بکەن و سودیان لێوەر بگرن بۆ بێهێز کردنی دەسەڵاتی ناوەند، بۆ ئەوەی زەمینە سازیەك بۆ دەستوەردانە نێو کاروباری نێوخۆیی ئێران فەراهەم بێنن.[1]

بەپێی نوسینەکەی ژرار و ئەوەی کە لە دواتردا ڕوی دا، ئەوە هەڵئەهێنجرێت کە ئێنگلیزەکان ئاگایان لە شوێنی دانیشتن و وردەکاری چالاکیەکانی سیخوڕە ئەلمانیەکانی نێو ئێران بووە، شولتز و مایر بە بێ ئەوەی کە خۆیان ئاگایان لێ بێت بووبوونە جێبەجێکاری بەرنامەکانی ئینگلیز لە ئێراندا، لەبەر ئەوە دەستکەوتێك کە لە شۆڕشی قەشقائیەکان و ڕشەکوژ کردنی سەربازانی ئێرانی لە سمیرم دا بەدەست هات، لاواز کردنی دەوڵەتی ئێران و زیادکردنی دەستوەردانەکانی بەریتانیا بوو لە کاروبارە نێو خۆییەکانی ئێراندا، لەبەر ئەوە شولتز و مایریش ئازاد بوون لە پەیوەندی کردنیان بە ئێرانیەکانەوە، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی ئەوانەوە لایەنگرانی ئەڵمانیا بناسنەوە و لە کاتی خۆیدا دەستگیریان بکەن و ئەم بەرنامەیەشیان لە سەرەتاکانی مانگی شەهریوەری ١٣٢٢هەتاوی دا جێبەجێکرد.

لە ژمارەیەکی گۆڤاری (خواندنیها)، لە ڕۆژی (١٩ شەهریوەری ١٣٢٢هەتاوی)دا باسێکی پوختی زیاتر لە حەوت لاپەڕەیی تایبەتکردووە بە ڕوداوی دەستگیر کردنی (١٨٠)کەس لە پیاوانی سوپاو لەشکر و ئەندازیاران و کارمەندانی ڕێگای ئاسن، لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە، لە هەمان ژمارەی گۆڤارەکەشدا ڕاگەیەندراوێکی وەزارەتی ناوخۆ لە بارەی هۆکاری دەستگیرکردنەکەیانەوە بڵاو کراوەتەوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

*ڕاگەیەندراوی وەزارەتی ناوخۆ:*

*هەموان ئاگادار دەکاتەوە کە لەم دواییەدا تۆڕێکی ئەڵمانی کە بە مەبەستی سیخوڕی و دروستکردنی دووبەرەکی و دابەشکردنی کۆمەڵگە، کە بە کرێگیراوە ئەڵمانیەکانیان لە پشتەوە بووە و بە شێوەیەکی نایاسایی لە*

[1] Gerard de Villiers, p 125 .

*ئێراندا نیشتەجێ بووبوون ئاشکرا کرا, ئەوەش زانراوە کە ئەم تۆڕە لە بیری ئامادە کردنی شۆڕشێکی چەکداریدا بوورن دژی دەوڵەت, وە هەروەها ویستویانە پرد و تونێلەکانی هێڵی ئاسن وێران بکەن و پەیوەندیی و ڕێگاکانی گواستنەوە بپچڕێنن, بۆ ئەوەی ڕێگر بن لە بەردەم گواستنەوەی کالاّ سەربازیەکانی هاوپەیمانان, لەگەڵ ئەوەشدا پێویستیەکانی گواستنەوەی ئێرانیش پەك بخەن, سەرەنجام لە ئێراندا پەشێوی لە ڕەوشی ئاسایشی ولاّتدا دروست بکەن و ڕێککەوتنە هاوکاریەکانی نێوان ئێران و هاوپەیمانان بدەن بە یەکدا.*

*بەداخەوە وا گومان دەکرێت کە ژمارەیەك ئێرانیش لەم کارەدا بەشداریان کردووە و هاوکاری کاری ئەڵمانەکان بوون, لەبەر ئەوە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ولاّت و ئەو بەڵێنەی کە ئێران داویەتی لە جێبەجێکردنی پەیماننامەی هاوپەیمانیدا, هەنگاوی بۆ دەستگیر کردنی ئەو کەسانە هەڵهێناوە بۆ ئەوەی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت, جا داوا لە هەمو ئەو کەسانە دەکەین کە ئاگاداری لە بارەی چالاکی ئەوتۆڕە یان هەر ناوچەیەکی دیکە هەیە کە ئەڵمانیەکان تیایدا پارێزراون لە بەدواداچون لەلایەن دەوڵەتەوە, ئیدارەی گشتی شارەوانی ئاگادار بکەنەوە, ...... وەزیری ناوخۆ .......... تەدین.*

**شیاوی وەبیر هێنانەوەیە کە دەستگیر کردنی پیاوان و ئەفسەرانی ئێرانی ئەندازیاران و کارمەندانی ڕێگاکانی ئاسنی دەوڵەتی ئێران, ڕاستەوخۆ لەلایەن سەربازانی بەریتانی و بەبێ ئاگاداری پێشوتری دەوڵەتی ئێران دەستی پێکرد, دەستگیرکردنەکەشیان لێوانلێو بوو لە ئەشکەنجەدان و سوکایەتی پێکردن, بە ڕادەیەك کە ئەندازیارانی ڕێگاکانی ئاسن لە ژوری کارکردنیاندا دەستگیر کراون, وە کەلەبچەیان لەدەست کراوە و ژمارەیەکی تایبەتی دەدرا لە پشتیان و سواری سەیارەی سەربازی دەکران و دبرانە دەرەوەی تارانەوە, گۆڤاری (خواندنیها) دوای ئاماژەدان بە ئەم بابەتە دەنووسێت: بۆ پێوشوێن گرتنی ئەم هەواڵە ئەنجومەنی دەوڵەت کۆبوونەوەیەکی ئەنجام داو ئەم بابەتەی گەیاندە باڵوێزی ئینگلیز و ئەمریکاو سۆڤیەت, داوای ئەوەی لێکردن کە ئەگەر چاودێرانی بیانی لە هەرکەسێك بەگومانن,**

چاوەڕێ بکەن تا لە ڕێگەی دام و دەزگا نێوخۆییەکانەوە هەنگاو بۆ دەستگیر کردنیان هەڵبگیردرێت, سەرەنجام نوسراوێك لەلایەن دەسەلأتدارانی ئینگلیزی و ئەمریکاییەوە لە بارەی ئەوانەی کە گومانیان لە سەرە دەدرێت بە دەوڵەتی ئێران, دواتر ژمارەیەکی زۆر لە ڕێگەی کارمەندانی شارەوانیەوە دەستگیر و دەست بەسەر دەکرێن.

گۆڤاری خواندنیها ئەوەش دەنووسێت کە: ڕاسپێردراوانی شارەوانی بۆ گرتن و دەست بەسەر کردنی ئاغای سەید ئەبوولقاسمی کاشانی ڕۆشتونەتە سەر ماڵی موشارئیلەیهی, بەلأم ئەو لە ماڵدا نەبووە, بلأو بوونەوەی ئەم هەواڵە بوویە هۆی ئالۆسکاندنی بازاڕ و سەرەنجام بازاڕیەکان وەك ناڕەزاییەك دووکانەکانیان داخست, بەهەر حاڵ ماڵەکەی ئەو لە ژێر چاودێری کارمەندانی شارەوانیدا بوو.

ئەو نوسراوەی کە لەلایەن دەسەلأتدارانی بیانیەوە درابوو بە دەوڵەتی ئێران بۆ دەستگیرکردنی گومانلێکراوەکان, ناوی (١٨٠) کەس بوو کە (٢٨) کەسیان ئەفسەرانی لەشکر بوون, وەزارەتی جەنگ دوو کاتژمێر دوای ئاگادار کردنەوەی لە بارەی هاوکاری کردن لەگەڵ دەسەلأتدارانی هاوپەیماناندا دەستیکرد بە دەستگیر کردنی ئەفسەرە ناوبراوەکان و لە باشگەی سەربازان دا دەستگیری کردن, (١٠) لە ئەفسەرە دەستگیر کراوەکان دانیشتوی تاران بوون و (١٠) نەفەرەکەی دیکەشیان لە ئەسفەهان و کرماشان دا بوون, بە پێی ئاگاداریەکان کۆلۆنێل (پیوس) ی ئینگلیزی لە بارەگای لەشکردا سەردانی تیمسار سەرتیپ (ڕەزم ئارا)ی کردووە, گفتوگۆیان لە بارەی ڕوداوەکانی سەرەوە کردووە, ئەوەش بیستراوە کە ڕەزم ئارا ی سەرۆکی بنکەی لەشکر وەك دەربڕینی ناڕەزاییەك لە دژی ئەم جۆرە دەستوەردانانەی هاوپەیمانان, کە دژی سەربەخۆیی بوونی دەوڵەتی ئێرانە دەستلەکار کێشانەوەی خۆیی پێشکەشی وەزارەتی جەنگ کردووە, سەرەنجام ئەنجومەنی دەوڵەت بۆ گفتوگۆ کردن لەم بارەیەوە کۆبوونەوەیەکی ئەنجام دا, بەپێی زانیاریەکان دەوڵەتی ئێران سەرقاڵی گفتوگۆ دەبێت لەگەڵ دەسەلأتدارانی بیانی دا و دەبێت ئەم کارانە ئەنجام بدرێن, یەکەم, بەڵگەی پێویست بۆ دادگایی کردنی دەستگیر کراوەکان پێشکەش بکرێت, دووەم, لەکاتی ساغبوونەوەی دەست هەبوونی هەر کەسێت لە هەر تاوان و خراپەیەکدا پێویستە لە ئێران و لە دادگایەکی ئێرانیدا لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا ئەنجام بدرێت.

هەروەها خواندنیها لە بارەی بڵاوکردنەوەی ناوی دەستگیر کراوەکانەوە دەنووسێت: (بەپێی زانیاریەکان دەرکەوتوە کە بڕیاری دەستگیر کردنی ئەو کەسانە لەلایەن هەردوو باڵوێزخانەی بەریتانیا و ڕوسیاوە بووە, ئەم بەڵگەو تاوانبار کردنانەش لە هەمان نوسینەکانی فرانتزمایر ی ئەڵمانیەوە بەدەست هاتووە, مایر یش هەمان ئەو کەسەیە کە چەند هەفتەیەك پێشوتر لە شاری تاران دا دەستگیر کراو ناسراوە کە سەرۆکی سیخوڕە بەکرێگیراوە ئەڵمانیەکانی نێو ئێرانە, لە پێش دەستگیر کردنی مایر یش هەواڵێك لە نێو خەڵکدا بڵاو بوویەوە کە سەرگوردێکی هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا بە ناوی (شوڵتز) لە نێو خاکی قەشقائیەکاندا کار دەکات, بەڵام دەوڵەت لەم بارەیەوە بێدەنگی هەڵبژاردووە, دواتریش دەنگۆیەك بڵاو بوویەوە کە چوار پەڕەشوتەوانی ئەڵمانی لە خاکی قەشقائیەکاندا دابەزیون و چەك و پێداویستی گرنگ و پارەیان بۆ سەرگورد شوڵتز هێناوە و دەوڵەتیش هیچ ئاگاداریەکی بە خەڵکی نەداوە ).

سەرەنجام عەلی سوهەیلی سەرۆك وەزیرانی ئێران لە دانیشتنێکی تایبەتی ڕۆژی پێنج شەممەی (١٠ شەهریوەری ١٣٢٠هەتاوی)ی پەرلەماندا, ڕونکردنەوەیەکی لە بارەی ڕوداوی دەستگیر کردنی ژمارەیەك لە پیاوان و ئەفسەرانی لەشکر و کار کەرانی ڕێگای ئاسنی ئێرانەوە دا, گۆڤاری (خواندنیها) کورتەیەکی لەو ڕونکردنەوەیە لە ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژگارانەوە بڵاو کردووە تەوە و دەنوسێت: (سەرەتا لەبارەی دەستگیر کردنی کەسانێك کە لە ناوەندی ڕێگای ئاسن و هەندێك لە وەزارەتخانەکانەوە ئەنجام دراوە و داوای ڕەنکردنەوە لە جەنابی سەرۆك وەزیران کراوە, کە بە پێی زانیاریە زانراوەکان دەستگیر کردنی ئەوانە لەلایەن سەربازانی بیانیەوە ئەنجام دراوە دەبێت ببێتە مایەی دەربڕینی ناڕەزایی, سوهەیلی سەرۆك وەزیر ڕونکردنەوەی داوە کە لە ناوەندی ڕێگای ئاسندا چەند کەسێك لە ئەندازیارە بیانیەکان لەلایەن بەرپرسە بیانیەکانەوە دەستگیر کراون, وە ئەوانی دیکەی کە گومانیان لەسەر هەبووە لەڕێگەی ئیدارەی شارەوانی و وەزارەتی جەنگەوە دەستگیر کراون, ئەم دەستگیر کردنانەش لە ئەنجامی پێوشوێن گرتنی دەستگیر کراوێکی ئەڵمانیەوە بووە کە ماوەیەك پێشتر لە تاراندا دەستگیر کرا, ئاغای سەرۆك وەزیران زیاتر ڕونی کردەوە و کە ماوەیەك پێشتر سێ پەڕەشوتەوانی (چەتربان) ئەڵمانی بە

فڕۆکەیەک هاتونەتە قەشقائی و لەویٰ دابەزیون, هەندێك ئامێری تەقینەوە و سندووقی بەستراوەیان پیٰ بووە, کە بە پێی لێکۆڵینەوەکان ئەم پەڕەشوتەوانانە پەیوەندیان لەگەلٰ ئەو ئەڵمانیانەدا هەبووە کە لە ئێراندا بوون و لەم دواییانەشدا یەکێکیان لە تاراندا لیٰ دەستگیر کراوە, دوای کۆتایی هاتنی ڕوداوەکانی قەشقائی, سیٰ پەڕەشوتەوان لەویٰ ڕۆشتوون و کەرەستەکانی تەقینەوەکانیشیان لەگەلٰ خۆیاندا بردووە کە بۆ تەقاندنەوەی پرد و تونێل و بینا گرنگەکان بووە, کە ئەمەش لەکاتی ئاشکرا بوونی کێشەکان و پێوشوێن گرتنیاندا بوووە.[1]

لەهەمان ژمارەی گۆڤاری (خواندنیها) دا ناوی دەستگیر کراوەکان بلاٰو کرابوویەوە کە لە نێویاندا چەندین پلەداری دەوڵەتی پێشوی تیدا بوو, وەك: دکتۆر مەتین دەفتەری سەرۆك وەزیری پێشو, دکتۆر سەجادی وەزیری پێشوی ڕێگاوبان, موسەویزادە سەرۆکی دیوانی تاوانەکان, عەلی هەیئەت سەرۆکی لقی دیوانی بالاٰی ولاٰت, وە ژمارەیەك لە بەرپرسانی لەشکر وەك: سەرلەشکر ئاق ئولی, سەرلەشکر پور زەند, سەرتیپ کوپالٰ, وە پلەدارانی ڕێگای ئاسنی دەوڵەتی ئێران وەك: ئەندازیار جەعفەر شەریف ئیمامی, ئەندازیار ناسیح ناتیق, ئەندازیار داود ڕەجەبی, وە چەند ڕۆژنامە نوسێکی وەك: خەسرەو ئیقبالٰ بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (نبرد), جەهانگیر تەفەزولی بەڕێوەبەری ڕۆژنامەی (ایران ما), هەروەها دوای بلاٰو بوونەوەی ئەم لیستە چەندین کەسی دیکە دەستگیر کران, کە لە نێویاندا: ئایەتولاٰ کاشانی و سەرلەشکر زاهیدی (فەرماندەی لەشکری ئەسفەهان) و حەبیبوولاٰنەوبەخت پەڕلەمانتاری خولی سیازدەیەمی پەڕلەمان, دەبینران, سەر لەشکر زاهیدی دوای دەستگیر کردنی دوور خرایەوە بۆ فەلەستین, ئایەتولاٰ کاشانی و حەبیبوولاٰ نەوبەخت هەتا کۆتایی هاتنی جەنگ لە نێو زیندانیەکانی هاوپەیمانان‌دا مانەوە, لە هەڵبژاردنی خولی چواردەیەمی پەڕلەماندا ئایەتولاٰ کاشانی وەك نوێنەری تاران بۆ پەڕلەمان هەڵبژێردرا, بەلاٰم بەرنامەکانی ئەو لە پەڕلەماندا پیشکەش نەکرا و ئینگلیزەکانیش بۆئەوەی هیچ ڕێگەیەك بۆ ئازاد کردنی نەهێڵنەوە, ئایەتولاٰ کاشانیان گواستەوە بۆ زیندانی لەشکری سور لە شاری ڕەشت.

---

[1] خواندنیها. سال چهارم, شماره سوم, مورخ ۱۹ شهریور ۱۳۲۲.

هەرگیز هۆکاری ڕاستەقینەی ئەم کەسانە ئاشکرا نەکرا، لەبەر ئەوە کاریان نەگەیشتە دادگایی کردن، بەڵام تاکە شتێك کە لە دەستگیر کراوانی وەکو: خوالێخۆشبوو ئەندازیار ناتیق و جەهانگیر تەفەزولیم بیست، تەنها بەڵگەیەك کە بەدەستی هاوپەیمانانەوە بوو، لیستێك بووە کە لە کاتی دەستگیر کردنی (مایر)ی سیخوڕی ئەڵمانیدا لای ئەو دۆزراوەتەوە، ئیدی هیچ بەڵگەیەکی بڕوا پێکراو بۆ دادگایی کردنی ئەو دەستگیر کراوانە لە بەر دەستدا نەبووە، خوالێخۆشبوو ناتیقی کە پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ نوسەردا هەبووە، دەیوت: (من حاشا لەوە ناکەم کە لەگەڵ ئەندازیارە ئەڵمانیەکاندا، کاتێك کە لە ڕێگاری ئاسندا کاریان دەکرد، پەیوەندیەکی نزیکم هەبووبێت، لەبەر ئەوە ئینگلیز و ڕوسم بە دووژمنی ئێران دەزانی، لەگەڵ ئەڵمانیەکانیشدا کە دووژمنی دووژمنی وڵاتەکەی ئێمە بوون، سەروکارێکم هەبوو، بەڵام (مایر)م نەدەناسی، ئەگەریش ناوی من و دۆستەکانم لە لیستەکەی ئەودا بووە، لەو ڕوەوە بووە کە دووژمنانی ئینگلیز و ڕوس یان هەوادارانی ئەڵمان بەویان داوە، بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا پەیوەندی لەگەڵ ئێمەدا دروست بکات، دەیانوت پەیوەندی بە هەندێك لە ئەفسەرانی لەشکرەوە هەبووە، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ ئێمەدا نەبوو، لەوانەیە هەلیشی بۆ نەڕەخسابێت! ).

ئینگلیزەکان لە مانگی میهری ساڵی ١٣٢٢هەتاوی دا، دوای ئەوەی کە سەید زیائەدین تەباتەبایی زیاتر لە (٢٠) ساڵ لە فەلەستین لە ژێر چاودێری خۆیاندا ژیانی بەسەر دەبرد، هێنایانەوە بۆ ئێران، حەمەڕەزاشایش هەستی بەگومانی خراپی ئینگلیزەکان کردبوو لە بەرامبەر خۆیدا، هەربۆیە گەڕانەوەی زیائەدین و ئەو پێشوازیە بێ وێنەیەی کە لەلایەن لایەنگرەکانیەوە لێی کرا بە مەترسیەکی دیکە بۆ سەر خۆیی دەزانی، هەندێك لە سیاسەتمەدارە دژەکانی زیائەدین، وەکو قەوام سەڵتەنە، کە لە دەورانی کودەتاکەیدا چەرمەسەرییان بەدەستی ئەو بینیبوو، بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان لە ڕێگەی پیاوەکانیانەوە حەمەڕەزاشایان ئاگادار دەکردەوە کە سەیدزیائەدین کاندیدی ئینگلیزەکانە بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی، وە ئەگەریش ئەو بەوە ڕازی ببێت کە زیائەدین ببێت بە سەرۆك وەزیران ئەوا ئیدی کاری تەواوە!.

دەستپێکی ئەم بەرنامەیە هەڵبژاردنی سەیدزیائەدین بوو بە نوێنەری خەڵکی شاری (یەزد) بۆ پەرلەمانی خولی چواردەیەم، لەم نێوەندە دا هەلێکی زێڕین بۆ حەمەڕەزاشا ڕەخسا بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بکات بە هاوپەیمانانەوە و پێگەی سەڵتەنەتی خۆی جێگیر بکات، یەکەمین کۆنفرانسی سەرانی هەرسێ دەوڵەتە زلهێزەکە (ئەمریکا، بەریتانیا، سۆڤیەت) لە نیوەی یەکەمی (ئازەری ١٣٢٢هەتاوی)دا لە تاران بەسترا، ئێرانیش بەر لە بەستنی ئەم کۆنفرانسە بە ڕاگەیاندنی جەنگ لەگەڵ ئەڵمانیا و خۆ پەیوەستکردنی بە هاوپەیمانانەوە پێگەیەکی بەهێزی پەیدا کرد، حەمەڕەزاڕەزاشا دەربارەی ڕوداوەکانی ئەم کۆنفرانسەو دیدارەکانی خۆی لەگەڵ سەرانی هەرسێ وڵاتی زلهێزدا بەئەم شێوەیە دەنووسێت:

(لە مانگی نۆڤەمبەری ١٩٤٣ز دا کۆنفرانسی مێژوویی تاران بە بەشداری (ڕۆزفێڵت سەرۆکی ئەمریکا و ستالینی سەرۆکی سۆڤیەت و چەرچڵی سەرۆکی بەریتانیا) بەسترا، ڕۆزفێڵت بە هۆی هۆکاری نەزانراوە وە لە باڵوێزخانەی سۆڤیەتدا کە شوێنی حەوانەوەی ستالین بوو ، نیشتەجێ بوو، چەرچڵیش لە باڵوێزخانەی بەریتانیادا، کە دوای تەواو بوونی بەستنی کۆنفرانسەکە دەچویەوە بۆ باڵوێزخانەی ناوەندی و نیشتەجێ دەبوو، ڕۆزفێڵت بە هۆی لاوازی میزاجیەوە (ناساغی) توانای ئەوەی نەبوو کە لە شوێنی حەوانەوەکەی خۆیدا بچێتە دەرەوە، ئەم بابەتەش ڕەوشێکی سەرسوڕهێنەری هێنابوویە بوون، لەبەر ئەوە من ڕۆیشتم بۆ دیداری ئەو لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت، ئەمە لە کاتێکدا کە خودی ستالین هاتبوو بۆ دیداری من، سەرجەم دانیشتنەکانی کۆنفرانسەکە لە باڵوێزخانەی سۆڤیەتدا دەبەسترا، تەنها جارێك نەبێت کە چەرچڵ بە هۆی ساڵیادی ڕۆژی لە دایك بوونیەوە میوانداریەکی لە باڵوێزخانەی بەریتانیادا ڕێکخست.

لەگەڵ ئەوەی کە ئێران لە کۆنفرانسی ئەو سێ دەوڵەتەدا ڕۆڵی نەبوو، من یەکەیەکە گفتوگۆم دەکرد لەگەڵ سەرانی ئەو سێ دەوڵەتەدا، بەتایبەتی ستالین لەکاتی دیدارەکانی لەگەڵ مندا بەڕێزو یاسا پارێز بوو، ئەو بە ڕواڵەت وا دەردەکەوت کە دەیەوێت کە یادگاریەکی باش لە بارەی خۆیەوە لە بیرەوەری مندا بەجێ بهێڵێت، تەنانەت پێشنیاری بەخشینی نزیکەی هەزار تانکی (ت-٣٤) و پۆلێك فڕۆکەی جەنگی پێدام، لەوکاتەدا لە بەردەم بابەتی جەنگێکی سەختی نویدا بووین لە

کەنداودا زۆری نەمابوو کە بە پێشنیارەکەی ڕازی ببم, بەڵام چەند هەفتەیەك دواتر کە لە وردەکاریەکان ئاگادار بووین دەرکەوت کە ئەو دیاری و بەخشینانە بە چەند مەرجێکی قورس و توند پێچراوەتەوە, بەو شێوەیە دەبوو ئەفسەر و پلەدارانی ڕوسی لەگەڵ ئەو دیاریانەدا بێنە وڵاتی ئێرانەوە, دەبوو شوێنی وەستانی تانکەکان تەنها لە شاری قەزوێن و فڕۆکە جەنگیەکانیش لە شاری مەشهەد دا بن, وەهەتا کۆتایی هاتنی ماوەی خولی فێربوونی ئێرانیەکان کە ماوەکەی دیاری نەکرابوو دەبوو تانك و فڕۆکەکان لە ژێر چاودێری ڕاستەوخۆی لەشکری ڕوسیادا بێت و فەرمان لە مۆسکۆ وە وەربگرن, هەڵبەتە نەك تەنها نەمدەتوانی دیاری ستالین بەو مەرجانەوە پەسەند بکەم, بەڵکو ئەگەر وەها پێشنیارێك لەلایەن هەر وڵاتێکی دیکەشەوە بووایە بەدڵنیاییەوە پەسەندم نەدەکرد, هەربۆیە دوای سوپاسگوزاری داوای لێبووردنم کرد لە قبووڵنەکردنی ئەو دیارییانە.

لە درێژەی کۆبوونەوە و گفتوگۆکانمدا لەگەڵ ڕۆزفێڵتدا, ئەوەی دردەخست کە دوای کۆ تایی هاتنی ماوەی سەرۆکایەتی کۆماری ئارەزومەنە کە بە ناونیشانی پسپۆری بە دۆکیۆمێنت کردنی جەنگەکان بگەڕێتەوە بۆ ئێران, ئارەزومەندی ئەو بۆ ئەو بەشە بۆ هەموان ئاشکرا بوو, وە ئەو سۆزو تاسەیەی کە ئەو هەیبوو بۆ گفتوگۆ لەمبارەیەوە ئەوەی دەردەخست و بەڵگەی ڕاستگۆیی وتەکانی ئەو بوو, بە بۆچونی من ڕۆزفێڵت کەسێکی ڕۆژئاوایی زیرەك و بەرجەستە دێتە پێش چاو, وە عاشقی زانا دانایانی پەرێشان و دڵرفێنی ئێرانی و فەرهەنگی ئەم سەر زەمینە بوو, لەگەڵ ئەوەی کە بەتەواوی دژی هەندێك لایەنی سیاسەتی دەرەوەی ڕۆزفێڵت بووم بەڵام لە هەندێك ڕوی دیکەوە بە چاوی ڕێزو خۆشەویستیەوە لێم دەڕوانی, زۆر بەداخم کە مەرگی لەناکاوی ئەو هەلی بەدیهێنانی ئارەزوەکانی کە بۆ ئێمەش بەسود بوو, نەڕەخساند.

کاتێك کە خەڵکی ئێران ئاگاداری دەقی ڕاگەیەندراوەکەی کۆنفرانسی تارانی ڕوزفێڵت و چەرچڵ و ستالین بوون زۆر شادوومان بوون, لەبەر ئەوە بە ملیۆنان کەسی ئەم وڵاتە لەڕەوشی خراپی ئابووری خۆیان کەمێك باشتر بوون و حەپەسابوون کە ئایا دوای تەواو بوونی جەنگ دووبارە ئازادی لەدەست چویان بۆ دەگەڕێتەوە یا نا, ڕاگەیەندراوەکەی تاران کە لە ڕۆژی (۱ی دیسەمەبەر, ۱۰ی ئازەر ۱۳۲۰هەتاوی)دا دەرکرا, بەهۆی ئەو ڕوداوانەی کە دواتر ڕویان دا ئەوەندە گرنگە کە بەشێك لە ڕستە

سەرەکیەکانی لێرەدا بخەینە ڕوو: دەوڵەتانی ئەمریکا و بەریتانیا و سۆڤیەت دان دەنێن بەو هاوکاریانەی کە دەوڵەتی ئێران ئەنجامی داوە بۆ بەرەو پێش چونی شەڕ لە دژی دووژمنی هاوبەش، بەتایبەت ئەنجامدانی ئەو ئاسانکارییانەی کە پێی هەستا لە گواستنەوەی کەلوپەلی پێویست لە ناوچەی نێوان دوودەریاوە بۆ یەکیەتی سۆڤیەت، هەرسێ دەوڵەتی ناوبراو بڕوایان بەوە هێناوە کە ئەم جەنگە چەرمەسەری تایبەتی ئابووری لە ئێراندا دروست کردووە، وە ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە بۆ هەمو جۆرە هاوکاریەکی ئابووری کە لە تواناداا بێت بۆ وڵاتی ئێران.

دەوڵەتانی ئەمریکا و بەریتانیا و سۆڤیەت هاوڕان لەگەڵ دەوڵتی ئێراندا بۆ پاراستنی سەربەخۆیی و سنورەکان و فەرمانڕەوایی لە ئێران، وە بە بەشداری دەوڵەتی ئێران لەگەڵ سەرجەم میلەتانی لایەنگری ئاشتی سورن لە سەربەخۆیی ئاشتی نێودەوڵەتی و ئاسایش و خۆشگوزەرانی دوای جەنگ، بە پێی بڵاوکراوەی ئەتلانتیك کە هەر چوار دەوڵەتەکە پەسەندیان کردووە.

هەرکەسێك ئەم دەستەواژە ئومێد بەخشانەی دەخوێنێتەوە، نزیك بوونەوەی سەرکەوتنی هاوپەیمانانی دەبینی، لەوە دڵنیا دەبوو کە سەردەمی ناڕەحەتی نیشتیمانەکەی من ڕو لە ئاوابوونە، بەڵام ڕوداوەکانی ڕابردوو لە بەرامبەر ئەوەی کە دوای ئەوە چی ڕودەدات مایەی گرنگی پێدان نەبوو، هەر لە بەر ئەوە لە باتی ئەوەی کە سەردەمی پەروەردەو فێرکردنی من (بۆ سەڵتەنەتداری) کۆتایی پێ بێت کەچی پێی دەنایە قۆناغێکی دژوار ترەوە).[1]

ئەوەی مایەی سەرسوڕمانە لەوەی کە حەمەڕەزاشا دەربارەی کۆنفرانسی تارانەوە نوسیویەتی، بێدەنگیەتی لە بارەی چەرچڵ و ڕەوشی ئینگلیزەکان لەو کۆنفرانسەدا، دواتر (کارانجیا)ی ڕۆژنامە نوسی هیندی کە چەندین گفتوگۆی دەربارەی ئێران و یادگاریەکانی شای لە ڕابردوو دا لەگەڵ حەمەڕەزاشا دا ئەنجام داوە، چەندین پرسیاری دەربارەی کۆنفرانسی تارانی سەرانی سێ وڵاتی زلهێز لە شا کرد، لەوەڵامدا شایش کەم و زۆر هەمان ئەو شتانەی کە لە کتێبەکەیدا نوسیبووی بۆ ئەویشی دووبارە کردەوە، بەڵام ڕۆنامە نوسە هیندیەکە کە ئاگای لە بێدەنگیەکانی شا

---

[1] ماموریت برای وطنم. ص ١٠١-١٠٣.

هەبوو دەربارەی چەرچڵ، بۆیە گووتی: (لەبارەی دیدارت لەگەڵ چەرچڵدا شتێکی وەهات نەوتووە)، شا لە وەڵامدا ووتی لەکاتی پێشتر ئەوم لە کاتی بەجێهێشتنی تاران (لەکاتی سەردانی بۆ مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٤٢ن) بینیبوو، وە لە کاتی بەستنی کۆنفرانسەکەی تارانیشدا سەردانم کرد، ڕۆژنامە نوسە هیندیەکە بە سەرسوڕمانەوە پرسی، چۆن چۆنی!؟ سەردنی ئەویشت لە باڵوێزخانەی سۆڤیەت دا کرد، شا وەڵام دەداتەوە (ئۆهـ..... بەڵێ ئەو زەحمەتی بە خۆی نەدا بۆ بینینی پادشای میواندار بێت بۆ شوێنی حەوانەوەی من! )، کارانجیا پرسی لە بارەی چیەوە گفتوگۆتان کرد؟ شا دەڵێت: (من چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد کە بۆچونەکانی دڵی خۆی لەگەڵ مندا باس بکات، ئەوەی کە ئەو دەیەویست دابەشکردنی ئێران بوو بۆ دووبەشی دەسەڵات لە نێوان ڕوس و ئینگلیزدا، پێشم وایە کە ئەو لەم بابەتەدا لەگەڵ ستالیندا هاوڕا بوو!).

هەر لەئەم چاوپێکەوتنەدا شا بابەتێکی نوێی دەربارەی گفتوگۆکانی خۆی و ستالین ئاشکرا کردووە و دەڵێت: بۆ ئەوەی ستالین من دڵنیا بکاتەوە دەربارەی مەبەستە سیاسیەکانی خۆی لە ئێراندا ووتی: (لەبارەی ئێمەوە نیگەران مەبە، کۆمۆنیست تا پەنجا شەست ساڵێکی دیکە بەلای ئێوەدا نایەت!).[1]

دڵنیا کردنەوەی چارەنوس ئەوەیە کە شا لە دیدارەکەیدا لەگەڵ ڕۆزفێڵت ی سەرۆکی ئەمریکادا کاریگەریەکی زۆری کردووەتە سەری، وە پێشنیاری دەرکردنی ڕاگەیەندراوی سێلایەنە، بۆ دڵنیا کردنەوەی ئێران لە پاراستنی سەربەخۆیی تەواوی سەرجەم خاکی ئێرانیش هەر لە لایەن ڕۆزفێڵتەوە بووە، ڕۆزفێڵت پێش دەرچونیشی لە ئێران نامەیەکی دۆستانەی بۆ شا نوسی ، تیایدا جەختی لەسەر ئەوە کردبوویەوە کە ئەو ئارەزو دەکات بە فراوانکردن و تۆکمەتر کردنی پەیوەندیەکانی نیوان ئێران و ئەمریکا، ڕۆزفێڵت لە دەقی فەرمی نامەکەدا ئەم ڕستەیەشی بە دەستنوسی خۆی زیاد کرد، کە ئومێدەوارە لە یەکەمین هەلی گونجاوی دوای کۆتایی هاتنی جەنگ لە واشنگتۆن پێشوازی لە شا بکات، ئەم نامەیە کە دەستپێکی دەسەڵاتی سیاسی و دەستوەردانەکانی دواتری ئەمریکا بوو لە کارو بارەکانی ئێراندا، زیاتر لە هەمو شتێك حەمەڕەزاشای خۆشحاڵ و گەشبین کرد.

[1] The mind of a monarch, pp 69-70.

تەمەنی خولی سیازدەیەمی پەرلەمان چەند رۆژێك بەر لە بەستنی کۆنفرانسی تارانی هاوپەیمانان کۆتایی هات, هەڵبژاردنەکانی خولی چواردەیەم لە مانگەکانی (دەی و بەهمەن)دا لە پێش بوو, هەتا کۆتاییەکانی مانگی (دی) لە شارەکانی باکوردا کە لە ژێر دەسەلاتی ڕوسەکان دا بوو چەند کەسێکی تودەی (ئەندامی حیزبی تودە) هەڵبژێردران, ئەنجامە بەراییەکانی هەڵبژاردنەکانی تارانیش باسیان لە سەرکەوتنی دەستەی کاندیداکانی وجیەالملە (جەبهی میللی) بە سەرۆکایەتی دوکتۆر موسەددەق دەکرد, سر رید پۆلارد کە لە دوای فراوانبوونی ڕوبەری نوێنەرایەتی بەریتانیا لە ئێران پلەکەی بەرز کرابوویەوە لە وەزیری موختارەوە بۆ باڵوێز, لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا (٢٠ی ژانویە , ٣٠ مانگی دی ١٣٢٢هەتاوی), ڕاپۆرتێکی نهێنی دەنێرێت بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا کە وێنای ڕۆڵی تازەی شایە لە ئێراندا, لەو ڕاپۆرتەدا هاتووە:

(شا لە (١٩یژانویە) ناردی بە دوامدا و لە بارەی کارێکە وە کە لەخەیاڵیدابوو ئەنجامی بدات بۆچونی منی وەرگرت, ئەویش ئەوە بوو کە پەرلەمان هەڵبووەشێنێتەوە[1], وە هەڵبژاردنێکی نوێ لە ژێر چاودێری سەرۆك وەزیرانێکدا کە هەموان باوەڕیان پێی هەبێت و لێی دڵنیا بن ئەنجام بدرێت, پرسیارم لێکرد کە ئایا بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەو پەرلەمانەی دروست دەبێت جیاوازی زۆری دەبێت لەگەڵ ئەو پەرلەمانەی کە ئەو دەیەوێت؟ وەلامی ئەو ئەوە بوو کە پەرلەمانتارانی نوێ بەلانی کەمەوە هەلبژێردراوی خەڵکن, دەترسم ئەوەی کە حەمەڕەزاشا دەیەوێ ئەوە نەبێت کە پەرلەمانتارە باشەکان بن, بەڵکو ئەوانەی بوویت کە زیاتر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوبن, پاڵەوانێك کە دەتوانێت ببێتە سەرۆك وەزیران و هەڵبژاردنێکی نوێ ئەنجام بدات دوکتۆر موسەددەقە, پێدەچێت دوکتۆر موسەددەق هەروەکو شا ئاماژەی پێدا, بەهۆی پێشینەی ناکۆکی لەگەڵ شای پێشودا (ڕەزاشا) جێگای ڕێز لێگرتن بێت, وە لەبەر ئەوەشی کە هەتا ئێستا لە لوتکەی دەنگە بەدەستهاتوەکانی تارانە, بەهەر حاڵ ئەو لە تەمەنی ڕاستەقینەی خۆی کە زیاتر لە شەست ساڵە پیرتر دەنوێنێت, لە

[1] لەو بەروارەدا پەرلەمان بوونی نەبووە, مەبەستی شا پوچەڵکردنەوەی هەڵبژاردنەکان بووە.

سەرچاوەیەکی جێگای باوەڕیشەوە دەستکەوتووە ئەو گرفتاری نەخۆشی پەرکەم (فیَ) بووە, چەند ساڵێك پێشتر وابەستەی سەربازی بەریتانیا بووە, ئەو دوکتۆر موسەددەقی لە پۆستی والی ویلایەتی فارس (شیراز) دا بە کەسێکی نە شیاو و لێنەهاتوو بەڵام ناسیۆنالیست دەزانێت, باسی ئەو لە کتیبی کەسایەتیەکان (شخصیتها)ی (سرجی هاوارد) دا بە ناونیشانی (کەسێکی لاف لێدەر) کە ئەوی باشتر دەناسی, هاتوە:

(لە گفتوگۆی ١٩ی ژانویە دا, شا زۆر هەوڵیدا کە ڕەزامەندی من لەبارەی پێشنیارەکەیەوە وەربگرێت, من لەو لایەنەوە خۆم لادا و وتم تەنها دەبێت ئەو بڕیار بدات, وە ئەوەشی لەبیر بێت کە پێدەچێت تاوانبار ببێت بە هەوڵدانی بۆ دەستوەردان لە هەڵبژاردنەکان بۆ مەبەستی خۆی, من لەو بڕوایەدام کە شا خەریکە دووچاری هەڵەیەکی گەورە دەبێتەوە, هەستم دەکرد ئەرکی سەرشانمە کە ئەو بابەتەی پیَ بڵێم)[1].

لە ڕاپۆرتەکەی باڵوێزی ئینگلیزدا چەند بابەتێك مایەی هەڵوەستە لەسەر کردنە, سەرەتا, ئەوەی کە ئەم ڕاپۆرتە لەچاو ڕاپۆرتەکانی دیکەدا جۆرێك لە ڕێزی لە بەرامبەر شادا تێدا بەدی دەکرێت, وە بەتەواوی ئاشکرایە کە پێگەی شا دوای بەستنی کۆنفرانسی سێلایەنەی تارانی نیوان سیَ دەوڵەتە زلهێزەکە بە هێزتر بووە, دووەمیان, ئاشکرایە کە خودی شا ناوی دوکتۆر موسەددەقی وەك کەسێکی لەبەرچاو بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی بردووە, سێەمیش, ئەوە باڵوێزی ئینگلیزە کە هەوڵدەدات شا لەو بۆچونەی پەشیمان بکاتەوە و شتانێکی نابەجێی لەڕاپۆرتەکەیدا داوەتە پاڵ دوکتۆر موسەددەق و بە شایشی وتووە.

بەڵام ئەوەی کە بۆچی حەمەڕەزاڕەزاشا لەو ڕەوشەدا دوکتۆر موسەددەق لە بەرچاو دەگرێت بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, کارێکی گرنگ و مایەی تێڕامانە, یەکەم, لەو کاتەدا شا لە خەیاڵی خۆیدا پێشینەیەکی باشی لەگەڵ دوکتۆر موسەددەقدا هەبووە, وا بیری دەکردە وە کە تکا کردنی ئەو لای باوکی بۆ دوکتۆر موسەددەق کە بە ئازاد کردنی ئەو لە زینداندا کۆتایی هات, زەمینە سازیەکی باش

[1] نامەهای خصوصی و گزارشهای محرمانە سر رید پولارد. ص٥١١_٥٢١.

دەبێت لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ دوکتۆر موسەددەقدا, دووەم, شا نیگەران بوو لە هاتنی نوێنەرانی حیزبی تودە بۆ نێو پەرلەمان, بیری لەوە دەکردەوە کە تەنها پیاوێکی خۆشەویست و ئێسقاندار دەتوانێت لە بەرامبەر کۆمۆنیستەکاندا ئالآ هەڵبکات, هۆکارێکی دیکە ئەوە بوو کە شا زیاتر لە نوێنەرەکانی حیزبی تودە لە هەڵبژاردنی سەید زیائەدین تەباتەبایی دەترسا کە وەك نوێنەری خەڵکی یەزد هاتبووە پەرلەمان, وا گومانی دەبرد کە لەکاتی پوچەڵکردنەوەی هەڵبژاردنەکان-و کردنی دوکتۆر موسەددەق بە سەرۆك وەزیران, دەتوانێت ڕێگری بکات لە هاتنی سەید زیائەدین بۆ پەرلەمان, چونکە دوکتۆر موسەددەق یەکێك بووە لە دژەکانی سەیدزیائەدین لە سەردەمی کودەتاکەی سەید دا.

حەمەڕەزاڕەزاشا لە کتێبێکیدا پشت ڕاستی ئەو ڕاپۆرتە نهێنیەی سر رید پۆلارد کە لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە دەکاتەوە, لە بارەی ڕوداوەکانی هەڵبژاردنی خولی چواردەیەمی پەرلەمانەوە دەنووسێت: (لەوکاتەدا لەبارەی دەستوەردانەکانی هاوپەیمانان لە ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکاندا و دیاری کردنی پەرلەمانتاران, زۆر ناڕازی و بێزار بووم, لەبەرئەوە ئەوان لیستێکیان لە کاندیداکانی خۆیان ئامادە دەکرد و دەیاندایە سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتە, وە فشارێکی توندیشیان دەخستە سەری کە بەدڵنیاییەوە دەبێت کاندە ناوبراوەکان هەڵبژێردرێن بۆ پەرلەمان, لەبەر ئەوە ئەم پرسە بۆ من مایەی ڕەزامەندی نەبوو, بەخەیاڵمدا هات کە دەربارەی جڵەوگرتنی ئەم کارە شەرم هێنەرە ڕاوێژ لەگەڵ دوکتۆر موسەددەقدا بکەم, لەبەر ئەوە لەو کاتەدا پەیوەندی من لەگەڵ موسەددەقدا, کە یەکێك بوو لە خزمەتکارە بەڕێزەکانی نیشتیمان و دژی هەمو دەسەلاتێکی بێگانەش بوو لە وڵاتدا, باش بوو, بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەگەرموسەددەق بەپێی بڕیارەکانی دەستور بکەم بە سەرۆك وەزیران و ڕایسپێرم بۆ پێکهێنانی حکومەت, پێدەچێت داوا بکات کە هەڵبژاردنێکی نوێ کە بەتەواوەتی دوور بێت لە دەستوەردانی بێگانەکان لە وڵاتدا ئەنجام بدرێت, لەبەر ئەوە بانگم کرد و خەیاڵەکەی خۆمم لەگەڵدا باسکرد, موسەددەق لە وەڵامدا ووتی: بە دوو مەرج ئەو بەرپرسیاریتیە لە ئەستۆ دەگرم, وەختێك پرسیم ئەو دوو مەرجە چیە؟ ووتی: یەکەم, ناردنی پاسەوانی چەکدار بۆ پاراستنی خۆی, دەست بەجێ ئەم مەرجەم پەسەند دەکەم, ئەوکات ووتی: مەرجی دووەم, ڕەزامەندی پێشوەختی ئینگلیزەکانە سەبارەت

بەم بەرنامەیە, لە بارەی ئەم مەرجەیانەوە توشی شۆك بووم, پرسیم (ئەی ڕوسەكان؟), وەڵامی دایەوە (ئەوانە گرنگیان نیە و تەنها ئینگلیزەكانن كە لە بارەی هەمو بابەتێكەوە لەم وڵاتەدا بڕیار دەدەن!.).

ئەم جۆرە بۆچون و ئایدیایە مەترسیدارەو بوویە هۆی نیگەرانیم, لەگەڵ ئەوەی كە دمبینی دەبوو ڕەچاوی ڕەوشی هەستیاری وڵاتەكەم بكەم كە كەوتۆتە چنگی هێزە داگیركەرەكانەوە, وە دەتوانە سەرجەم كاروبارە نێوخۆییەكانی وڵاتەكەی ئێمە, لەو دەمە قەیراناویەی وڵاتدا نیشتیمان پەروەری موسەددەق و ئەو خۆشەویستیەی كە لە نێو خەڵكدا هەیبوو, گەورەترین سەرمایەی وڵات بوو, لەبەر ئەوە بەوپەڕی ناچاریەوە وتم, كەسێك دەنێرم بۆلای باڵوێزی ئینگلیز لە تاران و لە مەبەستی خۆم ئاگاداری دەكەمەوە, بەڵام لەبەر ئەوەی كە داواكاریەكەی موسەددەق (كە تەنها ڕاوێژ كردن بوو بە باڵوێزی ئینگلیز) جێبەجێ نەكەم, پێم وت كەسێكی دیكەش بۆ باڵوێزخانەی ڕوس, واتە وڵاتێكی داگیركەری دیكە دەنێرم, بۆ ئەوەی ئەوانیش لەم بەرنامەیە ئاگادار بكاتەوە, لەو كاتەدا باڵوێزی گەورەی بەریتانیا لە ئێران, سر رید پۆلارد بوو كە بەئەم بەرنامەیە ڕازی نەبوو, بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە هەڵبژاردنێكی نوێی سەرتاسەری لەم كاتەدا پەشێوی دروست دەكات, بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێم كە باڵوێزی گەورەی ڕوس هیچ جۆرە دژبوونێكی لەمبارەیەوە دەرنەبڕیبوو, دوای ئاگادار بوونم لە هەڵوێستی هەردوو باڵوێزەكە, تەلەفۆنم بۆ دوكتۆر موسەددەق كرد و سەرەنجامی گفتوگۆكانم پێڕاگەیاند, ئەو لە وەڵامی مندا تەنها سوپاسگوزاری خۆی دەربڕی, ئیدی گفتوگۆی من و ئەو لە بارەی دووبارەكردنەوەی هەڵبژاردنەكانەوە كۆتایی پێهات و بۆچونی منیش بۆ پێدانی پۆستی سەرۆك وەیرانی بەو بە بنبەست گەیشت )[1].

دوای گواستنەوەی ڕاپۆرتەكەی سر رید پۆلارد و نوسینەكەی حەمەڕەزاڕەزاشا, جێگای خۆیەتی ئاماژەیەكیش بە دان پێدا نانی دوكتۆر موسەددەقیش لەمبارەیەوە بكەین, دوكتۆر موسەددەق لە وەڵامی ئەوەی كە حەمەڕەزاشا پێشنیاری بوون بە سەرۆك وەزیرانی ئەوی كردووە لە كاتی ڕوداوەكانی هەڵبژاردنەكانی خولی

---

[1] ماموریت برای وطنم, ص۱۰۹- ۱۱۱.

چواردەیەمی پەرلەماندا, دەنووسێت: (وابزانم تا ئەو ڕۆژە سێیەم جارم بوو بە خزمەتی شا بگەم, ئەم گفتو گۆیانەش کاتێك ئەنجام درا کە هەڵبژاردنەکانی خولی چواردەیەمی پەرلەمان لە هەمو شوێنێکدا تەواو بووبووو, لە دەنگەکانی تاراندا ژمارەیەکی کەمی مابوو کە جیا نەکرابوونەوە, لەو بە خزمەت گەیشتنەدا دەمبیست کە ڕەزامەندی دەر نابڕن بە هەڵبژاردنی من بە نوێنەری یەکەمی تاران لە خولی چواردەیەمی پەرلەماندا, بەڵام هەرچۆنێك بێت لە بەرامبەر فەرمایشتەکانیدا کە دەیفەرمو, داوای لێبووردنم دەکرد و دەموت دەستور ڕێگە نادات کە شا سەرۆك وەزیران لاببات و من لە جێگەی ئەودا دابنێت, دەوڵەتیش ناتوانێت کە ئەو دەنگانەی خەڵکی داویانە بە ژمارەیەك کەس و بە نوێنەری خۆیان هەڵیان بژاردوون, پوچەڵ بکاتەوە, هیچ کاریگەریەکی نەبوو, لەبەر ئەوەی کە خاوەن شکۆ (حەمەڕەزاشا) لە دوای (٢٠) ساڵ سەڵتەنەتداری[1], هێشتا نازانن کە جیاوازی حکومەتی سەرکوتکەر و خۆسەپێن لەگەڵ حکومەتی دەستوریدا چیە؟, بەڵام بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی کە بە هۆی تکای حەمەڕەزاڕەزاشا وە لای باوکی من لە بەندیخانەی (بیرجند) ئازاد کرابووم, نەمدەویست بە جۆرێك وەڵامی بدەمەوە کە ناڕەحەتی بە دەستمەوە بچەژێت, لەبەر ئەوە بوو کە پێم وت دانانی من لەو پۆستە لە کاتێکدا کە لەشکری بێگانە وڵاتی داگیر کردبوو, پەیوەستە بەوەی کە باڵوێزخانەی ئینگلیز دژایەتی دانانی من نەبن لەو پۆستەدا, بەڵام دڵنیا بووم لەوەی کە ئەو ئەزمونەی ئەو باڵوێزە لەگەڵ مندا هەیبوو[2], (ڕەزامەندی دەرنابڕێت) ).

لەگەڵ ئەو بەرەوپێشچونەی بڕیارەکەی شا بۆ دانانی دوکتۆر موسەددەق لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی و پوچەڵکردنەوەی هەڵبژاردنەکانی خولی چواردەیەمی پەرلەمان, ئاشکرا نەکرا و خولی چواردەیەمی پەرلەمانیش لە ڕۆژی (٦ی ئیسفەندی

---

[1] دوکتۆر موسەددەق ئەم بابەتەی لە ساڵی ١٣٤٠هەتاوی دا, دوای بڵاو بوونەوەی کتێبەکەی حەمەڕەزاڕەزاشا نوسیوە.

[2] خاطرات و تالمات مصدق, ص٣٥٨-٣٥٩. ڕونکردنەوەیە لە کتێبەکەدا بنەڕەتەکەدا ڕستەکەی ناتەواوە, پێدەچێت دەستەواژەی (ڕەزامەندی دەرنابڕێت) یان ڕستەیەکی هاوشێوەی ئەوە نەنوسرابێت, لەبیرچوبێت بنوسرێت.

١٣٢٢هەتاوی )دا کرایەوە, دوای پێکهێنانی پەرلەمان, کاتی پێشکەش کردنی کارنامەکان, دوکتۆر موسەددەق دژایەتی خۆی بۆ کارنامەکەی سەیدزیائەدین تەباتەبای دەربڕی و هێرشە توندەکانی بۆ سەر سەیدزیائەدین, کە بوویە هۆی لاواز بوونی پێگەی سەید هەر لە دەستپێکی دەورەی نوێی چالاکیە سیاسیەکانی ئەو لە ئێراندا, لە ڕاستیدا بێ دوودلّی بوویە مایەی دلّخۆشبوون و ڕەزامەندی حەمەڕەزاشا, سەید زیائەدین لە وەلاّمی دوکتۆر موسەددەقدا لە بابەتی بەرگریکردن لە کودەتاکەی (١٢٩٩هەتاوی)دا وشەگەلێکی ناحەز و ڕیسوایی ئامێزی لە بارەی ڕەزاشاوە بەکار هێنا کە بۆ کوڕەکەشی ناحەزو ڕیسواکەر بوو, سەید زیائەدین بە ئاماژە دان بە وتەکانی خودی دوکتۆر موسەددەق لە خولی پێنجەمی پەرلەمان کاتی پێشنیار کردنی مادەی یەك ی تایبەت بە ڕیشەکێشکردنی قاجاریەکان و لایەنگیری تەواوی دوکتۆر موسەددەق لە ڕەزاشا, دوای دووبارە کردنەوەی ئەم ڕستەیەی دوکتۆر موسەددەق کە (من باوەڕو ئیرادەم بە ڕەزاخانی پەهلەوی هەیە, لەبەر ئەوەی کە ئاسایشم دەوێت, هێمنیم دەوێت, کە هەر لە سپێەی دەرکەوتنی ئەوانەوە تەواوی ئەم شتانەمان لەم دوو سێ سالّەی کۆتاییدا هەبووە ), ووتی: (ئەو سەردارسپە (ڕەزاخان)ەی کە هێمنی بە ئێوە داو ئازادی کردن لە بەدەست هێنانی کاری خۆتاندا, کێ بە ئێوەی دا جگە لە سەیدزیائەدین؟.. ئێوە کە ڕەزا جانتان بە هیچ شێوەیەك نەدەناسی, ئەو سەربازێك بوو وەکو هەزاران سەربازی داماوی تر, هەمان ئەو ڕەزاخانە بوو کە لەگەلّ چوار هەزار قەزاقدا لە شاری قەزوێن کەوتبوون و پاشماوەکانی نان و گۆشتی لەشکری هیندیان بۆ ماوەی چوار مانگ پێدەدان, ئەوکاتە تۆ لەکوێ بوویت؟ ئەگەر ئەو باش بوو دەبێت منیش باش بم, تائەو کاتەی کە ئەو هەبوو منیش باش بووم, خزمەتی دەکرد هێمنی دەپاراست, پایتەختەکەی ئێوەشی لە مەترسی دەپاراست, ئێستا لە بەرامبەر ئەو خزمەتانەی کە کردوومانە, لە بەرامبەر ئەو مەترسیانەی کە لە ژن و مالّ و مندالّەکانی ئێوەمان دوور خستەوە, پاداشتمان ناوێت, ڕێزمان ناوێت, ئیدی بۆچی جنێوم پێدەدەیت؟ بۆچی لە خۆوە قسان دەکەیت؟ ئاخر خۆ بانێك و دوو هەوا نابێت, ئاغا!...)[1].

[1] نقل از صورت مذاکرات مجلس شورای ملی, جلسه چهار شنبه, ١٧ی ئەسفەندی ١٣٢٢هەتاوی.

ئەو بابەتانەی کەجێگای سەرنجن لە یەکەمین وتاری سەیدزیائەدین تەباتەبایدا لە پەرلەمان، کە لە وەڵامی دوکتۆر موسەددەقدا بوو، لایەنگری ئەو بوو لەو (٥٣) نەفەرە کۆمۆنیستەی بەندیخانەکانی سەردەمی ڕەزاشا، کە بناغەی تەواوی حیزبی تودەیان پێك دەهینا، سەیدزیائەدین بەدەم هێرش کردنە سەر دوکتۆر مەتینی دەفتەری، کە داداگایی کردنی ئەو (٥٣) کەسە لەسەردەمی وەزیری دادی ئەودا ئەنجام درا، ووتی: (برازای تۆ بنەڕەتی دادووەری ئێرانی تێکوپێك دا، زاواکەی تۆ تاوانبارترین سەرۆك وەزیری ئێران بوو، پەنجاوسێ کەسی ئازادیخوازی ئێرانی زیندانی کردوو کوشتنی، تۆ نقەت لێوە نەهات، تۆ لێپرسینەوەت نەکرد، تۆ پرسیارت نەکرد، نەچویت بڵێیت زاواکەی من مەکە، واز بێنە، خۆت بکوژە و خەڵك مەکوژە..)[1].

سەیدزیائەدین لە هەمان ئەو قسانەیدا چەندین جار ناوی ئەو (٥٣) کەسەی بە ئازادیخوازان هێنا، لە ڕاستیدا دەستی دۆستایەتی بۆ تودەییەکان درێژ کرد بەڵام حیزبی تودە بە ئاماژەی باڵوێزخانەی سۆڤیەت، کەوتە ململانێیەکی توندی سەیدزیائەدین، پەرلەمانتارانی سەر بە حیزبی تودەش هەتا پرسی نەوت و داواکاری خۆماڵی کردنی نەووتی باکور نەکەوتە نێو باسان، لایەنگرێکی توندی دوکتۆر موسەددەق بوون لە پەرلەماندا.

پەرلەمانی جولی چواردەیەم لە کۆتاییەکانی (ئەسفەندی ١٣٢٣هەتاوی)دا، ساعد ی ڕاسپارد بۆ پێکهێنانی حکومەت، ساعدیش یەکەمین خۆی لە (فەروەردینی ١٣٢٣هەتاوی)دا پێکهێنا، بەهۆی ئەوەی کە ساعد ماوەیەکی دووردرێژ لە سۆڤیەت بەناوی باڵوێزی گەورەی ئێران لەو وڵاتەدا نیشتەجێ بووبوو وە کەینو بەینێکی لەگەڵیاندا هەبوو، بە لایەنگری سۆڤیەت ناوبانگی دەرکردبوو، هەربۆیە دەوڵەتی سۆڤیەت بە هەبوونی ساعد لە پۆستی سەرۆك وەزیران و بوونی گروپێکی بەهێزی پەرلەمان بە سەرۆکایەتی دوکتۆر موسەددەق کە دژی سیاسەتەکانی ئینگلیز بوون، دڵنیابوو لەوەی کە هیچ ڕێگریەکی نایەتە بەردەم لە بەدەست هێنانی مافی دۆزینەوەی نەوت و دەرهێنانی لە باکوری ئێران، شاندێکی بە سەرۆکایەتی (کافتارزادە)ی جێنشینی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت نارد بۆ تاران، بە ڕواڵەت ساعید

[1] نقل از صورت مذاکرات مجلس شورای ملی، جلسە چهار شنبە، ١٧ی ئەسفەندی ١٣٢٢هەتاوی.

پێشوازی لە پێشنیارەکەی کافتارزادە کرد, بەڵام بەو ڕەوشە تایبەتیەی خۆیەوە نزیکەی دوومانگ هێنان و بردن دواخستنی کارەکە بۆ ئەمڕۆو سبەی, کار گەیشتە ئەوەی کە ڕوسەکان تێگەیشتن کە بە داواکاریەکەی ئەوان ڕازی نابن, لە سەرەتاکانی (ئابانی ١٣٢٣هەتاوی)دا ڕوسەکان بە ئاشکرا کەوتنە دژایەتیکردنی ساعدی سەرۆك وەزیرو لە چەندین ڕێگای جیاوازەوە فشاریان دەخستە سەر ئێران, حیزبی تودەش بە ڕێکخستنی ڕێپێوانی فراوانی نێو شەقامەکان و تورەکردنی خەڵك و ململانێکردن لەگەڵ حکومەتەکەی ساعد دا بەشداریان کرد, ساعدیش لە بەرئەوەی کە نەیدەتوانی بەردەوامی بدات بەو دژایەتیکردنەی ڕوسەکان بۆ حکومەتەکەی لە ڕۆژی (١٨ی ئابان ١٣٢٣هەتاوی) دەستی لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی کێشایەوە.

دوکتۆر موسەددەقیش لە هەمان ئەو ڕۆژانەدا بە پێشکەشکردنی وتارێك لە پەرلەماندا لە دژی پێدانی هەر جۆرە جیاوکێکی (امتیاز) نەوت بە بیانیەکان سەرنجی هەموانی بۆلای خۆی ڕاکێشا, حەمەڕەزاڕەزاشاش دووبارە کەوتەوە بیری پێدانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی بەموسەددەق, زۆربەی پەرلەمانتارانیش بە پێدانی پۆستی سەرۆك وەزیری بە موسەددەق ڕازی بوون, بەڵام دوکتۆر موسەددەق بەو مەرجە ڕازی دەبوو بە وەرگرتنی ئەو پۆستە کە لە دوای کەنارخستنی لە سەرۆك وەزیری بگەڕێتەوە بۆ پەرلەمان, ئەم مەرجەش لەگەڵ ئەو یاسایانەی کە هەبوون پێچەوانەبوو, پێداگری شا لە سەر موسەددەق بۆ ئەوەی ڕازی بێت بە وەرگرتنی ئەو پۆستە بە بێ ئەو مەرجە هیچ سودێکی نەبوو, دوای ڕاگەیاندنی پەشیمان بوونەوەی دوکتۆر موشەددەق لە پێکهێنانی کابینەی حکومەت دەنگ درا بە سەهام سولتان بەیات.

سەرەنجام گرێکوێرەی پێدان یان نەدانی جیاوکی نەوت بە سۆڤیەت بە دەستی دوکتۆر موسەددەق کرایەوە, ئەویش بە پەسەند کردنی پرۆژە یاسایەك لەلایەن پەرلەمانەوە کە دوکتۆر موسەددەق پێشکەشی پەرلەمانی کردبوو, هەوڵەکانی سۆڤیەتی بۆ بەدەست خستنی جیاوکی نەوتی باکوری ئێرانی بە نەزۆکی هێشتەوە, بە پێی مادەی یەکەمی ئەو پێشنیارە کە لە دانیشتنی ڕۆژی (١١یئازەر ١٣٢٣هەتاوی)ی پەرلەماندا دەنگی لەسەردرا, هیچ سەرۆك وەزیر و وەزیر و بەرپرسێکی دیکەی دەوڵەتی ناتوانێت لە بارەی جیاوکی نەوتەوە لەگەڵ هیچ نوێنەرێکی فەرمی یا نافەرمی دەوڵەتانی دیکە یان نوێنەرانی کۆمپانیا نەوتیەکان

گفتوگۆ بکات, له مادەی دووەمی پێشنیارەکەدا ڕێگە بە دەوڵەت درابوو کە گفتوگۆ بکات دەربارەی فرۆشتنی نەوت و توانای دەرهێنانی نەوت لەلایە خودی ئێرانەوە و پەڕلەمانیش لە ئەنجامەکەی ئاگادار بکاتەوە, بەپەسەند کردنی ئەم پڕۆژە یاسایە سەرۆك وەزیرانی نوێ خۆی بووارد لە بەردەوامی گفتوگۆکان دەربارەی پێدانی جیاوکی نەوت بە سۆڤیەت, کافتارزادەو شاندەکەی دوای نزیکەی سێ مانگ لە گفتوگۆی بێ ئەنجام, تارانیان بەجێ هێشت.

پەیوەندیەکانی ئێران و سۆڤیەت دوای خۆبوواردنی ئێران لە پێدانی جیاوکی نەوت بە سۆڤیەت بەتوندی تێکچوو, وە هێزەکانی داگیرکەری ڕوس لە باکوری ئێران لە مانگەکانی کۆتایی ۱۳۲۳هەتاوی, دا, بە هاوکاری حیزبی تودە کە لە ویلایەتەکانی باکوردا هێزێکی زۆری هەبوو دەستیان دایە ئاژاوە گێڕی, لەم نێوەندەدا, بەهۆی کاریگەری دەستوەردانەکانی (دوکتۆر میلیسپو) سەرۆکی شاندی ڕاوێژکارانی دارایی ئەمریکا لە کاروباری نێوخۆیی ئێران و پێداگری ئەو لە سەر کەنارخستنی بەڕێوەبەری گشتی بانکی میلی, کۆتایی هێنرا بە خزمەتەکانی ئەو لە ئێراندا, بەڵام ئەم ڕوداوە کیشەی زۆری لە پەیوەندیە ڕو بە گەشەسەندووەکانی ئێران و ئەمریکا دروست نەکرد.

لە کاتی بەستنی دووەمین کۆنفرانسی سەرانی هاوپەیمانان کە لە مانگی (بەهمەنی ۱۳۲۳هەتاوی)دا لە یاڵتا بەسترا, پرسی ئێران بوویە مەیدانی گفتوگۆکانی نێوان وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکا و ئینگلیز و سۆڤیەت, ئەم پرسەش لەلایەن (ئەیدن)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا وە ئاشکرا کرا, ئەو ئاماژەی بۆ ڕاگەیەندراوی بلاْوکراوەی سێلایەنەکە کرد و ووتی: دەوڵەتی ئینگلیستان باوەڕی وایە کە دەبێت هاوپەیمانان خۆیان ببوێرن لە دەستوەردان لە کاروبارە نێو خۆییەکانی ئێران, لەبەر ئەوە ئەم ڕەوشە بە ڕقەبەرایەتی کردنێك کۆتایی دێت کە دەستکەووتی پێویست و داواکراو بۆ هیچ کەسێك بەدی ناهێنێت, ئەیدن وتیشی کە دەوڵەتی ئینگلیز دژایەتی لەگەڵ بەشداریکردنی سۆڤیەت لە دەرهێنانی نەووتی باکوریئێرندا نیە, بەڵام بە بۆچونی ئەو باشترە کە دەوڵەتانی هاوپەیمانان ڕایبگەیەنن کە هەتا سەرجەم هێزەکانیان لە ئێران نەچنە دەرەوە, فشار نەخەنە سەر ئێران بۆ بەدەست هێنانی جیاوکی نەوت لە ئێراندا, هەروەما ئەیدن پێشنیاری کرد کە دەوڵەتانی هاوپەیمان,

بەدەرکردنی ڕاگەیەندراوێك لە کۆتایی کۆنفرانسی یالتا دا ڕۆژی دەرچونی هێزەکانیان لە ئێران دا پێشتر بخەن، بۆ ئەوەی کە نیەت پاکی خۆیان بسەلمێنن، وەزیری دەرەوەی ئەمریکاش پشتیوانی بۆچونەکانی ئەیدنی کرد، بەڵام (مولوتف)ی وەزیری دەرەوەی سۆڤیەت ووتی: پرسی چۆڵکردنی ئێران و جیاوکی نەوت دوو بابەتی لەیەکتر جیاوازە، لەبارەی چۆڵکردنی ئێرانەوە، دەبێت دەوڵەتی سۆڤیەت لەم بابەتە بکۆڵێتەوە، بەڵام لە بارەی نەوتەوە دەوڵەتی ئێران سیاسەتێکی ڕاستگۆیانەی بەرامبەر بە یەکیەتی سۆڤیەت پەیڕەو نەکردووە، لەکاتێکدا لە سەرەتادا پێشوازی لە دەوڵەتی سۆڤیەت کردووە، دواتر لە ئەنجامدانی بەڵێنەکانی خۆی پاشگەز بووەتەوە، مولوتف وتیشی: (بەشێکی زۆری ئێرانیەکان باوەڕیان وایە کە ئەم بڕیارەی ئێران عەجولانە دراوە و لە بەکارهێنانی ئاوەزەوە دوور بووە، بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئێرانیەکان جارێك بۆچونەکانی خۆیانیان گۆڕیوە، دەوڵەتی سۆڤیەت هۆکارێك نابینێت کە دووبارە بۆچونی ئەوانە نەگۆڕێتەوە و بگەڕێنەوە بۆ قۆناغی یەکەمجار! ).

سەرەنجام دەوڵەتی سۆڤیەت نەچوە ژێرباری پەیمانی نوێ دەربارەی چۆڵکردنە ئێران دوای کۆتایی هاتنی جەنگ، هەربۆیە ڕاگەیەندراوی کۆتایی کۆنفرانسی یاڵتا بە ئەم ڕستەیە ڕازی بوون کە وەزیرانی دەرەوەی هەر سێ وڵاتەکە پێکەوە گفتوگۆیان لە بارەی پرسەکانی تایبەت بە ئێرانەوە کرد، (ڕێکەوتن لە سەر ئەوەی کە گۆڕینەوەی بیرو ڕاکان دەربارەی ئەم پرسە، لە ڕێگەی دیبلۆماسیەوە بەردەوام بێت )[1]، ڕەوشی یەکیەتی سۆڤیەت لە کۆنفرانسی یالتا دا هاوکات بوو لەگەڵ جوڵاندنەکانی ئەو دەوڵەتە لە نێو ئێراندا، خوێندنەوەکانی کە هەبوون ئەوەیان دەردەخست کە کۆتایی هاتنی جەنگ دەستپێکی چەندین چەرمەسەری نوێیە بۆ دەوڵەتی ئێران.

---

[1] پوخت کراو لە کتێبی. ارتو کنت:(یالتا یا تقسیم جهان)، ت، محمود طلوعی، انتشارات هفته، ١٣٦٥.

# مەترسیەك كە لەسەر ئێران تێپەڕی

پیلان بۆ جیابوونەوەی ئازەربایجان، بیانوی پێکەنیناوی ستالین بۆ خۆ بواردن لە چۆڵکردنی ئێران، پێشنیاری دابەشکردنی ئێران بۆ چەند ناوچەیەکی دەسەلاتداری، ژەهرەکانی باڵوێزی نەفرینی ئینگلیز لە ئێران، شا و دوکتۆر موسەددەق هاو ئاواز دەبن، ڕێکەوتننامەی ڕوسەکان و ئینگلیزەکان بۆ جودا کردنەوەی خوزستان لە بەرامبەر جودا بوونەوەی ئازەربایجان!، نهێنی گەلێك لە دەورانی حکومەتی قەوام سەڵتەنە کە بۆ یەکەم جار ئاشکرا دەبێت، قەوام سەڵتەنە لە بیری دەرکردنی شاو سەرۆك وەزیرانی ئێران بوو.

ڕۆژی (٧ مەی ١٩٤٥ز ، ١٧ ئۆردیبەهەشتی ١٣٢٤هەتاوی) دا، لەگەڵ خۆبەدەستەوە دانی بێ کۆت و مەرجی ئەڵمانیا، جەنگ لەورووپا کۆتایی هات، پێش کۆتایی هاتنی جەنگ لە ئێراندا دەوڵەتی (بەیات) ڕوخابوو شوێنەکەی خۆیی دابوو بە دەوڵەتی (حەکیمی)، حەکیمی دووای ناساندنی کابینەکەی خۆی بە پەڕلەمان، لە سەرەتاکانی مانگی خوردادی ١٣٢٤هەتاوی دا، لە درێژەی یاداشتێکی دا بە بیری هاوپەیمانانی هێنایەوە کە هێزە بیانیەکانی نێو ئێران بە پێی پەیمانێکی پێشوی خۆیان، دەبێت تا شەش مانگ دووای کۆتایی هاتنی جەنگ، ئێران چۆڵبکەن، بەلام دەوڵەتی ئێران داوا دەکات کە کاری چۆڵکردن هەرچی زوترە ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی دەوڵەتی ئێران دەستی والا ببێت لە چارەسەر کردنی ئەو کێشانەی کە لە ئەنجامی جەنگەوە دووچاری ئێران بووە.

دەوڵەتەکەی حەکیمی پێش ئەوەی وەلامەکەی لە هاوپەیمانان وەربگرێتەوە، کۆتایی پێهات، زۆربەی پەڕلەمانتاران دەنگیان دا بە موحسین سەدر (صدرالاشراف)

بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئێران, دوواتر دەوڵەتی سەدریش دووچاری ڕووبەڕو بوونەوەیەکی توندی پەڕلەمان بوویەوە و چوار مانگ زیاتر بەردەوام نەبوو, لە ماوەی دەسەلاتداری سەدر دا, ڕەوشی ئازەربایجان ئاڵۆز بوو, وە بە دامەزراندنی گروپێکی سیاسی جودا خواز بە ناوی (فرقە دمکرات) کە لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە هاوکاری دەکرا, زەمینەسازی فەراهەم هێنا بۆ دروست بوونی شۆڕشێکی چەکداری لە ئازەربایجان.

لە سێیەمین کۆنفرانسی هاوپەیمانان کە لە کۆتاییەکانی مانگی (تیری ١٣٢٤هەتاوی) لە (پتسدام) بەسترا, (ترومن)ی سەرۆك کۆماری نوێی ئەمریکا (کە لە دووای مردنی ڕۆزفێلت لە ١٢ی ئەپریڵ, ٢٣ی فەروەردین ١٣٢٤هەتاوی,دا شوێنی گرتبوویەوە), و (ئەتلی) سەرۆك وەزیری نوێی ئینگلیستان (کە دووای شکستخواردنی چەرچڵ لە هەڵبژاردنە پەڕلەمانیەکەی ئینگلیز دا لە شوێنی ئەو هەڵبژێردرا), جەختیان لە سەر پێویستی چۆڵکردنی ئێران کردەوە لەلایەن هێزەکانی هاوپەیمانانەوە, بەڵام (ستالین) ئامادە نەبوو بەرواری دەرچونی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران دیاری بکات, یەکێك لە بیانوەکانی سۆڤیەت بۆ دوواخستنی چۆڵکردنی ئێران ئەوە بوو کە دەیان ووت: بەرواری چۆڵکردنی ئێران بە شەش مانگ دووای کۆتایی هاتنی جەنگ دیاری کراوە, لەبەر ئەوەی هێشتا جەنگ کۆتایی نەهاتوە, کاتی دیاری کردنی چۆڵکردنی ئێرانیش هێشتا نەهاتوە!, ڕوسەکان دەیان وت: کاتێك جەنگ لە ڕۆژهەلاتی دوور بەردەوامی هەیە, ناتوانین جەنگی دووەمی جیهانی بە تەواو بوو ناو ببەین, هەڵبەتە بە کەمتر لە مانگێك دووای کۆتایی هاتنی کۆنفرانسی (پتسدام), دووای ئەوەی دوو بۆمبی ناوەکی درا لە دووشاری گەورەی, یابانیش خۆی دا بە دەستەوە, ئیدی بیانویەك بۆ ڕوسەکان نەمایەوە.

ڕۆژی (٢ی ئابانی ١٣٢٤هەتاوی), دووبارە ئیبراهیم حەکیمی (حەکیمولمولك) بە بەدەست هێنانی دەنگی زۆرینەی پەڕلەمانتاران, هەڵبژێردرایەوە بۆ سەرۆك وەزیری, ئەمجارە بە ڕێککەوتنی نزیکەی زۆرینەی پەڕلەمانتاران لە هەلومەرجی قەیراناوی ئەو ڕۆژگارانەدا, دەنگیان بە دەوڵەتەکەی ئەودا, لەم کاتەدا شا ڕۆڵی کاریگەری لە ئاراستەی سیاسی وڵاتدا لە ئەستۆ گرتبوو, وە بە پێداگری و فشاری ئەو هێزێك لە تارانەوە بۆ هاوکاری کردنی سەربازگەکانی تەبرێز نێردران بۆ

ئازەربایجان, بەڵام هێزە نێردراوەکە لە شەریف ئابادی قەزوێن لە لایەن سوپای سورەوە ڕێگریان لێکرا, دەوڵەتی سۆڤیەتیش گوێی بەو یاداشتە ناڕەزاییەی دەوڵەتی ئێران نەدا کە لە ڕۆژی ٢٦ئابان دا بۆی ناردبوو, لەم ڕەوشەدا (فرقە دمکرات) ئازەربایجان, کۆنگرەیەکی بە نێوی کۆنگرەی (دروستکردنی ئازەربایجان) لە شاری تەبرێز بەست, ڕۆژی (١ ئازەر ١٣٢٤هەتاوی) لە نێو تەلگرافێکدا بە ناونیشانی (شا و سەرۆك وەزیران و سەرۆك پەڕلەمان و گۆڤارەکانی پایتەخت) ڕایانگەیاند, کۆنگرەی دروستکردنی ئازەربایجان بە ڕیککەوتنی بۆچونەکان بڕیاری داوە, سەردانی حکومەتی ناوەندی ئێران, پێنج دەوڵەتی گەورەی یەکێتی سۆڤیەت, ئەمریکا, ئینگلیستان, فەرنسا و چین (ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتوەکان) بکات و داخوازیە مەشروع و یاساییەکانی خۆیانیان پێ ڕایگەیەنن, لە ئەم ڕاگەیەندراوەدا هاتبوو کە: (دروستکردنی ئازەربایجان بنیادنراو و پشتبەستوە بە هۆکارەکان و ڕوداوە مێژوییە بێشومارە نەتەوییەکان و زمان و داب و نەریت و تایبەتمەندیە تایبەتەکانی خۆی, وە ئەم تایبەتمەندیانەش مافی ئەوەی پێدەدەن کە لەگەڵ ڕەچاو کردنی سەربەخۆیی و بێکەلێنی ئێران, وەکو سەرجەم میللەتانی دونیا بە هۆی گشتنامەی ئەتلەنتیك, ئازاد و سەرپشك بێت لە دیاریکردنی چارەنوسی خۆیدا).

هاوکات لەگەڵ ئازەربایجان, چەندین بزوتنەوەی جوداخوازیش لە کوردووستاندا دروست بوو, هەروەکو فیرقەی دیموکرات لەلایەن لەشکری سورەوە پارێزگاری لێدەکرا, سەید جەعفەری پیشەوەری ڕابەرایەتی فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجانی لە ئەستۆدا بوو, کۆمۆنیستێکی بەئەزمونی ئیرانیە کە لە دامەزرێنەرانی یەکەمین حیزبی کۆمۆنیستی ئێرانە لە کاتی ڕوداوەکانی شۆڕشی جەنگەڵ دا, لەسەردەمی ڕەزاشادا دەستگیر کراوەو پاشان خراوەتە زیندان, (قازی محەمەد) سەرۆکی حیزبی جوداخوازی (کۆمەڵە)ی کوردووستان بوو, پیشەوەری دووای ئازاد بوونی لە زیندان لە ساڵی (١٣٢٠هەتاوی)دا ڕۆژنامەیەکی بە نێوی (ئاژیر) لە تاراندا دەردەکرد, ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ باڵوێزخانەی سۆڤیەت دا لە تاران هەبوو, پیشەوەری لە هەڵبژاردنەکانی خولی چواردەی پەڕلەماندا بە هاوکاری و دەستوەردانی ڕوسەکان, بە نوێنەرایەتی شاری تەبرێز هەڵبژێردرا بۆ پەڕلەمان, بەڵام کارنامەکەی لە

پەرلەماندا دەنگی لە سەر نەدرا, دووای ئەم ڕوداوە پیشەوەری زیاتر لە جاران خۆی خستە دامێنی ڕوسەکان و گۆڕدرا بە ئامێرێکی بێ ئیرادە بە دەستی ئەوانەوە.

دەوڵەتی حەکیمی دووای دەرکردنی ڕاگەیەندراوە جوداخوازانەکەی فیرقەی دیموکرات, سەهام سوڵتان بەیاتی سەرۆك وەزیرانی پێشوی کردە پارێزگاری ئازەربایجان, ئەویش لە (٧ ئازەر)دا چویە تەبرێز, دەسەڵاتی ئەوەی پێدرابوو کە لەگەڵ پیشەوەری دا بکەوێتە گفتوگۆ و بە پێدانی بەڵێن و پەیمانان گەلێك, پیشەوەری لە بەرنامەی جوداخوازانەی خۆی پەشیمان بکاتەوە, بەڵام پیشەوەری دەسەڵاتێکی بۆ گۆڕینی ئەم بەرنامەیە نەبوو, بەرنامەکە لە مۆسکۆوە گەڵاڵە بووبوو, ڕوسەکان دەیانویست بەر لە چۆڵکردنی ئێران لە هێزەکانیان, ئازەربایجان لە پەیکەری ئێران جودا بکەنەوە و بەشێنەیی بیکەن بە یەکێك لە کۆمارەکانی سۆڤیەت یان پەیوەستی بکەن بە کۆماری ئازەربایجانی سۆڤیەتیەوە.

فیرقەی دیموکرات لە سەرەتاکانی مانگی ئازەردا, بە دروستکردنی گروپە چەکدارەکان کە بە چەکی ڕوسی و لە ژێر چاودێری ئەفسەرانی لەشکری سوردا بوون, وردەوردە دەستیان گرت بە سەر گوندوو شارەکانی ئازەربایجان و ڕۆژی (٢١ی ئازەر ١٣٢٤هەتاوی) بە گەمارۆ دانی لەشکری تەبرێز لەلایەن سەربازانی فیرقی دیموکراتەوە, کە سەربازانی لەشکری سور دەیانپاراستن, بەتەواوی ئازەربایجان کەوتە دەستی هێزە جوداخوازەکانەوە, لە هەمان ڕۆژدا (ئەنجومەنی نیشتیمانی ئازەربایجان) بە بەشداری نوێنەرانی فیرقەی دیموکرات لە تەبرێز پێکهات, دەوڵەتی دروستکراوی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتی پیشەوەری ڕاگەیەندرا, پیشەوەری کە ناونیشانی سەرۆك وەزیر, یان بە وتەی خۆیان (باش وەزیر)ی ئازەربایجانی هەبوو, بە ئەم شێوەیە کابینەی حکومەتەکەی خۆی ناساند:

| | |
|---|---|
| سەیدجەعفەر پیشەوەری | سەرۆك وەزیر |
| دوکتۆر سەلامولاّ جاوید | وەزیری ناوخۆ |
| ژەنەراڵ کاویان | وەزیری جەنگ |
| یوسف عەزیما | وەزیری داد |
| ڕەزا ڕەسولی | وەزیری بازرگانی و ئابووری |
| محەمەد بی ریا | وەزیری فەرهەنگ |

| | |
|---|---|
| دوکتۆر موهتاش | وەزیری کشتوکاڵ |
| دوکتۆر ئاورنگی | وەزیری تەندروستی |
| غولأمرەزا ئیلهامی | وەزیری دارایی |
| کەبیری | وەزیری پۆست و پەیوەندیەکان |
| بەیات ماکۆ | وەزیری ڕاگەیاندن |

لە نێو ئەوانەشدا زەینولعابیدین قیامی بە ناونیشانی سەرۆکی دیوانی باڵای ئازەربایجان و فەرەیدوون ئیبراهیمی بە ناونیشانی داواکاری گشتی ناسێنران, پیشەوەری وەك مافێکی تایبەتی بۆ تاران خۆی لادا لە ناساندنی وەزیری دەرەوە و ووتی: ئەگەر لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندا بگەینە ئەنجام , ئەوا وەزیری دەرەوەی ئێمە هەمان وەزیری دەرەوەی ئێران دەبێت!, بە ڕواڵەت لە قۆناغی یەکەمدا بە پێی ئەو بەرنامەیەی کە لە مۆسکۆ وە گەڵاڵە کرابوو, ئەوە بوو کە دەوڵەتی ئێران دان بە (خود موختاری) ئازەربایجاندا بنێت لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئێراندا, هەتا بەشی دووەمی بەرنامە, واتە جودا کردنەوەی تەواوی ئازەربایجان لە قۆناغێکی گونجاوترد جێبەجێ بکرێت.

لەشکری تەبریز لە ٢٢ی ئازەردا بەبێ هیچ بەرگریەك خۆی دابەدەستەوە, بەڵام تیپی ڕەزائیە کەوتە بەرگری لە بەرامبەر جوداخوازاندا و دووای چەند ڕۆژ (وەشاندن و خواردن)و بەرگەگرتنی زیانی قورس لە پاسەوانیکردن وەستان, لەم نێوەندەدا کوردەکانیش بانگی سەربەخۆییان دا, بە فەرمانی (قازی محەمەد) ی سەرۆکی حیزبی کۆمەڵە, ئاڵای ئێران لە سەر بینا حکومیەکاندا هێنرایە خوارەوە.

چەند ڕۆژێك دووای ئەم ڕوداوانە کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی هەر سێ وڵات (ئەمریکا, ئینگلیز, سۆڤیەت) لە مۆسکۆ بەسترا, بەرنامەی کاری کۆنفرانسەکە گفتوگۆ کردن بوو لەبارەی ئەو پرسانەی کە لە جەنگەوە سەرچاوەیان گرتوە, کە زیاتر پرسەکانی ئەورووپای لەخۆ دەگرت, بەڵام بە هۆی ئەو ڕوداوانەی کە لە ئێراندا ڕویان دابوو , بە دڵنیاییەوە پرسی ئێرانیش لە بەرنامەی کاریاندا بوو, وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئەمریکا (جیمز بیرنس) لە یاداشتەکانی خۆیدا کە بەناوی (گفتار صادقانە/گوتاری ڕاستبێژانە)ەوە بڵاو کراوەتەوە, دەربارەی گفتوگۆکانی کۆنفرانس ڕونکردنەوەی وردی داوە و لە نێویدا دەربارەی ئێران دەنووسێت:

(لەیەکەم دیدار لەگەڵ ستالیندا کە ڕۆژی (١٩ی دیسەمبەر , ٢٨ی ئازەر ١٣٢٤هەتاوی)دا ئەنجام درا, پێم وت: ئێمە لە بارەی ڕوداوەکانی ئێرانەوە بەهۆی ئەو پەیمانەی کە سەرۆك ڕۆزفێلت و چەرچڵ و خودی ئەو لە ساڵی ١٩٤٣ز دا لە تاران داوتانە زۆر نیگەرانین, ڕوداو گەلێك کە بەر لە ئەم کۆنفرانسە لە ئێران ڕویانداوە, ئەوە دەردەخات کە پێدەچێت پەیمانەکە پێشێل بکرێت, دەوڵەتی ئێران بۆ جێبەجێکردنی پەیمانی ناوبراو داوای کردووە کە هێزە بیانیەکان هەرچی زوترە ئێران چۆڵبکەن, ئێمە دەستبەجێ فەرمانمان کردووە کە پاشماوەی هێزەکانی ئەمریکا لە ئێران دەربچن, وە من پەیامێکم بۆ دەوڵەتانی ئینگلیستان و سۆڤیەت ناردووە و ئامۆژگاریم کردوورن کە هەمان کار بکەن, بەڵام دەوڵەتی سۆڤیەت نەك خۆی دەبووێرێت لە چۆڵکردنی ئێران بەڵکو ڕێگری کردووە لە جولاّندنی (١٥٠٠) سەربازی ئێرانی بەرەو ئازەربایجان, من بە ستالینم وت: کە ئەگەر ئێمە پەیمانێکی گونجاو لەگەڵ ڕاگەیەندراوەکەی تاراندا نەدەین, گومانی تەواو هەیە کە ئێران سکالاّی خۆی لە دانیشتنی نەتەوە یەککگرتوەکان کە بەم زوانە لە لەندەن دەبەسترێت بخاتە ڕو, ئەمریکاش بە ناونیشانی واژۆکەری ڕاگەیەندراوی تاران ناچار دەبێت کە پشتیوانی لە ئێران بکات, بە بۆچونی من بیانوی ئەم پرسە زۆر کێشەیە, ئامادەبوونی (١٥٠٠) سەربازی ئێرانی چۆن دەگونجێت (٣٠٠٠٠) لەشکری سۆڤیەت, وەك ئەوەی باسی لێوە کراوە, بخاتە مەترسیەوە.

ستالین لە وەڵامی مندا ووتی: کانە نەوتیەکانی سۆڤیەت لە دەوروبەری باکۆ, کەوتونەتە نزیکی سنوری ئێران و هێمنی ئەو کان و بیرانە بۆ دەوڵەتی سۆڤیەت مایەی گرنگی پێدانە, ئەم کانانە دەبێت بپارێزرێن لە هەر هەنگاوێکی دووژمنکارانەی دەوڵەتی ئێران, هیچ متمانەیەکیش بە دەوڵەتی ئێستای ئێران ناکرێت, پێدەچێت شتێکی خرابکاری ڕەوانەی کانەکان بکەن و چاڵە نەوتەکان ئاگر بدەن, ستالین درێژەی پێدا, لەبەر ئەوەی سۆڤیەت بە پێی پەیمانە بەستراوەکە مافی ئەوەی هەیە کە هێزەکانی هەتا (١٥ی مارس) لە ئێراندا بهێڵێتەوە, هەربۆیە نیازی نیە کە پێش ئەو بەرواره ئێران چۆڵبکات, وە دەبێت لەو بەروارەشدا لە ڕەوشەکە بکۆڵرێتەوە و تێبینی بکرێت کە ئایا گونجاوە سەربازانی سۆڤیەت لە ئێران دەربچن یا نا, بڕیار لە ئەم بارەیەوە پەیوەستە بە دەوڵەتی ئێرانەوە, هەروەها ستالین ئەوەشی بە بیر هێنایەوە

که پەیماننامەی ساڵی (١٩٢١ز)ی نێوان ئێران و سۆڤیەت, ئەو مافە بە دەوڵەتی سۆڤیەت دەدات کە هەرکاتێك گومانی مەترسی لە سەرچاوەیەکی دەرەکیەوە ڕوبەڕوی یەکێتی سۆڤیەت ببێتەوە, ئەوا سۆڤیەت لەشکری خۆی بنێرێتە باکوری ئێران.

من بە ستالینم وت: مایەی سەرسوڕمانە کە ئەو بۆچونی دەوڵەتی ئێران بەرامبەر بە سۆڤیەت بە دووژمنکارانە ناو دەبات, لەبەر ئەوەی تا ئەو شوێنەی کە ئێمە زانیاریمان هەیە دەوڵەتی ئێران ئەوپەڕی یارمەتی و هاوکاری لە گواستنەوەی چەك وپێداویستیەکان بۆ سۆڤیەت لە کاتی جەنگدا ئەنجام داوە, لەبەر ئەوە وتم: دەوڵەتی ئەمریکا ڕۆژی (٢ی مارس , ١٢ ئەسفەند١٣٢٤هەتاوی) بە کۆتا وادەی چۆڵکردنی ئێران دەزانێت, نەك (١٥ی مارس) کە ستالین وتبووی, ستالین لە وەڵامدا ووتی: دەوڵەتی سۆڤیەت هیچ جۆرە چاو تێبڕینێکی بۆ زەوی یان غەیرە زەوی دەوڵەتی ئێران نیە, بەڵام دووبارە ئاماژەی بۆ (ئاسایشی سەرچاوە نەوتیەکانی باکۆ) کرد و ووتی: هەرکاتێك دەوڵەتی سۆڤیەت دڵنیایی پارێزراوی ئاسایشی سەرچاوە نەوتیەکانی خۆی بەدەست هێنا, هێزەکانی خۆی لە ئێران دەباتە دەرەوە.

هەرچەند زیاتر بیرم دەکردەوە لە بارەی بیانوەکانی ستالین بۆ مانەوەی هێزەکانیان لە ئێران, زیاتر متمانەم بە سیاسەتەکانی سۆڤیەت کەمتر دەبوویەوە, دەربڕینەکانی ستالینیش کە پشت بەستو بوو بەوەی کە ئەو لە گومانی خراپ کردنی کانە نەوتیەکانی باکۆ بەهۆی ئێرانیەکانەوە, نیگەرانە, بیانویەکی لاواز بوو بۆ هێشتنەوەی لەشکری سور لە ئێران, بە تایبەتی ئاماژەدانی بەوەی کە دووای کۆتایی هاتنی مۆڵەتی دیایکراو بە پێی ڕاگەیەندراوەکەی تاران, بابەتی بردنە دەرەوەی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران, دەخات بەر لێکۆڵینەوە, (کە ئایا ئەم کارە لە بەرژەوەندی دایە یان نا!), بە تەواوی نیشانی دەدات کە نیگەرانیەکانی ئێمە دەربارەی جێبەجێکردنی پەیمانەکانی ڕاگەیەندراوی تاران لە جێی خۆیدا بووە, لەبەر ئەوە بڕیارم دا لە ئەم بارەیەوە هەوڵێکی نوێ بهێنمە ئاراوە و زیاتر ستالین تێبگەیەنم لە پێگەیەی ئێمە بەرامبەر بە ئەو پەیمانە.

(پرسی ئێران, یەکەم بابەت بوو کە من لە دووەمین دیدارم لەگەڵ ستالیندا باسم کرد, پێم وت: من نیگەرانم لە پیشنیار کردنی سکاڵای ئێران لە یەکەم دانیشتنی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکاندا, وە درێژەم پێدا, بە بۆچونی من جیگای گرنگی پێدانە

که دەوڵەتە زلهێزەکان ڕێز لە پەیمانەکانی خۆیان بگرن لەگەڵ دەوڵەتە بچوکەکاندا, لەگەڵ ئەوەشدا بە بیرم هێنایەوە کە ئەگەر دەوڵەتی ئێران سکالای خۆی بگەیەنێتە نەتەوە یەکگرتوەکان سەبارەت بە خۆ بواردنی سۆڤیەت لە ئەنجام دانی پەیمانەکە, ئێمە ناچارین پشتیوانی لە ئێران بکەین, وە ئەوەش مایەی نیگەرانیەکی زۆرە لای دەوڵەتی ئەمریکا کە نەتەوە یەکگرتوەکان لە دەستپێکی کاریدا لەگەڵ سۆڤیەتدا ڕوبەڕو بێتەوە, (ئەرنست بوین) وەزیری دەرەوەی ئینگلیستان پێشنیاری کرد کۆمیسیۆنێك لە نوێنەرانی هەر سێ دەوڵەتەکە هەڵبژێردرێت, بۆ ئەوەی بڕۆن بۆ ئێران و ڕێگەچارەیەکی گونجاو بۆ چارەسەر کردنی ناکۆکیەکان بدۆزنەوە, ستالین دەربارەی ئەم پێشنیارە بۆچونێکی یەکلاکەرەوەی دەرنەبڕی, وە من دووبارە هیوام خواست کە ڕەوشێك لە ئێراندا دروست نەبێت کە ببێتە هۆی ناکۆکی لە نێوان ئێمە و سۆڤیەت دا, ستالین لە وەڵامدا ووتی: خەمت نەبێت کارێك ناکەین کە ڕوخساری ئێوە سور بێت!)[1].

سەرەنجام لە کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی ئەمریکاو ڕوس و ئینگلیز دا لە مۆسکۆ, ڕیککەوتن لە سەر کارە پێشنیارکراوەکەی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز دەربارەی پێکهێنانی کۆمیسیۆنێك بۆ لێکۆڵینەوە لە مەڕ ئێران, بەڵام پێکهێنانی ئەم کۆمیسیۆنە, کە بە واتایەکی دیکەی لەرزۆك کردنی پەیمانە ڕاگەیەندراوەکەی تاران و دووبارە دانانەوەی ڕێگە چارەیەکی دیکەیە, لە تاراندا بەگومان و ڕەشبین بوون دەنگی دایەوە, ڕادیۆ لەندەن لە بەرنامەی فارسی ڕۆژی (١٥ مانگی دی ١٣٢٤هەتاوی) خۆیدا, هەواڵێکی لە ئەم بارەیەوە بڵاو کردەوە, کە گواستنەوەی ئەو هەواڵە ڕونکردنەوەیەکی زیاتر بە ئێمە دەدات, دەقی هەواڵەکەی ڕادیۆ لەندەن بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

(لە تارانەوە هەواڵ دەگات کە (سرریدبۆلارد) باڵوێزی مەزنی ئینگلیستان و ئاغای (والاس میوری) باڵوێزی مەزنی ئەمریکا لە تاران, پێشنیاریان بۆ دەوڵەتی

---

[1] ارتور کنت: یالتا یا تقسیم جهان, و, محمود طلوعی (نوسیویەتی (بیرنز) وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە نێوەرۆکی ئەم کتێبەدا دەربارەی ڕوداوەکانی کۆنفرانسی یالتا لاپەڕەکانی ٣٤٣ تا٣٤٦ کتێبەکە کورتکراوەیە).

ئێران کردووە کە هاوکاری ئەو کۆمیتە سێ کەسیە بکات کە لە نوێنەرانی سۆڤیەت و ئینگلیز و ئەمریکا پێکهاتوە, تا لێکۆڵینەوە لە ڕەوشی ئێران بەگشتی و ئازەربایجان بە تایبەتی بکات, لەمبارەیەوە دوو باڵوێزی مەزن دانوستانیان لەگەڵ خاوەن شکۆ حەمە ڕەزاشا دا ئەنجام داوە و پێشنیارەکەیان پێشکەش کردووە, دەوڵەتی ئێران هێشتا وەڵامی ڕازی بوونی بەم پێشنیارە نەداوەتەوە, پێدەچێت بیەوێت بەر لە ڕەزامەندی دەربڕین لە سەر ئەو پێشنیارە, پێشکەشی پەرلەمانی بکات).

حەمە ڕەزاشا لە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ (کارانجیا)ی ڕۆژنامە نوسی هیندی دا, پێشنیارەکەی بوین ی بە (پیلانێك بۆ دابەشکردنی ئێران بۆ چەند ناوچەیەکی دەسەڵاتی جیاواز) دادەنێت , دەڵێت: (وا دەهاتە بەرچاو کە بنەڕەتی پێشنیارەکەی بوین ئەوە بوو کە هاوپەیمانان فشار بخەنە سەر ئێران بۆ پێدانی دەسەڵاتی زیاتر بە پارێزگاکان, بۆ ئەوەی هەندێك لە پارێزگاکان بتوانن کە حکومەتێکی خود موختاری لە چوارچێوەی ئەنجومەنی ویلایەتەکاندا دروست بکەن, کە بە پێی دەستوریش پیشبینیکرابوو وە بە بەشێك لە ئێران دەهاتنە هەژمار, بەڵام لە ڕاستیدا پێشنیارەکەی بوین چاوی لە پێکهێنانی حکومەتانێکی خودموختار بوو لە ناوچە جیاوازەکانی ئێران دا وەك ئازەربایجان و گیلان و مازندەران و گورگان و کوردستان کە لە ژێر دەسەلاتی سۆڤیەت بن و پێکهێنانی حکومەتانێکی خودموختاری وەك خوزستان وفارس کە لە ژێر چاودێری و پاراستنی ئینگلیزدا بن, لە ڕاستیدا ئەمە پێشنیارێکی نوێی دابەشکردنی ئێران بوو بۆ چەند ناوچەیەکی دەسەڵاتی وەکو پەیماننامەکەی ساڵی ١٩٠٧ن)[1].

نیەت خراپی ئینگلیزەکان لە پێشنیارکردنی پێکهێنانی کۆمیسیۆنێکی سێلایەنە, لە تەلگرافی ڕۆژی (١٠ ژانویە ١٩٤٦ز , ٢٠ دی ١٣٢٤هەتاوی)ی والاس مری شدا باڵوێزی ئەمریکا لە تاران بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەردەکەوێت, والاس مری لە ئەم تەلگرافەدا دەڵێت: (سرریدبۆلارد لە بنەڕەتی پێشنیاری پەیوەندی دار بە پێکهێنانی کۆمیسیۆنیکی سێلایەنە لە ئێراندا, بە تایبەت ئاماژەی بۆ ڕەوشی خوزستان, گرنگترین پارێزگای پڕ لە نەوت و دانیشتوانێکی کەمینەی عەرەب زمان

---

[1] The mind of a Monarch, p,78.

کردووه, وه وا دەردەکەوێت کە ئینگلیزەکان بەرنامەی جوداکردنەوەی خوزستانیان لە ئێران, لە بەرامبەر جێگیر بوونی پێگەی سۆڤیەتەکان لە ئازەربایجان, لەبەرچاو گرتبوو)١.

لەکتێبێکی گرنگ و باوەڕ پێکراودا کە لە سالّی ١٩٨٤ز دەربارەی ڕەوتی سیاسەتی ئینگلیز لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا چاپ کراوە, چاپی سێیەمی ئەو کتێبە لە سالّی ١٩٨٨ز دا بەدەستی نوسەر گەیشتوە, نهێنی گەلێکی سەرسامکەر و نویّ لە بارەی پیلانی پارچەپارچە کردنی ئێران بە ڕەزامەندی ئینگلیزەکان ئاشکرا بووە, لەم کتێبەدا, کە لەلایەن زانکۆی ناوداری ئۆکسفۆردی ئینگلیزەوە چاپکراوە و ناونیشانی (امپراتوری بریتانیا در خاورمیانه/ ئیمپراتۆری بەریتانیا لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست) لەسەرە, لە بەشێکی پەیوەست بە ڕوداوەکانی ئێران دووای سالّی ١٩٤٥ز, سەرەتا ئاماژە کراوە بە نامەکانی سرریدپۆلارد ی بالّوێزی گەورەی ئەمریکا لە ئێران بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئینگلستان دووای کۆتایی هاتنی جەنگ, بە خوێندنەوەی ئەم نامەو تەلگرافانە کە پەیوەستە بە سالاّنی دووای جەنگەوە, ئەوە دەردەکەوێت کە بالّوێزی نەفرەتی و خراپەکاری ئینگلیز لە ئێران, لە تەواوی ڕاپۆرت و نوسینەکانیدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا هەولّی ڕیسواکردنی گەل و دەولّەتی ئێرانی داوە و جەختی لەسەر (سروشتی بوونی) هەستی جودا خوازانەی خەلّکی ئازەربایجان کردووەتەوە, لە یەکێك لەم ڕاپۆرتانەدا کە بە بەرواری (٣ مارس ١٩٤٦ز , ١٣ ئەسفەن ١٣٢٤هەتاوی) بۆ (بوین)ی وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی بەریتانیا نێردراوە, پۆلارد چەندین جار ناوی حکومەتی (فسفسی) دیموکراتەکانی لە تەبرێز بە نێوی (دەولّەتی نەتەوەیی ئازەربایجان) بردووە و دەنووسێت: هەستی جواداخوازانە لە ئازەربایجانی ئێران بە گوڕم و بەهێزترە لە سەرجەم پارێزگاکانی دیکەی ئێران و هۆکارگەلێکی مێژویی و سروشتی بەهێزیشی هەیە, نامەردی و بێئاگایی بەرپرسە دەولّەتیەکانی ئێران, لە بەرامبەر داواکاری و هەستەکانی خەلّکی ئازەربایجان بوویە هۆی ئەوەی کە خەلّکی ئازەربایجان پێشوازی (دەعوەت) هێزە هێرشکەرەکانی ڕوسیا (ئازادکەرەکان)

---

[1] Foreign Relations of the United Stats of America,1946, Vol, 7. pp,299-301.

بکەن بۆ ماڵەکانی خۆیان!, تەنانەت ئازەربایجانیەکان لە بەرپرسە گەندەڵ و ستەمکارەکانی ئێران بە باشتر دەزانن!!, وا بەرچاو دەکەوێت کە ئارەزومەندیەکی زۆر لە نێویاندا هەیە بۆ پەیوەست بوون بە ئازەربایجانی سۆڤیەتیەوە!![1].

لەو کتێبەی کە ئاماژەی بۆ کرا و دەستکەوتی چەندین ساڵەی لێکۆڵینەوەی نوسەرێکی بەناوبانگی وەك (ویلیام ڕاجر لوئیس)ە, ئاماژە بە پێشنیاری بوین دەکات بۆ پێکهێنانی کۆمیسیۆنێکی سێلایەنە بۆ لێکۆڵینەوەی پرسەکانی ئێران و تێیدا هاتوە: (بوین دنەی ئەوەی دەدا کە بابەتی ئێران, لە جیاتی ئەوەی لە نەتەوەیەکگرتوەکان پیشنیار بکرێت و هاوپەیمانانی دەورانی جەنگ لە دەست بەکار بوونی ئەم ڕێکخراوە دا ڕوبەڕوی یەکتری بکەنەوە, لە نێوان خودی دەوڵەتە خاوەن بەرژەوەندیەکاندا چارەسەر بکرێت, سەرباری ئەوەی کە بوین گومانی خراپی هەبوو لە مەبەستی ئەمریکیەکان لە ئێراندا, وای بۆ دەچو کە ئینگلیستان لە کۆمیسیۆنێکی سێلایەنەدا بۆ چارەسەرکردنی پرسەکانی ئێران باشتر دەتوانێت بەرژەوەندیەکانی خۆی لە ئێراندا بپارێزێت تا ئەوەی کە ئەم ڕەوشە بکێشرێتە دانیشتنەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان, لەلایەکی دیکەوە (خراپترین) سەرەنجام کە پێدەچو لە کۆنفرانسی سێلایەنەدا دەستبکەوێ, ناساندنی ئازەربایجانی سەربەخۆ بوو, کە پاراستنی پاشماوەی خاکی ئێران لە بەرامبەر ئەودا دەبوو!!![2].

حەمە ڕەزاشا سەرباری (ئامۆژگاریە دڵسۆزیەکانی!!) سرریدپۆلارد ئامادەنەبوو پێکهێنای کۆمیسیۆنی سێلایەنە پەسەند بکات, پەرلەمانتارانیش بە ئاماژەی ئەو کەوتنە دژایەتی کردنی ئەو پێشنیارە, یەکێك لە دووژمنە سەرسەختەکانی پێکهێنانی کۆمیسیۆنی سێلایەنە و دەستوەردانەکانی ئینگلیز لە چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەت, دوکتۆر موسەددەق بوو, کە لەدرێژەی وتارێکی دا لە دانیشتنی (١٩ دی ١٣٢٤هەتاوی)دا وتی: (بۆچونی من ئەوە بوو کە لە نێو دەوڵەتدا سەبارەت بە چەشنی ئیدارە کردنی بەشێك لە ئەم وڵاتە, کە لەگەڵ ژمارەیەك لە خەڵکی ئەو ناوچەیەدا ناکۆکی دروست بووە, سەرەتا دەبوو لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا

---

[1] Roger Louis, William: The british Empire in the Middle East 1945-1951, Oxford University Press, 1988, p,61.
[2] Ibid, p 67.

بکەوتایەتە گفتوگۆوە, لەوانە بوو بتوانرایە کە کێشەکان لەگەڵ خودی ئەواندا چارەسەر بکرانایە, ئەگەر لە ئەم ڕێگەیەوە دەستکەوتێك بەدەست نەهاتایە ئەوجا لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتدا گفتوگۆ کرابا بۆ ئەوەی ڕێگریەکان و ناکۆکیەکان چارەسەر بکرین, من لەبەر بەرژەوەندی و باشی میلەتی ئێران تکا لە ئاغای حەکیمی دەکەم کە زیاتر لە ئەمە کاتی وڵات بەهەدەر نەدات و دەستبەجێ دەست لەکار بکێشێتەوە).

بۆچونی شایش لە ئەم بارەیەوە بە تەواوی هاوتای بۆچونەکەی دوکتۆر موسەددەق بوو, شا لە چاو پێکەوتنی لەگەڵ کارانجیا ی ڕۆژنامە نوسی هیندی دا, لە نێو باسێك دەربارەی ڕوداوەکانی ئازەربایجان و پێشنیاری پێکهێنانی کۆمیسیۆنی سێلایەنە, سەرۆك وەزیرانی ئەوکات بە یەکێك لە بەکرێگیراوەکانی ئینگلیزی دەناسێنێت و دەڵێت: ئیگلیزەکان دەیانویست بە دەستی ئەو بەرنامەی پارچەپارچە کردن و دابەشکردنی ئێران بە سەر چەند دەسەڵاتێکدا ئەنجام بدەن, حەکیمی بۆ جێبەجێکردنی بۆچونەکانی ئینگلیزەکان, کەمتەرخەمی دەکرد لە گواستنەوەی کێشەکە بۆ نەتەوە یەککگرتوەکان, وە چارەسەر کردنی ئەم کێشەیەی لە ڕێگەی کۆمیسیۆنی سێلایەنەوە بە باشتر دەزانی تا لە ڕێگەی سکاڵای ئێرانەوە لە نەتەوە یەککگرتوەکان[1].

سەرەنجام حەکیمی کەوتە ژێر کاریگەری شا و پەرلەمان و ناچار بوو کە لە بەرامبەر دەستوەردانەکانی سۆڤیەتدا لە کاروبارە نێوخۆییەکانی ئێران, سکاڵای ئێران بگەیەنێتە نەتەوە یەککگرتوەکان, واز لە چارەسەر کردنی کێشەکانی ئێران بهێنرێت لە ڕێگەی کۆمیسیۆنی سێلایەنەوە, لە بەرواری (١٩ ژانویە ١٩٤٦ز , ٢٩ دی ١٣٢٤هەتاوی) دا ئاغای تەقیزادە باڵیۆزی ئێران لە لەندەن و لە هەمان کاتیشدا نوێنەرایەتی ئێرانی لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە ئەستۆدا بوو, لە نامەیەکیدا بۆ بەڕێوەبەری گشتی نەتەوە یەککگرتوەکان, سەرباری ڕونکردنەوەی دەستوەردانەکانی سۆڤیەت لە کارەکانی نێو ئێران و بیانو گرتنی ئەو وڵاتە بۆ هەڵادان لە چۆڵکردنی ئێران, داوای کرد کە لە ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوەکەدا لێکۆڵینەوە لە سکاڵاکەی ئێران بکرێت, لەوکاتانەدا نەتەوە یەککگرتوەکان تازە دەستی بە کارەکانی کردبوو, تا

[1] The Mind of a Monarch, p 79.

ئاماده كردنی باڵەخانه هەوربڕە شوشوییەكەی ڕێكخراوەكه له نیویۆرك, دانیشتنی گشتی و سەرجەم ئۆرگانەكانی دیكەی ڕێكخراوەكه له لەندەن دا ئەنجام دەدرا, سكاڵاكەی ئێران كەوته بەرنامەی كاری ئەنجومەنی ئاسایش, دووای گوێگرتن له ڕونكردنەوەكانی نوێنەری ئێران و وەڵامەكانی سۆڤیەت, له بەرواری (٣٠ ژانویه , ١٠ بەهمەن ١٣٢٤هەتاوی)دا له درێژەی نامەیەكی یەكلاكەرەوەدا, ئامۆژگاری هەردوولا كرا كه ڕاستەوخۆ بكەونه دانوستان بۆ چارەسەركردنی جیاوازیەكانیان و تا مانگێكی دیكه ئەنجومەن له سەرەنجامەكەی ئاگادار بكەنەوه.

بەر له دانیشتنی ئەنجومەنی ئاسایش بۆ پێوشوێنگرتنی سكاڵاكەی ئێران, دەوڵەتەكەی حەكیمی ڕوخا, ئەحمەدقەوام (قەوام سەڵتەنه) له ڕۆژی (٦ بەهمەن ١٣٢٤هەتاوی)دا به بەدەستهێنانی زۆرینەیەكی زۆر لاوازی پەرلەمان (٥٣ ڕازی, ٥١ ناڕازی) هەڵبژێردرا بۆ سەرۆك وەزیران, یەكەمین كاری قەوام سەڵتەنه دووای دەركردنی فەرمانی سەرۆك وەزیریەكەی له ڕۆژی (٧ ی بەهمەن)دا ناردنی تەلگرافێك بوو بۆ ستالین و ئەتلی (سەرۆك وەزیری ئینگلیز) و بیرنس (وەزیری دەرەوەی ئەمریكا), كه تیایدا ئامادەیی ئێرانی نیشاندا بۆ چارەسەر كردنی ناكۆكیەكانی نێوانیان له ڕێگەی دانوستانی ڕاستەوخۆوه, هەروەها قەوام نامەیەكیشی نارد بۆ تەقیزادەی باڵوێزی ئێران له لەندەن و نوێنەری ئێرانیش له نەتەوه یەكگرتوەكان, داوای لێكردبوو كه سكاڵانامەكەی ئێران له ئەنجومەنی ئاسایش وەربگرێتەوه, بەڵام تەقیزاده گوێی به ئەم تەلگرافه نەدا و به بیانوی ئەوەی كه دووای ئاماده بوونی ئەو له دانیشتنی ئەنجومەنی ئاسایش تەلگرافەكەی سەرۆك وەزیران به دەستی ئەو گەیشتوه, ئامادەی دانیشتنی ئەنجومەن بوو, وتاریكی ورد و بەڵگەداری له بارەی دەستوەردانەكانی سۆڤیەت و كەمتەرخەمی و بیانوەكانی ئەو وڵاته له جێبەجێكردنی پەیمانەكانی خۆیدا له بەرامبەر ئێران, پێشكەش كرد[1].

[1] ئەم بابەته كه پێدەچێت ئەمه یەكەمجار بێت ئاشكرا دەكرێت: له ئاغای عیزەدین كازمی سەرۆكی ئەوكاتی بەشی جفره و نهێنیەكانی باڵوێزخانەی ئێران له لەندەنم بیستوه و دەڵێت: تەلگرافەكه بەر له بەستنی دانیشتنەكەی ئەنجومەنی ئاسایش گەیشتبوو, بەڵام تەقیزاده لەبەر ئەوەی كه

قەوام سەڵتەنە لە ڕۆژی (٢٥ی بەهمەن)دا کابینەکەی خۆی ناساند, سەرباری پۆستی سەرۆك وەزیرانی سەرپەرشتی هەردوو وەزارەتی ناوخۆ و دەرەوەشی لە ئەستۆ گرت, یەکێك لە یەکەمین هەنگاوکانی قەوام لە پۆستی سەرۆك وەزیریدا, گۆڕینی سەرۆکی بارەگای لەشکر و سەرۆکی گشتی ژاندارمیری و فەرماندەی سوپای تاران بوو, کە ئەمە بە جۆرێك لە ململانێ خوازی لەگەڵ شادا دەهاتە هەژمار, هەروەها قەوام بە دانای (مەلیك شوعەرای بەهار) بە وەزیری فەرهەنگ و موزەفەر فەیروز (کوڕی نەسرەت دەولە فەیروز) کە دووژمنایەتیەکی دێرینەی لەگەڵ شادا هەبوو بە یاریدەدەری سەرۆك وەزیر, برەوی دا بە بەدگومانیەکانی شا بەرامبەر بە خۆی, بەڵام شا لەو ڕەوشە قەیراناویەدا چارەیەکی دیکەی جگە لە تەسلیم بوون و ڕازی بوون, نەبوو.

قەوام سەڵتەنە ڕۆژی (٢٩ی بەهمەن ١٣٢٤هەتاوی) بە دیاریکردنی سەهام سوڵتان بەیاتی وەزیری دارایی کابینەکەی خۆی وەك بریکاری سەرۆك وەزیر, خۆی بە سەرۆکایەتی شاندێك گەیشتە مۆسکۆ, لە ماوی (٢٠) ڕۆژ مانەوە لە مۆسکۆدا, دیدارو دانوستانی لەگەڵ ستالین و مولوتف و هەندێك لە لێپرسراوەکانی دیکەی سۆڤیەتدا ئەنجام دا. قەوام ڕۆژی گەڕانەوەی خۆیی بۆ تاران بە جۆرێك ڕێکخستبوو کە هاوکاتی کۆتایی هاتنی خولی چواردەیەمی پەڕلەمان بێت, بۆ ئەوەی ناچاری ئامادەبوونی پەڕلەمان و پێشکەشکردنی ڕاپۆرتی دانوستانەکان و وەرگرتنی متمانەی پەڕلەمان نەبێت, هەڵبەتە بۆ پاراستنی ڕوکەشانەی خۆی ڕۆژی (٢١ ئەسفەندی ١٣٢٤هەتاوی)دا کە تەمەنی پەرلەمان بە کۆتا دەگەیشت ئامادەی پەڕلەمان بوو, لە دانیشتنێکی تایبەتیدا ڕاپۆرتێکی لە بارەی دانوستانەکانیەوە لە مۆسکۆ پێشکەش کرد, لەبەر ئەوەی لە دانوستانەکانی مۆسکۆدا ئەنجامێك بەدەست نەهاتبوو, ڕوسەکان خۆیان دەبووارد لە چۆڵکردنی ئێران کشانەوەی هێزەکانیان, قەوام لە ڕاپۆرتەکانی حۆیدا لە پەڕلەمان بە ڕێزێکی زۆرەوە باسی لە خودی ستالین و

---

بەرژەوەندی وڵاتی لە پێشکەشکردنی سکاڵاکەی ئێران لە ئەنجومەنی ئاسایشدا دەبینیەوە, گوێی بە نامەکە نەدا.

پێشوازیە گەرم و دۆستانەکانی لە شاندی ئێران کرد, هەروەها لە نێو ڕاپۆرتەکانیشیدا باسی لە دووا دانیشتنی میوانداری شاندەکەی لە کۆشکی کرملن کرد, کە لەم دانیشتنەدا چەندین گفتوگۆی دۆستانە لە نێوان ئەندامانی شاند و بەرپرسانی سۆڤیەتدا ئەنجام دراوە, لە نێو ئەوانەشدا (خودی ژەنەڕاڵ ستالین چەندین بەیاننامەی وردوو دانابیانە, کە نمونەی فراوانی بۆچونەکانی و لوتکەی بیری سیاسی بەرێزیان بوو, لە بارەی پێویستی ڕیفۆرم و ئەنجامدانی چاکسازی لە ئێراندا خستە ڕو, لە وەلأمی ئەواندا ڕونمکردەوە کە تا ئێستا کاریگەریەکانی جەنگ و گۆڕانکاری ڕژێمی پێشو وە شێواویەکانی کاروبارەکانی ولأت, هەلی ئەنجامدانی چاکسازی بۆ دەولەتی ئێران نەهێشتوەتەوە, ئێستاش کە دەولەتەکەی من ئامادەی ڕیفۆرمی بنەڕەتی و فەراهەم هێنای ژیانێکی خۆشگوزەران و دادپەروەرانەیە بۆ خەلکی ئێران, بە هۆی هاوکاری نەکردنی دەولەتی سۆڤیەت بە نەکشانەوەی هێزەکانی خۆی لە ئێران و چەندین کێشەی دیکە, ئەنجامدانی کاری چاکسازی زۆر سەخت بووە, دەولەتی سۆڤیەت بە پیشاندانی نیەت پاکی خۆی و هەنگاوێك لە جێی خۆیدا دەتوانێت کێشەکانی بەر پێی ئێمە لاببات, هەلبەت لەم بارەیەوە چاکسازی بنەڕەتی لە نێوخۆی ئێراندا ئەنجام دەدرێت و سیاسەتی دەرەوەی ئێران لە ڕوی بنەمای هاوسەنگی و دۆستایەتی و ڕاستگۆیانە دەبێت لەگەلٚ یەکێتی سۆڤیەتدا, ستالین پشتیوانی لە ئەم بۆچونە چاکسازیەی دەولەت گرت و دانی پێدا نا, بەلأم لە بارەی چۆلکردنی ئێرانەوە وەلأمێکی گونجاوی نەدایەوە).

قەوام لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەیدا کە هیچ دەرەنجامێکی باشی لەبارەی چارەسەر کردنی کێشەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەتی تێدا نەبوو, وتی: (دەبێت لە کۆتاییدا ئەوە بلێم هەروەکو چۆن ڕونمکردەوە گفتوگۆکانمان دەستکەوتی داواکراوی بەدەست نەهێنا, بەلأم نابێت ببێتە مایەی ڕەشبینی, نەك تەنها بیروڕای من بەلکو بۆچونی سەرجەم نەتەوەپەرست و دووربینەکانیش ئەوەیە کە دەبێت گەلی ئێران و سۆڤیەت بە هۆی چەندین هۆکارگەلی مێژویی و پێکەوەبوونی سروشتی و جوگرافیایی و پێویستیە دارایی و فەرهەنگی و کۆمەلأتیەکانیان بە یەکتری, دەبێت دۆستی گیانی بەگیانی یەکتری بن و پەیوەندیەکانی نێوانیان لە سەر بنەمای ڕاستگۆیی و ڕێزگرتنی یەکتری کە ئەمانە پێویستیەکانی ڕیککەوتن و پێکەوەبوونن, ئەنجام بدرێت,

مەبەستی بڵاوکراوەکەی نەتەوە یەکگرتوەکانیش هەمان جۆری پەیوەندی ڕاستگۆیانە و دادپەروەرانە و ئاشتیخوازانەیە, بۆ ئەوەی خەڵکی دونیا لە چەرمەسەری و خوێن ڕێژیەکانی جەنگ پارێزراو بن, بە هۆی ئەم پێشەکیەی منەوە هەرگیز ڕەش بین نین و ناشبین لە پێکهێنانی پەیوەندی دۆستانە لە نێوان هەردوو وڵاتدا, ئەم ئامانجەش هەمیشەیی و بێ برانەوەیە, لەو ڕاگەیەندراوەش کە لە کۆتایی هاتنی مانەوەی ئێمە لە مۆسکۆ دەرچوە بە ڕونی هەمان ئارەزومەندی تێدا بەیان کراوە, ئومێدەوارم ئەم دۆستایەتیە بێ وێنەیەی نێوان هەردوو وڵات پراکتیکی بکرێت, زۆر خۆشحاڵم کە کەسێکی وەکو ئاغای (سادچیکۆف) کە پیاوێکی سیاسەتمەدار و خەیرخوازە بە باڵوێزی گەورەی سۆڤیەت لە ئێراندا دیاری کراوە, هیواخوازم بە هۆی بەڕێزیانەوە ڕۆژبەڕۆژ دۆستایەتی نێوان هەردوو وڵات بتەوتر دەبێت).

** ** **

قەوام سەڵتەنە ئەو ڕێکەوتنە ژێربەژێر و نهێنیەی کە لە سەفەرەکەی مۆسکۆیدا لەگەڵ ستالین و مولوتف دا بەستبووی, ئاشکرای نەکرد, بەڵام دەرەنجامەکانی ئەو ڕێککەوتنە بە شێنەیی ئاشکرا بوو: ڕۆژی (١٥ فەروەردینی ١٣٢٥هەتاوی) لە نێوان (قەوام و سادچیکۆف ی باڵوێزی نوێی سۆڤیەت لە ئێران)دا ڕێککەوتن نامەیەك دەربارەی پێکهێنانی کۆمپانیایەکی هاوبەشی نەوتی ئێران-سۆڤیەت واژۆ کرا, ماوەی ڕێککەوتن نامەکە (٥٠) ساڵ بوو, ناوچەی کار کردنیشی بریتی بوو لە سەرجەم ناوچەکانی باکوری ئێران جگە لە ناوچەکانی سنوری ئێران لەگەڵ تورکیادا, پشکی سۆڤیەت لە (٢٥) ساڵی سەرەتادا بریتی بوو لە (٥١٪) و پشکی ئێرانیش (٤٩٪) بوو, بەڵام لە (٢٥) ساڵی دووەم دا پشکی هەردوولا (پەنجا بە پەنجا) دەبوو, قەوام بەڵێنی بە ڕوسەکان دابوو کە هەڵبژاردنی خولی پازدەیەمی پەرلەمان بە شێوەیەك ڕێك بخات کە بە بێ هیچ کێشەو ڕوبەڕو بوونەوەیەك, ئەم ڕێککەوتنە لە پەرلەماندا پەسەند بکرێت و دەنگی لەسەر بدرێت, پەیڕەوی واژۆی ئەم ڕێککەتنە بە ڕاگەیەندراوێکی سێ مادەیی (کەلە خوارەوە نوسراوە) لەلایەن هەردوو دەوڵەتی (ئێران-سۆڤیەت)ەوە بڵاو کرایەوە:

١- چەند بەشێکی لەشکری سور لە ڕۆژی یەك شەممە (٢٤ مارس ١٩٤٦ز , ٤ فەروەردین ١٣٢٥هەتاوی), لە ماوەی یەك مانگ و نیودا تەواوی خاکی ئێران چۆڵدەکەن.

٢- ڕێککەوتن نامەی دامەزراندنی کۆمپانیای هاوبەشی نەوتی ئێران-سۆڤیەت و مەرجەکانی, لە بەرواری (٢٤ی مارس) هەتا ماوەی حەوت مانگ پێشکەشی خولی پازدەی پەرلەمان دەکرێت, بە مەبەستی دەنگ دان لە سەری.

٣- لەبارەی ئازەربایجانەوە, لە بەر ئەوەی کاروباری نێوخۆیی ولاّتی ئێرانە, ڕێکخستنێکی ئاشتیخوازانە بۆ جێبەجێکردنی چاکسازیەکان بە پێی یاسا و هاوکات لەگەڵ ڕۆحیەتێکی خێرخوازانە بەرامبەر بە خەڵکی ئازەربایجان, لە نێوان دەوڵەت و خەڵکی ئەو ناوچەیەدا ئەنجام دەدرێت.

هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی چۆڵکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە, دانوستان لەگەڵ نوێنەرانی ئازەربایجان بە سەرۆکایەتی پیشەوەری دەستپێکرد, قەوام سەڵتەنە بۆ خۆشحاڵکردنی سۆڤیەت چالاکیەکانی حیزبی تودەی ئازاد کرد و سێ وەزیری لایەنگری حیزبی تودەی خزاندە نێو کابینەکەی خۆیەوە, قەوام لە دیدارەکانی خۆشیدا لەگەڵ باڵوێزانی ئینگلیز و ئەمریکا, لەوە دڵنیای دەکردنەوە کە ئێران نەکەوتۆتە باوەشی ڕوسەکانەوە و چالاکیەکانی حیزبی تودەیش بەتەواوی لە ژێر چاودێریدان, ئەمریکیەکان زیاتر نیگەرانی چۆڵکردنی خاکی ئێران بوون لە هێزەکانی سۆڤیەت, بەلاّم ئینگلیزەکان بیریان لە گومانی بەردەوامی دەسەلاّتی سۆڤیەت لەئێران و سەرەنجامی پێکهێنانی پەرلەمانێکی لایەنگری سۆڤیەت و پەسەند کردنی ڕێککەوتن نامەی دامەزراندنی کۆمپانیایەکی هاوبەشی نەوتی ئێران-سۆڤیەت دەکردەوە, ڕۆژی (١٦ ئەپریڵی ١٩٤٦ز , ٢٧ فەروەردین ١٣٢٥هەتاوی), واتە دوازدە ڕۆ ژ دوای ڕاگەیاندنی واژۆ کردنی ڕێککەوتن نامەی نەوتی ئێران و سۆڤیەت دانیشتنێکی ناچاری (بەپەلە) لە وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیزدا بەسترا, بابەتی دانیشتنەکە لێکۆڵینەوە لە ڕەوشی ئێران و گفتوگۆ لە بارەی ڕاپۆرتی (ڕۆبرت هاو) یەکێك لە یاریدە دەرەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیز, بوو, لەم ڕاپۆرتەدا ئاماژە بە مەترسیەکانی بەرەو چەپ ڕۆیشتنی ئێران و (پێکهێنانی پەرلەمان و حکومەتێکی دیاریکراو لە ئێران) کە بەرژەوەندیەکانی ئینگلیستان دەخاتە مەترسیەوە, کراوە, لە

ڕاپۆرتەکەدا هاتوە کە ڕوسەکان بە کردنەوەی سەرچاوە نەوتیەکانی باکور واز ناهێنن, دووای ئەوەی کە شوێن پێی خۆیان بەهێز کرد و جێگیر بوون, دەکەونە بیری هەڵوەشاندنەوەی جیاوکی نەوتی ئینگلیز و دەبنە خاوەنی ئەویش, ڕاپۆرتەکەی رۆبرت هاو بە ئەم ڕستانە درێژەی پێدەدات: (ئیدی سەربەخۆیی ئێران مارێکی کۆتایی هاتوە و پەیوەستە بە ڕابردووە وە, ئێمەش بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆمان پێش ئەوەی کە زیاتر درەنگ بکات, دەبێت تاکتیکی ڕوسەکان بۆ لەبار بردنی بەرنامەکانی ئەوان لەبەرچاو بگرین و دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە باشوری ئێران (خوزستان) دروست بکەین), ڕاپۆرتەکەی ڕابرت هاو, وە بۆچونەکانی کە لەو بارەیەوە خستبوونیەڕو نێردرا بۆ (بوین) ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا, بەلاّم (بوین) ئەوی بێدەنگ کرد و تا ڕەوتی ڕوداوەکانی دوواتری ئێران, جێبەجێکردنی ئەو بۆچونەی ڕاگرت[1].

ڕەوتی ڕوداوەکانی دوواتر لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکادا کە (٣٠)ساڵ دوواتر بلاّو کرایەوە, لەگەڵ ئەوەی لە بارەی مێژووی ئێرانەوە گرنگیەکی زۆری هەیە بەلاّم هێشتا وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی فارسی, پێوشوێن دەگرین, ئەم بەڵگەنامانە چەندان بابەتی تێدایە کە بۆ یەکەمین جارە لە ئێراندا بلاّو بکرێتەوە, ئەم ڕاپۆرتانە لە بەرگی حەوتەمی ڕاپۆرتی (پەیوەندیەکانلی دەرەوەی ئەمریکا لە ساڵی ١٩٤٦ز) وەرگیراوە[2].

جۆرج ئالن باڵوێزی نوێی ئەمریکا لە ئێران, کە لە (ئۆردیبەهەشتی ساڵی ١٣٢٥هەتاوی)دا لە ئێراندا دەستی بە کارەکانی کردبوو, لەیەکەم ڕاپۆرتی خۆی دا بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کە لە بەرواری (٨ی مەی ,١٨ی ئۆردیبەهەشت)دا نێردراوە, دەنووسێت: (قەوام, کە یەکەمین دانیشتنم سەرلەبەیانی ئەمڕۆ لەگەڵیدا ئەنجام دا, باسی ئەو کێشانەی کرد کە لە کاتی دانوستاندا لەگەڵ پیشەوەری دا پێشهاتوە, ئەو بە جەخت کردنەوە لە سەر ئەوەی کە ئەم بەشەی وتەکانی زۆ نهێنیە ووتی: ئەوەندەی کەلەکەڵ شادا کێشەم هەیە ئەوەندە لەگەڵ پیشەوەری دا کێشەم

[1] Louis: The british Empire in the Middle Est 1945-1951, Oxford University Press, 1988, pp,71-72.
[2] Foreign Relations of the United Stated of America 1946, Vol, 7.

نیە, زیاتر لەسەری ڕۆیشت, لەگەڵ پیشەوەری دا گەیشتوەتە چەند ڕێکەوتنێك, بەڵام حەمە ڕەزاشا دژایەتی بنەماکانی ئەم ڕیکەوتنە دەکات, زیاتر ئارەزومەندی بەکار هێنانی هێزی سەربازیە بۆ چارەسەر کردنی کێشەی ئازەربایجان, شا وای بۆ دەچێت کە دەتوانێت بە ناردنی هێزێکی پێنج شەش هەزار کەسی دەتوانێت بەسەر ئازەربایجاندا سەرکەوێت و بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی, لەکاتێکدا کە پێدەچێت بەشێك لە ئەم هێزە لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەیاندا پەیوەستی لایەنی بەرامبەر ببن, سەرباری ئەوەش ئازەربایجانیەکان هێزێکی (٣٠ هەزار) کەسی یان هەیە, کە دەتوانن بە باشی ڕوبەڕوی لەشکری ئێران ببنەوە, دوواتر قەوام ووتی: کێشەی بنەڕەتی ئەو لەو کاتەدا سەر هەڵدەدات کە شا فەرماندەیی سەرجەم هێزەکانی لەشکری لە ئەستۆدایە, قەوام داوای لە من کرد کە لە دیداری دواترم دا لەگەڵ شا, بەبێ ئەوەی ئاماژە بە قسەکانی ئەو بدەم ئامۆژگاری شا بکەم, من پرسیارم لە قەوام کرد, ئایا کاری چۆڵکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە ئەنجام دراوە, قەوام ووتی: ئەو ڕاسپێردراوانەی کە لەلایەن دەوڵەتەوە نێردراون بۆ (تەبرێز و جلفا), ڕاپۆرتیان ناردووە کە هێزکانی سۆڤیەت ئەو دوو ناوچەیان چۆڵکردووە و وا بڕیارە کە باڵوێزی سۆڤیەت ڕاگەیەندراوێك دەربارەی کۆتایی هاتنی کاری چۆڵکردنەکە بڵاو بکاتەوە, بەوم وت: ڕاگەیەندراوی باڵوێزی سۆڤیەت بەس نیە, دەوڵەتی ئێران دەبێت ڕاپۆرتی تەواو ڕاست و ئاگاداریە سەرەتاییەکانی کۆتایی هاتنی چۆڵکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە, بدات بە ئەنجومەنی ئاسایش).

جۆرج ئالن لە ڕاپۆرتی ڕۆژی (١١ی مەی ,٢١ی ئۆردیبەهەشتی ١٣٢٥هەتاوی)دا بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا, لە باسی چۆنیەتی پێشکەشکردنی نامەی ناساندنی خۆی بە حەمە ڕەزاشا دەنووسێت: (لەڕێوڕەسمی پێشکەشکردنی نامەی خۆناساندنەکەمدا, قەوام وەك وەزیری دەرەوە ئامادە بوو, لە ڕوداوەکانی ئەم ڕێوڕەسمەدا ئاگاهی زۆرم بەدەست نەهێنا, لەبەرئەوە بە تەواوی دەردەکەوت کە قەوام و شا لە کاتی ئامادەبوونی یەکتریدا قسەی دڵیان نەدەکرد, دەربارەی بابەتی ئێران لە ئەنجومەنی ئاسایش وتم کە ئێران پێگەو قورساییەکی زۆری لە ئەمریکادا هەیە, بەڵام نەبوونی هەماهەنگی لە نێوان کەموکوڕیەکانی پلەدارانی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ ئەوەی کە لەلایەن نوێنەری ئێران لە نەتەوە یەکگرتوەکان پێشکەش دەکرێت, کێشە دروست

دەکات, لەبارەی پرسی ئازەربایجانەوە قەوام وتی: پیشەوەری و شاندی نوێنەرانی ئازەربایجان هێشتا لە تاران دان, بەڵام شتێکی لە بارەی ئەنجامەکانی دانوستانەکانەوە نەوت, هەڵهێنجاندن و تێگەیشتنی من هەر ئەوەیە کە شا لایەنگری کاری توندە, بەڵام قەوام بەدووای ڕێگەچارەیەکی ئاشتیخوازانەدا دەگەڕێت کە سەرەنجامەکەی بە مانەوەی هێزێکی سەربازی سەربەخۆ لە ئازەربایجان, تەواو دەبێت).

جۆرج ئالن لە ڕاپۆرتی بەرواری (١٣ی مەی , ٢٣ ئۆردیبەهەشت ١٣٢٥هەتاوی) خۆیدا دەنووسێت: (بەیانی ئەمڕۆ قەوام هەواڵی پێدام کە پیشەوەری و ئەندامانی شاندی نوێنەرانی ئازەربایجان بە توڕەییەوە گەڕانەوە بۆ تەبرێز, قەوام درێژەی پێدەدات کە نیگەرانی پیشەوەری و هاوڕیکانی لە شکستی دانوستانەکانەوە ئاڕاستەی خودی ئەو نیە, لەبەر ئەوە ئەوان دەیانزانی کە ئەو لایەنگری ڕێگەچارەیەکی ئاشتیخوازانەیەو ڕیگری لە ڕژانی خوێن دەکات, قەوام پرسیاری کرد: ئەگەر کار بگاتە ڕودانی جەنگ, ئەنجومەنی ئاسایش دەتوانێت چ کارێك بۆ ئێمە بکات, من بێپەردە پێم وت: ئەگەر ئێران دەیەوێت لە خستنەڕوی سکاڵای خۆی لە ئەنجومەنی ئاسایش دا ئەنجامێکی دەستکەوێت, دەبێت بەڵگەی ڕون و ئاشکرا دەربارەی دەستوەردانە دەرەکیەکانەوە بخاتە ڕوو, گومان کردن و تێبینی کاری بخاتە لاوە, ئەوەشم زیاد کرد کە دەربڕینە دژیەك و کەموکوڕیەکانی (عەلا) لە نیۆیۆرك و (موزەفەر فیروز) لە تاران, پێگەی ئێران دەتاسێنێت, من لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەم بە ڕاپۆرتی چاپکراوەکان کرد دەربارەی ئامادە بوونی باڵوێزی سۆڤیەت لە دانوستانەکانی نێوان قەوام و پیشەوەری دا و وتم: ئامادە بوونی باڵوێزی سۆڤیەن لەم دانوستانانەدا بەڵگەی دەستوەردانی سۆڤیەتە لە کاروبارەکانی ئێراندا, پێگەی ئێران لاواز دەکات لە کاتی خستنەڕوی سکاڵاکەی خۆی لە ئەنجومەنی ئاسایش).

باڵوێزی ئەمریکا لە ڕاپۆرتی بەرواری (١٥ی مەی , ٢٥ ئۆردیبەهەشتی ١٣٢٥هەتاوی) خۆیدا بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەنووسێت: (ئەمڕۆ قەوام ئەم بۆچونەی خۆی لای من دەربڕی کە دەبێت دەوڵەتی تاران جیاوك (امتیاز) بە ئازەربایجان بدات, لە نێو ئەوانەشدا ئاماژەی بە بابەتی فەرماندەی هێزی ئازەربایجان و دانانی پارێزگار, کرد, قەوام وتی: ئەگەر ئێمە ئامادەی پێدانی جیاوك بە

ئازەربایجان نەبین, پێدەچێت ئازەربایجان سوربەخۆیی ڕابگەیەنن و بنەماڵەی پەهلەوی ڕەد بکەنەوە (پەسەندنەکەن), قەوام درێژەی پێدا کە شا دەستی وەرداوەتە ڕەوتی دانوستانەکانی ئەم دووایییەو ڕێگر بوو لە بەردەم ڕێکەوتن لەگەڵ پیشەوەری دا, دەربارەی قسەکانی شەوی ڕابردووی پیشەوەری لە ڕادیۆ تەبرێز دا, کە شکستی دانوستانەکانی تارانی گەڕاندبووە وە بۆ دەستوەردانی کەسانی نا بەر پرس, ووتی: مەبەستی ئەو حەمە ڕەزاشا بووە, قەوام داوای لە من کرد کە سود لە پێگەی خۆم وەربگرم لە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی شا بۆ پێدانی چەند ماف و جیاوکێك بە ئازەر بایجان, ئەوەشی وت کە ئەگەر ئەو (شا) دەیەوێت تەخت و تاجەکەی خۆیی و یەکپارچەیی خاکی ئێران بپارێزێت, دەبێت بە ئەم داواکاریە ڕازی ببێت, دوواتر قەوام بە ئاوازێکی توندترەوە ووتی: ئەگەر شا مل بۆ خۆساچاندن نەدات, مەترسی ڕودانی جەنگی نێوان ئێران و سۆڤیەت دوور نیە, من باوەڕم وایە ئاماژەدانی قەوام بە مەترسیەك کە هەڕەشە لە شا و تەخت و تاجەکەیشی دەکات, بۆ ڕازی کردنی ئەوە بە پێدانی مافە لەبەرچاو گیراوەکەی لە بارەی ئازەربایجانەوە).

باڵوێزی ئەمریکا لە ڕاپۆرتێکی دووروودرێژی بەرواری ((٢٥ ی‌مەی , ٥ی ئۆردیبەهەشت ١٣٢٥هەتاوی) دا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا, بەم پێشەکیە دەست پێدەکات: پێدەچێت قەوام لە بۆ ڕازیکردنی ڕوسەکان سکاڵای ئێران لە بەرنامەی کاری ئەنجومەنی ئاسایش بکێشێتەوە, دوواتر بە ئاماژەدانی بەئەو نائارامیانەی کە دەگونجا لە ئێراندا ڕوبدات, ئاگاداریەك دەنێرێت بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا, بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- لەگەڵ ئەوەی کە سەربازانی یەك پۆشی لەشکری سور ئێرانیان چۆڵکردووە, هێشتا ژمارەیەکیان بە پۆشاکی مەدەنی یا پۆشاکی لەشکری ئازەربایجان ماونەتەوە, (دووهر) بریکاری کونسوڵی ئەمریکا لە تەبرێز ژمارەی ئەوانەی کە تەنها لە تەبرێزدان بە (٢٥٠٠) کەس مەزەندە دەکات, هەڵبەتە زۆرێکیان خەڵکانی ناوچەی ئازەربایجانی سۆڤیەتین, وە دیاری کردنی ناسنامە و ناونیشانی ڕاستەقینەی ئەوانە ئاسان نیە.

٢- دەربارەی دەستوەردانەکانی سۆڤیەت لە کاروبارەکانی ئێراندا, جگە لە کاروبارە باڵاکان ناتوانرێت بابەتێکی دیاریکراو بخرێتە ڕو, پێشەوەری لە تەبرێز بە

شێوەیەکی ڕێکوپێك لە کونسوڵخانەی سۆڤیەتدا لەگەڵ کونسوڵدا دیدار ساز دەکات و کونسوڵیش زۆر دەچێت بۆ دیتنی ئەو, وا گومان دەبرێت کە پیشەوەری لە سەرجەم هەنگاوەکاندا لەگەڵیدا ڕاوێژ بکات, باڵوێزی سۆڤیەت لە تاران (بەشێوەیەکی پێشبینی نەکراو) سەری لە قەوام شێوابوو, لەگەڵ ئەوەی کە قەوام ناڕازی بووە لە هەندێك لە کارەکانی حسەین عەلا ی نوێنەری ئێران لە نەتەوە یەکگرتوەکان, وا بیردەکاتەوە کە عەلا بە ئاگاداری ئەو ئەوکارانەی ئەنجام داوە.

٣- موزەفەر فیروز (یاریدەدەری سیاسی قەوام سەڵتەنە) لە هەمان کاتدا کە وا دەردەکەوێت هۆکاری جێبەجێکاری مەبەستەکانی سۆڤیەتە, ئارەزومەندی وەرگرتنی پۆستیشە, ئامانجی کۆتایی ئەو بەدەست هێنانی دەسەلآت و تۆڵە سەندنەوەیە لە شا, (ئاخر باوکی موزەفەر فیروز, باوکی شای ئێستا کوشتویەتی), خودی قەوام وا بیر دەکاتەوە کە دەتوانێت لەگەڵ سۆڤیەت و هێزە چەپگەراکاندا یاری بکات و لە کاتی خۆیدا چەپەکان لەسەر جێگای خۆیان دانیشێنێت.

٤- لە ئێستادا دەوڵەتی ئێران پێشوازی لە پێشنیاری هەناردنی شاندی لێکۆڵینەوەی ئەنجومەنی ئاسایش بۆ ئێران ناکات, بەلآم گەلآڵە کردنی ئەم بابەتە دەتوانێت پێگەی دەوڵەت لە دانوستان لەگەڵ ئازەربایجانیەکاندا بەهێز بکات.

باڵوێزی ئەمریکا دووای ئەم تەلگرافە دیدارێك لەگەڵ شادا ئەنجام دەدات, ڕۆژی دوواتر (٦ی ئۆردیبەهەشت) لە تەلگرافێکیدا بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا, دەنووسێت: (شا لە سیاسەتی شپرزانەی قەوام ناڕازیە, ئارەزومەندی بەدەست هێنانی دڵنیایی ئەمریکیەکانە بۆ ڕووبەڕو بوونەوەی دەستوەردانەکانی سۆڤیەتیەکان), بەلآم قەوام سەڵتەنە بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ڕوسەکان تا ئەوەندەش بەرەو پێشەوە دەچێت کە (حسەین عەلا)ی نوێنەری ئێران لە نەتەوە یەکگرتوەکان لە پۆستەکەی لادەدات, سەرباری دژایەتی و ناڕەزاییەکانی (حەمە ڕەزاشا)یش, سێ وەزیری سەر بە حیزبی تودە دێنێتە نێو کابینەکەی خۆیەوە, بەر لە پێکهێنانی کابینە هاوپەیمانێتیەکە لەگەڵ حیزبی تودە دا, شاندێك بە سەرۆکایەتی موزەفەر فیروز دەڕۆن بۆ تەبرێز و ڕێککەوتن نامەیەك لەگەڵ پیشەوەری دا واژۆ دەکەن لەسەر بنەمای ئەوەی کە ناوی پەڕلەمانی دروستکراوی ئازەربایجان دەگۆڕدرێت بۆ (ئەنجومەنی ویلایەتی ئازەربایجان), سەلامولآ جاویدی وەزیری ناوخۆی دەوڵەتەکەی پیشەوەری

فەرمانی پارێزگاری ئازەربایجان وەردەگریت, بەلاّم لە ڕاستیدا ئازەربایجان لە دەستی پیشەوەری و فیرقەی دیموکورات دا بوو, ئەم گۆرانکاریانەش لە ڕواڵەتدا بوو, گۆڕانکاریەك لە چۆنیەتی جودایی ئازەربایجان لە ئێران نەبوو.

جۆرج ئالن ی باڵوێزی ئەمریکا لە ڕاپۆرتی بەرواری (١٧ی ژوئین , ٢٧ی خوردادی ١٣٢٥هەتاوی) خۆیدا بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا, دەنووسێت: (ڕێککەوتن نامەی (١٣ژوئین , ٢٣ خورداد) ی نێوان تاران و تەبرێز, بەسەرکەوتنێکی گەورە بۆ قەوام دانانرێت, من وای بۆ دەچم کە لە باتی ئەوەی ئازەربایجان گەڕابێتەوە سەر قەڵەمرەوی دەوڵەتی ئێران, ئێران کەوتۆتە ژێر دەسەلاّتی ئازەربایجان, نەك تەنها ئەوەی کە حیزبی دیموکراتی ئازەربایجان بە تەواوەتی دەسەلاّتەکەی خۆیی پاراستوە, بەڵکو هاوکاری حیزبە کۆمۆنیستەکانی دیکەی ئێران, واتە حیزبە تودەش دەکات بۆ بلاّوبوونەوەی دەسەلاّتی لە سەرانسەری ئێراندا, چاودێرانی کاروبارەکان لێرەدا زیاتر لە جاران دووچاری دڵەڕاوکێ بوون دەربارەی مەبەستی ڕاستەقینەی قەوام, بە گشتی باوەڕیان وایە کە ئەو لە ڕادەبەدەر خۆی خستوەتە باوەشی سۆڤیەتەکانە و ڕێگەیەکی بۆ گەڕانەوە نیە).

جۆرج ئالن لە ڕاپۆرتی بەرواری (٦ ئوت , ١٥ مورداد ١٣٢٥هەتاوی) خۆیدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا, دەنووسێت: (قەوام بە هێنانی وەزیرە تودەییەکان بۆ نێو کابینەی حکومەتەکەی, شا و تەواوی مەملەکەتی غافڵگیر کردووە), زیاتر لە سەری دەڕوات, کە گوایا بۆ پیشەوەریش یان یەکێك لە هاوکارەکانی پۆستێکی لە کابینەکەیدا بۆ داناوە, دوواتر باڵوێزی ئەمریکا بۆچونی یەکێك لە ئەندامانی شاندی دیبلۆماسی ئەمریکا لە ئێران کە ناوی (ڕۆسۆ)یە و پێشتر کونسوڵی ئەمریکا بووە لە تەبرێز, دووبارە دەکاتەوە و دەنووسێت: (بە بۆچونی ڕۆسۆ نەك تەنها ئازەربایجان, بەڵکو بەشەکانی دیکەی ئێرانیش وردەوردە دەکەونە ژێر کۆنترۆڵی سۆڤیەتەوە, وە ئەگەر بارودۆخ بە هەمان چەشن بڕواتە پێش, ئەگەر قەوامیش بیەوێت, ڕێگەی گەڕانەوەی نابێت).

ڕاپۆرتی (٢٥ ئوت , ٣ شەهریوەری ١٣٢٥هەتاوی)ی باڵوێزی ئەمریکا بۆ وەزیری دەرەوەی وڵاتەکەی لەچاو ڕاپۆرتەکانی دیکەیدا, گەشبینانە ترە, جۆرج ئالن دووای ئاماژەدانی بە دانوستانەکانی پێشوی نێوان دەوڵەتی ئێران و شاندی

نوێنەرانی ئازەربایجان بۆ چارەسەر کردنی کێشە هەڵواسراوەکانی دیکەی نێوانیان, دەنووسێت: (منَ نیگەرانیەکانی خۆمم لەو ڕاپۆرتانەی کە دەربارەی ڕەزامەندی دەوڵەتی ئێران بۆ پاراستنی ڕەوشی ئێستای هێزە چەکدارەکانی ئازەربایجان دەربڕیوە, ڕونمکردەوە و وتم: هەبوونی لەشکرێکی سەربەخۆ لە ئازەربایجان, کە لە ڕاستیدا لە ژێر کۆنترۆڵی سۆڤیەتەیەکاندان, بە مەترسیەکی هەمیشەیی بۆسەر سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی ئێران دێتە هەژمار.

قەوام جەختی لەوە دەکردەوە کە نوێنەرانی ئازەربایجان لەم ڕوە وە پێداگری دەکەن, بەلاّم دووپاتی کردەوە کە ئامادەی پەسەند کردنی داواکاریەکانی ئەوانە نەبووە, قەوام پەشیمانی خۆشی دەربڕی لە هێنانی وەزیرە تودەییەکان بۆ نێو کابینەکەی خۆی, ووتی: من ئومێدەواربووم بەشداری پێکردنی ئەوانە لە کابینەکەدا ببێتە هۆی ئەوەی کە زیاتر بیر لە بەرژەوەندیە نیشتیمانی و نەتەوەییەکان بکەنەوە و پێگەی حکومەت لە بەرامبەر سۆڤیەتدا بەهێز بکەن, بەلاّم ئێستا دەبینم کە ئەوانە هەر وەکو ڕابردوو شوێنکەوتوی سیاسەتەکانی سۆڤیەتن, دوواتر قەوام ووتی: حیزبی تودە بە شێوەیەکی ئاشکرا لەلایەن باڵوێزخانەی سۆڤیەتەوە ڕێنوێنی دەکرێت, درێژەی پێدا, کە لە کەین و بەینی هەلێکی گونجاودایە بۆ دەرکردنی وەزیرە تودەییەکانی نێو کابینەکەی).

ڕاپۆرتەکەی سەرەوە هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی شۆڕشی هۆزەکانی فارس (شیراز) لە دژی دەوڵەتی ناوەندی, نێردراوە, شۆڕشی هۆزەکانی فارس کە لە سەرەتاکانی مانگی شەهریوەرەوە دەستی پێکردبوو, لە کۆتاییەکانی ئەو مانگەدا بەشێکی زۆری ناوچەکانی ویلایەتی فارسیان خستە ژێر دەسەلاّتی خۆیانەوە, براکانی (قەشقائی) کە سەرۆکایەتی ئەم شۆڕشەیان دەکرد, ڕۆژی (٣١ی شەریوەر) لە دووتوێی تەلگرافێکدا بە ناونیشانی (سەرۆك وەزیر), داوای ئەو مافانەیان بۆ خۆیان کردبوو, کە بە ئازەربایجان درابوو, لە ئەم تەلگرافەدا سەرباری خودموختاری بۆ ویلایەتی فارس و پێکهێنانی ئەنجومەنی ویلایەتی بۆ بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی ئەم پارێزگایە, داوای دەرکردنی وەزیرە تودەییەکانیشیان لەو کابینەیەدا کردبوو.

باڵوێزی ئەمریکا ڕۆژی (٢٨ سێپتەمبەری ١٢٤٦ز ,٦ میهری ١٣٢٥هەتاوی) تەلگرافێك دەنێرێت بۆ وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کە لە بارەی ڕونکردنەوەی ڕۆڵی

ئینگلیزەکان لەو کاتە هەستیار و قەیراناویەدا, گرنگی خۆی هەیە, جۆرج ئالن لە تەلگرافەکەیدا دەنووسێت: (بەڵگەو شاهید لە بەردەستدا هەیە کە ڕونی دەکاتەوە ئیگلیزەکان پارچەکردن و جودا کردنەوەی ئازەربایجان لە ئێران دەگۆڕنەوە بە دەسەڵاتی سۆڤیەت لە تەواوی ئێراندا), (واتە سۆڤیەت تەنها لە ئازەربایجاندا دەسەڵاتی هەبێت باشترە تا لە تەواوی ئێراندا), ئەوان دەڵێن: بڕین و دروخستنەوەی بە شێکی گەنیوی سێو لەوە باشترە کە وازی لێ بهێنین تا ئەو پارچە گەنیوە تەواوی سێوەکە خراپ بکات, دووێنێ باڵوێزی ئینگلیز لە دانیشتنێکی لەگەڵ مندا ووتی: هەوڵ و تێکۆشانی بەردەوامی دەوڵەتی ئێران بۆ پاراستنی ئازەربایجان وەك بەشێك لە خاکی ئێران واقیع بینانە نیە, وە بەردەوامی ئەم پەیوەندیش دەبێتە هۆی فراوان بوونی دەسەلاّتی سۆڤیەت لە سەرانسەری ئێراندا. بەڕواڵەت بۆچونی ئەو ئەوە بوو کە دەبێت دەوڵەتی ئێران بە شێوەیەکی تەواو پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ حکومەتی تەبرێز دا بېڕێت, بەجێگیرکردنی هێزێکی سەربازی بهێزیش لە سنورەکانی ئازەربایجاندا ڕێگری بکات لە فراوان بوونی دەسەلاّتی ئازەربایجان بۆ ناوچەکانی دیکەی خاکی ئێران, بەبۆچونی ئەو دەوڵەتی ئێران لەبەر خاتری پاراستنی ئازەربایجان لە چوارچێوەی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی ئێراندا جیاوك و مافی زۆری داوە بە دەوڵەتی سۆڤیەت, بەشداری پێکردنی چەند وەزیرێکی حیزبی تودەش یەکێکە لەو مافانە, ئەم بارودۆخەش تەواوی ئێران دەخاتە بەر مەترسی کارتێکردن و دەسەلاّتی سۆڤیەتەوە.

باڵوێزی ئەمریکا لە ڕاپۆرتەکەیدا باس لەوەش دەکات کە ئینگلیزەکان لە ئێراندا زیاتر بیر لە بەرژەوەندیە نەوتیەکانی خۆیان دەکەنەوە نەك سەربەخۆیی ئێران, لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەشدا بە پێچەوانەی بۆچونەکانی باڵوێزی ئینگلیزەوە دەنووسێت: (من پێم وایە بە جوادایی ئازەربایجان لە ئێران, فشارەکانی سۆڤیەت بۆ سەر ئێران کۆتایی نایەت, بەڵکو ئەوان دەخاتە پێگەیەکی بەهێزترەوە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی دیکەی خۆیان, من هێشتا ناتوانم ئەو بۆچونە پەسەن بکەم کە ئازەربایجان لە دەست چووە, وە باوڕم وایە کە دەبێت ئێمە بە هەمو توانای خۆمانەوە بەردەوام بین لە پارێزگاری کردنی یەکپارچەیی خاکی ئێران لەسەر بنەمای ڕاگەیەندراوەکەی تاران و بلاّوکراوەکەی نەتەوە یەکگرتوەکان).

ڕۆژی (٣٠ سێپتەمبەر ,٨ میهری ١٣٢٥هەتاوی) باڵوێزی ئەمریکا لەسەرداوای قەوام سەڵتەنە دیدارێکی لەگەڵدا ئەنجام دەدات و لە ڕاپۆرتی هەمان ڕۆژیدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا, دەنووسێت: (دووای ڕوداوەکانی باشور, قەوام لە سیاسەتی ئاشتی خوازانەی خۆی دەربارەی پرسی ئازەربایجان بێ ئومێد بووە, بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانیشی داوای هاوکاری لە ئێمە دەکات, لەدووای ئەم تەلگرافە, (ئەچسۆن) کە لە نەبوونی (بیرنس) دا, بەوەکالەت وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکای لە ئەستۆدا بوو, تەلگرافێکی لە ڕۆژی (١ ئۆکتۆبەر , ٩ میهری ١٣٢٥هەتاوی)دا بە ناونیشانی (وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لە پاریس)ە دەنێرێتەوە و لە نێویدا دەنووسێت: (ئێمە نیگەرانین لە ڕەوتی ڕوداوەکانی ئەم دووابیەی ئێران, ئەم ڕەوشەی دەستوەردانەکانی سۆڤیەت و ئینگلیز کە گومانی مەترسی ڕودانی جەنگێکی نێوخۆیی لە ئێراندا لێدەکرێت, بە هەڕەشەیەك دادەنرێت بۆ سەر ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی, لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەگەر ئەو جۆرە دەستوەردانانە هیچ مەترسی یەکیشی نەبێت, ئەو هەڕەشانەی کە ڕووبەڕوی یەکپارچەیی و سەربەخۆیی ئێران بوونەتەوە پێچەوانەیە لەگەڵ دەستوری بڵاوکراوەی نەتەوە یەکگرتوەکان و سیاسەتی ئەمریکا, پێدەچێت بەردەوامی ئەم ڕەوشە بە دابەشبوونی ئێران بۆ دووناوچەی دەسەڵاتداری جیاواز یان سەپاندنی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی هێزێکی دەرەکی بەسەر ئێراندا تەواو ببێت, لە ئەم بارودۆخەدا باشترین ڕێگەچارەی گونجاو بۆ پاراستنی سەربەخۆیی ئێران و بەهێز کردنی قەوام, دڵنیا کردنەوەیەتی لە هاوکاری و پارێزگاری کردنی ئەمریکا لەو), ئەم تەلگرافە بە پشتیوانی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا دەنێردرێت بۆ تاران و جۆرج ئالن ی باڵوێزی ئەمریکاش لە تاران قەوام لە هاوکاری و پارێزگاری کردنی ئەمریکا بۆ ئێران دڵنیا دەکاتەوە, قەوام سەڵتەنەش بڕیار دەدات کە خودی خۆی بۆ ئامادەبوون و بەشداریکردن لە کۆبوونەوەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان و دانوستان لەگەڵ بەرپرسانی باڵای دەوڵەتی ئەمریکا, سەردانی ئەو وڵاتە بکات.

جۆرج ئالن ڕۆژی (٥ ئۆکتۆبەر , ١٣ میهری ١٣٢٥هەتاوی) لە تەلگرافێکی دیکەیدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا, دەنووسێت: (ئەمڕۆ قەوام پێی وتم کە ناچار کراوە لە بەرنامەی پێشوی خۆی بۆ ئامادە بوون لە دانیشتنی گشتی ڕێکخراوی

نەتەوە یەکگرتوەکان پەشیمان ببێتەوە, لەبەر ئەوەی باڵوێزی سۆڤیەت فشاری خستوەتە سەری بۆ دەست بەجێ ئەنجامدانی هەڵبژاردنێك[1], لەبەرئەوە لەم بارودۆخەدا ناتوانێت لە ئێران بچێتە دەرەوە, بەبۆچونی من هەڵبژاردن لە ئێران دا لە وەها ڕەوشێکدا جگە لە شانۆیەکی پێکەنیناوی هیچی دیکە نیە, بەڵام مەبەستی سۆڤیەتیەکان بۆ دەنگدانە لەسەر ڕێککەوتن نامەی نەوت), باڵوێزی ئەمریکا ڕۆژی دوواتر (١٤ میهر ١٣٢٥هەتاوی) لە تەلگرافێکی دیکەیدا بۆ واشنگتۆن دەنووسێت: (دووێنێ شا پێی وتم کە فەرمانی دەستپێکردنی هەڵبژاردنی واژۆ کردووە, شا وتی لە واژۆ کردنی ئەم فەرمانە گومانی هەبووە, بەڵام نەیدەتوانی بەرپرسیارێتی سەرەنجامی زیاتر دوواخستنی ئەو هەڵبژاردنە لە ئەستۆ بگرێت, شا ترسی لەوە هەیە کە لە خولی داهاتوی پەرلەماندا تەنها دوو دەستە (دەست نیشانکراوەکانی سۆڤیەت و لایەنگرانی قەوام) بێنە پەرلەمانەوە, وا بیردەکاتەوە کە دەستەی دووەمیش (لایەنگرانی قەوام) لە ژێر کاریگەری ئەم ڕەوشەی ئێستادا ببنە لایەنگری سۆڤیەت و (فاتیحەی سەربەخۆیی ئێران بخوێنن), شا دەیوت لەبەر ئەوەی کە خودی قەوام حیزبێکی دروست کردووە دەبێت دەست لەکار بکێشێتەوە و هەڵبژاردن بە سەرپەرشتی دەوڵەتێکی بێلایەن ئەنجام بدرێت, هۆکاری سەرەکی نیگەرانیەکانی حەمە ڕەزاشا لەوە وەیە کە دەترسێت پەرلەمانی داهاتو لە ژێر کۆنترۆڵی قەوام و موزەفەر فیروز دابن و پێگەی ئەو بخەنە مەترسیەوە, من ناتوانم هەستی خۆم دەربڕم کە سەرەنجام شا چ کارێك دەکات, لەوانەشە وەکو زۆربەی کارەکانی دیکە هیچ نەکات و بە چاوەڕانی ڕەوتی ڕوداوەکانەوە دابنیشێت).

قەوام ڕۆژی (٢٥ میهری ١٣٢٥هەتاوی) بەشێوەیەکی ئاسایی دەستی لە کار کێشایەوە, حەمە ڕەزاشایش دەستلەکار کێشانەوەی کابینەکەی پەسەند کرد و دووبارەش ڕایسپاردەوە بۆ پێکهێنانی کابینەیەکی نوێ, لە کابینە نوێیەکەدا کە

---

[1] پەلەپەلی ڕوسەکان بۆ ئەنجامدانە هەڵبژاردن, بۆ پەسەند کردنی ڕێککەوتن نامەی نەوتە لە پەرلەماندا, لەبەر ئەوە بە پێی ئەو ڕێککەوتن نامەیەی کە لە مانگی فەروەردینی ١٣٢٥هەتاوی, دا بەسترابوو, دەبوو ئەم ڕێککەوتن نامە لە ماوەی ئەوپەڕی (٧) مانگ دووای واژۆ کردنی, لە پەرلەماندا پەسەند بکرێت.

ڕۆژی (٢٧ میهر) بە ئامادەیی شا ناسێنران, وەزیری دیکە شوێنی وەزیرە تودەییەکانیان گرتبوویەوە, مەبەستی دەستلەکار کێشانەوە و گۆڕینی کابینەکە تەنها دوور خستنەوەی تودەییەکان بوو لە دەوڵەت, گۆڕانکاریەکی دەست ئەنقەستی دیکە لە دەوڵەتدا, لادانی موزەفەر فیروز بوو لە کابینەکە و دیاریکردن و دانانی وەك باڵوێزی ئێران لە مۆسکۆ.

جۆرج ئالن لە ڕاپۆرتی ڕۆژی (١٩ ئۆکتۆبەر ,٢٧ میهر ١٣٢٥هەتاوی) کە دووای ناساندنی کابینە نوێیەکەی قەوام ناردوویەتی, لە دەمی خودی قەوامەوە دەنووسێت: (گۆڕانکاری کابینەکە و دەرکردنی وەزیرە تودەییەکان لە سەر بڕیار و پێداگری خودی ئەو بووە, دیاریکردنی موزەفەر فەیروزیش وەك باڵوێزی ئێران لە مۆسکۆ بۆ پاراستنی پەیوەندیە دۆستانەکانی نێوان ئێران و سۆڤیەت بووە, بەلاّم لە ڕاپۆرتی ڕۆژی (٢٠ ئۆکتۆبەر) ی باڵوێزی ئەمریکا بۆ واشنگتۆن, کە لە دووای دیداری باڵوێز لەگەڵ شادا نێردراوە, فلیمێکی تەواو جیاواز لەوەی کە ڕویداوە پیشاندراوە, جۆرج ئالن لە ئەم ڕاپۆرتەیدا بەم شێوەیە دەنووسێت:

(شەوی ڕابردوو تەواوی ڕوداوە ڕاستەکان کە بوویە هۆی گۆڕانکاریەکانی ئەم دووایییەی کابینەکەی قەوام, لە زمانی شاوە بیست, کە جیاوازە لەگەڵ ئەو ڕاپۆرتەی پێشتر ناردم, شا ووتی: دووای کۆتا گفتوگۆی لەگەڵ مندا بڕیاری داوە قەوام لە کار بخات, دەیویست ئەو بڕیارە ئەمڕۆ (٢٠ ئۆکتۆبەر و ٢٨ میهر) جێبەجێ بکات, قەوام ڕۆژی (١٦ ئۆکتۆبەر , ٢٤ میهر) لە گومانی لەکارخستنی و دەستگیر کردنی لەلایەن شاوە ئاگادار دەکرێتەوە, دەربارەی ڕاست و هەڵەیی ئەم دەنگۆیە لەگەڵ وەزیری جەنگ (سپەهبەد ئەمیر ئەحمەدی) دا قسان دەکات, وەزیری جەنگ پێی دەڵێت: ئاگای لە بەرنامەی شا نیە, بەلاّم ئەوە دەزانێت کە شا ناڕازیە لە ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بەدەمەوە چوونی دەوڵەتی ئێران بەرەو سۆڤیەتیەکان, بەهەر حاڵ لەشکر وەفادارە بەرامبەر هەربڕیارێك کە شا دەری بکات و گوێڕایەڵی سەرجەم فەرمانەکانی بەڕێزیان دەبێت.

قەوام بەیانی ڕۆژی دوواتر (١٧ ئۆکتۆبەر , ٢٥ میهر) داوای بە خزمەت گەیشتنی شا دەکات و ئامادەیی خۆی بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی شا نیشان دەدات, شا دەیوت کە: (قەوام لە ترساندا دەلەرزی), لە ئەم دیدارەدا شا بە قەوام دەڵێت:

مەرجی یەکەمی بەردەوامی حکومەتەکەی ئەو ئەوەیە کە موزەفەر فەیروز و هەر سیٚ وەزیرە تودەییەکە لە کابینەکەیدا دەربکات, مەرجی دوووەم ئەوەیە کە حیزبی دیموکراتی ئەو (واتە قەوام) هەمو بیرو بۆچونێکی هاوپەیمانی لەگەڵ حیزبی تودە دا بخاتە کەنارەوە و لە هەڵبژاردندا لەگەڵ حیزبی تودە دا بکەوێتە ململانێوە, قەوام سەڵتەنە سەرجەم مەرجەکانی شا پەسەند دەکات و تەنها داوا دەکات کە هەرچۆنێك بێت موزەفەر فیروز بە شێوەیەکی کاتی لە دەوڵەتدا بمێنێتەوە, شا دەڵێت: ئەو لە پێداگریەکەی قەوام دەربارەی موزەفەر تورە دەبێت و لەکاتێکدا کە بە مشت دەیکێشا بەسەر مێزەکەدا وتی: ئەگەر یەك جاری دیکە ناوی موزەفەر لە بەردەمی ئەودا بهێنێت هەمو شتێك لە نێوان ئەواندا کۆتایی پیٚ دێت, دوواتر شا دەڵێت: موزەفەر یان دەبێت دەست بەجیٚ وڵات بە جێبهێڵێت یان دەبێت دەستگیر و زیندانی بکرێت, لەم کاتەدا قەوام دەڵێت: ئەگەر خاوەن شکۆ پەسەندی بکات ئەو بنێرین بۆ مۆسکۆ, شا پاش کەمێك ئارام بوونەوە پەسەندی دەکات, قەوام سەڵتەنە دەستلەکارکێشانەوەی کابینەکەی پێشکەش دەکات و دووبارە ڕادەسپێردرێتەوە بۆ پێکهێنانی کابینەیەکی نویٚ, لەهەمان دانیشتندا لیستی ناوی کابینە نوێیەکە لەلایەن شا وە پەسەند دەکرێت.

ئەوانە (شا و قەوام) ڕێك دەکەون کە ڕاگەیاندی کابنە گۆڕاوەکە بۆ ماوەی (٢٤) کاژێر دووابخەن و بابەتەکە بە نهێنی بمێنێتەوە, بۆ ئەوەی ڕێکاری پێویست بۆ ڕوبەڕو بوونەوەی خۆپیشاندان کە دەگونجێت ڕوبدات, ئامادە بکەن, بەڵام قەوام بابەتەکە لەگەڵ موزەفەردا باس دەکات و ئەویش دەست بەجیٚ باڵوێزی سۆڤیەت لە ڕوداوەکە ئاگادار دەکاتەوە, (سادچیکۆف)ی باڵوێزی سۆڤیەت شەو دەچێت بۆ بینینی قەوام و بە ئاوازێکی توند و هەڕەشە ئامێزەوە لەگەڵیدا قسان دەکات, قەوام بەیانی ڕۆژی دوواتر (٢٦ میهر) دووبارە دەچێتەوە خزمەتی شا و بە حاڵەتێکی سپرزی و پەشۆکاویەوە دەڵێت: پێدەچێت لە کاتی گۆڕینی کابینەکەدا هێزەکانی سۆڤیەت دووبارە هێرش بکەنەوە سەر ئێران, شا دەڵێت: ئەو وا بیر ناکاتەوە کە سۆڤیەت لە بەرخاتری گۆڕینی کابینەیەك سنوری خاکی ئێران بشکێنێت, لەکاتێکدا ئەگەر ئەوەش بکات ئێران دەتوانێت داوای هاوکاری لە ڕێکخراوی نەتەوە

یەکگرتوەکان بکات, شا پێداگری لەسەر گۆڕینی کابنەکە دەکاتەوە و قەوامیش ڕۆژی دوواتر ئەندامانی کابینە نوێیەکی بە ئامادەیی شا دەناسێنێت).

شا پێی وتم: کە بۆ دەرکردن و جێبەجێکردنی ئەم بڕیارە و ئەوەی کە ئایا لە بەرژەوەندی دا هەیە چانسێکی دیکە بدرێتەوە بە قەوام, سێ شەو نەخەوتوە و سەرەنجام گەیشتوەتە ئەو دەرئەنجامەی کە وا باشترە خودی قەوام تودەییەکانی هێناوەتە نێو کابینەی حکومەتەکەی و هەر خۆیشی لێپرسراویەتی دەرکرنی ئەوانە لە ئەستۆ بگرێت, ئەو لە بارەی ئەم بڕیارەیەوە لە بۆچونی منی پرسی, منیش وتم: وای بۆ دەچم کە بیرێکی ژیرانە بووە و ئەو کاروکردارەشی کە لە ئەم گۆڕانکاریەدا بەکار هێنراوە, پەسەند کراوە.

** ** **

قەوام سەڵتەنە لەو بەروارە بەدوواوە لە دەسەلأت و گەورەیی خۆی کەوت, بە ئاگاداری لەوش کە هەم لەشکر و هەمیش دوو دەوڵەتی گەورەو بەهێزی ڕۆژ ئاوایی پارێزگاری لە شا دەکەن, گوێڕایەڵی دەکرد و ملی بۆ دەدا, ئاژاوەکەی باشوریش دووای دەرکردنی وەزیرە تودەییەکان لە کابینەی حکومەتدا کۆتایی پێ دێت, هەڵبژاردن دووا دەکەوێت و سەرەتاکانی هێرشی لەشکر بۆ ئازەربایجان لە مانگی (ئازەر ی ١٣٢٥هەتاوی)دا فەراهەم دێت, کارگێڕی ڕاستەقینەی ئەم چالاکیانە خودی (شا) و فەرماندەی لەشکرەکەی (ڕەزم ئارا) بوون, قەوامیش هەمیشە دووای دەربڕینی نیگەرانی لە بەرپەرچ دانەوەکانی سۆڤیەت و گوێ پێنەدانی (شا) بە ئاگادارکردنەوەکانی ئەو, فەرمانە شاهانەکای جێبەجێدەکرد.

پەیوەندی نهێنی و ڕاستەوخۆی (شا) لەگەڵ کۆشکی سپی واشنگتۆندا لە هەمان بەروارەوە دەست پێدەکات, نامە ئاڵوگۆڕکراوەکان لە نێوان (شا) و (ترومن) ی سەرۆك وەزیرانی ئەوکاتی ئەمریکا, وەهەندێك لە نامەکانیش کە لە ڕێگەی باڵوێزی ئەمریکاوە دەنێردران و دەهێندران, بەتەواوی لە (بەڵگەنامە نهێنیەکانن), کە لە نێو ئەو بەڵگەنامانەی کە لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاوە بلأوکراونەتەوە, بەرچاو ناکەون, بەلأم بۆچونی ڕاست ئەوەیە کە (شا) بەبێ دڵنیای و پشتیوانییەکی ڕاستەقینەی ئەمریکا, کەلەوکاتەدا تەنها وڵاتی دارای چەکی ئەتۆمی بوو, زاتی

نەدەکرد دەست ببات بۆ وەها کارێکی بەجەرگانە کە مەترسی ڕوبەڕووبوونەوەی لەگەڵ سۆڤیەتدا هەبوو.

سالأنێك دوواتر (ترومن) ئاشکرای کرد کە لە ساڵی (١٩٤٦ن)دا دووجار ئاگاداری داوەتە (ستالین) دەربارەیئێران, کە جاری یەکەمیان پەیوەستە بەسەرەتاکانی هەمان ساڵەوە (مانگی مارس), دەربارەی چۆڵکردنی ئێران لەلایەن هێزەکانی سۆڤیەتەوە, جاری دووەم لە کۆتاییەکانی ئەو ساڵە (مانگی دیسەمبەر) کاتی هێرشی ئێران بۆ ئازەربایجان بوو, لە ئاگاداری یەکەمدا (ترومن) مەترسی ئەوەی دابوو بە (ستالین) کە ئەگەر هێزەکانی خۆی لە ئێران نەکێشێتەوە, ئەمریکاش هێزی خۆی دەهێنێتە نێو خاکی ئێرانەوە, ئاگاداری دووەم هەڕەشەی سود وەرگرتن بووە لە چەکی ئەتۆمی, (ستالین) پێشتر بێباکی (ترومن)ی لە بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لە ژاپۆن دا بینیبوو, نەیدەتوانی گوێ نەدات بە بەکارهێنانی ئەو چەکە لە ئازەربایجان و قەفقاز و ناوچە سەرچاوە نەوتیەکانی سۆڤیەت.

فەرمانی پاشەکشە کردنی هێزەکانی فیرقەی دیموکرات لە ئازەربایجان, دووای تێپەڕینی هێزەکانی لەشکر لە ڕێڕەوی قافلانکوە و تصرف میانە, بە پەلەپەلێك لە مۆسکۆ وە دەرکرا, کە ژمارەیەك لە سەران و ئەندامە کاریگەر و بەرجەستەکانی حیزب, هەلی هەڵهاتنیان دەست نەکەوت و بەدەستی خەڵکی یان هێزەکانی سوپا کوژران, خودی (پیشەوەری)ش بە شێوەیەکی تەواوی هەتا (٢٤) کاژێر بەر لە هێرشی لەشکر ئاگای لە چارەنوسی خۆی نەبوو, لەبەرئەوە ڕێك ڕۆژێك بەر لە هاتنە ناوەوەی لەشکر بۆ ئازەربایجان, دروشمە بەناوبانگەکەی خۆی (ئولمك وار — دونمك یوخدور) یا (مەرگ ڕاستیە و ناگەڕێتەوە), لە ڕادیۆی تەبرێزدا دووبارە دەکردەوە.

بەڕواڵەت وا دەردەکەوێت کە باڵوێزی سۆڤیەتیش لە تاران ئاگاو هەواڵی لە هۆکاری ئەم گۆڕانکاریە لەناکاوەی سیاسەتی (ستالین) و فەرمانی گەڕاندنەوەی هێزەکانی حیزب لە ئازەربایجان, نەبووە, لەبەرئەوەی بە شێوەیەك کە (شا) لە چاوپێکەوتنەکەیدا لەگەڵ (کارانجیا)ی ڕۆژنامە نوسی هیندیدا دەڵێت: (دووای دەرکردنی فەرمانی هێرشی هێزەکانی لەشکر بۆ ئازەربایجان, باڵوێزی سۆڤیەت داوای دیداری دەست بەجێی شا دەکات, (شا) کاتێك کە داواکەی پەسەند دەکات کە هێزەکانی لەشکر لە کاتی پێشڕەوی کردندان لە نێو ئازەربایجاندا, باڵوێز بە توندی

ڕەخنە لە هێرشی لەشکر بۆ سەر ئازەربایجان دەگرێت و دەڵێت: ئەم کارە ئاشتی جیهانی دەخات مەترسیەوە, باڵوێز داوا لە (شا) دەکات کە دەستبەجێ فەرمانی پاشەکشەی لەشکر لە ئازەربایجان دەربکات, هەڕەشەی ئەوەش دەکات کە بەردەوامی ئەم چالاکی و هێرشانە بە جەنگ و خوێنڕێژیەکی دووروودرێژ تەواو دەبێت, (شا) ئەو تەلگرافانەی کە هەر ئەو کاتە بەدەستی گەیشتبوو بۆ باڵوێز دەخوێنێتەوە و دەڵێت: (نیگەران مەبە, لە هیچ لا یەکەوە ڕوبەڕو بوونەوە ڕوی نەداوە, تەبریزیش بەبێ هیچ خوێنڕێژیك خۆی داوە بەدەستەوە!,) شا دەڵێت: (کاتێك ئەم تەلگرافانەم بۆ باڵوێز خوێندەوە حەپەساو بەبێ ئەوەی کە یەك وشەی تر قسە بکات کۆشکی بەجێهێشت)[1].

حەمە ڕەزاشا دووای سەرکەوتنی لە ئازەربایجان پێگەیەکی دەستکەوت کە هەرگیز تا ئەو کاتە بەخۆیەوە نەدیبوو, دووای ئەم ڕوداوانە (شا) دەیتوانی بەبێ ڕوبەڕوبوونەوەی بچوکترین کێشە قەوام سەڵتەنە لە سەرۆك وەزیری لابدات و کەسێکی دیکە لە شوێنی دابنێت, بەڵام وای دانا کە هەڵبژاردنی خولی پازدەیەم بەدەستی ئەو ئەنجام بدرێت, وەك دەڵێن: حوشترێك کە خۆی بردوویەتیە سەرەوە خۆشی بیهێنێتەوە خوارەوە, خۆی بەرپرسیارێتی پێشنیاری ڕیکەوتن نامەی نەوت بۆ بەردەم خولی داهاتوی پەرلەمان لە ئەستۆ بگرێت, شا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەستی وەردایە هەڵبژاردنەکانی خولی پازدەی پەرلەمانەوە, زۆرێك لەو نوێنەرانەی کە بە ڕواڵەت کاندیدی حیزبی دیموکراتی قەوام بوون هەڵبژێردران بۆ پەرلەمان, لە ڕاستیدا هەڵبژێردرا و دەسنیەی خودی (شا) بوون, (قەوام سەڵتەنە) ڕێکەوتن نامەی نەوتی بۆ دەنگدان لەسەری پێشکەشی ئەو پەرلەمانە کرد کە خۆی دروستی کردبوو, هەمان ئەو پەرلەمانە بە زۆرینەی دەنگی (١٠٢ بەرامبەر ٢) دەنگ, ڕێکەوتن نامەی نەوتی هەڵوەشاندەوە.

لە مادەیەك دا کە لە دانیشتنی ڕۆژی (١٩ میهری ١٣٢٦هەتاوی) پەرلەماندا دەنگی لەسەر دراوە هاتبوو کە هەرچەندە سەرۆك وەزیران نیەتی باش بووە لە ئەنجام دانی دانوستان بۆ بەستنی پەیمان نامە لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەتدا, کارەکەی بەڕێزیان بە گەڕانەوە بۆ یاسای پەسەند کراوی (١١ ئازەر ١٣٢٣هەتاوی), (پڕۆژە یاسای

---

[1] The Mind of a Monarch. P,86.

دوکتۆر موسەددەق دەربارەی پێنەدانی جیاوکی نەوت بە بیانیەکان) بە کارێکی نایاسایی دادەنرێت, لەهەمان مادەدا هاتوە بۆ دروستکردنی هاوسەنگی لە کاروڕەفتاری ئێراندا لەگەڵ دەوڵەتە بیانیەکاندا, ئەم بەندەش گونجێنراوە کە: (دەوڵەت ناچارە لە سەرجەم ئەو بابەتانەی کە مافی گەلی ئێرانن لەبەرامبەر سەرچاوەکانی داهاتی ولأت بەگشتی لە سەرچاوەی ژێر زەوی و سەرچاوەکانی دیکە کە بە خەسار دەدرێن, بە تایبەت لە بارەی نەوتی باشورەوە, بەمەبەستی بەرژەوەندی مافی نەتەوەیی دانوستان و کاری پێویست ئەنجام بدات و پەرلەمان لە دەرەنجامەکەی ئاگادار بکاتەوە).

قەوام سەڵتەنە دوو هەفتە دوواتر بە نامەیەك باڵوێزخانەی سۆڤیەتی لە ڕەت کردنەوەی ڕێکەوتنی پێکهێنانی کۆمپانیای هاوبەشی نەوتی (ئێران-سۆڤیەت) ئاگادار کردەوە, (سادچیکۆف)ی باڵوێزی سۆڤیەت ڕۆژی (٢٠ نۆڤەمبەری ١٩٤٧ز ,٢٩ ئابان ١٣٢٦هەتاوی) لە دووتوێی نامەیەکی توند دا بۆ سەرۆك وەزیران, ئەم هەنگاوانەی دەوڵەت و پەرلەمانی ئێرانی بە پەیمان شکێنی و دووژمنانە ناوزەد کردووە و بەرپرسیارێتی هەر دەرەنجامێکیشی خستوەتە ئەستۆی دەوڵەتی ئێرانەوە, قەوام بۆ ڕونکردنەوەی ئەوەی کە ڕوی داوە نامەیەکی دیکەی بۆ (سادچیکۆف) نارد, بەلام باڵوێزی سۆڤیەت ڕۆژی (١ دیسەمبەر , ١٠ ئازەر ١٣٢٦هەتاوی) لە دووتوێی نامەیەکی فەرمی دا لەگەڵ جەخت کردنەوەی لەسەر ناوەڕۆکی نامەکەی پێشوی خۆی, نوسیبووی: (ڕونکردنەوەکانی دەوڵەتی ئێران هەوڵدانێکی بێهودەیە بۆ ڕەوایەتی پێدانی کوم و کوڕیی و پەیمان شکێنیەکانی دەوڵەتی ئێران).

لەگەڵ گۆڕانەوەی ئەم یاداشتانەدا, لێپرسراویەتی (قەوام)یش بە کۆتا گەیشت و ئێدی (شا) هۆکارێکی بۆ بەردەوامی حکومەتەکەی (قەوام) نەدەبینی, ئاماژەی بۆ پەرلەمانتارانی وابەستەی دەربار کرد کە زەمینەسازی ڕوخانی کابینەکەی (قەوام) فەراهەم بێنن, (١٠) کەس لە وەزیرەکانی کابینەکەی (قەوام) دەستیان لە کار کێشایەوە و (قەوام) ڕۆژی (١٨ ئازەر ١٣٢٦هەتاوی) بۆ دڵنیا بوون لە پاڵپشتی کردنی پەرلەمان و ناساندنی وەزیرە نوێیەکانی, داوای بەخشینی متمانەی بە وەزیرەکان کرد, بە ئامادەبوونی (١١٢) پەرلەمانتار تەنها (٤٦) ئەندام پەرلەمان

دەنگی ڕەزامەندییان بۆ دا, بەو شێوەیە (قەوام سەڵتەنە) لە لایەن ئەو پەرلەمانەی کە خۆی بڕیبووی و دووریبووی دەرکرا,!!.

** ** **

ئەم بەشە بە تێڕامانێکی گشتی بۆ کردەوەکانی کۆتا حکومەتی قەوام سەڵتەنە و دەستکەوتە نوێیەکانی کەسایەتی ئەو لە پەیوەندی لەگەڵ شادا, کۆتایی پێ دێنین.

ماوەی نزیەك بە نیو سەدە بەسەر کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانی و ڕوداوەکانی ئازەربایجاندا تێدەپەڕێت, کەسایەتیەکی ئەفسانەیی لە قەوام سەڵتەنە دروستکراوە, کە بە لێهاتویی و زیرەکی خۆی (ستالین)ی گۆڵ داوە و بە بەڵێنی پێدانی جیاوکی نەوت, کە خۆشی دەیزانی پەرلەمان دەنگی لەسەر نادات, بوویە هۆی دەرکردنی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئێران و زەمینە سازی و پیلان گێری جودابوونەوەی ئازەربایجانی لەبار برد, نوسەری ئەم کتێبە ڕای وایە بە پێی ئەو بەڵگانەی کە لەم بەشەدا کەوتە بەر دیدی خوێنەران, جێگایەکی بۆ دوودڵی نەهێشتوەتەوە کە (قەوام) نەك تەنها لە پێدانی بەڵێنی بەشداری پێکردنی سۆڤیەتیەکان لە دۆزینەوە و دەرهێنانی نەوتی ئێران, مەبەستی فریودانی (ستالین)ی نەبووە, بەڵکو لە ماوەی دەسەلاّت داری خۆیشی دا ماف و جیاوکی سیاسی زۆری داوە بە ڕوسەکان, ئەگەر بەرگریەکانی (شا) و خاوەن دەسەلاّتە دەرەکیەکانی دیکە ڕێگەیان لێ نەگرتبا, پێدەچو هێدی هێدی ئێرانی بگۆڕیایە بە یەکێك لە مانگەکانی یەکێتی سۆڤیەت.

قەوام سەڵتەنە, بە پێچەوانەی ئەوەی کە ناوبانگی دەرکردووە, سیاسەتمەدارێکی زیرەکیش نەبووە, باشترین بەڵگەی ئەوەش شکستخواردن و وردەوردە پاشەکشەی ئەو بوو لە بەرامبەر (شا)یەکی لاوی بێ ئەزموندا, ئەقڵی دابڕاوی (قەوام) لە کۆتایی سەردەمی دەسەلاّتداری خۆیدا (موزەفەر فیروز) بوو, کە جگە لە تۆڵە سەندنەوەی کوشتنی باوکی لەلایەن (ڕەزاشا)وە, تەنانەت ئەگەر بە فیدا کردنی بەرژەوەندی نەتەوەیش بێت, ئامانجێکی دیکەی لە سەردا نەبوو, وابەستەیی لە ڕادەبەدەری (قەوام) بە وەها کەسێکی نەزان و کینەلەدڵ, کە بوویە هۆی گومان خراپی شا لە بەرامبەر مەبەستەکانی ئەودا, خۆی بۆخۆی هۆکارێکی دیکەیە لەسەر نا وریایی سیاسی (قەوام سەڵتەنە).

هەندێك لە نوسەران کە هەر خویان گرتوە, سەرجەم پیاوانی کۆن و نوێی ئێران بە بەکرێگیراوی یەکێك لە ولاٌتە بیانیەکان دەناسێنن, (قەوام سەڵتەنە)شیان بە بەکرێگیراوی ئینگلیز یان ئەمریکا ناساندووە, بە بۆچونی من (قەوام) نە ئەمریکایی, نە ئینگلیزی, نە ڕوسی نەبووە, کە لە کۆتاییەکانی دەورانی دەسەلاٌتداری خۆیدا لە جێی ئەواندا یاری دەکرد, (قەوام) سیاسەتمەدارێکی پۆست ویست بووە, کە لە هەمو کاتێکدا دەیویست سود لە هێزێکە دەرەکی وەربگرێت بۆ بەهێز کردنی پێگەو دەسەلاٌتی خۆی, ئەوەی کە مایەی سەرسوڕمانە ئەم سیاستمەدارەی ناسراو بە زیرەك و کارزان, هەمیشە هەڵەی دەکرد لە هەڵبژاردنی ئەو دەسەلاٌتەی کە دەبۆ پاڵپشتی ئەو بووایە, ئەو دوو جار بەر لە دەست پێکردنی سەڵتەنەتی پەهلەوی (سەردەمی قاجاری) و دوو جاریش لە سەردەمی (حەمە ڕەزاشا)دا پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرتوە, کە هەر چوار جارەکە بە هۆی هەڵەیەك یان چەند هەڵەیەکی سیاسیەوە لە شانۆکە دەر دەکرا, ئاخرین و گەورەترین هەڵەی سیاسی ئەو ڕازی بوونی بوو بە وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری لە (مانگی تیری ١٣٣١هەتاوی)دا بۆ جاری پێنجەم, کە لە شوێنی شیاوی خۆیدا ئاماژەی بۆ دەکەین.

موزەفەر فیروز, کە لە کۆتاییەکانی حکومەتی قەوام سەڵتەنەدا بە پێداگری (شا) لە باڵوێزی ئێران لە مۆسکۆ لادرا و یەکسەرە لەوێوە ڕۆیشت بۆ پاریس, تا کۆتای تەمەنی لەوروپا بەردەوام بوو لە ململانێکردن دژی ڕژێمەکەی (شا), جار جارێك وتاری لە ڕۆژنامەکانی فەڕەنسا دا دەنوسی, لە وتارێکی دا, یان لە چاوپێکەوتنێکیدا بوو خوێندمەوە: کە ئەگەر حکومەتەکەی (قەوام) لە ئەنجامی پشتیوانی کردنی ئەمریکیەکان لە (شا), لاواز نەبووبا, خودی ئەوان (واتە قەوام سەڵتەنە و موزەفەر فیروز) حکومەتی (شا)یان لەناو بردبوو, ئەم بانگەشەیە دەگونجێت ڕاست بێت, چ جای ئەوەی کە خودی (قەوام)یش کینەیەکی دێرینەی بەرامبەر بە (ڕەزاشا) و کوڕەکەی هەبوو, بە بەڵێنی (سەوٚرك کۆماری ئێران) لەلایەن (ستالین)ەوە لە مۆسکۆوە گەڕابوویەوە بۆ تاران, ئەگەر (شا)ی گەنج و بێ ئەزمون لە کاروباری سیاسەتدا, هاوتای ئەم سیاسەتمەدارە کۆنەکارو بەئەزمونە نەدەبوو, بە ئامانج و ئارەزوی خۆی دەگەیشت.

# مەتەڵۆکەی فەوزیە

بۆچی فەوزیە بەتۆراوی لە ئێران ڕۆیشت, ڕۆڵی ئەشرەفی خوشکی شا لە جیابوونەوەی شا و فەوزیەدا, فەوزیە دەترسا کە دەرمانخواردی بکەن, نامەی پاڕانەوەی حەمە ڕەزاشا بۆ مەلیك فاروقی میسر بۆ گەڕاندنەوەی فەوزیە, باڵوێزی شا لە میسر تۆمەتی خیانەت دەداتە پاڵ فەوزیە!, مەتەڵێك کە تەنها ئەشرەف دەتوانێت هەڵیبهێنێت!.

بەدرێژایی ئەو ساڵە پڕ لە ڕوداوانەی کە لە بەشەکانی پێشودا خرانە بەر دیدی خوێنەران, حەمە ڕەزاشا بە تەنها لە کۆشکەکەی خۆیدا دەژیا, فەوزیەی هاوسەری یەکەمی شا, دوای ئەو ڕوداوانەی کە لە بەشی دوەمدا ئاماژەی بۆ کراوە, ئاپارتمانەکەی خۆی لە شا جودا کردەوە و ئیدی ئامادە نەبوو گفتگۆ لەگەڵ شادا بکات, دەوترێت کە فەوزیە ژنێکی ساردو سڕ بووە بە جۆرێك کە (ژرار دو ویلیە)ی نوسەری فەرەنسی دەنووسێت کە شا نازناوی (ڤینۆسی سەهۆڵین) پێداوە, لەگەڵ ئەوەی کە فەوزیە دوای لەسەر تەختی سەڵتەنەت دانیشتنی حەمە ڕەزا, کۆشکی سەڵتەنەتی تەرك نەکرد و لە میوانداریە فەرمی و تەشریفاتیەکانی دەرباردا وەکو شاژنی ئێران ئامادە دەبوو, بەڕواڵەت هەڵسەکەوتەکانیشی لەگەڵ شادا باش بوو بە ڕادەیەك کە جگە لە دەرباریەکان هیچ کەس ئاگاداری ساردی نێوانیان نەبوو.

فیردۆست لە یاداشتەکانی خۆیدا بابەتێکی لە بارەی فەوزیە وە نوسیوە, کە هەرچەندە وەکو هەمو بابەتەکانی دیکە کە لە وتەی ئەو وەرگیراوە یان نوسراوە پێچەوانەو ناتەواون و مایەی وردبوونەوەن لێیان, بەڵام بە هۆی ئەوەی کە یەکێکە لە سەرچاوە پەیوەندیدارەکان بە ژیانی یەکەمین هاوسەری شاوە, بەوپەڕی خۆپارێزیەوە

بە شێکی لێدەگوازینەوە, فیردۆست دەنووسێت: (دەتوانم بانگەشەی ئەوە بکەم کە فەوزیە ژنی ژیان بوو, شەرمن قەشەنگ و تەنها هۆگری ژیان بوو, بەلآم حەمە ڕەزا پەیوەندی زۆری بەوە وە نەبوو, ئەو بە سروشتی خۆی ژنی رودارو سەرەڕۆی خۆشدەویست و فەوزیەی شەرمنیش ئەوی ڕازی نەکرد, ژیانی فەوزیە ئەم جۆرە لە دەرباردا بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی کە سیاسەتی ئینگلیزەکان گۆڕدرا و جودا بوونەوەی حەمە ڕەزا و فەوزیە لە هەمبانەی کاریاندا بوو, بۆچی؟ هۆکارەکەی نازانم بەلآم دەتوانم گومان ببەم, کە لەوانەیە لەو ڕۆژگارانەدا ئینگلیزەکان بە هۆی گەندەڵی مەلیك فاروقەوە پێشنیاری لەکار خستنی ئەویان ئامادە کردبوو, وە دەیانویست بە جودابوونەوەی حەمە ڕەزا لە فەوزیە بابەتەکانی ئەو دو وڵاتە لە یەکتر جودا ببنەوە, بۆ ئەوەی هیچ مەترسیەك هەڕەشە لە سەڵتەنەتەکەی حەمە ڕەزا نەکات, بەهەرحاڵ لە ڕوداوی جیابوونەوەی فەوزیە و حەمە ڕەزا دا (ئەرنست پرۆن) ڕۆڵی بنەڕەتی لە ئەستۆدا بوو.

لەم ساڵانەدا حەمە ڕەزا مەعشوقێکی پەیدا کردوە کە ناوبانگی بنەماڵەکەی (دیوسالار) بوو, چۆن و بە هۆی کێوە؟ ئاگام لێی نیە, بەلآم گومان دەکەم کە ڕاستەو خۆ بە هۆی دایکی کچەکەوە بووبێت, کە بۆ پێشکەشکردنی نامەیەك چوەتە خزمەتی حەمە ڕەزا و ئەم پەیوەندیە دروست بووە, ئەم کچە زۆر جوان هەرزە و خۆساچێن بووە و هۆنراوەشی دەوت و بەتەواوی ئەو ژنە بوو کە حەمە ڕەزا دەیویست, یەکەمجار لە ڕێگەی (پرون)ەوە لەم کەین و بەینە ئاگادار کرام, ڕۆژێك پرون ووتی: (هیچ دەزانی کە حەمە ڕەزا ماوەیەکە لەگەڵ کچێکدا بە ناوی دیوسالار پەیوەندی عاشقانەی هەیە), وتم نەخێر هیچ ئاگام لێی نیە, ئەی دەلآلیان کێ بووە؟ پرونیش نەیدەزانی, پرون ووتی: (من بەرگەی ئەم ڕەوشە ناگرم, کە حەمە ڕەزا سەرباری هەبوونی ژنێکی جوان و شەرمن (فەوزیە) ئەم ڕەفتارانەشی هەبێت...! دەبێت یان تۆبە بکات و ئیدی بەدوای ژندا نەڕوات یان من ئامۆژگارییەکی دەکەم کە فەوزیەی لێ جودا بێتەوە!), هەمان ئەم بابەتە شێوەی ڕەفتاری پرون لەگەڵ حەمە ڕەزا دا و ڕادەی ڕوداری ئەو بە باشی دەردەخات.

بەکورتی, پرون فەوزیەی ئاگادار کردەوە کە (مێردەکەت هاوەڵی کچی گرتووە و خیانەت لە تۆ دەکات, بۆ ئەوەی کە ئەم بانگەشەیەی من بسەلمێندرێت دەبێت خۆت

بێیت و بەچاوی خۆت ڕوداوەکان ببینیت..!)، ئەو لەوە ئاگادار بوو کە حەمە ڕەزا چ ڕۆژانێك دەچێت بۆ ماڵی ئەو کچە، ناونیشانی ماڵی کچەکە لە کوێیە..؟، چ کاتێك دەچێتە ژور و چ کاتێکیش دێتە دەرەوە، لە کام ژوردا یەك دەبینن و سیستمی خەوەکەیان لە کام ژوردایە، ئەم وردەکاریانە زانیاریەك نین کە دەستی پرون کەوتبێت بەڵکو بەدڵنیاییەوە بەوردی هەموی لە لایەن باڵوێزخانەی ئینگلیزەوە پێی درابوو، ئەم بەرنامەیەش بە هۆی ئەوانەوە پێشنیار کرابوو.

(پرون) دۆستێکی هەبوو بەناوی (ڕەفعەتیان) کە سەرهەنگی لەشکر بوو، ئەوکاتەی کە زانی حەمە ڕەزا دەچێت بۆلای دیوسالار بە ئۆتۆمبیل فەوزیەی برد و لە باتی شۆفێرەکەی ڕەفعەتیانی سوار کرد و ڕۆیشت بۆ لای ماڵی دیوسالار، لەوێ بە فەوزیەی وت کە ئاگادار بێت بۆ ئەوەی کە دڵنیا بێت کە حەمە ڕەزا لەوێیە، دواتر فەرمانی کرد بە ڕەفعەتیان کە بە سیلاحەکەی لاقەوی گوللەیەك بنێت بە ژوری خەوتنەکەوە، ڕەفعەتیان تەقاندی و گوللە دای لە سەقفی ژورەکە، پاش ماوەیەك، کچەکە کە نیگەران بووبوو وە تاڕادەیەکیش بەجەرگ بوو هاتە بەردەم پەنجەرەکە و کردیەوە و سەیرێکی دەرەوەی کرد، بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەوەی کە کەس لە دەرەوە نیە و حەمە ڕەزا بتوانێت بێتە دەرەوە، پرون و فەوزیە و ڕەفعەتیان لە تاریکی دا چاوەڕێیان کرد و دوای ماوەیەك حەمە ڕەزا بەو پەڕی ورپاییەوە لە باڵەخانەکە هاتە دەر و سواری ئۆتۆمبیلێك بوو، لەکاتێکدا کە خۆی شۆفێر بوو بەبێ پارێزەر ڕۆیشت و فەوزیەش هەمو ئەم شانۆیانەی بینی.

حەمە ڕەزا هەرگیز ئەم ڕوداوەی تا ساڵی ١٣٥٧هەتاوی بۆ باس نەکردم، بەڵام هەر هەمان شەو دوای گەڕانەوەی منی برد بۆ ژورەکەی و ڕوداوەکەی بە وردودرشتیەوە بۆ باس کردم، من نیگەران بووم و پێم وت (چۆن ڕێگە بە خۆت دەدەیت لەگەڵ حەمە ڕەزادا وەها کارێك بکەیت؟ ئەگەر گوللەکە بەر ئەو بکەوتایە چی دەبوو..؟)، پرون ووتی: (ئێستە خۆ بەری نەکەوت، من کاتێك هەستەکانم دێتە کوڵ لەم شتانە تێناگەم..!)، سەرم لە ڕەفتارەکەی سوڕ نەما، لەبەر ئەوە ئەمە یەکەمجارم نەبوو کە توندی و زبری ئەوم لەگەڵ حەمە ڕەزا بینیبێت.

مانگێك بە سەر ئەم ڕوداوەدا تێپەڕی و لەو ماوەیەدا فەوزیە نەلەسەر مێزی نان خواردن و نە لە هۆڵەکەشدا تەنها وشەیەك لەگەڵ حەمە ڕەزا قسانی نەکرد و هەمیشە

خەمبار بوو, دوای ماوەیەك تێگەیشتم كە فەوزیە دەیەوێت بچێتەوە بۆ میسر, لێم پرسی ئەوە بۆ چیە..؟ وەڵامی دایەوە كە هیلاك بووم و دەمەوێت بۆ ماوەی مانگێك بڕۆمەوە بۆ میسر و ئیسراحەتێك بكەم و دوای مانگێك دەگەڕێمەوە, فەوزیە ڕۆشتەوە بۆ میسر و نەزانرا لەوێ چی ڕوویدا, لەوانەیە بە هۆی كاریگەری ئامۆژگاریەكانی دایكی و خوشكەكانیەوە بووبێت دوای ماوەیەكی كەم گەڕایەوە بۆ ئێران و تیری پرون دای لە بەرد.

بە شكست خواردنی ئەم بەرنامەیە پرون بەرنامەیەكی دیكەی ئامادە كرد, ئەو پێشتر بە پێداگرتنێكی سەرسوڕهێنەر كەسێكی بە ناوی (تەقی ئیمامی) خزاندە نێو كۆشك و ئاهەنگە تایبەتیەكانی حەمە ڕەزاوە, ئیمامیش بە هۆی وەرزشكارییەوە توانیبووی لەگەڵ حەمە ڕەزادا ببێتە دۆستێكی گیانی بەگیانی, ماوەیەك دوای گەڕاندنەوەی فەوزیە, ڕۆژێك پرون بانگی كردم و ووتی: (لە كۆشكدا ڕوداو گەلێك ڕودەدات, لە نێوان تەقی ئیمامی و فەوزیەدا پەیوەندیەكی نا شەرعی دروست بووە!), وتم ئەمە چ قسەیەكە كە دەیكەیت, كوا شایەتت؟ ووتی: (شۆفێرەكەی فوزیە شایەتە و بابەتەكەش تۆماركراوە و ئەمەش بە حەمە ڕەزا دەڵێم!), پرون نەوەستا و هەمان ڕۆژ بابەتەكەی بە حەمە ڕەزا وت, حەمە ڕەزا منی بانگ كردو ووتی: (بڕۆ شۆفێرەكەی فەوزیە ببینەو بە شێوەیەكی تەواو لێكۆڵینەوەی لەگەڵدا بكە, وە دڵنیایشی بكەرەوە (كە دوردەبێت لە مەترسی) و هەڕەشەیشی لێ بكە كە ئەگەر شتی درۆ بڵێت, بەڵگەی دیكەش هەیەو بە توندی سزا دەدرێت!), منیش دیدارێكم لەگەڵ شۆفێرەكەی فەوزیەدا ڕێكخست, ئەویش ووتی: (ئەم بابەتە ڕاستە و ماوەیەكە كە هەفتەی دو شەو یان شەوێك و هەندێك جاریش هەمو شەوی هەفتە, تەقی ئیمامی و فەوزیە دەبەم بۆ گردەكانی مەحمودیە, (مەحمودیە لەو كاتەدا بیابان بوو, دواتر بوویە شەقامی پیراستە), لەوێ فەرمان بە من دەكەن كە پیادە ببم و دور بكەومەوە تا خۆیان ئاگادارم دەكەنەوە), دواتر شۆفێرەكە تكای دەكرد كە من تاوانم نیە و تەنها شۆفێرم, شاژن فەرمان بەمن دەكات و منیش دەبێت جێبەجێی بكەم, وتەكانی شۆفێرەكەم بۆ حەمە ڕەزا باسكرد, ووتی: (فەرمان بدە بە گارد كە ئیدی ڕێگە نەدەن تەقی ئیمامی بێتە نێو كۆشكەوە!), من دەست بەجێ ئەم فەرمانەم جێبەجێكرد و كاتێك كە تەقی ئیمامی ویستی بێتە نێو كۆشكەوە لەلایەن گاردەوە پێی وترا كە تۆ مۆڵەتت نیە بچیتە ژورەوە

بگەڕێرەوە و ئیدی نەیەیتەوە تا فەرمان دەکرێت, فەوزیە تێگەیشت کە ئیدی تەقی ئیمامی نایەت بۆ کۆشك و هەرچۆنێك بێت بابەتەکەی پێگەیشتبوو, کە لە بارەی ئەوە وە قسانێك هەیە, بەو تایبەتمەندیە ڕەوشتیانەی کە هەیبوو پێدەچو کە ئەمە تەنها شتێك بێت لای ئەو مایەی ئارامگرتن بەرگەگرتن نەبێت, دوبارە ئەو دە پازدە ڕۆژێك زۆر بێدەنگ و خەمبار بوو دواتر ڕایگەیاند بە مەبەستی حەوانەوە دەچێتەوە بۆ میسر, ڕۆشتەوە بۆ میسر ئیدی نەگەڕایەوە, پاش ماوەیەکیش مەلیك فاروقی برای پەیامێکی دایە حەمە ڕەزا کە دەبێت فەوزیە تەلاق بدەیت..)[1].

ڕاست و چەوتی ئەم وتانەی فیردۆست, بە تایبەت لەو لایەنەوە کە لە هەموشتێك تەنانەت لە پەیوەندیە جنسیەکانی دەرباریەکانیش لە دەستی ئینگلیزەکان وەردەگرێت, دڵنیای ناکەمەوە, بەڵام بەهەرحاڵ بەشێك ڕاستی لە دەربڕینەکانی فیردۆست دا هەیە و سەرچاوەی دیکەش خیانەتی شا و فەوزیەیان لە بەرامبەر یەکتریدا پشت ڕاست کردوەتەوە, پێویستە ئەوە بە بیر بهێنینەوە کە فەوزیە تەنانەت بەر لەو ڕوداوەی کە فیردۆست ئاماژەی بۆ دەکات, ئاگاداری پەیوەندیەکانی شا بووە لەگەڵ ژنانی دیکەدا و خوشکەکانی شایش لەم بارەیەوە بە تاوانبار دەزانێت, وە بابەتی پەیوەندی ئەویش لەگەڵ تەقی ئیمامی دا ئەگەر ڕاست بێت, نەك لەڕوی هەوەس بازیەوە بێت بەڵکو جۆرێك بووە لە تۆڵە سەندنەوە.

لە یاداشتەکانی (سورەییا) ژنی دوەمی حەمە ڕەزاشایشدا ئامارژەیەکی کورت بە ژیانی شا لەگەڵ فەوزیەدا کراوە, لەبەر ئەوەی شیاوی ڕاستترە لە چاو سەرچاوەکانی دیکەدا بۆیە گواستنەوەی ئەوە بەسودتر دێتە هەژمار, سورەییا دەنووسێت: (هاوسەرگیری شا لەگەڵ فەوزیەدا هەر لە سەرەتاوە هاوسەرگیریەکی سەرکەوتو نەبوو, لەبەرئەوەی کە فەوزیە لە دەربارێکی پڕ زرق و برق و لە نێو نازو نیعمەتێکی زۆردا گەورە بووە و دەرباری پەهلەوی بەبۆچونی ئەو زۆر هەژارانە دەهاتە بەر چاو, سەرباری ئەوەی کە ئەو چەندین ساڵ لە ئێراندا بوو هەوڵی نەدا فێری فارسی ببێت, وە هیچکاتێك پێگەی خۆیی وەك شاژنی ئێران بەلاوە گرنگ نەبوو, بەبیری ئەو تاران

---

[1] خاطرات ارتشبد سابق حسین فردوست,(ظهور وسقوط سلطنت پهلوی, موسسه مطالعات و پژوهشهای سیاسی, جلد اول, ص١٩٣-١٩٧.

شارێکی بچوك و مردو بوو, وه له تهواوی ئهو ماوهیهی که شاژنی ئێران بوو بهردهوام تاسهی بۆ گهڕانهوهی بۆ میسر و دوباره بینینهوهی ڕۆشناییهکانی شاری دڵگیری قاهیره دهخوارد.

شا لهگهڵ زۆر ژندا پهیوهندی ههبوو, که دوای جیابوونهوهی له فهوزیه لای شتێکی سروشتی بوو, ئهو به ژنانی ئهوروپایی و ئهمریکایی وه بهتایبهتی گروپی ژنانی ئهوروپاییهوه پهیوهندی ههبوو, بهڵام ههرگیز مهبهستی هاوسهرگیری لهگهڵیاندا نهبووه, لهبهرئهوه پێگهی خۆی وهك شای وڵاتێکی موسوڵمان دهپاراست, وهله دوای فهوزیهش له بیری هاوسهرگیری لهگهڵ ژنێکی ئێرانی و موسوڵماندا بوو)[1].

سورهییا له شوێنێکی دیکه دا له باسی پێشهکی هاوسهرگیری و چۆنیهتی ئاشنا بوونی به شا, ئاماژهی به دیداری خۆی لهگهڵ(شمس پههلهوی) دا دهکات له پاریس, دهنووسێت: ئهو (شمس) له یهکهم دیداردا پێی وتم (دڵم تۆی زۆر گرتوه, وه ئهگهر هاوسهرگیری لهگهڵ براکهمدا بکهیت, دهبم به باشترین دۆستی تۆ), من له کاتی فهوزیهدا زۆر پهشێو بووم, وهکاتێك هۆکارهکهیم لێ پرسی ووتی: (ئهشرهفی خوشکم خۆی زۆر لهو نزیك کردبوویهوه, ئهوانه ههمیشه پێکهوه بوون, سهرهنجام ئهشرهف بوویه هۆی جودا بوونهوهی فهوزیه له براکهم, ئاگات له خوشکهکهم بێت, ئهو کهسێکی پێگه ویست و پیلان گێڕه!)[2].

لهو سهرچاوه جیاوازانهی که دهربارهی فهوزیه له بهردهمی نوسهردان, ئاماژه به دهستوهردانهکانی ئهشرهف و پرون و فردوست کراوه لهو ڕوداوانهی که سهرهنجامهکهی ڕۆیشتنی فهوزیه بوو له ئێران, بهڵام بابهتی سهلمێنراو ئهوهیه که کاتێك فهوزیه له سهرهتاکانی ساڵی ١٣٢٤ههتاوی دا به مهبهستی سهرانی میسر, ئێرانی به جێهێشت, شا مهبهستی تهڵاق دانی ئهوی نهبووه, کاتێك که فهوزیه خۆی دهبووارد له گهڕانهوهی بۆ ئێران, شا له چهندین ڕێگهی جیاوازهوه کهوته بیری دڵدانهوهی ئهو ئامادهکردنی پێداویستیهکانی گهڕانهوهی بۆ ئێران, وه یهکێك لهو کهسانهی که داوای لێکرد (یوسف زولفقار پاشا) باوکی شاژنه فهریده (خهزوری

---

[1] Soraya, Princess:The Autobiography, of H. I. H. Prencess Soraya. London Arthur Barker, LTD 1963, p 70.

[2] Soraya, pp44-45.

مەلیك فاروق) و باڵوێزی گەورەی پێشوی میسر لە ئێران بوو, (دوکتۆر قاسم غەنی) کە لەگەڵ بەرپرسیارێتی گەڕاندنەوەی فەوزیە بۆ ئێران, لە مانگی (میهری ١٣٢٦هەتاوی)دا بە ناونیشانی باڵوێزی گەورەی ئێران لە میسر, بەرەو ئەو وڵاتە بەڕێکەوت, لە یەکەم قۆناغی کاری خۆیدا دیدارێکی لەگەڵ زولفقاردا ئەنجام دا بۆ ئەوەی سود لە دەسەڵات و پێگەی ئەو لە دەرباری میسردا وەر بگرێت بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە, لێکۆڵینەوە لە یاداشتەکانی دوکتۆر غەنی کە لە گرنگترینی سەرچاوەکانە دەربارەی ڕوداوی تەڵاق دانی فەوزیە, دەست دەکەین بە ڕاڤە کردنی ئەم دیدارە.

دوکتۆر غەنی دەربارەی یاداشتەکانی ڕۆژی (٢٦ میهری ١٣٢٦هەتاوی) خۆیدا دەنووسێت: (بەیانی زولفقار پاشا کاتژمێر دەونیو تەلەفونی کرد و هات بۆ باڵوێزخانە, زولفقار پاشا, باوکی شاژنە فەریدەیە کە یەکەم باڵوێزی میسر بوو لە ئێران, وە لە کاتی شاییەکە, واتە لە مارسی ١٩٣٩ز وەك باڵوێز دیاری کرا و لە کاتی گواستنەوەی خاوەن شکۆیان پەهلەوی و فەوزیە و شاژنە نازلی دا لەگەڵ ژنەکەی و کوڕەکەیدا هاتن بۆ ئێران, زۆر ئێران دۆستە, شای زۆر خۆشدەوێت, هاوڕێیەتیەکی پێشینەدار و درێژ خایەنیشی لەگەڵ مندا هەیە, زۆر بەڕێزە, زۆر دەربارەی بابەتەکەی ڕێزدار فەوزیە قسەم کرد, ئەم پیاوە تا ئیستا زۆر هەوڵی داوە بەڵام سەرکەوتو نەبووە, جارێك (خودی خاوەن شکۆ لە تاران بۆی باسکردم) بە جۆرێك کە خۆی بە درێژی باسی کرد, دەچێتە خزمەتی مەلیك فاروق, واتە نزیکەی دوساڵ پێشتر (کەمێك دوای هاتنی فەوزیە بۆ میسر), وە دەلیلی زۆری بۆ باس دەکات کە واباشترە شاژنە فەوزیە بگەڕێتەوە بۆ ئێران, مەلیك فاروق دوای گوێگرتن لە سەرجەم هۆکارەکان دەڵێت, من چی بکەم؟ خوشکەکەم نایەوێت بڕواتەوە, دەست بەجێ تەلەفون دەکات و فەوزیە دێت, دەڵێت: خوشکێ لە بارەی ئێران و گەڕانەوەت چی دەڵێیت؟ زولفقار پاشا دیسان هۆکارەکانی خۆی دوبارە دەکاتەوە, فەوزیە دەڵێت: نا هەرگیز ناگەڕێمەوە, هەرچۆنێك بێت ماوەی چەند ساڵ ئارامم گرت, چەرمەسەریم کێشا, ئیدی توانام نیە, ئارامم لە سەر هەمو جۆرە هەڕەشە و سوکایەتیەك گرت, ئیدی لە توانامدا نەما و هەرگیز ناگەڕێمەوە, زولفقار پاشا دەڵێت: ئاخر خاوەن ڕێز چی بە شاهینازی کچتان دەکەیت؟ دەڵێت: بەڵێ, ئەمە تەنها کارەساتێکە بۆ من,

دەبێت کارێك بکەین کە شەش مانگ جارێك چەند ڕۆژێك ئەو بنێردرێت بۆ میسر, بەکورتی ڕازی نابێت.

ئەم بەشەی گفتوگۆکەم لە دۆسیەی ئەو بابەتەدا خوێندبوویەوە, بەڵام زولفقار پاشا لە درێژەی باسکردنی ئەم گفتوگۆیەدا, داوای بەڵێنی لێکردم کە نهێنی بێت و هیچ کەسێك نەزانێت, وتی ئەو نهێنیەی کە دەبێت بەتۆ بڵێم ئەوەیە کە لەو کاتەدا لەبەر ئەوەی کە من زۆر پێداگریم لەسەر دەکرد, فەوزیە ووتی: (زۆر باشە, ئەگەر بڕۆمەوە ئیدی بەهیوای ئەوە وە نەبێت کە من بە زیندویی ببینیتەوە, توشی شۆك بووم کە واتای چیە؟ ووتی: بەڵێ, من دڵنیام کە ژەهر خواردم دەکەن و لەناوم دەبەن و ناوناتۆرەیەکی ناسازیشم دوا دەخەن!...)[1].

دوکتۆر قاسم غەنی لە یاداشتەکانی ڕۆژی (٦ی ئابانی ١٢٣٦هەتاوی) خۆیدا, لە خانم (محسن قرەگوزلو)ەوە کە لە تاران دا هاتوچۆی لەگەڵ فەوزیەدا هەبووە, دەنووسێت: (فەوزیە هەر لەسەرەتاوە ماوەیەکی کاتی هات, بەڵام کاغەزێکی بەدەست گەیشت کە خوێندیەوە گریا و دەرگای لە خۆی داخست و پێشوازی لە کەس نەکرد و نانی نەخوارد, کاتژمێر سێی دوای نیوەشەو براکەی هات و ئەوی لەگەڵ خۆیدا برد, ئیتر تا ئێستا بەو شێوەیە یە کە دەیبینیت), کاغەزەکە لە کێوە و چی بووە, نەیدەتوانی هیچ گومانێك ببات, هەرچی لە بارەی فەوزیەوە دەبیستم بەڵگەی هیوابڕاویین و دەچنە سەر نا ڕۆشنی بابەتەکە, چۆن فەوزیەیان بەو کاغەزە پڕ کەین و بەینە هەڵوەراند؟ کاغەز هی کێ بوو وەبە چ مەبەستێك؟ یەکێك لەو کاغەزانە بە هۆی وەزارەتی دەرەوە لە تاران هاتوە, کاتێك دەچیتە بەڕێوەبەرایەتی وەزارەتی دەرەوە دەڵێن: کاغەز لەلایەن ئەشرەفەوە بووە, ئەشرەف حاشا دەکات و بێئاگایی خۆی دەردەبڕێت, لەوانەیە ڕاستیش بکات بە ناوی ئەوە وە پێیان دابێت, دەڵێن خانم عەلا و دایکە جادوگەرەکەی لەم ڕوداوەدا هەبوون, بە بیری ئەوەی کە (ئێرانی کچی عەلا) بکەن بە هاوسەری شا, ئاغای صاحبدیوانی ئەمە بە پیلانی ژنی عەلا و ئەشرەف پەهلەوی دەزانێت و دەڵێت: ئێستاش ئەشرەف ڕۆشتوە بۆ ئەمریکا و ئەمەش لە کارەکانیەتی, خانم قرەگولوزیش دەیوت: ئەشرەف ئێستا زۆر بەرز بووەتەوە و

---

[1] خاطرات دکتر قاسم غنی. انتشارات کاوش, ١٣٦١, ص١٤-١٥.

بووەتە هەمەکارەی دەربار, ناچار حەزی نەدەکرد کە فەوزیە بڕوات و دەردیسەری بۆ ئەو دروست بکات, واتە ئەو لە ژێر ڕۆشنایی کەسێکی دیکەدا بێت[1].

دوکتۆر غەنی لە یاداشتەکانی ڕۆژی (١٩ ئابن ١٣٢٦هەتاوی) خۆی دا, باس لە یەکەمین پێشوازی خۆی بە ئامادە بوونی مەلیك فاروق دەکات پاش ڕونکردنەوەیەکی ورد دەربارەی گفتوگۆ سەرەتاییەکانی لەگەڵ پادشای میسر دا, دەنووسێت: سەرەنجام باسی فەوزیە هاتە نێو باسان, (باسێکی پەیوەندی و خۆشەویستیە گیان بە گیانیەکانی خاوەن شکۆم بۆ شاژنە فەوزیە لە خزمەتی مەلیك دا کرد, کە ئەمە بنەڕەتەو کێشەکانی دیکە لە نێو دەچن و بیر نامێنن, لە بەرئەوەی کە خودی ئەویش شاژنی زۆر خۆشدەویست, ئارەزوی خۆشبەختی ودڵخۆشی ئەوی دەکرد, شاهینازی بیگوناهی منداڵیش نیشانەی تەواوی ئەم بەدبەختیانەیە, لەم بابەتە وەها باسێکم لە خزمەتیاندا باسکرد کە مەلیك فاروق لە کاتی قسەکردنی مندا ووتی: بەڵێ, ئەمە بە تەواوی مایەی داخ و نیگەرانیە, دواتر وتم: خاوەن شکۆ تۆ لە جێگەی باوکی فەوزیە دادەنرێیت, لە دونیای باوکایەتیشدا دەبێت ئەوەی کە لە بەرژەوەندی ئەوە, دەستور بدەیت ئەنجام بدرێت) مەلیك فاروق ووتی: من سەرجەم وتەکانی تۆ بە ڕاست دەزانم, وە ئەوەش بزانە ئەم بەیەك گەیشتنە من ئەنجامم داوە, پیاوانی میسر و زۆربەی دەرباریەکان و ئەندامانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی هەموان دژی ئەوە بوون, تەنانەت دایکیشم زۆر ڕەزامەندی لەسەر ئەم کارە نەبوو, من هەمان ئەو بەرژەوەندیەم لە بەرچاو گرت و گرنگیم پێدا تا ئەنجام بدرێت, بەڵام بەداخەوە کارەکەمان ڕاست دەرنەهات, من خوشکەکەمم خۆشدەوێت و ئەویش منی خۆشدەوێت, کاتێك هاتەوە تەندروستی ئەو بە تەواوی واتا خراپ بوو بوو, ئەوەی کە دەستکەوتوە, ناتوانێت و ناشیەوێت ئەم کارە بکات, من ئەتوانم چی بکەم..؟.

دوکتۆر غەنی دیسان پێداگری دەکات و مەلیك فاروق وەڵام دەداتەوە: (کاکی باڵوێز باوەڕبکە و قبووڵی بکە کە ناتوانم, تەواو بووە), دوکتۆر غەنی داوای دیدار لەگەڵ فەوزیەدا دەکات تا ڕاستەوخۆ گفتوگۆی لەگەڵدا بکات, مەلیك فاروق لە وەڵامدا دەڵێت: (فەوزیە نایەوێت جارێکی دیکە لەو بارەیەوە گفتوگۆ بکات, نوێی بکاتەوە و

---

[1] خاطرات دکتر قاسم غنی. ص ٢٣-٢٥.

بێتەوە بیری, لەبەر ئەوە سودی نیە), دوکتۆر غەنی هەمان دانوستانی خۆی لەگەڵ مەلیك فاروق دا بوو ڕاپۆرتێك دەنێرێتەوە بۆ تاران, وەڵامی پێدەگاتەوە کە (خاوەن شکۆ (حەمە ڕەزاشا) فەرمویەتی ئەو کارانەی کە ئەنجامت داوە باش بووە, دانوستان و کارەکانی خۆتان بە شێوەیەك کە بە گونجاو و لەباری دەزانن, پێوشوێن بگرن)[1].

بەر لە پێوشوێن گرتنی یاداشتەکانی دوکتۆر غەنی, پێویستە دەقی نامەیەك کە محەمەدشا لە ڕێگەی (مەحمود جەم)ی باڵوێزی پێشوی ئێران لە میسر, ناردویەتی بۆ مەلیك فاروق, لێرەدا یبخەینە ڕو, ئەم نامەیە کە بە زمانی فەڕەنسی نوسراوە, بە ڕواڵەت وادەردەکەوێت کە دوای ئەوەی مەلیك فاروق ئاگاداری دەداتە باڵوێزی ئێران کە ئیدی فەوزیە ناگەڕێتەوە بۆ ئێران, بۆ پادشای میسر نێردراوە, دەقی نامەکە ئەوە دەردەخات کە مەلیك فاروق هۆکاری خۆی بۆ داواکردنی تەڵاق دانی فەوزیە خستوەتە ڕو, لەگەڵ ئەوەشدا تۆمەتانێکیشی داوەتە پاڵ شا, وەرگێڕدراوی نامەکە بۆ مەلیك فاروق, دوای لابردنی پێشەکیەکەی بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

*((من بەداخم ئێوە لەم بابەتە ئاگادار بکەمەوە, کە ئەوەی دەربارەی بەزۆر هاوسەرگیری من, بە فەرمانی باوکم, وە ئەوەی کە من پێش ئەنجام دانی هاوسەرگیریم مەعشوقێکم هەبووبێت, بە ئێوە وتراوە درۆیەکی شاخدارە, عەشق و دڵبەستراوی من بە خوشکەکەی ئێوە وە بەڕادەیەك ڕونە کە من هیچ پێویستیەك بۆ جەختکردنەوە لە سەر ئەو بابەتە نابینم.*

*من دەتوانم بە تەواوی ئەم بابەتە بخەمەڕو کە ماوەی سێ ساڵ (تا ڕوداوەکانی شەهریوەری ١٣٢٠هەتاوی) من باشترینی مێردەکان بووم, دوای ڕوداوەکەی شەهریوەر کە شاژن بۆ ماوەی بیست تا سی ڕۆژ سەفەرێکی کرد بۆ ئەسفەهان, لە گەڕانەوەی ئەو سەفەرەیدا هەستەکانی ئەو بەرامبەر بە من گۆڕنکاری بە سەردا هات, وە نەخۆشی ئەویش بوویە ڕێگری بەردەم هاونشین بوونمان.*

*پیویست بە ڕونکردنەوە ناکات کە جەنابی خاوەن شکۆ خۆتان ئاگاتان لە ڕودانی کارەساتەکانە کە بە ڕوخاندنی خەم هێنەری باوکم کۆتایی پێهات,*

---

[1] خاطرات دکتر قاسم غنی. ص٤٤-٤٦.

دەزانن کە من تا چ ڕادەیەك گرفتاری کارو بارەکانی ولأتەکەم بووم چەندە پێویستیم بە هاوکاری هەبوو, دیسان دەبێت بە تەواوی داخەوە بڵێم کە خوشکی ئەو خاوەن شکۆیە هیچ جۆرە یارمەتی و هاوکاری لەگەڵ مندا نەکرد, ئەگەر ئێستا ئەو من تاوانبار دەکات بە هەبوونی مەعشوقێك, ئابڕو ناموسی من ڕێگە نادات کە هەندێ بابەت پەیوەندی بەوە وە هەیە ئاشکرا بکەم, لەبەر ئەوە کە دەستکەوتێکی جگە لە ڕسوا بوونی هەردو بنەماڵەکە نیە, پەیوەندی تایبەتی و ژن و مێردی من لەگەڵ شاژن دا ڕێك دە مانگ پێشتر, ئەویش بە هۆی کۆمەڵە هۆکارێکە وە کە لە وتنیان شەرم دەکەم, پچڕاوە.

لەگەڵ تەواوی ئەو شتانەی کە بە بیرم هێنایەوە, ڕۆژێك نەبووە کە لە کاتی خۆیدا نەگەڕێمەوە بۆ کۆشك و لەگەڵیاندا نانم نەخواردبێت, وە دەبێت ئەوەش زیاد بکەم کە هەمیشە کاتژمێر (۹) لەماڵدا بووم, مەگەر ئەوەی کە ڕوداوێك ڕوی دابێت و دوایخستبم.

بەلأم دەربارەی نە خۆشی شاژن, ئەم بابەتە پەیوەندی بە منەوە نەبووە, بە پێچەوانەوە لە ئەنجامی ئەو ڕەوشە شەرم هێنەرەی کە ئەو دروستی کردبوو, سەرچاوەی گرتوە, ئەو تۆمەتە ئاڕاستە کراوانە بەرامبەر بە من بەڕادەیەك بێ بنەمایە کە من بە سەر سوڕمانەوە لە خۆم دەپرسم, ئەم بابەتە بۆچی بوەتە سەرباس...؟ ژوری خەوی ئێمە لە یەکتری جودا نەبوو وە من هەمیشە لەگەڵیدا باشترین ڕوبەڕو بوونەوەم هەبووە, بەلأم ئەو هەرگیز ئارەزوی هاونشینی لەگەڵ مندا دەرنەدەبڕی.

ئەو هیچکات هۆگری بۆ کاروباری ولأت دەرنەدەبڕی, هەمیشە کاتژمێر یەکی دوای نیوەڕۆ لە خەو هەڵدەستا و بە زۆری بە تەنیایی و بە بێ شۆفێر لە کۆشك دەچویە دەرەوە, وە ڕێگەی بە کەسیش نەدەدا کە لەگەڵیدا بڕوات..!, من تەواوی هەوڵی خۆمم بۆ بە نهێنی هێشتنەوەی ئەم کارە شەرم هێنەرە خستبوویە گەڕ, بەداخەوە شاژن ئەوەندە خۆ پارێزی نەدەکرد تا هەراوقاڵەی ئەوە تارانی تەنیەوە.

ئەگەر شاژن دەیەوێت لە میسر بمێنێتەوە, دەبێت بزانێت کە بووارنامەی هەندێك کەس سەبارەت بە سەرنجی ئەو تۆمارکراوە, من بەو

*دەرئەنجامە گەیشتوم کە ئەو تۆمەتانەی ئەو داویەتە پاڵ من بۆ بەرگریکردنە لە خۆی، (بەهیە و گاگنیس)[1] باشترین شایەتن بە ئێوە بڵێن کە من کەی گەڕاومەتەوە بۆ ماڵ))*[2].

ئەم نامەیە، کە زۆر بێ ئەزمونانە و بە بێ ڕەچاوکردنی یاسای نامەنوسین، ئەویش لە نێوان دو پادشادا، نوسراوە، ڕوبەڕوی بەرپەرچدانەوەیەکی توندی دەرباری میسر بوویەوە، تەنانەت هەوڵەکانی دواتری مەحمودجەمیش بۆ ساغکردنەوە و گەڕاندنەوەی بابەتەکە بەرهەمی نەبوو، سەرەنجام مەلیك فاروق لە درێژەی نامەیەکیدا بۆ شای ئێران بێ پێچو پەنا نوسی: بەداخم کە خوشکەکەم ناتوانێت و نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ ئێران و داوای تەڵاق دەکات، منیش ناتوانم ئەم ڕوداوە بگۆڕم، باشتر وایە ئەم کارەش بۆ پاراستنی بەرژەوەندی و ئابڕوی هەردو بنەماڵەی سەڵتەنەتی، بە شێوەیەکی ئاشتیانە و دۆستانە ئەنجام بدرێت و کار نەگاتە دیوانی سەڵتەنەتی میسر، دوکتۆر غەنی دوای گەیشتنی ئەم نامەیە لەمریکاوە بۆ تاران بانگ کرایەوە، لەگەڵ کارەکانی باڵوێزی گەورەی ئێران لە میسر چارەسەرکردنی ئەم کێشە یەشی پێ سپێردرا، شا نامەیەکی بۆ وەڵامی نامەکەی مەلیك فاروق ئامادە کردو بە خودی دوکتۆر غەنیدا ناردی، دوای سەرنجەکانی، بە زیاد کردنی چەند دێڕێك بە مەبەستی ناساندنی دوکتۆر غەنی بابەتی کارەکەی، نامەکەی واژۆ کرد، دەقی ئەو نامەیەی کە خودی دوکتۆر غەنی هەڵیگرتبوو بەم شێوەیە بوو:

((لەوەڵامی نامەکەی برای بەڕێزمدا، بەسەرنج دان بەو هۆگریە زۆرەی دڵم کە بۆ خودی شاژنە فەوزیە و خۆشبەختی (شهناز) منداڵە ئەزیزەکەمان هەمە، وە گومان دەبەم هەرکاتێك جەنابیان (فەوزیە) بگەڕێنەوە بۆ دڵی خۆیان، دوای هەمو ئەو دڵتەنگیانەی کە پێدەچێت هەیبێت، ناتوانێت حاشا لەو هۆگریەی دڵی من بکات

---

[1] ئەوانە ناوی خزمەتکارە میسریەکانی فەوزیەن.

[2] دەقی فەرەنسی ئەم نامە، کە چەند هەڵەیەکی ڕێزمانی و ڕێنوسیشی تێدایە، لە لاپەڕەی ٢٦٧-٢٦٨ ی کتێبی (خاطرات دکتر قاسم غنی، انتشارات کاوش)، چاپ کراوە، دەقە فارسیەکە لە فەرەنسیە بنەڕەتەکەوە وەرگێڕدراوە، چونکە لە وەرگێڕدراوی کتێبەکەدا بۆ گونجاندن، چەند هەڵەیەك بە دی دەکرێت.

سەبارەت بە خۆیی و خۆشبەختی منداڵە ئەزیزەکەمان، هەربۆیە بە پێویستی دەزانم کە جارێکی دیکەش ئەم خاڵانەی خوارەوە بە بیری بەڕێزیان بهێنمەوە:

١- ئەوان چەندین ئەرکی ئەخلاقی و ویژدانی لە سەرە کە دەبێت بە بیرێکی ڕاست و دروستەوە بڕیار بدات کە شایستەی پێگەکەی ئەو بێت.

٢- ئەوان شاژنی مەملەکەتێکی مێژویی مەزنن کە سەرجەم تاکەکانی ئەو میللەتە، بەئەوپەڕی ڕاستگۆییەوە خۆشیان دەوێت و ڕێزی لێدەگرن، دایکی منداڵێکی بێگوناهن، کە بە هەمان ئەو جۆرەی گوڵێکی ناسك پێویستی بە نور و گەرمایی هەیە تا پەروەردە بێت و گەشە بکات، ئەویش نیازمەندی نورو گەرمایی خۆشەویستی دایکانەیە.

٣- ئەوان هاوسەری پاشایەکن کە لەدڵ و گیانیەوە ئەوی خۆشدەوێت و هۆگری خۆشبەختیەکانی ئەوە، چۆن دەگونجێت گوێ بەم هەمو ئەرکە نەدات و زیاتریش ورك گیر بێت و پێداگری بکات لە سەر جێبەجێکردنی کارێکی شومی وەکو تەلاق.

پێدەچێت ڕەوشی ژیانی ئەو و ژینگەی دەربار هاوتای ئارەزوەکانی ئەو نەبووبێت، وە لەم ڕووەوە ناڕەزایی زۆری هەبێت، بۆ ئەمەش پێویست بوو ئەوکاتانەی کە لە ئێراندا بوو بە دەمی پێی بووتمایە وە یان دواتر بە نوسراو منی ئاگادار بکردایەتەوە، تا بە هەر چەشنێك کە ئارەزوی ئەوان بێت بۆیان ئامادە بکرێت، ئەو ژینگەیەی کە ئارەزوی لێیەتی دروست بکرایا، ئەوکەسانەی کە بۆ هاونشینی خۆی یان بۆ جێبەجێکردنی کارە دەرباریە تایبەتەکانی خۆی بوویێت، بەگشتی میسری یان ئێرانی دەنێردرانە خزمەتی. من پڕ بە دڵ بەڵێن دەدەم کە هەرچۆنێك ئەوان بەدڵیان بێت ژیانیان بۆ ڕێك بخەم، وە ئەوان فەرمون بگەڕێنەوە و هەستن بە کاری تایبەتی سەڵتەنەتی شاژنی ئێران و دایکایەتی و هاوسەرداری.

خاوەن شکۆ (مەلیك فاروق) لەبەرامبەر مندا ڕێژەیەك برایەتی و لە بەرامبەر ئەویشدا بە شێوەیەکی تایبەتی و جۆرێك لە ڕێژەی باوکایەتی و گەورەیتان هەیە، لەئەو دونیا نیەت پاکی و بیرە باشەی کە هەتە دەبێت ئامۆژگاری و ڕێ پیشاندەری برایانە ئەنجام بدەیت و ئەوەی کە پێویستی خۆشگوزەرانی هەردو وڵاتە ئامادەی بکەیت، دڵنیام کە بەڕێزتان تەنها کەسێکن کە دەتوانێت بیری شاژن بگۆڕێت و

پێداویستیەکانی لێك تێگەیشتنی من و ئەو ئامادە بکات, منیش بە نۆرەی خۆم, بەوجۆرەی کە ئاماژەی بۆ کرا, هاوتای سەلیقەو ئارەزوی ئەو ژیانی خودی و دەرباریشیان بە باشترین شێوە بۆ فەراهەم دەکەم.

خاوەن شکۆ شایەتی ڕوودانی ڕوداوەکان بوویت, کە نزیکەی دو ساڵە بە هۆی هۆگری فراوانی دڵم بە خۆشبەختی شاژنە فەوزیە و شهناز هەمبووە, هێمنی و ئارامیم کردوەتە دروشمی خۆم, لەم ماوەیەشدا هیچ دەلیلێکی ڕاستم نەدۆزیەوە کە ببێتە هۆی وەڕەز بوون ئێستاش هیچ دەلیلێکیئاوەزی نابینم کە ببێتە مایەی وەڕەز بوون و تەلاق دان, باڵوێز و نوێنەری تایبەتی من دوکتۆر غەنی کە بە تەواوی ئاگای لە نیەت باشی من هەیە, دێتە خزمەتی ئەو برا بەڕێزەم, بە ئومێدم کە وتەکانی ئەو کە هاوتای نیەتی منە لەگەڵ سەرنجی ڕوخۆشی و خۆشەویستیدا هاوتابووە, ئەم کارە بە ڕەچاو کردنی باشی و بەرژەوەندیەکانی هەردو کۆتایی پێ بێت))[1].

دوکتۆر غەنی دوای پێشکەشکردنی دەقی نامە فەڕەنسیەکە بە مەلیك فاروق و ئەنجامدانی گفتوگۆ لەگەڵیدا, سەرکەوتوبوو لە ڕێکخستنی دیدارێك لەگەڵ خودی فەوزیەدا لە ڕۆژی سێشەممە (١٧ ئازەر ١٣٢٦هەتاوی)دا, دوکتۆر غەنی لە بارەی ڕوداوەکانی ئەم دیدارەوە کە لە کۆشکی (قبە)ی شوێنی نیشتەجێبوونی فەوزیە ئەنجام درا, بە دورو درێژی باسکردوە, کە پێشەکی ئەو ڕوداوە, ڕۆشتنە نێو کۆشك و پێشوازی و یەکترناسین و پاشان خستنە ڕوی بابەتەکەیە, کە تاڕادەیەك پوختە نامەکەی محەمەدشایە بۆ مەلیك فاروق, کە تیایدا زیاتر جەخت کراوەتەوە لە سەر عەشق و هۆگری شا بۆ هاوسەرەکەی و بەڵێنی جێبەجێکردنی سەرجەم داواکاریەکان و مەرجەکانی بۆ گەڕانەوەی بۆ ئێران, وە جوڵاندنی هەستی دایکایەتی فەوزیە, فەوزیە لە وەڵامدا دەڵێت: (من لەو بارەیەوە بیری خۆمم کردوەتەوە, ماوەیەکە بڕیاری یەکلاکەرەوەم داوە, کە ئەویش نەگەڕانەوەیە بۆ ئێران, ئارەزو دەکەم ناکۆکی دروست ببێت و کۆتایی پێ بێت, هەڵبەتە (شهناز)م خۆشدەوێت, خۆشحاڵم کە هەموان ئەوتان

[1] دەقی ئەم نامەیە لە کتێبی (خاطرات دکتر غنی) وەرگیراوە, دوکتۆر غەنی دەقی نامە فەڕەنسیەکەی خۆیشی کە پێشکەشی مەلیك فاروقی کردووە, چاپ کردوە, کە لە دەقە فارسیەکەی کورت و پوخت ترە.

خۆش دەویێت و گرنگی پێ دەدەن)، دیسان دوکتۆر غەنی باسێکی دوورو درێژ دەربارەی هەستەکانی شا لە بەرامبەر ئەودا دەخاتە ڕو، وە دەڵێت: (ئەمڕۆ ئەو پاشا گەنجە تاکە پاڵپشتێکی دەرونی کە دەبێت هەیبێت، هێمنی و ئارامیە لەماڵەکەی خۆیدا، کە بەداخەوە ئەوەی نیە، تۆ هەمو شتێکی ئەویت، تۆ ناتوانی هەست بکەیت کە تا چ ڕادەیەك تۆی خۆشدەوێت، بەشێکی بۆشاییت لە دڵی ئەودا بەرهەم هێناوە، بە هەر هەنگاوێك منداڵەکەتان سەرجەمی نوێ دەکاتەوە، وەرە و ڕابردو فەرامۆش بکە، بگەڕێرەوە بۆ لای مەملەکەت و منداڵەکەت و هاونشینی مێردەکەت)، دوبارە فەوزیە هەمان وەڵامی کورتی دەداتەوە کە: (من هەستەکانم گۆڕاوە، ناگەڕێمەوە!).

دواتر دوکتۆر غەنی بابەتی ئەو نامەیەی کە بۆ فەوزیە نێردراوە و بووەتە هۆی بڕیاردانی لە ناکاوی جودا بوونەوەی ئەو لە محەمەدشا دێنێتە بەر باس و دەڵێت: (بیستومە کاغەزێك گەیشتوە بە تۆ، خانم دەبێت ئەوە بزانیت کە تۆو خاوەن شکۆ خراپەکار و دڵ ڕەشتان لە دورو نزیکی خۆتاندا هەیە، بەتایبەت مەلیکەکان و پاشاکان و شاژنەکان لە بەردەمی ئەم مەترسی و خراپ تێکەیاندن و گومان خراپیەدان، ئایا ئەگەر بەو شێوەیەش بێت، تۆ دەتوانیت سەرجەم پێوەرەکانی ژیری و ویژدان و ئەرك وکار فەرامۆش بکەیت و کاریگەر بیت بە کاغەزی ڕێکخراوی کەسێکی دڵ ڕەش..؟)، فەوزیە حاشا لە بابەتی ئەو نامەیە دەکات و سەرەنجام دەڵێت: (من دەمەوێت بە شا بڵێیت کە من ناگەڕێمەوە، باشترە بە شێوەیەکی ئاشتیانە من تەڵاق بدات، ئەگینا من خۆم لێرە هەنگاو هەڵدێنم، پێی بڵێ کە بە دۆستانە و بە خۆشی کۆتایی پێ بهێنێت، تا ناچار نەبم کە خۆم لێرە هەنگاو هەڵبێنم...)[1].

دوای باسکردنی ئەم دیدارە ئاوازی دوکتۆر قاسم غەنی گۆڕانی بەسەردا دێت و گومانانێك بە فەوزیە و مەلیك فاروق، تەنانەت پەیوەندیشیان لەگەڵ یەکتری، دەداتە پاڵیان، لە شوێنێکدا لە درێژەی گفتوگۆکانی لەگەڵ زولفقارپاشای خەزوری مەلیك فاروق دا، دەنووسێت: (هەرچەندێك پێویست بوو قسەمان لە ڕوداوەکە کرد، لێی پرسیم: ئەگەر پێداگری بکەن لەسەر تەڵاق چی دەکەن؟ وتم من باوەڕم وایە کە نابێت تەڵاقی بدەین و پێداگری بکەین، لەبەر ئەوە ئێمەیان لە دەست خستوە و هەرچیەك کە

---

[1] خاطرات دکتر قاسم غنی، ص ٧٦-٨٠.

نەدەبوو ڕوبدات, ڕویدا, ئیدی بۆ ئێمە جیاوازی نیە....., پرسیارم لە شاژنە فەریدە (هاوسەری مەلیك فاروق) کرد: دەیوت تەنیا لە کۆشکی (عابیدین)ە و مەلیك لەگەڵ فەوزیەش لە کۆشکی (رقبە)ن, باسی بێ هەستی ئەوانی دەکرد, وتم: ئایا مەلیك فاروق منداڵەکانی دەبینێت؟ وتی نەخێر, تەنانەت چەند ڕۆژێك لەمەو بەر لە ساڵیادی لەدایك بوونی یەکێك لە کچەکان من لێرە بووم, ئەو ڕۆژە مەلیك لە (رقبە) لە میوانداریەکی فەوزیەدا لەگەڵ هەزاران ژندا بووە, واتە ئەو تەنها پیاو بووە و وێنەی گرتوە, باوەڕی وابوو کە سەرەنجام محەمەدشا (کچەکەی)[1] تەڵاق دەدات)[2].

وردەوردە بابەتی تەڵاق یەکلایی دەبێتەوە و تەنها دەربارەی مەرجەکانی تەڵاق وناوەڕۆکی ئەو ڕاگەیەندراوەی کە بڵاو دەکرێتەوە, گفتوگۆ دەکرا, ئیدی دوکتۆر غەنی بێ پەروا گومانی خراپ لە وتەکانی ئەم و ئەوە وە دەداتە پاڵ فەوزیە, لە نێو ئەوانەشدا لە یاداشتەکانی ڕۆژی (١٠ فەروەردینی ١٣٢٧هەتاوی) خۆیدا دەنووسێت: (مەلیحە شەفیق (خوشکی مێردە میسریەکەی ئەشرەف) دەیوت: ئیمامی لە تاران نزیك بوونەوەیەکی تایبەتی لەگەڵ فەوزیەدا پەیدا کرد و لەگەڵیدا دەچو بۆ پیاسەو سەیران, لەلایەکی دیکەوە شاپور مەحمودڕەزا دڵدۆڕاوی فەوزیە بوو, شاپور بەوئێرەییەی کە هەیبوو چاودێری فەوزیەی دەکرد, ڕۆژێك بە ئۆتۆمبیل پێوشوێنی ئەو دوانە (فەوزیەوئیمامی)ی گرت و هەدروکیانی لە سەیرانێکدا بینی, ئەو شەوەی کە ڕۆژی دواتری دەڕۆیشت بۆ ئەمریکا بەنهێنی بە شای وت, شا پێشوتر شتانێکی دەزانی, بەڵام گوێی پێ نەدەدا (باوەڕی نەدەکرد), پرون و فیردۆست و ئەوانی دی بوونە هۆی دەرکردنی ئیمامی, ئێمە لە کاتی سەفەری فەوزیەدا یەکلامان کردبوویەوە کە ئەگەر بێت, ناگەڕێتەوە)[3].

لە یادشتەکانی ڕۆژی (٢٩ مەی ١٩٤٨ز , ٨خورداد ١٣٢٧هەتاوی)دا دەنووسێت: (کاتژمێر یازدە عەسەل بێگ (باڵوێزی میسر لە ئێران) هات بۆ سەردان,

---

[1] لە کتێبە فارسیەکەدا (کچەکەی) نوسراوە, بەڵام (خوشکەکەی) ڕاستە, چون فەوزیە خوشکی مەلیك فاروقە نەك کچی. (وەرگێڕ).

[2] خاطرات دکتر قاسم غنی, ص١٠١.

[3] خاطرات دکتر قاسم غنی, ص١٦٦.

دەیوت: پێنج جار بە خزمەت گەیشتووم, خاوەن شکۆ میهرەبان و بەڕێز و دیموکورات و....هتد, لە بارەی تەڵاقەوە شا فەرمویان بە بۆچونی فلانی:

١- فەوزیە بنوسێت بۆ شاو هۆکارەکانی داواکردنی تەڵاق بخاتە ڕو.

٢- دەرکردنی ڕاگەیەندراوێك کە قەڵاق دانەکە بە هۆی چ هۆکارێکەوە بووە.

٣- پەیوەندی هەردولا لە سەرنجەکانی مەملەکەت تەنانەت هاوپەیمانان.

٤- وەرگرتنەوەی دوپارچە خشڵی یادگاری و چاوپۆشین لەوانی دی.

تێیگەیاندین کە دەبێت تەواوی خشڵەکان بدەن بە (شهنان)و تەنانەت قەرەبووی زیانەکانیش بکەنەوە, خزمێکی بێ شەرەفتر و مادیتر لە بنەماڵەی سەڵتەنەتی ئێرە, بوونی نیە, باسێکی لە ئیمامی و کەین و بەینەکانی ئەو لەگەڵ ئەم کچە[1] و ڕاپۆرتی شاپور غوڵامڕەزا[2] و دورخستنەوەی ئەوکوڕە, کرد, کوڕەکە لە تارانە و مافی سەفەرکردنی نیە..)[3].

دوکتۆر غەنی بۆ ئاخیر جار لە ڕۆژی (١٠ شەهریوەری ١٣٢٧هەتاوی)دا دیداری مەلیك فاروقی کرد و بە دوای ئەوەدا تەڵاقی فەوزیە ڕێکخرا, لە (٢٤ی میهری ١٣٢٧هەتاوی) دا بە فەرمی تەڵاق درا, ڕۆژی (٨ی فەروەردینی ١٣٢٨هەتاوی) واتە پێنج مانگ و نیو دواتر لەگەڵ (ئیسماعیل شیرین بك) ی میسری هاوسەرگیری ئەنجام دا, دوکتۆر غەنی لە بارەی ئیسماعیلەوە دەنووسێت: ئەو سیویەك ساڵەیەو دەرچوی زانکۆی کامبریجە, هۆکاری هاتوچۆی بۆ دەربار ئەوە بووە کە خوشکەکەی مەعشوقەی مەلیك فاروق بووە!.

** ** **

دوای تێپەڕ بوونی زیاتر لە بیست وپێنج ساڵ لەم ڕوداوە, لە کاتێکدا کە محەمەدشا دو جاری دیکە هاوسەرگیری کردوە, بووەتە خاوەنی چوار منداڵی دیکە,

---

[1] مەبەست لەم کچە, فەوزیە یە, کە پێشتر خاوەن شکۆ بە بێ نازناوی (شاژن) ناوی نەبردوە!.

[2] لە یاداشتی پێشودا ناوی مەحمودڕەزا ی بردوە, بەڵام بە لە بەرچاو گرتنی تەمەن, دەبێت غوڵامڕەزا ڕاست بێت.

[3] خاطرات دکتر قاسم غنی, ص١٩٢.

له چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ (کارانجیا)ی ڕۆژنامەنوسی هیندی دا دەڵێت کە فەوزیەی خۆشویستوە, ئەو کەسەی بووەتە هۆی جودا بوونەوەیان, مەلیك فاروقی برای بووە![1]

ڕوداوی فەوزیە و هۆکاری ڕاستەقینەی تەلاٌق دانی ئەو لە پەردەیەکی نهێنی دا شاراوەتەوە, وە هیچ یەك لەو کەسانەی ئاگایان لە ڕاستی ئەم ڕوداوە هەیە, ئامادەی ئاشکرا کردنی نین, محەمەدشا مرد, هەرگیز فەوزیە لەم بابەتەوە وشەیەکی نەوتوە, ڕونکردنەوەکانی خەڵکانی دیکەش خستنە ڕوی تەوای ڕاستیەکانّ نیە, لە خوێندنەوەکانی کە هەن و یەکەم نامەی محەمەدشا بۆ مەلیك فاروق و نوسینەکانی (ژرار دو ویلیە) و فیردۆست, کە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە, ئەوە هەڵئەهێنجرێت کە فەوزیە لە بەرامبەر شا دا ساردو سڕ بووە, وە پێدەچێت لەگەڵ پیاوێك یان پیاوانێکی دیکەشدا پەیوەندی هەبووبێت, لەم کاتەدا ئەو خاڵە جێگای پرسیارە کە بۆچی محەمەدشا پێداگری کردوە کە ئەم ژنە ساردوسڕو بێوەفایە لە داوای تەلاٌقدانی خۆی پەشیمان بکاتەوە و دوبارە بگەڕێتەوە بۆ تاران؟, ئایا هەمان ئەو شێوەیەی کە خودی فەوزیە چەندان جار وتبووی بەرنامەی ژەهر خواردنی ئەویان لە تاران کێشابوو؟!, کلیلی هەڵهێنانی ئەم مەتەڵەیش تەنها لە دەستی یەك کەسدایە, ئەشرەف پەهلەوی, کە ئاگای لە زۆربەی ڕوداوەکانی پشت پەردەی دەربار و دەرباریەکانە, فەوزیەش ئەوی بە پیلان دانەر بۆ کوشتنی خۆی تاوانبار کردبوو.

---

[1] The Mind of a Monarch. P178.

# سالانی قەیراناوی

حەمە ڕەزاشا زیاتر لە جاران دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەشرەفی خوشکیەوە, باندی حکومەتی ئەشرەف بەسەر ئێرانەوە, دەستپێکردنی ڕوداوەکانی نەوت, نهێنی گەلێك لە بارەی یەکەمین هەوڵی کوشتنی حەمە ڕەزا شا, یەکەمین دەرەنجامەکانی سەفەری شا بۆ ئەمریکا, بە بۆچونی ئەمریکیەکان محەمەد شا بۆ ولاتێکی ڕۆژهەلاتی تەواو ڕۆژئاوایی بوو!, بەڵگەنامەی نوێ دەربارەی چۆنیەتی سەپاندنی ڕەزم ئارا بە سەر شادا, ئینگلیزەکان محەمەد شا بە هۆکاری شکستی ڕەزم ئارا دەزانن, نهێنیەکانی کوشتنی ڕەزم ئارا.

ڕەوتی ئەو ڕوداوانەی کە لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٣٢٦)هەتاوی لە ئێراندا ڕوی دا, تەنها بە دەنگی یەك نوێنەر (پەرلەمانتار) لە کۆی (١٠٧) پەرلەمانتار گۆڕانی بە سەردا هات, دووای ڕوخانی حکومەتەکەی (قەوام سەلتەنە), (فاخرحیکمەت) سەرۆکی ئەوکاتی ئەنجومەنی شورای نەتەوەیی (پەرلەمان) لەلایەن زۆرینەی پەرلەمانتارانەوە کاندید کرا بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, بەلام ئەو بەردەوامی سەرۆکایەتی پەرلەمانی نەگۆڕایەوە بە پۆستی چەند مانگەی سەرۆك وەزیران, دووای ڕەتکردنەوەکەی سەردار (فاخر حیکمەت), دوو کەسی دیکە کاندید کران بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران کە بریتی بوون لە: ئیبراهیم حەکیمی (حەکیمولمولك) کە پێش حکومەتەکەی قەوام سەڵتەنەش ئەو پۆستەی لە ئەستۆدا بوو, دوکتۆر محەمەد موسەددەق (موسەددەقولسەڵتەنە) کە لە هەڵبژاردنەکانی خولی پازدەی پەرلەماندا سەرکەوتو نەبووبوو, سەیر لەوەدا بوو کە زیاتر لایەنگرانی بوون بە سەرۆك وەزیرانی دوکتۆر موسەددەق ئەندامانی پێشوی حیزبی دیموکوراتی قەوام

سەڵتەنە بوون!, سەرنجامی دەنگەکان بریتی بوو لە (٥٤) دەنگ بۆ حەکیمی و (٥٣) دەنگیش بۆ موسەددەق و فەرمانی سەرۆك وەزیرانی بە ناوی (ئیبراهیم حەکیمی)ەوە دەرکرا.

ئەگەر لەم دەنگ دانەدا, تەنها کەسێك لە باتی حەکیمی دەنگی بۆ موسەدق بدابایە, ئەوا دوکتۆر موسەددەق لە ڕەوشێکی گونجاوتر و ئاشتیانە تردا دەبوو بە سەرۆك وەزیران نەك لە دووای ململانێی لەگەڵ حکومەتەکەی ڕەزم ئارا و کوشتنی ئەو لە سەروبەندی ململانێکانی نەوت دا, هەنگاوی دەنا بۆ بەدەست هێنانی مافی گەلی ئێران لە کۆمپانیای نەوت دا, نەك ئەوەی داوای خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران بکات و ئەو هەمو زیانە بە دووای خۆیدا بهێنێت, دوکتۆر موسەددەق دووای ئەم شکستە کەوتە دژایەتی کردنی دەوڵەتی حەکیمی و ئەو دەوڵەتانەی دیکە کە شوێنی ئەویان دەگرتەوە, لە ئەنجامی ئەم ململانێ یانەدا هەر وەکو بینرا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر خۆی توندتر دەکردەوە.

دەوڵەتەکەی حەکیمی بە دەست لە پشتدان و پشتگیری محەمەدڕەزاشا کەوتە دروستکردنی دۆسیە گەلێك دژی حکومەتەکەی قەوام سەڵتەنە, شا کە ڕقی لە قەوام بوو دەیویست ئەو بە تۆمەتی ڕەشوە وەرگرتن و گەندەڵی دەستگیر بکات, بەڵام پێش ئەوەی کە شا بتوانێت کارەکەی بگەیەنێتە ئەنجام قەوام ئێرانی بە جێ هێشت, لەگەڵ هەبوونی ئەم سەرۆکەدا (حەکیمی) وەزیری داد لە مانگی فەروەردینی ١٣٢٧ هەتاویدا ڕاپۆرتێکی تێرو تەسەلی لە بارەی گەندەڵیە داراییەکانی حکومەتەکەی قەوام سەڵتەنەوە پێشکەشی پەرلەمان کرد کە زیاتر لە بارەی فرۆشتنی جەوازە دەوڵەتیەکانەوە بوو بە بازرگانەکان, ئەم دۆسیەیەش لەگەڵ کۆتایی هاتنی حکومەتەکەی حەکیمی دا پشتگوێ خرا, دووای ئەو لێپرسینەوەیەی کە لە لایەن پەرلەمانەوە لە حکومەتەکەی کرا, حەکیمی لە (١٨ خوردادی ١٣٢٧)هەتاوی دا ئامادەی دانیشتنێکی پەرلەمان بوو, دووای ئەوەی کە (عەبدوول حسەین هەژیر)ی وەزیری ڕاوێژکار لە حکومەتەکەی حەکیمی دا ڕاپۆرتێکی پێشکەش کرد و داوای لە پەرلەمان کرد کە دووبارە متمانە بدەنەوە بە حکومەت, بەڵام لە نزیکەی (١٠٠) پەرلەمانتاری ئامادە تەنها (٣٨) پەرلەمانتار دەنگیان دایەوە بە حکومەت, دووای

ڕاگەیاندنی ئەنجامەکەش (حەکیمی) بە بیٚ ئەوەی هیچ وتەیەك پیٚشکەش بکات دانیشتنەکەی بە جیٚهیٚشت و بە پیادەڕەوی ڕۆشتەوە بۆ ماڵ.

محەمەدڕەزاشا کە لە دووای حکومەتەکەی قەوام سەڵتەنەوە وردە وردە پیٚگەی خۆی بەهیٚز دەکرد, دووای نەمانی حکومەتەکەی حەکیمی سەردار (فاخر حیکمەت)ی سەرۆکی پەڕلەمانی بانگهیٚشتی کۆشکی سەڵتەنەتی کرد و دانانی (عەبدوول حسەین هەژیر)ی لە پۆستی سەرۆك وەزیری دا پیٚ ڕاگەیاند, لە سەرەتای دەستپیٚکردنی دەسەلاٌتی محەمەدڕەزاشا وە ڕیٚوڕەسمی دانانی سەرۆك وەزیران وابوو کە پەڕلەمان دەنگی دەدا بە دانانی کەسیٚك بۆ سەرۆك وەزیری و پاشانیش (شا) فەرمانی پۆستی سەرۆك وەزیرانی بۆ ئەو کەسە دەردەکرد کە پیٚشوتر لە پەڕلەمان دا دەنگی بۆ درابوو, ئەمە یەکەم جار بوو کە (شا) پیٚش متمانە بەخشینی پەڕلەمان بە سەرۆك وەزیری نویٚ, بۆچونی خۆی بە سەرۆکی پەڕلەمان ڕاگەیاندووە, کە ئەمە بە خاڵیٚکی وەرچەرخان لە سەڵتەنەتی محەمەدڕەزاشا دا دیٚتە هەژمار.

عەبدوول حسەین هەژیر کە لەو کاتەدا تەمەنی (٤٧) ساڵ بوو, لەگەڵ ئەوەی پیٚشینەیەکی وەزارەتداری هەبوو لە کابینەکانی (سوهەیلی و قەوام سەڵتەنە و حەکیمی)دا, هەربۆیە لایەنگری زۆرینەی لە پەڕلەماندا نەبوو, بەلاٌم بەهۆی پشتگیریەکانی (محەمەدڕەزاشا) وە کە پیٚشوتر لە ڕیٚگەی فاخر حیکمەتی سەرۆك پەڕلەمانەوە بە پەڕلەمانتاران ڕاگەیەندرابوو, کاریگەری خۆیی هەبوو, هەژیر بە بەدەست هیٚنانی (٦٦) دەنگ لە بەرامبەر (ساعد) دا کە (٤٣) دەنگی بەدەست هیٚنابوو, بوویە سەرۆك وەزیران.

سەرۆك وەزیرانی هەژیر کە دەوتریٚت بە هۆی دەستوەردانەکانی (ئەشرەف پەهلەوی)ەوە بووەتە سەرۆك وەزیر, لەگەڵ لیٚشاویٚك تۆمەتی مەزهەبی دا ڕووبەڕو بوویەوە, دووچاری خۆپیشاندانیٚکی بیٚ پیٚشینەی پیاوانی ئاینی و بازاڕیان بوویەوە بە ڕیٚبەرایەتی (ئایەتولاٌ کاشانی و نەواب سەفەوی) ڕیٚبەری (فیدائیان ئیسلام), خۆپیشاندەران لە کاتیٚکدا کە قورئانیان بە دەستەوە گرتبوو لە مەیدانی بەهارستان دا کۆبنەوە, بەلاٌم کاتیٚك هەندیٚك لەوانە کە ویستیان بچنە نیٚو حەوشەی پەڕلەمانەوە کەوتنە بەر گوللەی پاسەوانانی پەڕلەمان و بلاٌوەیان پیٚکرا, هەژیریش بۆ لە بار بردنی ئەو تۆمەتانەی کە لە ڕوی مەزهەبیەوە ڕووبەڕوی بووبوونەوە لە یەکەمین کۆبوونەوەی

ئەنجومەنی دەوڵەت دا بریاری دەرکرد کە تیایدا ئامادە کردن و فرۆشتنی خواردنەوە کهولیەکانی لە شارە مەزهەبیەکانی (مەشهەد و قوم و ڕەی) دا یاساغ کرد, بەڵام ئەم بریارەش پیاوانی ئاینی لە دژایەتیکردنی هەژیر پاشگەز نەکردەوە و ئەمەیان بە جۆرێك لە سیناریۆ و ساختەکاری بۆ ئارام کردنەوەی ئەوان دەزانی.

** ** **

بەر لە باسکردنی ڕوداوەکانی سەردەمی حکومەتەکەی هەژیر, باس لە ڕوداوێك کە لەو ساڵانەدا ڕوی داوە و لە بارەی ژیانی تایبەتی (شا) وە جێگای تێڕامانە, بە پێویست دەزانم, دوکتۆر موئەددەب نەفیسی سەرپەرشتیاری شا لە کاتی خوێندنی ئەودا لە سویسرا, وە دووای گەڕانەوەی لە سویسراوە بۆ تاران و هەتا گەیشتنی (حەمە ڕەزا) بە سەڵتەنەت داری ئێران سەرۆکایەتی نوسینگەی ئەوی لە ئەستۆدا بوو, لە نەخۆشخانەدا خەوێنرابوو, بەردەوام داوای لە دەوروبەرەکەی دەکرد کە بیبەن بۆ لای شازادەی جێنشینی وڵات, لەو کاتەدا چەندین ساڵ بەسەر سەڵتەنەتداری محەمەدڕەزاشا دا تێپەڕی بوو, بەڵام هێشتا دوکتۆر نەفیسی (شا)ی بە جێنشین ناو دەبرد و ئارەزوی دیدەنی ئەوی دەکرد, ئەم بابەتەیان یەك دوو جار بە (شا) ڕاگەیاندبوو, بەڵام شا بە هۆی ئەو ڕق و کینەیەی کە لە دوکتۆر نەفیسی هەیبوو لە داخی ئەو سەرگیری و بەرگیریەی کە لێی دەکرد لە کاتی خوێندنی دا لە سویسرا, هەر بۆیە ئامادە نەدبوو ئەو ببینێت, تا ئەو کاتەی هەواڵیان پێدا کە دوکتۆر موئەددەب نەفیسی لە کۆتا ڕۆژەکانی ژیانی نزیك بووەتەوە و جگە لە بینینی (شازادەی جێنشین) هیچ ئارەزویەکی دیکەی نیە, سەرەنجام دایکی (شا) داوای لێ کرد کە سەردانی نەفیسی بکات, ئەحمەد نەفیسی کە ئامادەی ئەم دیدارە بووە دەڵێت: کاتێك شا هاتە ژورەوە دوکتۆر نەفیسی بێهۆش بوو, چەند ڕۆژێك دەبوو کە نەهاتبوویەوە هۆش خۆی, کاتێك (شا) هاتە ژورەوە بە گوێیاندا چرپاند: ( بێدار بەرەوە شا هاتوە بۆ دیدەنت), مامم بێدار نەبوویەوە, دووبارە بە دەنگی بەرز وتیان: (شازادەی جێنشین) هاتووە, مامم لە ناکاو چاوەکانی کردەوە و دەستیکرد بە قسەکردن و هەواڵ پرسینی (شا), چەند دەقیقەیەك دووای ئەوەی کە (شا) ڕۆیشت دووبارە بێهۆش کەوتەوە و ڕۆژی دوواتر کۆچی دوایی کرد...

له سەردەمی حکومەتەکەی هەژیر دا, کە بە دەستپێکی دەورانێکی نوێی قەیراناوی لە سەڵتەنەتی شا دا دێتە هەژمار, دەسەلاّتی (ئەشرەف پەهلەوی) لە دەربار و حکومەتدا گەیشتە لوتکە, شا تەنها کەوتبوو جگە لە ئەشرەفی خوشکی هاودەمێکی دیکەی نەبوو, ئەشرەفیش بە پڕکردنەوەی لایەنی بواری جنسی (سێکسی) براکەی وەك پێناساندنی کچانی شۆخوشەنگ و هێنانیان بۆ دیداری براکەی بە تەواوی (شا)ی کۆنترۆڵ کردبوو, (ژرار دوو ویلیە)ی نوسەری فەڕەنسی لە بارەی ئەم سەردەمەی ژیانی (شا)وە کە لە سەرەتاکانی ساڵی (١٩٤٧ز , کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٢٥هەتاوی)ەوە دەست پێدەکات, بابەتێکی تایبەتی نوسیوە بە ناوی (ژیانی شیرین), کە ئەمەش وەك ناوی فلیمێکی ئیتالیە کە پڕیەتی لە کاری (سێکسی), ئەو نوسەرە فەڕەنسیە بابەتێکی لە (کویك)[1]ی ئەمریکیەوە وەرگرتوە کە لە ژمارەی مانگی ژانویەی ١٩٤٧ز دا بابەتێکی لەبارەی ئێرانەوە بلاّو کردبوویەوە و دەنووسێت: ( ئیدی شا بە کچانی شۆخشەنگی تارانی واز ناهێنێت و داواکارەکانی خۆی لە نێو کچانی ئەوروپا کە بالاّبەرز و چاو ڕونن پەیگیری دەکات, ماوەیەکە کرێکارەکانی فڕۆکەخانەی تاران توشی مەراق بوون لەداخی هاتنی ئەو گەشتیارە تەنهایانەی کە بەرپرسەکان بە ئۆتۆمۆبێلی شیکەوە پێشوازیان لێدەکەن و بە خێرایی لە فڕۆکەخانە دەیان بەنە دەرەوە, گەشتیارە شۆخەکانی نێو ئەم ئۆتۆمۆبێلانەش دەبرێن بۆ ئەو ڤێلایانەی کە لە گەڕەکی شەمێران بۆیان ئامادە کرابوو, تیایاندا نیشتەجێ دەکران بۆ ئەوەی بە نۆبەت لە مەجلیسی کەیف و نۆشەکانی شاهانەدا بەشدارییان پێ بکرێت[2].

دوو ویلیەی فەڕەنسی لە پێوشوێن گرتنی ئەم بابەتەدا ئاماژەی بە کوشتنی (محەمەد مەسعود)ی ڕۆژنامەنوسی دیاری ئێرانی کردووە کە بابەت گەلێکی لە دژی (ئەشرەف) و بنەماڵەی سەڵتەنەتی بلاّو کردبوویەوە و ددەنووسێت: لەگەڵ ئەوەی کە بکوژی ئەو ڕۆژنامەنووسە نەدۆزرایەوە بەلاّم هەموان ئەشرەف و دەربارییان تاوانبار دەکرد[3], لە ژێر نوسی هەمان بابەتیشدا بە شێوەیەکی یەك لایی کەرەوە نوسراوە کە

---

[1] Quick, Jan 1947.

[2] Gerard de Villier. P. 161.

[3] بۆ یەکەمجار بەشداریکردنی حیزبی تودە لە کوشتنی (محەمەد مەسعود) دا لەلایەن (دوکتۆر فەرەیدوونی کشاوەرز)ەوە کە یەکێك بوو لە ڕێبەرانی حیزبی تودە لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (من

(محەمەد مەسعود) بە دەستوری خودی (شا) کوژراوە, بەلاّم دوواتر دەرکەوت کە کۆمیتەی تیرۆری حیزبی تودە (بۆ ناو زڕاندنی دەربار) ئەم کارەی ئەنجام داوە.

هەرچۆنێك بێت.... لەو کاتەدا ئەشرف پەهلەوی دەسەلاّتێکی زۆری لە نێو حکومەتدا هەبوو بە ڕادەیەك نەك بە تەنها (شا) بەڵکو دەوڵەتیشی لە بەر دەستدا بوو, ئەو گروپێکی لە خاوەن پۆستە ئیداری و سەربازیەکانی لە دەوری خۆی کۆکردبوویەوە, لە نێو ئەوانەدا دەتوانین ئاماژە بە هەندێکیان وەك: (هەژیر کە تازە بووبوویە سەرۆك وەزیران, ڕەزم ئارا سەرۆك لەشکر, مەنوچەر ئیقبال و جەواد بووشەهری) کە ئەمانیش هەر بە پشتگیری ئەشرەف پۆستی وەزارەتیان لە کابینەکەی هەژیر دا هەبوو, پەیوەندی ئەشرەف بە هەژیرەوە کە چاوێکی نابینا بوو زۆر سەر سوڕهێنەر بوو, عەشقی کاترینی مەلیکەی شەهوەترانی ڕوسیەی بۆ سەرداره یەك چاوەکەی خۆی (پوتمکین) وەبیر دەهێنایەوە, هەرچەندە پێدەچێت پەیوەندیەکانی ئەشرەف و هەژیر زیاتر لە ڕوی سیاسیەوە بووبێت و مەبەست لێی بەدەست هێنانی پۆست و دەسەلاّت بووبێت, هەروەها پەیوەندی ئەشرەف و ڕەزم ئاراش هەر پەیوەندیەکی سیاسی بووە, لەلایەکی دیکەشەوە ڕەزم ئارا و هەژیربە چاودێری یەکدی دێنە هەژمار.[1]

محەمەدڕەزاشا لەسەروبەندی حکومەتەکەی هەژیر دا بە بانگهێشتێکی فەرمی سەردانی ئینگلیستانی کرد, بەلاّم پێش دەستپێکردنی سەفەرەکەی ئەندامانی

---

متهم می کنم...) ئاشکرا کرا, (کیانوری)ش کۆتا ڕێبەری حیزبی تودە ناوی سەرۆکی کۆمیتەی حیزبی بردووە, کیانوری لە یاداشتەکانی خۆیدا مەبەستی ڕاستەقینەی ئەم بابەتە کە بەشداری کردنی تودەییەکانە لەم کوشتنەدا بەرپەرچ ناداتەوە, بەلاّم دەڵێت من هیچ ڕۆڵێکم لەو کارەدا نیە, ئەم کارە کاری گروپی ڕوزبە و خودی ئەبوولحەسەنی عەباسی بووە, ئەم گروپە بڕیار دەدەن چەند کەسێك تیرۆر بکەن و بیخەنە ئەستۆی دەربارەوە و یەکەم کەسیش (محەمەد مەسعود) دەست نیشان دەکەن. (خاطرات نوردین کیانوری, ص١٤٩– ١٥٠.)

[1] دووای شۆڕشی ئیسلامی لە نێو ئەو بەڵگەنامانەی کە بلاّو کرانەوە, ئەو نامانەی کە لەلایەن ڕەزم ئاراوە نێردرابوون بۆ ئەشرەف ئاوازێکی عاشقانەی لێ دەهات و باسی لە پەیوەندی نزیکی ئەوانی دەکرد, بەلاّم لە بارەی ئەوەی کە ڕەزم ئارا بە ڕاستی پەیوەندی لەگەڵ ئەشرەف دا هەبووە یان بۆ بەدەست خستنی پۆست بووە, بە ڕونی دیار نیە.

پەرلەمانی لە کۆشکی سەڵتەنەتی دا کۆکردەوە و داوای لێکردن ئە لە کاتی نەبوونی ئەودا پشتگیری دەوڵەت بکەن، ئەم کارەی (شا) لە پێشتردا نەبینرابوو، ئەمەش بە دەستپێکی دەستوەردانی ڕاستەوخۆی (شا) بۆ نێو کارەکانی دەسەلأتی یاسا دانان دێتە هەژمار، لەگەڵ ئەمەشدا هەندێك لە پەرلەمانتارەکان ئەم (فەرمانە شاهانە) یان جێبەجێ نەکرد، عەباس ئەسکەندەری پەرلەمانتار کە هێشتا وەفای بۆ (قەوام سەڵتەنە) هەبوو لەکاتی سەفەرەکەی شا دا لێپرسینەوەی لە دەوڵەتەکەی هەژیر کرد و بە نێوی (خراپی ڕەوشی سیاسەتی نێوخۆ و دەرەوە) هەژیری هێنایە نێو پەرلەمان بۆ لێپرسینەوە، هەیریش لەوەلأمی لێپرسینەوەکەی عەباس ئەسکەندەری دا وتارێکی دووردرێژی پێشکەش کرد و بەدەنگی سەرجەمی پەرلەمانتاران دووبارە متمانەی پێدرایەوە.

حەمەڕەزاشا لە سەفەرەکەی بەریتانیایدا ڕووبەڕووی پێشوازیەکی ساردوسڕ بوویەوە کە هیچ وەخت بە خەیاڵیدا نەدەهات، بەڕادەیەك کە چاپخراوەکانی تاران یش ئاماژەیان بەو پێشوازیە ساردەی کە لە (شا) کرابوو کرد، وە لە نێو لێپرسینەوەی دەوڵەتیشدا ئەم بابەتە سەری هەڵدا کە بۆچی (شا) بەبێ ئامادەکاری پێشوەخت ئەم سەفەرەی ئەنجام داوە، ئایا ئەم سەفەرە چ دەستکەوتێکی بۆ ئێران تێدایە؟.

پێدەچێت لە ئەنجامی ڕازی نەبوونی (شا) لەو پێشوازیە ساردەی لەندەن و بێ ئەنجام بوونی لە هەوڵەکانی بۆ خۆ نزیك کردنەوە لە ئینگلیزەکان بوبێت کە لە کاتی گەڕانەوەی(شا)، دەوڵەتی هەژیر هەنگاوی نا بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری پەسەندکراوی پەرلەمان سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی پەیماننامەی نەوتی ئێران و سۆڤیەت و (پاراستنی مافی ئێران) لە کۆمپانیای نەوت، لەگەڵ ئەوەشدا پەرلەمان پرۆژە یاسایەکی پەسەند کرد کە تێیدا چەندین مەرج و پێشنیاری هەبوو بۆ پێدا چونەوەی پەیماننامە نەوتیەکان، بەلأم ململانێکانی ئەو لەگەڵ پەرلەماندا بوویە هۆی ڕێگری لە بەردەم ئەم بڕیارەدا و سەرەنجام هەژیر دووای گاڵەوهەرایەکی زۆری لەگەڵ پەرلەمان دا، لە دانیشتنی فەرمی ڕۆژی (١٥ ئابان ١٣٢٧ هەتاوی) پەرلەمان دا دەستلەکار کێشانەوەی کابینەکەی پێشکەشی (شا) کرد.

دووای دەستلەکار کێشانەوەی هەژیر پەرلەمانتاران دەنگیان بۆ (ساعد) دا و کردیانە سەرۆك وەزیران، ئەویش ڕۆژی ( ٢٥ ئابان) حکومەتی پێکهێنا، هێشتا

دەوڵەت شوێنی خۆی نەگرتبوو (عەباس ئەسکەندەری) پەرلەمانتاری جەنجاڵی خولی پازدەیەم لێپرسینەوەی لە دەوڵەت کرد و یەکێك لە بابەتەکانی دەربارەی کەتەرخەمیەکانی دەوڵەت بوو لە پاراستنی مافی ئێران لە کۆمپانیای نەوت دا, عەباسی ئەسکەندەری لە وتارەکەیدا واژۆ کردنی پەیماننامەی ساڵی (۱۹۳۳ن) بە خیانەت دانا و لەگەڵ هێرشکردنی ڕاستەوخۆ بۆ سەر واژۆکەرانی ئەو پەیماننامەیە وەك (سەید حەسەن تەقی زادەی وەزیری دارایی ئەو کات و ئەندامی خولی پازدەی پەرلەمانیش بوو) داوای هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیماننامەیەی کرد, تەقی زادەش لە دانیشتنی ڕۆژی (۹ بەهمەنی ۱۳۲۷ هەتاوی) دا بۆ وەڵامی ئەسکەندەری و بەرگری کردن لە خۆی وتارێکی گرنگی پێشکەش کرد کە نەك بەرگری لە پەیماننامەی (۱۹۳۳ن) نەکرد بەڵکو بە ڕونکردنەوەی ئەو ڕەوشەی کە بووەتە هۆی بەستنی ئەو پەیماننامەیە, بنەڕەتی پەیماننامەکەی لەرزاند.

تەقی زادە لەم وتارەیدا, کە خۆی لەخۆی دا بەڵگەنامەیەکی گرنگی مێژوییە, ووتی: وەڵامی هێرشەکانی عەباسی ئەسکەندەری بۆ سەر من و بابەتی ئەندامیەتی من و هەندێك لە برادەران لەو لیژنەیەدا کە بە (ئەفسانەو چیرۆکی جنۆکە و پەری) دەزانی, وەڵام نادەمەوە, بەڵکو تەنها ئاماژە بۆ بابەتی پەیماننامەی نەوت کە بابەتێکی گرنگی نیشتیمانی و نەتەوەییە دەکەم, ئەو بەشەی وتارەکەی تەقی زادە کە پەیوەستە بە چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی (دارسی) و ڕوداوەکان و دانوستانەکانی نەوت و سەرەنجام ئەو ڕەوشەی کە (ڕەزاشا)ی ناچار کرد ڕەزامەندی لەسەر ئەو پەیماننامەیە دەرببڕێت زۆر پێویست نییە, بەڵام بەشی کۆتایی وتارەکەی کە پەیوەستە بە ڕۆڵی خۆی لە واژۆ کردنی ئەو پەیماننامەیەدا بە گرنگی دەزانین بیخەینە ڕوو, ئەم بەشە لە وتارەکەی تەقی زادە بە وەرگرتن لە گفتوگۆکانی پەرلەمانەوە دەینوسم:

*بەڵام بەشی بەندە لەم کارەدا.... دەبێت ئەوە ڕاگەیەنم کە بەندە لەم کارەدا هەرگیزاوهەرگیز هیچ دەستوەردانێکم نەبووە, جگە لەوەی کە واژۆی من بەسەر ئەو وەرەقەوەیە (پێکەنینی توندی پەرلەمانتاران)! وە ئەو واژۆیەش, چ من بمکردایە, یان نەمکردایە و هی کەسێکی دیکە بووایە, دەبوو دەست بەجێ کەسێك ئەوەی واژۆ بکردایا هیچ جۆرە گۆڕانکاریەکی لەو*

*نوسراوەی کە هەبوو نەدەکرد و نەکردنی واژۆی یەکێك, کە ئەگەر هەر نەشی کردایە, هیچ کاریگەریەکی لەسەر ئەسڵی بابەتەکە تەنانەت بە قەدەر مسقاڵێکیش نەدەکرد, (محەمەد حسەین قەشقائی... لەم ڕوانگەیەوە پەیماننامەکە یاسایی نیە), بەندە لەم بارەیەوە هیچ ڕونکردنەوەیەکم نیە, کۆتاییەکەی ئەوەیە کە دەگونجێت خودی ئەو واژۆیەی کە سەپێنراوە خراپ یان بە تاوان بێتە هەژمار.... من هەرگیز بە درێژکردنەوەی ماوەی پەیماننامەکە ڕازی نەبووم و ئەوانی دیکەش بە هەمان شێوە, ئەگەر تاوانێك لەم کارە یان هەر هەڵەیەك کە بووە , تاوانی ئێمە نیە بەڵکو ئەنجام دەری کارەکە (ڕەزاشا) تاوانبارە, کە بێچارە هەڵەیەکی کرد و نەیتوانی لێی پاشگەز بێتەوە,,,.*

مەبەستی تەقی زادە لە (ئەنجامدەری کارەکە) ڕەزاشا بوو, لە کۆتاییەکانی وتەکانیدا باسی ئەوەشی کرد کە ئەویش بە درێژکردنەوەی ئەو پەیماننامەیە ڕازی نەبووە بەڵکو لە ژێر فشار و لەڕوی سەپاندنەوە ڕازی بە واژۆ کردنی ئەو پەیمانە بووە, دووای کۆتایی هاتنی وتەکانی تەقی زادە (ڕەحیمیان) ئەندامی پەڕلەمانی نوێنەری (قۆچان) کە یەکێك بوو لە ڕەخنەگرانی دەوڵەت و خوازیاری هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی (١٩٣٣ز) بوو ووتی: (بە تێڕامان لە ڕونکردنەوەکانی جەنابی ئاغای تەقی زادە کە ئێمە لەوە زیاترمان چاوەڕوان نەدەکرد, ئەم پەیماننامەیە بەتاڵە, هەر بە پێی ئەو ڕونکردنەوانە ئەم پەیماننامەیە لە ڕوی گرنگیەوە ناتەواوە,..), زۆربەی پەرلەمانتاران بە وتنەوەی دروشمی (ڕاست دەکات) پشتگیری وتەکانی ئەویان دەکرد.

وتارەکەی تەقی زادە لە ڕاپۆرتی چاپکرداوەکان و ڕۆژنامە نوسە بیانیەکانیش بە سەردێڕی (پێشەکیەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی نەوت) کەوتە بەر شیکردنەوە و بۆچونی جیاوازەوە, بەر لە دانیشتنی فەرمی دوواتری پەڕلەمان دا (حسەینی مەکی) و چەند پەڕلەمانتارێکی دیکە داوای دانیشتنێکی تایبەتی پەڕلەمانیان کرد, لەو دانیشتنە دا (حسەینی مەکی) نامەیەکی (دوکتۆر موسەددەقی) خوێندەوە کە تیایدا وتەکانی (تەقی زادە)ی بە ڕاست دانابوو, وە داوای لە (عەباس ئەسکەندەری) کرد لێپرسینەوەکەی خۆی وەربگرێتەوە و داوا لە دەوڵەت بکەن کە

بەبێ بە هەدەردانی کات لەگەڵ ئینگلیزەکان بکەونە گفتوگۆوە لە بارەی پاراستنی مافی ئێران لە کۆمپانیای نەوت, ڕۆژی (١٤ بەهمەن) دەوڵەت (عەباسقولی گلشائیان) وەزیری دارایی ڕاسپارد کە گفتوگۆ لەگەڵ کۆمپانیای نەوت دا بکات و لە هەمان ڕۆژیشدا بۆ یەکەم جار لەلایەن خوێندکارانی زانکۆوە خۆپیشاندانێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی نەوت سازکرا.

** ** **

ڕوداوی هەوڵی کوشتنی (شا) لە ڕۆژی (١٥ بەهمەن ١٣٢٧هەتاوی), کە بە خاڵێکی وەرچەرخان لە ژیانی (شا) دا دێتە هەژمار, هەفتەیەك دووای دەستپێکردنی گفتوگۆکان بوو لە بارەی پرسی نەوت و گەرمەی هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەی (١٩٣٣ز) ڕوی دا, نوسەر لەو کەسانە نیە کە لە هەمو ڕوداوەکاندا باس لە دەستێکی بیانی دەکەن, بەڵام خودی خۆی لە نوسین و چاوپێکەوتنەکانیدا بە ڕاشکاوی ئاماژە بە دەستی بیانی دەکات لەو ڕوداوەدا, هەرچەندە (حیزبی تودە) لایەنی جێبەجێکاری ئەم پیلانە بووە, بەڵام ئینگلیزەکان لە پشتی سەریانەوە بوون.

بەر لە باسکردنی ئەم ڕوداوە و هۆکارو مەبەستەکانی لە زمانی خەڵکانی دیکەوە واباشترە کە لە زمانی خودی (شا) وە ئەم ڕوداوە ببیستین, (شا) لە کتێبێکی دا بە ناوی (ماموریت برای وطنم) دەرباری ئەم ڕوداوە بەم شێوەیە ددەنووسێت:

((یەکێك لە ڕوداوە سەرسوڕهێنەرو تەڵخەکانی سەردەمی فەرمانڕەواییم لە مانگی (بەهمەنی ١٣٢٧ هەتاوی) ڕوی دا لە کاتێکدا کە لە بۆنەی ساڵانەی زانکۆدا بەشداریم دەکرد, لەو ڕۆژەدا پۆشاکی سەربازیم پۆشیبوو, لە کاتێکدا کە لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزیم و خەریکی ڕۆیشستن بووم بۆ نێو کۆلێژی ماف و شوێنی گێڕانی بۆنەکە, لەناکاو دەنگی گوللە کەوتە بەر گوێم و چەند گوللەیەك لێیدام, لەگەڵ ئەوەشدا زۆر سەرسوڕ هێنەر بوو, سێ گوللە دابووی لە کڵاوە سەربازیەکەم بە بێ ئەوەی هیچ زیانێك بەر سەرم بکەوێت, بەڵام گوللەی چوارەم لەلای ڕاستەوە بەر گۆنام کەوت و لە لێوی سەرەوە و ژێر لوتمەوە دەرچوو.

ئەو کەسەی کە هەوڵی کوشتنمی دا بە نێوی وێنەگرەوە هاتبوویە ئەو شوێنە و دوو مەتر زیاتر لە منەوە دوور نەبوو, لولەی دەمانچەکەی خۆیی ڕو کردبوویە سەر سنگی من, من و ئەویش هەردووکمان ڕوبەڕوی یەکتر وەستابووین و کەس لە

نزیکمانەوە نەبوو کە لە نێوانماندا ڕێگر بێت, هەر بۆیە دەمزانی هیچ ڕێگریەك نیە بۆ ئەوەی کە گوللەکانی ئەو ئامانجەی کە دەیەوێت نەیپێکێ, ئەو پەرچەکردارەی کە لەو ساتە لە بیر نەکراوەدا ئەنجامم دا هێشتا بە جوانی لە بیرم ماوە, بیرم کردەوە کە خۆم بەرەو ڕوی بچم بەڵام دەست بەجێ لەوە تێگەیشتم کە ئەگەر بەرەو ڕوی ئەو هەنگاو هەڵگرم ئەوا نێشانەگیری ئەو ئاسانتر دەبێت, وە ئەگەریش هەڵبێم ئەوا لە پشتی سەرەوە بە باشی دەمپێکێت, ناچار بەخێرای مارپێچ ئاسا دەستم کرد بە زنجیرەیەك جولاّن و خۆ بادان بۆ ئەوەی بە تاکتیکێکی سەربازی سەر لە بەرامبەر بشێوێنم, ئەو دووبارە گوللەیەکی دیکەی تەقاند کە شانی بریندار کردم, کۆتا گوللەشی لەدەمانچەکەیدا گیری کرد و نەتەقی, لەو کاتەدا لەوە تێگەیشتم کە ئیدی مەترسی لەسەر من نەماوە و بە زیندووی دەمێنم, تەقەکەر بە توڕەییەکی توندەوە سیلاحەکەی دا بە زەوی داو ویستی هەڵبێت بەڵام لەلایەن هاوەڵ و پارێزەرەکانی منەوە گەمارۆ درا و بەداخەوە کوژرا و هەڵسوڕێنەرە سەرەکیەکانی ئەو کارە ئاشکرا نەبوون, دوواتر ئەوە زانرا کە ئەو پەیوەندی لەگەڵ هەندێك لە دەماگیرە ئاینیەکانەوە هەبووە و لە هەمان کاتیشدا چەند زانیاریەك دەربارەی پەیوەندیەکانی ئەو لەگەڵ حیزبی تودەی هەڵوەشاوەدا دەستکەوت, ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە کە مەعشوقەکەی ئەو بکوژە کچێکی باخەوانی باڵوێزخانەی ئینگلیز بوو لە تاران.

خوێن لە برینەکانی من وەکو فوارە دەڕۆیشت, بەڵام لە یادمە کە لە هەمان کاتدا ئارەزوی ئەوەم دەکرد کە بەشداری بۆنەی ئەو ڕۆژە بکەم, بەڵام پارێزەرەکانم ڕێگایان نەدا و منیان گەیاندە نەخۆشخانە و لەوێدا دەستیان بە تیمار کردنی برینەکانم کرد, ئەم ڕوداوە ئیمانی منی بە ڕێگای ڕاست و پارێزگاری زاتی یەکتای مەزن بەهێزتر کرد و پەیوەندی ئاگای منی بە خودای گەورەوە بەهێزتر کرد,[1] .......)).

ژرار دوو دیلیەی نوسەری فەرەنسی لەو ماوە زۆرەی نیشتەجێبوونی لە تاران توێژینەوەیەکی وردی لە بارەی ڕوداوی هەوڵی کوشتنی (شا) وە ئەنجام داوە, بابەتگەلێك زیاتر لەوەی کە (شا) لە کتێبەکەی خۆیدا باسی دەکات لە زمانی خودی (شا) وە دەگێڕێتەوە, یەك لەوانەی کە (شا) ئاماژەی بۆ دەکات ئەوەیە کە دەڵێت:

---

[1] ماموریت برای وطنم, ص٧٠-٧١.

کاتێك بکوژەکە گوللەی بەرەو ڕوی من دەتەقاند سەرجەم پارێزەرو هاوەڵ و دەوروبەرەکەم هەڵهاتن, تەنانەت کەوتە بەرچاوم کە کە یەکێك لەو ئەفسەرانەی کە لەگەڵ مندا بوو خۆی خزاندە ژێر ئۆتۆمبیلێکەوە, بەلأم کاتێك بکوژەکە سیلاحەکەی خۆی فڕێدا و مەترسی نەما هەموان هێرشیان کردە سەری و گوێیان بە هاوارەکانی من نەدا کە دەمووت: (ئەو مەکوژن... ئەو مەکوژن... ئەوم بە زیندووی دەوێت), لێرەدا (دوو ویلیە) ئەفسەرێکی هاوڕازی (ڕەزم ئارا) بە نێوی (سەرهەنگ دەفتەری) ناو دەبات کە گوللەکانی سیلاحەکەی لە سەری بکوژەکەدا کە نێوی (ناسر فەخر ئارائی) بووە خاڵی دەکاتەوە, ئەمەش ئەوە دەردەخات کە (ڕەزم ئارای) سەرۆك لەشکری ئەوکات لەم پیلانەدا دەستی هەبووە و لەلایەن ئەوەوە سەرهەنگ(دەفتەری) ڕاسپێردراوە کە دووای کوشتنی (شا) ئەوویش (ناسر فەخر ئارائی) بکوژێت,بۆ ئەوەی ئەم پیلانە لای هەموان بە شاراوەیی بمێنێتەوە, هەروەها ئەو نوسەرە فەڕەنسیە مەعشوقەکەی (ناسر فەخر) کە شا بە کچێکی باخەوانی باڵوێزخانەی ئینگلیز لەتاران باسی دەکات, بە (مەهین ئیسلامی) ناوی دەهێنێت, سەرەنجامیش ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ دەکات و ددەنووسێت: لەگەڵ ئەوەی کە چەندین وێنەگر لە کاتی ڕودانی ئەو ڕوداوەدا لەو شوێنەدا بوونیان هەبووە, ڕون نیە کە بۆچی تەنانەت یەك وێنەی ئەو ڕوداوەنەگیراوە, وە ئەگەر وێنەیەکیش گیردراوە ئەی بۆچی ڕێگری کراوە لە بلأوکردنەوەی لە بلأوکراوەکاندا[1]..؟.

دوو دیلیەی نوسەری فەڕەنسی یەکەم کەسە کە دووای تێپەڕ بوونی (٢٥) ساڵ بەسەر پیلانی کوشتنی (مەحەمەد شا) دا لە نێو زانکۆ, ( ڕەزم ئارا) بەوە تۆمەتبار دەکات کە بەشداری ئەو پیلانەی کردووە و بە بێگومانیش خودی (شا) و دەرباریەکانیش ئەم بۆچونەیان دەربارەی (ڕەزم ئارا) هەبووە, سێ (٣) ساڵ دووای بلأو بوونەوەی کتێبەکەی (ژرار دوو ویلیە) لە پاریس, (دوکتۆر فەرەیدوونی کشاوەرز) کە یەکێك بووە لە ڕێبەرانی پێشوی (حیزبی تودە) لە چاوپێکەتنێکدا ڕۆڵی (ڕەزم ئارا)ی لەم ڕوداوە و پەیوەندی بە (حیزبی تودە)وە ئاشکرا کرد, دوکتۆر کشاوەرزی لەم چاوپێکەوتنەدا کە بەنێو نیشانی (من متهم میکنم) چاپ و بلأو

[1] Gerard de Villiers. Pp 21-22.

کرایەوە, بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە (حیزبی تودە) هیچ ئاگایەکی لەو ڕوداوە نەبووە, (دوکتۆر کیانوری) کە پەیوەندیەکی نزدیکی هەبووە لەگەڵ (ڕەزم ئارا) دا ئەم پیلانەیان داڕێژاوە[1],,,.

لەم سالأنەی دووایدا یەکێکی دیکە لە ئەندام و کادیرانی (حیزبی تودە) بە نێوی (دوکتۆر ئەنەوەر خامەیی) لە یاداشتەکانی خۆیدا دەربارەی ئەو سەردەمە نهێنیەکی دیکەی ئاشکرا کردووە و دەدەنووسێت: (ئێستا دووای تێپەڕینی چەندین ساڵ و ئاشکرا بوونی نهێنی گەلێك کە ئەوە دەردەخەن (ڕەزم ئارا) هەڵسوڕێنەری سەرەکی ئەم تیرۆرە بووە و ئینگلیزەکان بەدەستی ئەو ئەم پیلانەیان جێبەجێکردبوو بۆ ئەوەی دەسەلأت بدەنە دەست دیکتاتۆرێکی سەربازی و بزوتنەوەی دژایەتی داگیرکەر و تێکۆشان بۆ بەدەست هێنانی جیاوکی نەوتی باشور هەر لە سەرەتاوە تەفروتونا بکات, گرنگترین بەڵگەیەك بۆ ئەوەی کە (ڕەزم ئارا) لەم کاری تیرۆر کردنەدا دەستی هەبووبێت ئەو سودەیە کە دەستی دەکەوت, ئەگەر (شا) بکوژرایە ئەگەرێکی بەهێز هەبوو کە دەسەلأتی ڕەها دەکەوتە دەستی (ڕەزم ئارا) و هیچ دەسەلأتێك نەیدەتوانی لە بەرامبەری دا بووەستێت, دەوڵەت و وەزارەتیش بە رادەیەك بێ توانا بوون تەنانەت بەر لە ڕوداوی هەوڵی کوشتنی (شا) لە دووای ئەو فەرمانیان لە (ڕەزم ئارا)وە وەردەگرت, لە لەشکر و هێزە سەربازیەکانیش دا ئەگەر تەنها هێز نەبووایە ئەوا دەسەلأتی لە (شا) زیاتر بوو, لە پەڕلەمانیشدا زۆرینەی ئەندام پەڕلەمانەکان وابەستەی ئینگلیزەکان بوون و ئەوانەشی کە پەیوەندیان لەگەڵ ئینگلیزەکان دا نەبووایە ئەوا پشتگیری (شا) یان (ڕەزم ئارا) بوون, وە ژمارەی ئەو پەڕلەمانتارانەشی کە بە هۆی دەسەلأتی (ڕەزم ئارا) لە لەشکرەوە هەڵبژێردرابوون کەم نەبوون, لەئەو ڕوەشەوە دەتوانرێت هەست بە بەهێزی دەسەلأتی (ڕەزم ئارا) بکرێت کە تەنانەت دوای شکستی پیلانی ناوبراو (تیرۆری شا) و نەکوژرانی (شا), پەڕلەمانتاران بە ڕادەیەك دەترسان کە هەتا ماوەیەك ورتە لە هیچکامیانەوە نەدەهات و (ڕەزم ئارا) هەر کارێکی بوویستایە ئەنجامی دەدا, هەربۆیە ئەگەر پیلانەکە سەرکەوتو ببووایە و (شا) بکوژرایە ئەواجێگیر کردنی دیکتاتۆریەتی (ڕەزام ئارا) بێگومان بوو.

---

[1] دکتر فریدوون کشاورز: من متهم میکنم,ص ٨٢_٨٤.

هەر بۆ ئەوەی کە بزانین دووای شکستی پیلانی تیرۆری (شا)، دەسەلاتی (ڕەزم ئارا) تا چ ڕادەیەك بووە، لێرەدا ئامارژە بە بەشێك لە یاداشتەکانی (ساعد) دەکەین کە دەنووسێت: (ڕۆژی ۱۵ بەهمەن لە نێو زانکۆ دا هەوڵی کوشتنی (شا) درا، من کە لەو کاتەدا سەرۆك وەزیران بووم بە هۆی نەخۆشیەوە لە ماڵ کەوتبووم، تەنانەت لە کاتی گەرماوگەرمی ڕوداوەکەدا منیان ئاگادار نەکردەوە و دووای چەند کاژێرێك لەو ڕوداوە ئاگادار کرام، هەمان شەو خوالێخۆشبوو (ڕەزم ئارا) هات بۆ ماڵی من و ووتی: (بکوژەکە لە پیاوەکانی (ئایەتولا کاشانی) بووە و یەکێك لە لایەنگرەکانی ئەو باجی هاتنە ژوورەوەی بە نێوی ڕۆژنامەنوس وێنەگرەوە پێداوە و ئەو بکوژەش بە ناسنامەی پەیامنێری ڕۆژنامەی (پرچم اسلام)ەوە هاتۆتە نێو زانکۆ و هەستاوە بەو کارە ناپاکە، سەرەنجام (کاشانی) لای ئێمە جێگەی گومانە و ئەومان دەستگیر کردووە و دەمانەوێت دادگایی بکەین...)، من داداگایی کردنی (کاشانی)م بە باش نەزانی و وام بەباشتر زانی کە ئەو دوور بخەینەوە، دیسان ڕەزم ئارا ووتی: (من بە زۆر (سەید زیا و قەوام سەڵتەنە)شم دەستگیر کردووە، چونکە وا دەردەکەوێت کە ئەوانیش لەم ڕوداوەدادەستیان هەبووبێت..)، من وا هەستم دەکرد ڕوداوەکە لە شوێنێکی دیکەوەیە، بە (ڕەزم ئارا)م وت دەستگیر کردنی (سەید زیا و قەوام) لە بەرژەوەندی ئێمەدا نیە، چونکە سی(۳۰) ساڵ دەبوو کە من سەید زیائم دەناسی، قەوامیش هەروەها، هەربۆیە کاتێك کە (ڕەزم ئارا) ڕۆیشت تەلەفونم کرد بۆ خاوەن شکۆ و داوام لێکرد کە (سەید زیا و قەوام) ئازادبکەن، شاهنشا فەرمویان بە لێپرسراوی خۆتان ئەم کارە بکەن، دووای ئەوەی من ئەو کارەم ئەنجام دا (سەید زیا و قەوام)م بە مەبەستی واژۆ کردن نارد بۆ دیوانی خاوەن شکۆ، لەوێدا (سەید زیا) گەیشتبووە خزمەتی خاوەن شکۆ و پێشوازی ودڵنەوایی کرابوو، بەڵام (قەوام سەڵتەنە) درەنگ گەیشتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەن شکۆ دڵنەوایی هەردووکیانی کردبوو، ڕەزم ئارا دەیویست لانی کەم ئەو ڕوداوە کە بەدەستی بیانیەکان ئەنجام درابوو بۆ سودی خۆی بەکاری بهێنێت، بۆیە دەیویست بە دەستگیر کردن و زیندانی کردنی کەسایەتیە خاوەن پێگەکان، ڕیگای بوون بەسەرۆك وەزیرانی بۆ خۆی بسازێنێت)[1].

---

[1] روزنامه (اراده اذربایجان)، ژماره ۱۰۷۳، به نقل از کتاب (خلع ید)، جلد سوم، ص۱۸۹.

لەم نوسینەی (ساعد) دا ئەوە ڕون دەبێتەوە کە عەسری ڕۆژی (١٥ بەهمەن) ڕەزم ئارا دەسەڵاتداری ڕەها بووە, شارەوانی و سوپا و سەرجەم پۆستە سەربازیەکانی لە ژێر دەسەڵاتدا بووە, وەزیرەکان گوێڕایەڵی ئەویان دەکرد و سەرۆك وەزیرانیش لە هەمو شتێك بێئاگا بووە, (ڕەزم ئارا) هەرکەسێکی ویستوە دەستگیری کردووە, تەنانەت کەسانی وەکو (کاشانی و سەیدزیا و قەوام)یش, سەرۆك وەزیرانیش بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو بڕیارە مۆڵەتی لە خودی (شا) وەرگرتووە, واتە ئەگەر (شا) بکوژرایە هیچکەس نەیدەتوانی ئەو بڕیارە هەڵوەشێنێتەوە, سەرسوڕهێنەر تر لە هەمو شتێك ئەوەیە کە (ساعد) بە ئاشکرا (ڕەزم ئارا) وەك پیلان داڕێژەر و ئامادەکاری ئەو ڕوداوە دەناسێنێت و پەیوەندیەکانی ئەو بەلایەنی دیکەوە وەبیر دێنێتەوە, سەرباری ئەوەش شاهیدی دیکەش هەیە, یەکێك ئەوەیە کە بە پێچەوانەی ڕێوڕەسمی ساڵانی دیکەوە بە بیانوی هەبوونی حیزبی تودە لە (ئیمامزادە عەبدوولا میتینگ)دا (ڕەزم ئارا) خۆی دزیوەتەوە لە ئامادە بوونی لە نێو زانکۆدا و لە بارەگای لەشکرەوە چاودێری ڕەوشەکەی کردووە, ئەگەر تێڕامانێکی وردمان هەبێت و پشت بەستو بە وتەکانی (دوکتۆر کشاوەرز) کە بە هۆی سەختگیری و پێشنیاری (کیانوری)ەوە دەستەی جێبەجێکار ڕازی دەبن لە جیاتی (١٤ بەهمەن) ڕێوڕەسمی یادکردنەوەی (ئارانی) دەخەنە (١٥ بەهمەن)ەوە, بە سەرنج دانیش بە پەیوەندیەکانی (دوکتۆر کیانوری و ڕەزام ئارا) چ لە ڕێگەی (خەسرەو روزبە)ەوە یان بەڕاستەوخۆ ئەوە دەردەکەوێت کە (ڕەزم ئارا) لە چاوەڕوانی هەواڵی کوشتنی (شا)دا بووە بۆ ئەنجام دانی کودەتا, گەواهییەکی دیکەی ئەم ڕوداوە ئەوەیە کە لەو ڕۆژەدا بەرفەرمانی (ڕەزم ئارا) سەرجەم سەربازگەکانی پایتەخت دەستوری ئامادەباشیان پێگەیشتبوو بە ڕادەیەك کە سەرجەم هێزەسەربازیەکان بەتەوای پێداویستیەکانیانەوە لە سەربازخانەکاندا ئامادەی کار کردن بوون.[1]

ژرار دوو ویلیەی نوسەری فەرەنسیش کە یەکەم کەس بووە پەردەی لەسەر ڕۆڵی (ڕەزم ئارا) لە هەوڵی کوشتنی (شا) دا لاداوە, باوەڕی وایە کە (ڕەزم ئارا) ئەو

---

[1] د. انور خامەای: خاطرات دکتر انور خامەای (از انشعاب تا کودتا), انتشارات هفتە, ص١٢٧-١٢٩.

کارەی بە شێوەیەك ڕیکخستبوو کە بە ئاسانی بتوانێت ئەو هەوڵی کوشتنە بداتە پاڵ حیزبی تودە یان گروپە هەزهەبیەکان و دووای مەرگی (شا) ئەوانیش بسڕێتەوە, هەر لەبەر ئەوە لە بەرنامەیدا بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی ڕەها لە ئێران دا هیچ تروسکاییەك بۆ مانەوەی گروپە سیاسی و مەزهەبیەکان بوونی نەبوو.

یاداشتەکانی (فیردۆست)یش لەم بارەیەوە بەو هەمو ناڕونیەی کە تێیدایەتی مایەی تێڕامانە, فیردۆست دەڵێت: (١٥ی بەهمەن ١٣٢٧هەتاوی) من و پرون لە کۆشکی (محەمەدڕەزا)دا دانیشتبووین, لەو ڕۆژەدا ڕێوڕەسمێك لە زانکۆدا دەکرا کە (محەمەدڕەزا) ئامادەی دەبوو, پاسەوانانێکی زۆر کە پێکهاتبوون لە گاردی هەمیشەیی و گاردی تایبەتی و تەنانەت دژبانەکانیش لە دەوری (محەمەدڕەزا) هەڵقەیان بەستبوو, لەو ڕۆژەدا سەرلەشکر (دەفتەری) هاوڕازو نزیکترین کەسی (ڕەزم ئارا)یاوەری (محەمەدڕەزا) بوو کە لە تەنیشتی شۆفێرەکەوە دانیشتبوو, دووای ئەوەی کە (شا) لە ئۆتۆمبێلەکە دابەزی و ویستی بچێتە نێو کۆلێژی مافەوە کەسێك لەسەر لێواری چیمەنەکەیەوە پێنج(٥) گوللەی بەرەو ڕوی (محەمەدڕەزا) تەقاند و گوللەکانی تەواو بوون, (محەمەدڕەزا) بە ئەنجام دانی جوڵەی جەستەیی هەوڵی دابوو کە گوللەکانی بەر نەکەوێت, بەڵام هەر پێنج(٥) گوللەکە ی بەرکەوتبوو, تەقاندنی پێنج (٥) گوللە لە دووری بیست (٢٠) مەترەوە بە سیلاحی بەرپشتوێن (دەمانچە) کە قەرەوڵی وردووتەواوی نیە بە شێوەیەك کە هەر پێنج (٥) گوللەکە بەر بەشی سەرەوەی جەستە بکەوێت ئەوە دەردەخات کە بکوژەکە تیرئەندازێکی شارەزا بووە, زۆربەی پاسەوانەکان خۆیان لە پشتی درەختەکانەوە حەشار دابوو چونکە لە سەرەتاوە بکوژەکە نەدەبینرا, سەرلەشکر (دەفتەری)ش خۆی لە ژێر ئۆتۆمبێلەکەدا حەشار دابوو, کاتێك کە زانیان ئیدی بکوژەکە گوللەی پێنەماوە, لە جیاتی دەستگیر کردنی, سەرلەشکر (دەفتەری) فەرمانی دا کە بیکوژن, تەنانەت خۆشی هێرشی بۆ کرد و چەند گوللەیەکی لێدا, پاسەوانەکانیش لە پشتی درەختەکانەوە دەرکەوتن و بۆ خۆ دەرخستنیان یەکی دوو (٢) گوللەیان لێدا, بکوژەکە وەك بێژنگی لێهات, فەرمانەدەی گاردیش میهرەبان بوو کە ئەویش تەنها یەك گوللەی لێدابوو.

من و پرون کەلەکۆشك بووین چاوەڕوانی گەڕانەوەی (محەمەدڕەزا) بووین, لەوکاتەدا بە تەلەفون ئێمەیان لە ڕوداوەکە ئاگادار کردەوە, دەستبەجێ (پرون)م برد و

بەئۆتۆمبێلەکەی خۆم بە خێرای بۆ نەخۆشخانەی ژمارە یەکی لەشکر کە کەوتبوویە پێچی (یوسف ئاباد)ەوە ڕۆیشتین, محەمەدڕەزایان لە ژورێکی گەورەدا لەسەر مێزێك خەواندبوو, هەر بەرپرسێك کە ئاگای لە ڕوداوەکە بوو خۆی گەیاندبوویە ئەوێ و دەوری مێزەکەیان دابوو, دوکتۆری ئێسك (سەرتیپ نەجەف ئابادی) شوێنە برینەکانی تیمار دەکرد, من و پرونیش نزیکی مێزەکە بووینەوە و نیگەرانی خۆمان مان ڕاگەیاند, ئەویش وەڵامی ڕێزەکەی ئێمەی دایەوە, دوکتۆر وتی پێویستی بە نوژداری ناکات, چونکە ئێسکە سەرەکیەکان ئازاریان بەر نەکەوتووە, محەمەدڕەزا دووای تیماری سەرەتایی گەڕایەوە بۆ کۆشك, من وپرونیش بەهۆی ئازاری ئەوەوە چرکەیەك لێی دوور نەدەکەوتینەوە شەوانەش لە تەنیشت سیستەمەکەی ئەوەوە دەخەوتین, دوکتۆرەکەش شەووڕۆژ دووکاتژمێر جارێك دەهات و محەمەدڕەزای دەبینی.

هەوڵی کوشتنەکە درایە پاڵ (ئایەتوڵا کاشانی و حیزبی تودە), بەڵام گومان و دوودڵیش لەبارەی (ڕەزم ئارا)شەوە هەبوو, محەمەدڕەزا لە ڕەزم ئارای پرسی بۆچی تۆ لە ڕێوڕەسمەکەی زانکۆدا نەبوویت؟ ئەویش لە وەڵاد دا ووتی: (کاتێك کە تۆ دەردەچیت دەبێت من لە شوێنی کاری خۆم ئامادە بم و فەرمانی چاودێری و پارێزگاری بدەم)), محەمدڕەزا ووتی: (ئەمجارە فەرمانەکەی تۆیان جێبەجێ نەکرد!!!), ورتەورتێك هەبوودەربارەی پەیوەندی (ڕەزم ئارا) لەگەڵ هەندێك لە سەرانی (حیزبی تودە) لە ڕوداوی هەوڵی کوشتنی (محەمەدڕەزا) دا, ماوەیەك دوواتر کە خودی (ڕەزام ئارا) تیرۆر کرا, (موبسیر) کە لەو کاتەدا سەرۆکی هەواڵگری و سیخوڕی بەشی (٢)ی لەشکر بوو, لەکاتی پشکنینی ماڵەکەی (ڕەزم ئارا)دا دەفتەری یاداشتەکانی ئەوی دۆزیبوویەوە, پێی وتم کە لە دەفتەری یادەوەریەکانی ڕەزم ئارا) دا لە بارەی ڕوداوەکەی (١٥ بەهمەن)ەوە شتانێکی سەیر هەیە, هەرچیم کرد ئەو بەشەی پێنەدام و وتی داومە بە (شا) و ئەو پێی نەداومەتەوە, ئەگەر دەتەوێت برۆ لەخۆی وەربگرە!, منیش داوام لێنەکرد, بەڵام (شا) یەك دوو جار لای من دەیوت: ((ئەم ڕەزم ئارایە عەجەب کەسێکی مەترسیدار بوو!!)), ئەم ئاماژەیە بە سەرنجدان لە وتەکانی (موبسیر) بۆ من بەس بوو کە دڵنیا بم لەوەی کە بەڵگەیەك هەبووە بۆ نیشان دانی ڕۆڵی (ڕەزم ئارا) لە کوشتنی (شا) دا, بێگومان ئەگەر هەوڵی کوشتنەکە

سەرکەوتو دەبوو ئەوا ڕەزم ئارا بەوەی کە هێزەکانی سوپا و لەشکری لەبەردەستدا بوو، دەبوویە سەرۆکێکی ڕەهای بێ ڕکەبەری ئێران، لەبەر ئەوە لەو کاتەدا (محەمەدڕەزا) جێنشینی نەبوو.[1]

بەر لە ئەتیجەگیری لەم بارەیەوە، گواستنەوەی بەشێك لە یاداشتەکانی (کیانوری) کە یەکێکە لە ڕێبەرە پێشینەکانی حیزبی تودە و کۆتا ڕێبەری ئەو حیزبەشە، کە خۆیشی یەکێکە لە تۆمەتبارەکانی بەشدار لە پیلانی کوشتنی (شا) دا، بە پێویست دەزاندرێت، (کیانوری) لە وەڵامی پرسیارێکدا دەربارەی ڕۆڵی ئەو لە ڕوداوی (١٥ بەهمەن هەتاوی١٣٢٧) دەڵێت: (دەربارەی من بە تەواوی بەم شێوەیە، یەکێك لەئەندامانی حیزب بە ناوی (عەبدوڵائەرکانی) کە لاوێکی زۆر باش و خوێندکاری زانکۆ بوو منیشی دەناسی، چەند مانگێك پێش (١٥ بەهمەن) هات بۆلای من کە لەوکاتەدا بەرپرسی ڕێکخستنەکانی حیزب بووم، ووتی: یەکێك لە هاوڕێیانی من کە ناوی (ناسر فەخر ئارائی)ە و لە ژیان بێزا بووە و بڕیاری داوە کە (شا) تیرۆر بکات، ڕای تۆ چیە؟ دەست بەجێ منیش کەوتمە هەواڵ پرسینی(دوکتۆر ڕادمنش)ی بەرپرسی یەکەمی کۆمیتەی ناوەندی، دوواتر زانیم کە ئەو لە ئیدارەی ڕۆژنامەی مردم (بینایەکی هاوسێی بیناکەی حیزب بوو)، ڕۆشتم بۆ ئەوێ، (د. ڕادمنش، د.کشاوەرز، ئیحسان تەبەری) لە بالکۆنی قاتی دووەمی بیناکەدا سەرقاڵی گفتوگۆ بوون، من بابەتەکەم پێیان ڕاگەیاند، د. ڕادمنش ووتی: (بەشێوەکی بنەڕەتی حیزبەکەی ئێمە دژی تیرۆر کردنە، ئێمە تیرۆر بە هۆکاری بەرەوپێشبردنی شۆڕش نازانین، بەڵام ئەگەر کەسێك دەیەوێت (شا) بکوژێت، خۆ ئێمە ناتوانین بڕۆین و زانیاری بە (شا) بدەین (ئەمە دەقی وتەکەی ئەوە)، دوای ئەوە منیش ڕێگریم لە (ئەرکانی) کرد کە پەیوەندی بە ئێمەوە نیە، جار جارانێك (ئەرکانی) دەهاتە لای من و هەواڵی ڕەوشی (ناسر فەخر ئارائی) پێدەدام کە بە هۆی هۆرکاری جۆراوجۆرەوە نەیتوانیوە سەرکەوتو بێت، لە هەوڵی پەیدا کردنی چەك دایە، دانەیەکی پەیدا کردووە بەڵام بە کەڵك نایەت، منیش بە سادەیی ڕەوشەکەم دەگوزەراند و ئەوەندە کە لە یادم مابێت جارێکیان پێم وت: (واز لەم کەسە بهێنە، بە بڕوای من ئەو کەسێکی ئاسایی نیە)، بەڵام لەڕواڵەتدا وا

---

[1] خاطرات فیردوست. ص١٦٥-١٦٧.

دەردەکەوێت کە (ناسر) لەگەڵ کەسانێکی دیکەدا پەیوەندی هەبووبێت, وەك لەگەڵ فەقیهی شیرازی زاوای (ئایەتوڵا کاشانی)..).

کیانوری جەخت لەسەر نەبوونی پەیوەندی خۆی لەگەڵ (ڕەزم ئارا) دەکاتەوە و لە کۆتایی گفتوگۆکەیدا دەربارەی (١٥ بەهمەن) دەڵێت: (بەو بۆچونەش کە ئەگەر تیرۆر کردنەکەی (شا) سەرکەوتو ببووایە ئەوا ڕەزم ئارا دەبووە دیکتاتۆر, بە بۆچونی من هیچ ڕاست نیە, هەرگیز داگیرکەر ڕازی نەدەبوو دەست لە ڕژێمی پاشایەتی بەربدات, لەکاتی کوشتنی (شا) دا, (عەلیڕەزا) بە پێچەوانەی (محەمەدڕەزا)ی برایەوە کەسێکی زۆر بەهێز و بە ئیرادە بوو دەبووە (شا) و داگیرکەرانیش پشتگیریان دەکرد[1]...).

دەرەنجامەکانی نوسەر لە وەرگرتنی ئەم وتانە و ئەو نوسین و سەرچاوانەی دیکە کە لەو بارەیەوە خوێندوومەتەوە, بەکورتی لێرەدا دەیخەمە ڕوو:

١- ڕەزم ئارا ڕاستەوخۆ جێبەجێکاری ئەم پیلانە نەبووە, پێدەچێت خودی (ناسر فەخر)ی بکوژی (شا)یشی نەناسیبێ, بەلآم لە ڕێگەی (کیانوری)ەوە لەم پیلانە ئاگادار دەکرێت, نەك هەر ڕێگری لەو کارە ناکات بەڵکو ئاسانکاریش بۆ چونە ناوەوەی بکوژەکە دەکات بۆ نێو زانکۆ, وە پێدەچێت سەرلەشکر (دەفتەری) یاوەری (شا)یش کە لەگەڵ (شا)دا دەچێت بۆ زانکۆ ئاگاداری ئەم پیلانە بووبێت و هەر لەبەر ئەوەش بووە کە لەکاتی سەرنەکەوتنی هەوڵی کوشتنی (شا)دا ئامادە سازی بۆ کوشتنی (ناسر فەخر) کردووە, (هەڵبەت کیانوری پەیوەندی خۆی لەگەڵ ڕەزم ئارا دا ڕەت دەکاتەوە بەلآم چەندین گەاهی و نزیکبوونەوە هەیە کە ئەو بانگەشەیە هەڵدەوەشێنێتەوە).

٢- ئەوەی کە کیانوری و کەسانی دیکە وتویانە کە ئەگەر (ڕەزم ئارا) یان دەستی دەرەکی داڕێژەری ئەم پیلانە بونایە ئەوا چەکێکی باشتریان دەدا بە (ناسر فەخر) یان تفەنگچیەکی لێهاتو تریان بۆ ئەو کارە دیاری دەکرد, ڕۆڵی ڕەزم ئارا لەم کارەدا ڕەت ناکاتەوە, هەروەکو پێشوتر ئاماژەمان بۆ کرد کە (ڕەزم ئارا) نەیدەویست بە جێبەجێکار و هەڵسوڕێنەری ئەم پیلانە بناسرێت و لە کاتی سەرنەکەوتنی

[1] نوردین کیانوری: خاطرات نوردین کیانوری, انتشارات اطلاعات, ص١٨٣-١٨٩.

چالاکیەدا (وەك چۆن سەرکەوتوش نەبوو) گرفتار ببێت, سەرباری ئەوەش ئەگەر ڕازی بین بە بانگەشەکانی (فیردۆست) ئەوا (ناسر فەخر) کەسێکی لێهاتو بووە و ئەگەر یەك لە گوللەکانیشی بەر شوێنێکی هەستیاری وەکو مێشکی یان دڵی بکەوتایا ئەوا کاری (شا)ی ساز دەکرد, چونکە ناسر سەری (شا)ی کردبوویە ئامانج, ئەگەریش هیچکام لەو پێنج گوللە بەر سەری نەکەوتن بەڕاستی موعجیزە ئاسا بوو.

٣- ڕەزم ئارا ئامادەکاریەکانی بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەلأت دووای گوشتنی (شا) فەراهەم هێنابوو, ئەو بانگەشەیەی (کیانوری)ش کە (هەرگیز داگیرکەر ڕازی نەدەبوو دەست لە ڕژێمی پاشایەتی بەربدات), ئەوە لە شێوەی بیرو بۆچونە کۆنەکانە کە پێچەوانەکەی (ناڕاست) سەلمێنراوە, لە ئێران دا داگیرکەر هیچ جۆرە دڵبەستەگیەکی بە سیستمی ڕژێمەوە نەبوو, بەڵکو پێشوازی لە هەرکەسێك دەکرد کە زیاتر بتوانێت بەرژەوەندیەکانی بۆ دەستەبەر بکات, لەبارەی (عەلیڕزا)شەوە کە ئەو بەڵگەنامە نهێنیانەی بەم دوواییە بلأو کرانەوە, لەوانەش وەك ڕاپۆرتەکانی (سر رید بۆلارد)ی باڵوێزی پێشوی ئینگلیز لە ئێران ئەوە ڕون دەکاتەوە کە لە نێو براکانی (شا) دا, عەلیڕەزا کە لە هەمویان زیاتر شانسی جێنشینەوەی (شا)ی هەبوو, لای ئەوان کەمتر لە هەمویان مایەی گرنگی پێدان بووە.

٤- ڕۆڵی ئینگلیزەکان لەم ڕوداوانەدا, کە شا و ساعد بە ڕاشکاوانە ئاماژەی بۆ دەکەن, ڕون نییە و نوسەر ناتوانێت ئەم بابەتە پشت ڕاست یان ڕەت بکاتەوە, بەلأم بۆچونی دیار ئەوەیە کە ئینگلیزەکان لە سەروبەندی سەڵتەنەتداری (حەمە ڕەزاشا) دا بۆچونی باشیان لە بارەی ئەوەوە نەبووە و ئەویان بەکەسێکی بەتوانا و ئارەزومەند بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان نەدەزانی, بە پێچەوانەی (ڕەزم ئارا)وە کە بە پێی ئەو بەڵگانەی دوواتر ئاماژەیان بۆ دەکرێت جێگای ڕەزامەندی و گرنگی پێدانی ئینگلیزەکان بووە, سەرەنجامیش (شا)یان ناچار بە دەرکردنی فەرمانی سەرۆك وەزیرانی (ڕەزم ئارا) کرد.

** ** **

محەمەدشا هەوڵی سەرنەکەوتوی تیرۆر کردنی خۆی کردە دەستپێك و بیانویەك بۆ هەڵوەشاندنەوەی (حیزبی تودە) و دەستگیر کردن و دادگایی کردنی نەیارەکانی و پتەو کردنی پێگەو دەسەلأتی خۆی, وە بە دامەزراندنی (ئەنجومەنی موئەسیسان)یش

لە مانگی (ئۆردیبەهەشتی ١٣٢٨ هەتاوی)دا بە ئارەزوی خۆی تەواو پێگەی خۆی بەهێز کرد, لە گرنگترین گۆڕانکاریەکانیش لە دەستوری ولآتدا بەخشینی مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و دەرکردنی پەرلەمانتارەکان بوو بە خودی (محەمەدشا), کە بە تەواوی دەسەلآتی یاسادانانی لە بەرامبەر ئەودا لاواز دەکرد, هەروەها (شا) بە دامەزراندنی (ئەنجومەنی سەنا) کە نیوەی ئەندامەکانی لەلایەن خودی (شا)وە دادەمەزران, بەشێوەیەکی کرداری دەسەلآتی یاسادانانی لە ژێر ڕکێفی خۆیدا کۆت و بەند کرد, لە بەر ئەوە کە بڕیارە گرنگەکان بە دەنگی زۆرینەی هەردوو ئەنجومەنەکە دەبوو, هەمیشە (شا) دەنگی زۆرینەی ئەنجومەنی سەنای لە ژێر دەستدا بوو.

محەمەدشا لە بەرامبەر سیاسەتە توندەکانی نێوخۆیدا, لە دەرەوە سیاسەتێکی نەرمی لە ڕادەبەدەری پیادە دەکرد بە تایبەتی لە بارەی چارەسەر کردنی پرسی نەوت لەگەڵ بەریتانیەکان دا زۆر لێبووردە بوو, سەرەنجام ئینگلیزەکان ڕازی بوون کە جیاوکێکی کەم بدەن بە ئێران و مافی لە پەیمانی ساڵی (١٩٣٣ز) دا زیاد بکەن, نوێنەرێکی کۆمپانیای نەوت بە نێوی (گس) گەیشتە تاران و دووای گفتوگۆی لەگەڵ (گلشائیان)ی وەزیری دارایی حکومەتەکەی (ساعد) دا پەیمان نامەیەکی واژۆ کرد, کە بە پەیمان نامەی (ئیلحاقی نەوت) یان (گس – گلشائیان) ناسراوە.

ئەم پەیمان نامەیە لە کۆتاییەکانی خولی پازدەیەم دا پێشکەشی پەرلەمان کرا, بەلآم نوێنەر (پەرلەمانتار)ە کەمینەکانی وەکو (حسەینی مەکی, د.موزەفەری بەقایی, حائیری زادە) دەنگی دژایەتی کردنی ئەو پەیمان نامەیەیان بەرز کردەوە, پەیمان نامەکە بۆ ماوەیەك لە نێو لیژنەکانی پەرلەمان دا مایەوە, پاش خستنەڕوی لە دانیشتنی ئاسایی پەرلەمان دا, حسەینی مەکی لە چەندین دانیشتندا دژایەتی خۆی دەربڕی و لەو بارەیەوە قسانی دەکرد, ئەمە مایەوە تا تەمەنی خولی پازدەی پەرلەمان کۆتایی هات, بڕیاری کۆتایی دانرا بۆ خولی داهاتوی پەرلەمان.

ڕەوتی هەڵبژاردنی خولی شازدەی پەرلەمان کە پڕ لە شلۆقی و نا ڕونی بوو, (د.موسەددەق) بە سەرۆکایەتی دەستەیەك لە پەرلەمانتارانی خولی پیشو, کەمینەکانی خولی پازدەیەم, بەرپرسە حکومیەکان و ڕۆژنامە نوسان, کە دوواتر (جەبهەی میللی)یان دروست کرد, بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە بارەی دەستوەردان لە هەڵبژاردنەکان چونە کۆشکی دەربارەوە, گرد بوونەوەی (د. موسەددەق) و هاوڕێکانی

بە بێ ئەنجام دووای چەند ڕۆژێك کۆتایی هات, ئەوەش دەوترا کە لە هەڵبژاردن (هەژیری وەزیری دەربار و د, ئیقبالی وەزیری ناوخۆ) کە هەردووکیان وابەستەی (ئەشرەف پەهلەوی) بوون, دەسەڵاتیان دەبێت و بە هەمان شێوەی پێشو بەردەوام دەبن, (هەژیر)ی وەزیری دەربار لە (١٣ ئابان ١٣٢٨ هەتاوی) دا لە نێو مەجلیسی شیوەنی دەربارەدا بە بۆنەی یادی (عاشورای حسەینی)ەوە کە مزگەوتی (سپەهسالار) ئەنجام درابوو, کرایە نیشانەی گوللە و کوژرا, بکوژەکەش ناوی (حسەینی ئیمامی) بوو کە یەکێك بوو لە ئەندامانی (فیدائیانی ئیسلام) دەست بەجێ دووای دەستگیر کردنی دانی بە کوشتنەکەدا ناو ڕایگەیاند کە (هەژیر)ی بە ناپاك زانیوە و خود ویستانە بڕیاری کوشتنی ئەوی داوە, لەبەر ئەوە (د. موسەددەق) و ژمارەیەك لەوانەی کە لەگەڵیدا بەشداری گردبوونەوەکەی بەردەم دەربار یان کردبوو, چەند کەسێکیش لە ڕۆژنامەنوسەکان و ئەندامانی کۆمەڵەی (فیدائیانی ئیسلام) و تەنانەت (سەید موستەفا کاشانی) کوڕی (ئایەتوڵا کاشانی) دەستگیر کران, د. موسەددەق دوور خرایەوە بۆ ئەحمەدئاوا, بەڵام ئەوانی دیکە زیاتر لە مانگێك لە زیندان دا مانەوە.

ڕۆژی (٢٤ ئابان ١٣٢٨ هەتاوی) بە دەعوەتی فەرمی (ترومن)ی سەرۆکی ئەمریکا (محەمەدشا) سەردانی ئەو وڵاتەی کرد, ئەم سەفەرەی (شا) بۆ ئەمریکا خاڵێکی ورچەرخانە لە پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکا و ئێران دا, کە وردە وردە بوویە هۆی دەستوەردانی زیاتری ئەمریکا لە کاروباری ئێران دا و زاتێکی بە (شا) بەخشی کە پاڵپشت بە پشتگیریەکانی ئەمریکا لە بەرامبەر بەرتانیا دا ڕاوەستێت, لەبارەی ڕوداوەکانی ئەم سەفەرە و پێشهات و دەستکەوتەکانی, توێژەر و نوسەری ناوداری ئەمریکی, پرۆفیسۆر (باری روبین) کە چەندین کتێبی جیاوازی لە بارەی ئێران و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستەوە نوسیوە, لە کتێبێکی دا بە ناونیشانی ((سنگفرش شده با حسن نیت))[1] بەم جۆرە دەنووسێت:

---

[1] ناونیشانی ((سنگفرش شده با حسن نیت)) Paved with Good Intentions لە ئینجیلەوە وەرگیراوە, مەبەست لەوەش ئەوەیە کە ئەمریکاییەکان لە نیەت پاکیەوە هاتنە نێو جەنگی سیاسەتی ئێران, بەڵام بە بێ ئاگا لە مەیدانەکە چونە دەرەوە, ئەم کتێبە بە نێو نیشانی (جنگ قدرتها در ایران / جەنگی هێزەکان لە ئێران) وەرگێردراوە بۆ زمانی فارسی.

( یەکەم سەفەری شای ئێران بۆ ئەمریکا لە ساڵی (١٩٤٩ن) سەرکەوتنێکی ڕاگەیاندنیی گەورە بوو, شا لە ڕێکخراوی نەتەوە یەککگرتووەکان وتارێکی پێشکەش کرد, ناوەندی توێژینەوەی ئێرانی لە زانکۆی کۆلۆمبیادا کردەوە و سەردانێکی بۆ کۆلێژی بەناوبانگی (وست پونیت) ی ئەمریکا ئەنجام دا, وە چاپەمەنیەکانی ئەمریکا لە هەموان زیاتر پێشوازییان لەو کرد چەندا وتاریان لە بارەی سەفەری ئەم پادشا ڕۆژ هەلاّتیەوە بۆ ئەمریکا, نوسی. ڕۆژنامەی (نیۆرك تایمز) زیاتر لە هەموان بە (شا)یدا هەڵدەدا و ڕێزی لێ دەگرت, لە سەر وتارێکی ڕۆژی (١٧ نۆڤەمبەری ١٩٤٩ن)دا سەرباری باسکردنی گرنگی پێگەی جوگرافیای ئێران لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست و پێدا هەڵدانی خودی (شا), ئامۆژگاری ئەمریکای دەکرد لە بارەی زیاتر هاوکاری کردنی ئێران, تەنانەت دووای گەڕانەوەی (شا) لەمریکاشەوە بۆ ئێران, ڕۆژنامەی (نیۆرك تایمز) بەردەوام بوو لە پشتیوانیەکانی خۆی بۆ (شا)ی ئێران, لە وتارێکی ڕۆژی (١١ فەبریوەری ١٩٥٠ن) خۆیدا ددەنووسێت: شا بە بیری پێشکەوتو گەشەکردووانەی خۆیەوە دەیەوێت چاکسازی و ڕیفۆرمی بنەڕەتی لە ولاّتی ئێران دا بکات, بەلاّم دەستەیەکی پارێزکار و دوواکەوتو کە بە (هەزار فامیل) ناسراون و پەڕلەمان و فەرمانگە فەرمانڕەواکانی ئێرانیان خستوەتە ژێر دەستی خۆیانەوە, بوونەتە بەربەستی ڕێگەی پێشکەوتن و گەشەسەندنی ئەو ولاّتە, (تایمز) لەوەش زیاتر پێی ڕاکێشاوە و نوسیبووی: شا ڕوخساری گەشەسەندن و چاکسازی کۆمەلاّیەتی و پەڕلەمانیش لانکەی دواکەوتنی ئێرانە !.[1]

هەڵبەتە سەرۆك (ترومن) و (ئەچسن) ی وەزیری دەرەوە و ژەنەراڵ و پلەدارەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بەو شێوەیە هێڵێکی دیارو ڕونیان لە نێوان گروپی پێشکەوتو خوازو دوواکەوتوی ئێراندا نەکێشابوو, لە پەیوەندیشیان لەگەڵ (شا) دا پارێزکار بوون, خەرجی بەرنامەی نوێی ئابووری ئێران (٦٥٠) ملیۆن دۆلاری پێویست بوو, بەلاّم ئامادەکردنی بوودجەی ئەو بەرنامەیە لە کاتێکدا کە بەشێکی زۆری بوودجەی ئێران بۆ کاروباری سەربازی خەرج دەکرا, زۆر دژوار بوو, بە (شا) وترا کە توانایی ئەمریکا بێ سنور نیە و کۆنگرێسی ئەمریکی هەرگیز بە بڕێکی

[1] ئەم وتارە ڕێك لە ڕۆژی کردنەوەی خولی شازدەی پەڕلەمان و خولی یەکەمی سەنا دا بلاّو کرایەوە.

زۆری هاوکاری ئابووری بۆ ئێران ڕزامەندی دەرنابڕێت, ئێران دەبێت بە دەستهاتە نەوتیەکانی خۆی بسازێت و کورت هێنانەکانی لە ڕێگەی قەرزی بانکیەوە دابین بکات, هاوکاریە هونەریەکان لە ڕێگەی بەرنامەی بەندی چوارەوە بۆ ئێران پێشبینی کراو بوو, بەڵام جێ بەجێکردنی بەرنامە مۆدێرنیزەکانی ئێران بەو خێراییەی کە (شا) دەیویست نەدەکرا.

دوواتر ئەچسۆنی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا وتی کە: ( شا پیاوێکی واقیع بین نیە و بیر لە توانای کرداری خۆی ناکاتەوە.... ئەو بیرو خەیاڵاتی زۆری لە سەردایە و خۆی بە سەردارێکی گەورەی سەربازی دەزانێت, بەڵام بڕوابەنی ئەو بەوەی کە ڕۆژێك سوپاکەی دەتوانێت بەرامبەری سوپای ڕوسی بووەستێت هیچ نیە جگە لە خەوروخەیاڵ...). تەنانەت (ئەچسۆن) بەرنامە ئابووریەکەی ساڵی (١٩٤٩ – ١٩٥٠ز) ئێرانی بە بەدەر لە ڕادەی توانایی ئەو وڵاتە دەزانی.

دەگونجێت دیداری (شا و ئەچسۆن) لە (١٨ نۆڤەمبەری ١٩٤٩ز) دا بە یەکێك لە سەرنج ڕاکێشترین دیدارە سیاسیەکانی نێوان (شا و ئەچسۆن) بێت. لەم دیدارەدا ئەچسۆنی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بابەتێکی لەگەڵ شا دا باس کرد کە ڕاستی و دروستی ئەو (٢٥) ساڵ دوواتر دەرکەوت, لەم گفتوگۆیەدا کە دەقەکەی لە بەرگی شەشەمی کتێبی (روابط خارجی امریکا در سال ١٩٤٩) تۆمار کراوە, ئەچسۆن بە شا دەڵێت: (هەوڵەکانی ئێوە بۆ دروستکردنی لەشکریك کە لە توانایدا هەبێت بەرامبەر هەڕەشە سەربازیەکانی سۆڤیەت ڕاوەستێت, سەرباری ئەوەی کە بێ ئەنجامە, بە ڕادەیەکیش ئێران لاواز دەکات کە زەمینەی ڕوخانی وڵاتەکەتان بە بێ هێرشی سەربازی سۆڤیەتیش دەسازێنێت ), دوواتر ئەچسۆن ووتی: ( باشترین ڕێگەی پێشگرتن لە شەڕ, کە ئامانجی ڕاستەقینەی ئێمەیە, هەبوونی سوپایەکی بەهێز نیە, بەڵکو بە دروستکردنی ژێرخانێکی تەندروست و بەهێزی ئابووری و کۆمەڵایەتی باشتر دەتوانێت بیری ڕوسەکان لەهێرشکردن و دەستوەردان و تێکدەری ڕابگرێت..).

دیداری (شا و ئەچسۆن) هاوکات بوو لەگەڵ ڕوخانی حکومەتی (چیان کای شای) لە چین بە دەستی کۆمۆنیستەکان, هەربۆیە ئەچسۆن وڵاتی چینی بە نمونە هێنایەوە و ووتی: ( چیان کای شان لە جیاتی چاکسازی کردن لە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی دەستی دایە دروستکردنی سوپایەکی بەهێز و گەورە, بەڵام نەبوونی

هاوسەنگی ئابووری و ئەو گەندەڵیەی کە کۆمەڵگەی یەخسیر کردبوو، گورزی لەو سوپا بەهێزەش دا و لە دەرونەوە هەڵی وەشاندەوە...)، بەڵام شا وتی: ڕەوشی ئێران لەگەڵ چین دا شیاوی بەراورد کردن نیە و درێژەی پێدا: (گەندەڵی چیان کای شای لە بن دەرهێنا، بەڵام لە ئێراندا وەها گەندەڵیەك بوونی نیە)، شا دیسانەوە وتی: کە دەیەوێت چاکسازی کۆمەڵایەتیش بکات، بەڵام ناتوانێت گوێ لە دروستکردنی سوپایەکی بەهێزیش بخەوێنێت، لەبەر ئەوە ئیدی ئامادەی خۆگرتنی شکستی سەربازی نیە، ئەچسۆنیش پێداگری لەسەر بیروباوەڕکانی خۆی کرد، ئەم دیدارەش تاڕادەیەك بە بێ هیچ ئەنجامێك کۆتایی هات.

شا لە کۆتایی سەردانەکەی دا بۆ ئەمریکا بەو ئەنجامە گەیشت کە نابێت بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی خۆی پشت بە ئەمریکا ببەستێت، وە لەوە تێگەیشت کە تەنها ڕێگە بۆ دابینکردنی خەرجیە پێویستەکانی خۆی زیاد کردنی بەرهەمی نەوتە، لەبەرئەمە چەند هەنگاوێکی بۆ چاو خشاندنەوە بە پەیماننامە نەوتیەکانی نێوان ئێران و کۆمپانیا نەوتیەکانی (ئێران _ ئێنگلیز) هەڵگرت، بەڵام ئینگلیزەکان لەگەڵ ئەو هەمو قازانجەی کە لە چالاکیە نەوتیەکانی خۆیان دەیانکرد لە ئێران دا توندیەکی زۆریان دەنواند لە بەرامەر پێدانی جیاوکی زیاتر بە دەوڵەتی ئێران، پرسی ناکۆکیەکانی ئێران و کۆمپانیای نەوت و بیانووی ئینگلیزەکان لە پێدانی ماف وداواکاریە ڕەواکانی ئێران زەمینەی بۆ قەیرانێکی نوێ لە پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکا و بەریتانیا لە ئێران دا ڕەخساند، ئینگلیزەکان لەو باوەڕەدا بوون کە ئەمریکا هاوکاریەکانی خۆی بۆ ئێران وابەستە بکات بە نیشاندانی ڕەزامەنی ئێران بە پێشنیارەکانی کۆمپانیای نەوتی (ئێران _ ئینگلیز)، بەڵام ئەمریکا ئامادە نەبوو وەها کارێك بکات...، هەرچەندە بەو شێوەیەی کە ئامازەی بۆ کرا، لەو کاتەدا لێك تێگەیشتنێکی باش لە نێوان دەوڵەتی ئەمریکا و شای ئێران دا نەبوو، هەروەها داوای هاوکاری چەك و سەربازی دەکرد و ئەمریکاش لە بارودۆخی حکومەت و ڕەوشی بوواری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئێران ڕازی نەبوو، هەندێك لە کارەکانی (شا) وەك دابەشکردنی زەوی سەڵتەنەتی لە نێوان جوتیاران دا ببوویە مایەی سەرنج و تێڕامان و پێشوازی ئەمریکیەکان، بەڵام دیپلۆماتکارە ئەمریکیەکان گومانیان لە توانایی (شا) هەبوو بۆ ئەنجام دانی چاکسازیەکی ڕیشەیی و بنەڕەتی، بە بۆچونی ئەو

ئەمریکیانەی کە لەوکاتانەدا پەیوەندیان لەگەڵ (شا) دا هەبوو، ئەو پێکهاتەیەکی نامۆ لە لاوازی و غیرەت و سەرسەختی و گونجاوی بوو، (ویلی) باڵوێزی ئەمریکا لەو کاتەدا لە ڕاپۆرتێکی دا بۆ (ئەچسۆن) دەدەنووسێت: ( ئەو بۆ وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتی، زۆر ڕۆژ ئاواییە)، تەنانەت خودی (ئەچسۆن) یش لە هەموان زیاتر ڕەش بین تر بوو لە بەرامبەر ئەنجام دانی ئەو بەرنامانەی (شا) لە وڵاتێکدا کە هێشتا بە کۆمەڵگایەکی فیودالّی دێتە هەژمار، دووای ئەو گفتوگۆیانەی کە لەگەڵ (شا) دا لە میانەی گەشتەکەیدا بۆ ئەمریکا ئەنجامی دا، ئەچسۆن گەیشتبووە ئەو باوەڕەی کە لەو کاتەدا هەر پارەیەك لە ئێران دا خەرج بکرێت ئەوا وەك (وڵاتی چین) بە با دا دەچێت..[1]

لەماوەی سەردانەکەی (شا) بۆ ئەمریکا، بابەت گەلێکیش دەربارەی خۆشگوزەرانیەکانی ئەو لە بلاّوکراوەکانی ئەمریکادا بلاّو کرایەوە، کە ڕیگری کرا لە بلاّو کراوەکانی ئێران دا بلاّو بکرێنەوە، لە کتێبێکی پڕ فرۆشیش دا بە نێوی (واشنگتن _ محرمانە)[2] کە لە ساڵی ١٩٥١ز لەمریکا بلاّو کراوەتەوە، دەربارەی ئەو خۆشگوزەزانیانە، وە ئەوەشی کە خودی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا هۆکاری ڕابواردن و خۆشگوزەرانیەکانی (شا) ی ئامادە دەکرد، بابەتێك بلاّو کراوەتەوە، لەو کتێبەدا کە جۆرێك لە ئاشکرا کردنی چالاکیەکانی وەزارەتی ئەمریکا بوو، هاتبوو:( دوو ساڵ پێشتر، کاتێك شای ئێران هات بۆ ئەمریکا، وەزارەتی دەرەوە بۆ ئامادەکردنی کچانێکی پەسەندیدەی (شا) لە هۆلیود و شیکاگۆ کێشەی نەبوو، بەلاّم لە نیویۆرك کاتێك کە (شا) داوای لە میواندارەکەی کرد کە کچێکی ڕەشیق و جوانی بۆ پەیدا بکات، فەرمانبەری وەزارەتی دەرەوە ناچار بوو کچێکی لە مۆدێلەکانی ڕێکخراوی (پاورز) هەڵبژێرێت بۆ تێپەڕاندنی تەنها شەوێك لەگەڵ خاون شکۆ دا، (شا) بە ڕادەیەك خۆشی لەو کچە هاتبوو، کە بەیانی ڕۆژی دوواتر موستیلەیەکی زمرودی سەوزی بە دیاری بەخشیە ئەو کچە کە نرخەکەی (٢٠٠٠٠) بیست هەزار دۆلار بووا، ئەو فەرمانبەرەی وەزارەتی دەرەوە کاتێك کە ئەم داستانەی بۆ ئێمە (نوسەرانی کتێب) دەگێڕایەوە، لە کاتێکدا کە ئاخی هەڵدەکێشا دەیوت: (ئەو کچە....

---

[1] باری روبین: جنگ قدرتها در ایران، ت. محمود طلوعی، انتشارات اشتیانی، ص٥٤-٥٠.

[2] Washington - Confidential

لەگەڵ وەرگرتنی ئەو دیاریە گران بەهایە! وازی لەو (٢٠٠) دووسەد دۆلارەش نەهێنا کە ئێمە بۆ کرێی تێپەڕاندنی شەوێك لەگەڵ شا دا بۆ ئەومان دیاری کردبوو!).[1]

** ** **

ڕەوشی (شا) لەکاتی گەڕانەوەی لە سەفەرەکەی ئەمریکای بە شێوەیەکی هەست پێکراو گۆڕرانی بەسەردا هاتبوو, ماوەیەك دووای گەڕانەوەی بڕیاری دووبارە کردنەوەی هەڵبژاردن لە تاران دا دەرچوو, وە بە ئازاد کردنی چالاکیەکانی (د. موسەددەق) و هاوبیرانی ئەو کە تازە لە زیندان هاتبوونە دەرەوە, سەرکەوتنیان لە هەڵبژاردنەکانی پایتەخت دا شتێکی بڕاوە بوو, خولی شازدەی پەرلەمان (مەجلیسی شازدە) و یەکەمین خولی (سەنا) بەر لە ئاشکرا کردنی ئەنجامەکانی تاران کرایەوە, بەلأم دەوڵەت خۆی بووارد لە دوواخستنی پاشکۆی پەیمان نامەی نەوت لە پەرلەمان دا هەتا ڕاگەیاندنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکەی تاران, لەم ماوەیەدا (ساعد) دەستی لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی کێشایەوە و (عەلی مەنسور) لە لایەن (شا) وە ڕاسپێردرا بر پێکهێنانی کابینەی نوێی دەوڵەت.

ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی تاران لە مانگی (فەروەردین ی ١٣٢٩)هەتاوی دا ڕاگەیەندرا, هەر بەو شێوەیەش کە چاوەڕوان دەکرا (د. موسەددەق) و هاوڕێی و هاوبیرانی ئەو لە نێو هەڵبژێردراوەکان دا بوون, هەڵبژێردراوەکان بە پێی زۆری دەنگەکان بریتی بوون لە: (د. موسەددەق, د. موزەفەری بەقائی, حسەین مەکی, حائیری زادە, سەید ئەبوولقاسمی کاشانی,عەبدوولقەدیر ئازاد, جەمال ئیمامی, سەید عەلی شایگان, مەحمود نەریمان,سەید محەمەد سادق تەباتەبائی, جەواد مەسعودی, میر سەید عەلی بەهبەهانی), کە هەشت کەس لەوانە لە دامەزرێنەرانی (جەبهەی میللی) یان لایەنگری بوون, (سەید ئەبوولقاسمی کاشانی) کە دووای ڕوداوی هەوڵی کوشتنی (شا) دوور خرابوویەوە بۆ وڵاتی لوبنان, لە مانگی (خوردادی ١٣٢٩)هەتاوی لە پێشوازیەکی بە شکۆ دا گەڕایەوە بۆ شاری تاران, بەلأم ئامادەی پەرلەمان نەبوو, پەیامی ئەو لە دانیشتنی ڕۆژی (٢٨ خورداد) ی پەرلەمان دا

[1] Jack Lait and Lee Mortimer: Washington Confidential. New York, Dell Books. P. 181

لەلایەن (د. موسەددەق) ەوە خوێنرایەوە, ئایەتولاّ کاشانی لەم پەیامەدا, پیلانی هەوڵی کوشتنی (شا)ی لە (١٥ بەهمەن ١٣٢٧)هەتاوی دا بە پیلانێکی خۆیانی ناو بردووە و جەختی لەوە دەکردەوە کە کوشتنی بکوژەکەی (شا)یش بۆ ڕێگرتن بووە لە ئاشکرا بوونی ڕیشەکانی ئەم پیلانە, بەشێك لە پەیامەکەی (ئایەتولاّ کاشانی) تایبەت بوو بە بوواری نەوت, کە جەختی لەوە دەکردەوە کە نەوتی ئێران تایبەتە بە گەلی ئێرانەوە و پەیمان نامەی نا یاسایی کە بە زۆر و ناچارکردن بسەپێنرێت هیچ بەهایەکی نیە.

ڕۆژی یەکەمی مانگی (تیری ساڵی ١٣٢٩)ی هەتاوی پەرلەمان کۆمیسیۆنێکی تایبەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە پەیمان نامەی پاشکۆی نەوت دیاری کرد, (د.موسەددەق) و ژمارەیەك لە هاوبیرەکانیی وەك: ( حسەین مەکی, ئەلهیار سالّح, حائیری زادە, د. شایگان) وەك ئەندامانی ئەو کۆمیسیۆنە هەڵبژێردران, کۆمیسیۆنی نەوت لە یەکەم دانیشتنی خۆیدا (د. موسەددەق) ی وەك سەرۆك دیاری کرد, ئەمەش زەنگێکی مەترسی دار بوو بۆ گوێی ئینگلیزەکان, هەربۆیە بە خێرای هەڵوێست و پەرچەکرداری خۆیان لە بەرامبەر ئەم کارە نوێیەی پەرلەمان دا نیشان دا.

ڕۆژی پێنجی مانگی تیر (عەلی مەنسور) ی سەرۆك وەزیران بە بیٚ هیچ پێشەکیەك دەستی لە کار کێشایەوە, هەمان ڕۆژ (سپەهبەد ڕەزم ئارا)ی سەرۆك لەشکر بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران دیاری کرا, بێگومان هەڵبژاردنی (ڕەزم ئارا) بۆ سەرۆك وەزیران بە بیٚ ئارەزومەندی دەرونی (شا) ئەنجام درابوو, لەبەر ئەوە (شا) سەرباری ئەو بەدگومانیەی کە لە ڕوداوی هەوڵی کوشتنەکەی دا لە (١٥ بەهمەن ١٣٢٧)هەتاوی بەرامبەر (ڕەزم ئارا) هەیبوو, هەمیشە خۆی دەبووارد لە دانانی کەسایەتیەکی بەهێز لەو پۆستەدا, جا چ جای ئەوەی کە کەسێکی سەربازیش بێت, سەرەتا ئاماژە بۆ ئەو بۆچونە جیاوازانەی کە لە سەرچاوە بیانیەکان دا لە بارەی ئەم بڕیارەی (شا) وە بلاّو کراونەتەوە دەکەین دوواتر دەرەنجامێکی لیٚ باس دەکەین.

یەکەمین ڕاڤە دەربارەی هەڵبژاردنی (ڕەزم ئارا) بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی لە کتێبی (ریچارد کاتم)ی نوسەر و توێژەری ئەمریکی بە نێوی (ناسۆنالیزم در ایران) دەخەینە ڕوو, گرنگی ئەم نوسینەی (کاتم) لەوەدایە کە خودی نوسەر لەو کاتانەدا وەك دیپلۆماتکار لە باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئێران دا کاری بۆ دەزگای هەواڵگری

ئەمریکی (سی ئای ئەی) دەکرد و ئاگای لە تەواوی ڕوداوەکانی پشتی پەردە بووە, (کاتم) هەڵبژاردنی (ڕەزم ئارا) بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئێران دەبەستێتەوە بەسەردانە فەرمیەکەی (شا) لە ساڵی (١٩٤٩ن) بۆ وڵاتی ئەمریکا و ددەنووسێت: شەش مانگ دووای ئەم سەفەرە, ڕەزم ئارا بوو بە سەرۆك وەزیری ئێران, لەو کاتەدا باوەڕی گشتی وابوو کە (ڕەزم ئارا) هەڵبژێردراوی هاوبەشی (ئەمریکا و ئینگلین)بووە بۆ سەرۆکایەتی حکومەتی ئێران, ئەم باوەڕەش زیاتر سەرچاوەی لە چالاکیەکانی یەکێك لە ئەندامانی باڵوێزخانەی ئەمریکاوە گرتبوو کە بەڕاشکاوی پارێزگاری لە (ڕەزم ئارا) دەکرد[1], سەرباری ئەمە چاپەمەنیەکانی ئەمریکاش لەو کاتانەدا زۆر بە گەرم و گوڕی بە (ڕەزم ئارا) یاندا هەڵدەدا و وەك پێشەوایەکی بەهێز و چاکەخواز ناویان دەبرد, لە نێو ئەوانەشدا دەتوانین ئاماژە بە وتارەکانی ڕۆژنامەی (نیۆیۆرك تایمز) لە دەورانی سەرۆك وەزیرانی (ڕەزم ئارا) دا بکەین, لەوکاتانەدا چاپەمەنیەکانی ئەمریکا و وڵاتانی ڕۆژئاواش زۆر بە ڕاشکاوانە ئەو بۆچونەیان بلاو دەکردەوە کە (ڕەزم ئارا) پاڵێوراوی ئەمریکا بووە بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئێران, لە نوسینەکانیشدا ئەویان وەك پێشەوایەکی بەهێز و لایەنگری ڕۆژئاوا و خۆ ڕاگر و پێداگر بۆ ئەنجام دانی چاکسازی دەناساند[2],,.

باری روبین یەکێکی دیکە لە نوسەر و توێژەرانی ئەمریکا لەم بارەیەوە بۆچونێکی جیاوازی هەیە و ددەنووسێت: کاتێك کە (شا) لە (ژوئین ١٩٥٠ن) فەرمانی بوون بە سەرۆك وەزیری (ڕەزم ئارا)ی دەرکرد, دەنگۆیەك هەبوو کە (ڕەزم ئارا)بە پشتیوانی (ئەمریکا) بووەتە سەرۆك وەزیران, لەوانەیە خودی (ڕەزم ئارا) و دەوروبەرکەشی بۆ بەهێز کردنی پێگەی خۆیان ئەم دەنگۆیەیان بلاو کردبێتەوە, بەلأم بەڵگەنامەکانی بەردەست دەربارەی مێژوی پەیوەندیەکانی ئێران وئەمریکا وەها بابەتێکی تێدا نیە, هەرچەندە ئەمریکیەکان پێشوازییان لە بوون بە سەرۆك وەزیرانی ئەو کرد و لە سەرەتادا گەشبین بوون بە تواناییەکانی ئەو بۆ ئەنجام دانی چاکسازی

[1] کاتم لە ژێر نوسی هەمان بابەت دا ناوی ئەو ئەندامەی باڵوێزخانەی ئەمریکای بە (جرالد دوهر) بردووە.

[2] Richard Cottam: Nationalism in Iran. Pittsburgh, Universty of Pittsburgh Press, 1979, P, 209.

و چارەسەر کردنی کێشەکانی ئێران, بەڵام ئەم گەشبینیە زۆری نەخایاند, لەبەر ئەوە (ڕەزم ئارا) ئەوەی نیشان دا کە نە سیاسەتمەدارێکی گونجاوە و نە دەشتوانێت متمانە و پشتیوانی بیری زۆری خەڵکی بەلای خۆیدا ڕابکێشێت, سەرباری لاوازی خودی (ڕەزم ئارا), باروودۆخی ئەمریکا و ئینگلیستانیش هاوکاری پێشکەوتنی کارەکانی ئەوی نەدەکرد و لە سەرو هەموشیانەوە دژایەتی دەرونی (شا) لە بەرامبەر ئەو دا ڕێگر بوو لە بەردەم سەرکەوتنی کارەکانیدا.., (شا) هەمو سەرۆك وەزیرە بەهێز و خاوەن کەسایەتیەکانی بە مەترسی دادەنا بۆ سەر پێگەی سیاسی خۆی و تەنانەت بە هەڕەشەشی دەزانین بۆ سەر تەخت و تاجەکەی.[1]

بەڵام تازەترین سەرچاوە لەو بارەیەوە کە پێدەچێت بڕواپێکراو ترینیشیان بێت, کتێبێکە کە لە ساڵی (١٩٨٤ز) لە لەندەن چاپکراوە و ناوی (امپراتوری بریتانیا در خاورمیانە)یە, لە بەشێکی دا بە نێونیشانی (بحران نفت در ایران/ قەیرانی نەوت لە ئێران) باس لەوە دەکات کە چۆن لەوکاتەدا ئینگلیزەکان فشاریان خستبوویە سەر (شا) بۆ دانانی سەرۆك وەزیرانێکی بەهێز, فشاری ئینگلیزەکان بۆ دانانی سەرۆك وەزرانێکی بەهێز لە ئێران دا دەست بەجێ دووای گەڕانەوەی (شا) لە سەفەری ئەمریکا دەست پێدەکات, ئەویش ئەو کاتانەیە کە (ساعد) دوای سەرنەکەوتنی لە تێپەڕاندنی پڕۆژە یاسای تایبەت بە پاشکۆی نەوت لە خولی پازدەی پەڕلەمان دا, سەرگەرمی کارەکانی هەڵبژاردنی خولی شازدەی پەڕلەمانە, چالاکی (د. موسەددەق) و هاوڕێکانیشی دووای پۆچەڵکردنەوەی دەورەی یەکەمی هەڵبژاردنەکانی تاران ئازاد کراوە, ئینگلیزەکانیش نیگەرانن لە نیەتی (شا) و ئازاد کردنی چالاکیەکانی (د. موسەددەق) وهاوڕێکانی,ئەم ڕاپۆرتەی (سرجان لورۆژتل/ Sir John Le Rougetel )ی باڵوێزی ئینگلیز لە تاران کە لە (٨ دی ١٣٢٨)هەتاوی دا بۆ وەزارەتی دەرەوەی وڵاتەکەی ناردووە شیاوی خوێندنەوەیە: ( من هەمو هەوڵێکی خۆمم دا بۆ ئەوەی کە ئەو (شا) بخەمە ژێر فشارەوە, وە پێم ڕاگەیاند کە بەهێزی پێگەی دەوڵەتێکی ڕاستەقینە بەندە بە بوونی سەرۆکێکی بەهێز و خاوەن کەسایەتی.., ئەو هێشتا پێچەوانەی ئەم بۆچونە هەنگاو هەڵدەگرێت, بەڵام بە ئاماژەدان بەو لافاوەی کە

[1] جنگ قدرتها در ایران, ص ٥٥-٦٥.

هەستاوە پێم ڕاگەیاند کە مەترسی دانانی سەرۆك وەزیرێکی بەهێز بۆ سەر ئەو بە پێوانە بەو مەتریسی یانەی کە دەوڵەتە لاوازەکان بۆ پێگەی ئەو دروستیان کردووە, هیچ نیە!..)[1]

** ** **

شا بە ڕواڵەت گرنگی بە ئامۆژگاریە (شیفا بەخشەکانی) باڵوێزی بەریتانیا نادات, (سرجان لوروژتل) دەگەڕێتەوە بۆ لەندەن و باڵوێزێکی نوێ بە پە یامێکی (boowin)ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیاوە دەگاتە تاران, باڵوێزە نوێیەکە کە ناوی (سر فرانسیس شفرد / Sir Francis Shepherd)ی هەیە و پەیامەکەی وەزیری دەرەوەش دیسانەوە پێداگری لەسەر هەڵبژاردنی سەرۆك وەزیرێکی دەکەنەوە بۆ کۆتایی هێنان کارەکانی نەوت, لە پەیامە نوسراوەکان دا ناوی (ڕەزم ئارا) نەهاتووە, بەڵام ئەو کەسەی جێگای متمانەی بەریتانیەکانە بۆ تێپەڕاندنی پەیمان نامەی پاشکۆیی تایبەت بە نەوت و سەرکوتکردنی نەیارەکان, جگە لە (ڕەزم ئارا) هیچ کەسی دیکە نیە!.

دەتوانین لەئەوەی پێشو وە سەرچاوەکانەی دیکەی وەك بەڵگەنامە نهێنیەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە لێرە توانای نوسینی هەمویان نیە, ئەوە هەڵدەهێنجرێت کە (شا) دووای گەڕانەوەی لەمریکا بە گومانی ئەوەی کە ئەمریکیەکان پشتگیری لەهەنگاوەکانی ئەو بۆ بەدەست هێنانی جیاوکی زیاتری نەوت لە بەریتانیەکان دەکەن, زەمینەی بۆ هەڵبژاردنی (د. موسەددەق) و هاوڕێ و هاوبیرانی ئەو سازاند تا ببنە ئەندامی خولی شازدەی پەرلەمان, بۆ ئەوەی سود لە کەمینەیەکی پڕ هات و هاوار وەربگرێت تا ئینگلیزەکان ڕازی ببن بە پێدانی مافێکی نوێ بە وڵاتی ئێران, ئینگلیزەکانیش کە لە بارەی ڕوداوەکانی ئێرانەوە نیگەرانن و دەکەونە فشار خستنە سەر (شا) بۆ پەسەند کردنی پرۆژە یاسای پەیمان نامەی نەوت, شا (عەلی مەنسور) کە ناسراوە بە لایەنگری بەریتانیەکان دەکاتە سەرۆك وەزیران و (عەلی مەنسور)یش لە پەرلەمان دا داوای پیاچونەوە و پەسەند کردنی پەیمان نامەی پاشکۆی نەوت دەکات, پەرلەمان بە پێشنیاری (د. موسەددەق)

---

[1] The British Empire in the Middle East. P, 633.

کۆمیسیۆنێکی تایبەت بۆ لێکۆڵینەوە لە پەیمان نامەی پاشکۆی نەوت دیاری دەکات و هەڵبژاردنی (د. موسەددەق) هەمو گومانەکان دەڕەوێنێتەوە کە پە پەیمان نامەی نەوت بە ئاسانی لە پەڕلەمان دا تێناپەڕێنرێت و پەسەند ناکرێت.

ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە کە تەنها فشاری بەریتانیا بۆ دانانی (ڕەزم ئارا) لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئێران دا کاری خۆی نەکرد, (شا) تا ئەو کاتەی ئومێدی بە پشتیوانی ئەمریکیەکان هەبوو خۆی لە بەرامبەر فشاری ئینگلیزەکان دا ڕاگرت, بەڵام لەم ماوەیەدا ئەمریکیەکانیش لە ژێر کاریگەری بەریتانیەکان دا, نیگەران بوون لە باری ڕەوتی ڕوداوەکانی ئێران و بە هات و هاواری بەریتانیەکان ئەمریکیەکانیش پەیوەست بوون بە داواکردنی پێکهێنانی دەوڵەتێکی بەهێز لە ئێران دا, (شا)یش لە ژێر فشارێکی زۆر دا ڕەزامەندی دەربڕی بە دانانی (ڕەزم ئارا ) وەك سەرۆك وەزیری ئێران, هەڵبەتە بە هەمان شێوەی کە (باری روبین)ی توێژەری ئەمریکی ئاماژە بۆ ڕاپۆرتە نهێنیەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا دەکات, ئەمریکیەکان هەر لە چەند مانگی یەکەمەوە لە دەوڵەتەکەی (ڕەزم ئارا) بێ هیوا دەبن, (هنری گریدی)باڵوێزی نوێی ئەمریکاش لە ئێران دا کە بۆچونێکی سازی لە بارەی ئینگلیزەکانەوە نیە, ڕۆڵێکی گرنگی گێرا لە گۆڕینی سیاسەتی ئەمریکیەکان لە ئێران دا.

دەوڵەتەکەی ڕەزم ئارا لە پەڕلەمان دا ڕوبەڕوی ناڕەزاییەکی توند بوویەوە, بەڵام ڕەزم ئارا بۆ یەکەم جار بە پۆشاکی مەدەنیەوە لە پەڕلەمان دا ئامادە بوو هیچ گوێی بە هاوارو ناڕازیەکانی (د. موسەددق و مەکی و بەقائی) و ئەوانی دیکەش, ئەندامانی کابینەکەی خۆی بە پەڕلەمان ناساند و ئەندمانی پەڕلەمانیش بە تەواوی ترسابوون, چەند ڕۆژێك دوواتر بەزۆرینەی دەنگەکان (٩٣ ڕازی, ١٤ ناڕازی) متمانەی پەڕلەمانی وەرگرت, (ڕەزم ئارا ) لە ئەنجومەنی (سەنا) دا ڕوبەڕی ناڕەزاییەکی زیاتر بوویەوە و سێ یەکی دەنگەکان لە دژی ئەو بوون, ڕەزم ئارا لە وەها ڕەوشێك دا بە هێزەوە کاری خۆی دەست پێکرد, لە دووەمین مانگی حکومەتەکەیدا بە بلاَو کردنەوەی لیستێکی ڕیزبەندی بە نێوی فەرمانبەرە ناباشەکان یان بێ دەسەلاَتەکان جەنجاڵیەکی گەورەی دروست کرد, لەم لیستەدا فەرمانبەرە پلەدارەکانی دەوڵەت, کە نێوی هەندێك لە پەڕلەمانتاران و سیناتۆرەکانیش کە پێشینەی کاری دەوڵەتی یان هەبوو تێدا بوو, ناوەکان دابەشکرابوون بۆ سێ دەستەی (ئەلف, با, جیم), دەستەی (ئەلف) بریتی

بوون لە کارمەندە باشەکان, دەستەی (با) کارمەندە ناوەندەکان بوون, دەستەی (جیم) کارمەندە گەندەڵ و خراپەکاەکانی لە خۆی دەگرت, کە پێدەچو لە بێژنگ بدرێن و لە کارەکانیان دوور بخرێنەوە, لەم دەستەیەدا کە بە (گروپی جیمیەکان) ناسرابوون ژمارەیەکی دیاری پەرلەمانتار و سیناتۆر و وەزیرەکانی پێشویشی تێدا دەبینرا, کە سەردار (فاخر حیکمەت)ی سەرۆکی پەرلەمانیش لە نێو ئەوانەدا بوو.

ئامانجی (ڕەزم ئارا) لە بڵاو کردنەوەی ئەو لیستە فەرمانبەرە گەندەڵانە و هەنگاو نان بۆ لە بێژنگ دانیان, ڕاکێشانی سۆزی گشتی بۆ لای خۆی و بەهێزکردنی پێگەی خۆی بوو بۆ ئەنجام دانی کارەکانی دوواتری, بەڵام ئەم کارەی کاریگەریەکی وەهای نەبوو بۆ ڕاکێشانی سۆزی گشتی بە لای خۆی دا, بە پێچەوانەشەوە کەسانێك کە پێشتر بۆچونی خراپیان لە بارەی ئەوە وە نەبوو چونە بەرەی دژەوە و بوونە دووژمنی, دەستەیەك لە پەرلەمانتاران بە پێشکەشکردنی پرۆژە یاسایەك بە پەرلەمان داوای هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری لە بێژنگ دانی کارمەندانی دەوڵەتیان دەکرد, ئەم پرۆژە یاسایەش لە پەرلەمان دا بە زۆرینەی دەنگ پەسەند کرا.

پەیوەندی (ڕەزم ئارا) لەگەڵ ئەمریکیەکان دا لە مانگەکانی سەرەتای حکومەتەکەیدا ڕوی لە ساردی کرد, (باری روبین) توێژەری ئەمریکیش هۆکاری ئەم گۆڕنکاریە بەم شێوەیە باس دەکات: (لە سەرەتای حکومەتەکەی (ڕەزم ئارا) دا, ئەمریکیەکان بە سەرنج دان بەو لێهاتوییەی کە لە بواری سەربازی دا نیشانی دەدا, ئومێدەوار بوون بە گۆڕانکاری ریشەیەی و بەرەو پیش بردنی ئێران, بەڵام ئەم ئومێدەواریە بە شێوەیەکی خێرا گۆڕا بۆ ڕەش بینی, (ڕەزم ئارا) بە پێچەوانەی ئەو بۆچونانەی کە پێشتر لە بارەیەوە هەبوو, دووای گەیشتن بە پۆستی سەرۆك وەزیری کەوتە بیری خۆ نزیك کردنەوە لە سۆڤیەت, بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئەوان (لەوانەشە ئینگلیزەکان)یش, سنوری بۆ سەفەری دیپلۆماتکار و فەرمانبەرە ئەمریکیەکان لە ئێران دا دانا, یەکێك لە هۆکارە سەرەکیەکانی ساردی پەیوەندیەکانی ئێران و ئەمریکا لەو کاتانەدا, خۆدزینەوەی ئەمریکا بوو لە پێدانی ئەو قەرز و هاوکاریەی کە ئێران داوای کردبوو, ئێران داوای قەرزێکی (٢٥٠ ملیۆن) دۆلاری لەمریکا دەکرد کە لەو ڕۆژانەدا بڕێکی ئێجگار زۆر بوو, ئەمریکیەکان ڕەزامەندی یان تەنها لەسەر قەرزێکی (٢٥ ملیۆن) دۆلاری دەربڕی و ئێرانیەکانیش بە تورەییەوە

خۆیان دەبووارد لە درێژەدان بە گفتوگۆکان, پێگەو ئابڕوی ئەمریکیەکان لە ئێران دا دابەزی و لە گفتوگۆی ئاهەنگەکانی ئێران دا کاتێك دەیان ویست ئاماژە بە (بەڵێنی درۆ) بکەن, زاراوە (بەڵێنی ئەمریکی) یان لە جێگەی ئەودا بەکار دەهێنا...!.

ڕەزم ئارا لە دەستپێکی کارەکەیدا پلانی زۆری لە سەردا بوو, یان هیچ نەبێت وتاری گوندانەی دەدا, ئەو جارێکیان بە دیبلۆماتکارە ئەمریکیەکانی وتبوو کە تەنها ڕێگە بۆ ئەنجام دانی چاکسازی کۆمەڵایەتی و جێبەجێکردنی بەرنامەی پێشکەوتنخوازی لە ئێران دا بەستنی دەرگای پەرلەمان و زیندانی کردنی پەرلەمانتاران و بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتە بە شێوەیەکی دیکتاتۆری, هەڵبەتە ئەم گوتنانە بۆ ئەمریکیەکان خۆشحاڵکەرانە نەبوو, وە ڕەنگدانەوەی ئەوە لە واشنگتۆن زیاتر بوویە هۆی بەدگومانی ئەمریکا دەربارەی بیر و ئامانجی ڕاستەقینەی ئەو, بە پشتگیری نەکردن و نەپاراستنی ئەمریکا و شا, ڕەزم ئارا چانسی زۆری بۆ سەرکەوتن نەبوو, بەلاّم گورزی کۆتایی کە لە حکومەتەکەی درا پرسی نەوت و سەرنەکەوتنی (ڕەزم ئارا) بوو لە چارەسەر کردنی ئەم پرسەدا,[1].

لە مانگی (میهر ی ١٣٢٩)هەتاوی دا دوکتۆر موسەددەق و هاوبیرانی بە هۆکاری کەمتەرخەمی لە دابینکردنی مافی گەلی ئێران لە پرسی نەوت دا, لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەوڵەتی (ڕەزم ئارا) دا کرد و لە سەرەتای مانگی (ئازار) دا کۆمیسیۆنی تایبەتی نەوت پەیمان نامەی پاشکۆیی نەوتی ناسراو بە پەیمان نامەی (گس _ گلشائیان) یان بە دابینکەری پێویستی مافی گەلی ئێران یان لە کۆمپانیای نەوت نەدەزانی, ڕاپۆرتی کۆمیسیۆنی نەوت ڕۆژی (٢٦ ئازەری ١٣٢٩) پێشکەشی پەرلەمان کرا, لە هەمان دانیشتن دا پرۆژە یاسایەك بە واژۆی (د. موسەددەق و ١٠ پەرلەمانتاری دیکە) لە بارەی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێرانەوە پێشکەشی پەرلەمان کرا.

ئینگلیزەکان (شا) یان بە هۆکاری سەرەکی شکستی (ڕەزم ئارا) دەزانی, ڕاپۆرتەکانی (سر فرانسیس شفرد)ی باڵوێزی ئەوکاتی ئینگلیز لە ئێران ئەم بەد گومانیەی بەباشی تێدا ڕەنگ دەداتەوە, ڕاپۆرتی نهێنی ڕۆژی (١٧ دیسامبەری ١٩٥٠ز , ٢٧ ئازەری ١٣٢٩ هەتاوی)ی باڵوێزی بەریتانیا کە بۆ (بووین)ی وەزیری

---

[1] جنگ قدرتها در ایران. ص٥٦_٥٧.

دەرەوەی ئەو وڵاتە نێردراوە ڕەخنە گەلێکی لە خودی (شا) تێدایە, لەم ڕاپۆرتەدا هاتووە:

*( شا کەسێکی لاوازە و بە گشتی دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئاخرین کەس کە دیداری لەگەڵ دەکات, ئەگەر خاوەن شکۆ لە ڕادەی خۆی زیاتر دەستی وەرنەدایەتە کاروباری دەوڵەت و لە باتی چارەسەر کردنی کێشەکانی خۆی بە سەرۆك وەزیرانی (ڕەزم ئارا), بە شێوەیەکی جودا و تایبەتی پەیوەندی لەگەڵ وەزیرەکانی دا نەکردبا, لەوە دەچو ئەم لاوازیە شاهانەیە دەرنەکەوتبا, ئەندامانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی بە شێوەیەکی نایاسایی و زۆر بێکەڵکانە و هەر لە خۆیانەوە دەست وەردەدەنە کارەکان.*

*خاڵێکی گرنگی دیکە نارەزایی پیاوانی ئاینی یە کە سەرجەم ئەندامان و زنجیرەی بنەماڵەی پەهلەوی دەگرێتەوە و بنەماڵەی سەڵتەنەتیش هیچ هەوڵێکی بۆ ئارام کردنەوەی ئەوانە نەداوە, ڕەوشی ژیانی ئەندامانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی کە هاوشێوەی شێوەی ژیانی ڕۆژئاوایە, بە شێوەیەکی سروشتی مایەی خۆشحاڵی توێژی پیاوانی ئاینی نیە)*[1].

باڵوێزی بەریتانیا لە ڕاپۆرتەکانی دوواتریشیدا وا دەردەکەوێت کە دژایەتیەکانی (ڕەزم ئارا) لە پەرلەمان دا لە لایەن دەربارەوە هاوکاری کراوە و جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە (د. موسەددەق) و دەستە بچوکەکەی بە تەنها نەیان دەتوانی وەها ڕەوشێکی دژکارانە لە پەرلەمان دا دروست بکەن, لەلایەکی دیکەوە (ڕەزم ئارا) بە شێوەیەکی نهێنی لەگەڵ بەریتانیەکان دا لە گفتوگۆی بەردەوام دایە, وە ڕازی یان دەکات کە بۆ ڕێگرتن لە خۆماڵیکردنی نەوت دەبێت ڕەزامەندی دەرببڕن لە سەر بنەمای ڕاستەقینەی دابەشکردنی داهات کە ناسراوە بە ( پەنجا بە پەنجا) و ئەمەش بنەمای کۆتا پەیمان نامەی نەوتیە لە نێوان (ئەمریکا و عەرەبستانی سعودی) دا. دەربارەی ڕەزامەندی کۆمپانیای نەوت بە یەکسانی دابەشکردنی داهات, کە لەوکاتەدا بە سەرکەوتنێکی گەورە هەژمار دەکرا, بەڵگەی باوەڕ پێکراو لە بەردەست دایە, لێرەدا ئاماژە بە هەندێك لایەنی دەکەین:

---

[1] The British Empire in the Middle East. P,637.

فواد ڕوحانی که لەوکاتانەدا لە ئەندامە پلەدارەکانی کۆمپانیای نەوتی (ئیران _ ئینگلیز) بووە بە وردی و ئاگای لە سەرجەم گفتوگۆکان بووە لە بارەی پرسی نەوتەوە, ددەنووسێت: ( لە (٢١ بەهمەن ) سپەهبەد ڕەزم ئارا بە نوێنەری کۆمپانیای لە تاران ڕاگەیاند, لەبەرئەوەی کە خەیاڵی خۆماڵیکردنی نەوت بە خێرایی بەرپەرچ دەدرێتەوە, هەر بۆیە پێویستە دەوڵەت هەنگاوێکی خێرا هەڵبگرێت و کارێکی دیکە بکات, تەنها ڕێگەی گەیشتن بەم ئامانجەش پێشنیار کردنی پەیمان نامەیەکی نوێیە لە سەر بنەمای (پەنجا بە پەنجا) بێت, نوێنەری گۆمپانیاش لە وەڵام دا ووتی: کۆمپانیا ئامادەیە ڕەزامەندی دەربپڕێت بە شێوەیەك لەسەر بنەمای پەیمان نامە نوێیەکەی عەرەبستانی سعودی, بە مەرجی ئەوەی کە چالاکیەکانی کۆمپانیا لە ئێران لە چالاکیەکای لە ولآتانی دیکە دا جودا بکرێتەوە,,, دوای ئەم گفتوگۆیە کۆمپانیا چەند جارێك بە زارەکی داوایان لە (ڕزم ئارا) کرد کە ئامادەی گفتوگۆ کردن بێت لە سەر بنەمای دابەشکردنی یەکسان, بەلآم بە هۆکار گەلێك کە ڕون نیە (ڕەزم ئارا) هەنگاوی بۆ دستپێکردنی گفتوگۆکان لە سەر ئەو بنەمایە هەڵنەدەگرت, تەنانەت ئامادە بوونی کۆمپانیایشی بۆ وەها دانوستانێك ئاشکرا نەدەکرد..)[1].

بەڵگەنامەیەکی دیکە کە ئامادە بوونی بەریتانیەکان بۆواژۆ کردنی پەیمان نامەیەکی نوێ لە سەر بنەمای دابەشکردنی یەکسان لەگەڵ دەوڵەتی (ڕەزم ئارا) دا دەسەلمێنێت, نامەیەکی نهێنی (سر فرانسیس شفرد) باڵوێزی ئەو کاتی بەریتانیایە لە ئێران کە بۆ (ڕەزم ئارا) ی ناردووە, کە لە ڕۆژی (٢٣ فەبریوەر ١٩٥١ز ,٤ ئەسفەند ١٣٢٩ هەتاوی) واتە دووازردە ڕۆژ بەر لە تیرۆر کردنی (ڕەزم ئارا) بۆی نوسراوە, لەو نامەیەدا دووای ئامارژەدان بەو کێشانەی کە هاتنە بەردەم پەسەند کردنی پەیمان نامەی پاشکۆی نەوت, وە بیر هێنانەوەی پێشنیاری قەرزدانی دەوڵەتی بەریتانیا بۆ چارەسەر کردنی کێشە داراییەکانی ولآتی ئێران, ددەنووسێت: ( سەرباری ئەوەی کە کۆمپانیای نەوت ئامادەیی خۆی بۆ بەستنی پەیمان نامەیەك لەسەر بنەمای دابەشکردنی یەکسانی داهات واتە (پەنجا بە پەنجا) هاوشێوەی ئەو پەیمان نامەیەی

---

[1] فواد ڕوحانی: تاریخ ملی شدن نفت ایران, شرکت سهامی کتابهای جیبی, چاپ اول, ١٣٥٢, ص ٨٩_٩٠.

که لەم دوواییانەدا لەگەڵ عەرەبستانی سعودیەدا بەستراوە, نیشان داوە, خەڵکی بە گشتی لە هیچ یەك لە هەنگاوەکان چ پەیوەست بە نەوت و چ پەیوەست بە پێدانی قەرز ئاگادار نەکراونەتەوە, ڕێگە بەوە دراوە کە ڕەوشێکی دووژمنکارانە لە شەقامی ئێرانی دا لە بەرامبەر کۆمپانیادا دروست ببێت, سەرەنجام دەولەتی بەریتانیاش هەستی پێ بکات, من بە هەست کردن بەوەی کە ڕەوشەکە قەیراناویە, بە نوسینی ئەم نامەیە دەست پێشخەری دەکەم بۆ ئەوەی وەبیر بێنمەوە کە تەنها هەنگاوی کاریگەر و بە هێز لەلایەن حکومەتەوە, ڕای گشتی لەم ڕەوشە قەیراناویە وریا بکاتەوە و کۆتایی بە ڕێگە چارەکان دێت..).

(مستەفا فاتیح)یش ئەندامی پەلەداری کۆمپانیا, کە لەو کاتانەدا جێگا باوەڕی تەواوی ئینگلیزەکان بووە, سەرباری ئاماژە دان بە نامەکەی سەرەوە, وەبیر هێنانەوەی ئامادەیی کۆمپانیای نەوت بە یەکسانی دابەشکردنی داهات بە وتەی (نور تکرافت)ی نوێنەری کۆمپانیا لە ئێران دا جەختی لە سەر دەکاتەوە و دەنووسێت: ( نورتکرافت دووای گەڕانەوەی لە لەندەن وتی کۆمپانیا ئامادەیی خۆی بۆ پەسەند کردنی یەکسانی دابەشکردنی داهات دەربڕیوە, بەلأم (ڕەزم ئارا) پێداگری لەوە دەکات کە ئەم بابەتە ئاشکرا نەبێت), دوواتر فاتیح دەنووسێت: (ئاگاداری و تێگەیشتنی من ئەوەیە کە (ڕەزم ئارا) خەیاڵی وا بوو لە کاتێکدا کە بۆچونی خۆی ڕەوشی سیاسی لەبارە, ئەم پێشنیارە نوێیەی کۆمپانیای نەوت بباتە پەڕلەمانەوە و ئەمەش بە دەستکەوتێك و سەرکەوتنێك بۆ دەوڵەتەکەی خۆی دابنێت, بەلأم ئەژمارەکەی هەڵە هاتە دەست و تەمەنی کۆتایی هات...!)[١].

حەمە ڕەزاشاش ئاگای لە پێشنیاری ئینگلیزەکان هەبوو بۆ بەستنی پەیمانێکی نوێ لە سەر بنەمانی (پەنجا بە پەنجا), لەم بارەیەشەوە بە نهێنی ڕاوێژی لەگەڵ (گلبنگیان)ی سەرمایەداری نەوت دا کردبوو[٢], کارێکی سروشتیە کە (شا) بەدگومان بێت لەوەی کە (ڕەزم ئارا) بابەتی پێشنیاری کۆمپانیای نەوتی بە نهێنی هێشتبوویەوە و ئاشکرا کردنی بە ستوەتەوە بە کاتێکی گونجاوە وە, پیاوەکانی

---

[1] مصطفی فاتح: پنجاه سال نفت ایران, چاپ اول,1335, ص ٤٠٧.

[2] Power Play – L. Mosley... P. 162.

(شا)یش لە دەوڵەت و لەشکریش دا هۆشداری یان پێدابوو لە بارەی گومانی بزوتنەوەیەکی سەربازی لەلایەن خودی ڕەزم ئارا وە, نوسەر دەرەنجامی توێژینەوەکەی خۆی دەربارەی ئەم ڕوداوە و نهێنیەکانی کوشتنی (ڕەزم ئارا) لە کتێبێکدابە ناونیشانی (بازی قدرت) بلأوکردووەتەوە, هێنانی چەند دێرێك بۆ کۆتایی هێنان بەم بابەتە بە پێویست دەزانم:

ئەو بزوتنەوەیەی کە بۆ خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران دەستی بەکار کردبوو, پیلانەکانی (ڕەزم ئارا)ی بۆ گەیشتن بە دەسەلأتی ڕەها کردە بڵقی سەر ئاو, تەنها چانسێك کە بۆی مابوویەوە ئەنجامدانی کودەتا و چارەسەر کردنی کێشەی نەوت بوو بە دڵی خۆی دووای ئەوەی کە دەستی بە دەسەلأت دەگات, (ڕەزم ئارا) دەیویست ڕەزامەندی کۆمپانیای نەوت بە دابەشکردنی یەکسانی داهاتی نەوتی ئێران کە بە بەراورد بە پەیمان نامەی ساڵی (١٩٣٣ز) نزیکەی سێ ئەوەندە زیادی کردبوو, دووای ئەنجام دانی کودەتاکەی ئاشکرای بکات, لەوانەشە بە هیوا بووبێت بە بەدەست هێنانی ڕەزامەندی بەریتانیا, پەیمان نامەیەکی نوێ بە پێدانی گرەنتی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی بەریتانیا, لە چوارچێوەی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران دا پیادەبکات.

چۆنیەتی ئامادەبوونی (ڕەزم ئارا) لە پرسەی (ئایەتوڵآ فەیض) دا لە (١٦ ئەسفەند ١٣٢٩) هەتاوی و کوشتنی بە دەستی (خەلیل تەهماسب)ی ئەندامی گروپی (فیدائیانی ئیسلام), یەکێکە لە مەتەڵۆکەکانی مێژوو, کە مەگەر تەنها بە سەرنجدان لە چۆنیەتی ئەنجامدانی کارەکە بۆچون و گومان دەرببڕدرێت, ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە لەو ڕۆژەدا (ڕەزم ئارا) بە نیازی ڕۆشتن بۆ ئەو پرسەیە نەبوو, شا ئەمیر ئەسەدوولأی عەلەمی (سەرۆك وەزیر و وەزیری دەرباری ئاییندە)ی ناردە لای سەرۆك وەزیران و ڕای سپارد کە بە نوێنەرایەتی ئەو بەشداری لەو پرسەیەدا بکات, ئەوەی کە (شا) بەشداری کردووە لە کوشتنی ڕەزم ئارا دا بە دەستی یەکێك لە ئەندامانی گروپی فیدائیانی ئیسلام, مایەی پەسەند کردن نیە, بەڵأم دەتوانرێت ئەوە بگوترێت کە سەرچاوە هەواڵگریەکانی (شا) ئەویان لەو پیلانە ئاگادار کردووەتەوە, لە هەندێك سەرچاوەشدا وەك (خاطرات سیاسی سرهنگ مصور رحمانی) دا هاتووە کە خودی

(شا) سەر دەستەیەکی لەشکری ڕاسپاردبوو بۆ کوشتنی ڕەزم ئارا, ئەو گوللەیەشی کە ڕەزم ئارا لە قاچی دەری هێنا لە چەکەکەی ئەوە وە قەقێنرابوو, ئەگین بە پشت بەستو بە نوسەری کتێبی ناوبراو, گوللەکەی (خەلیل تەهماسبی) برینێکی سەختی لە جەستەی ڕەزم ئارا دا دروست نەکردبوو!.

شا وا گومانی دەبرد کە بە کوشتنی (ڕەزم ئارا) چارەسەر کردنی کێشەی نەوت و زیاد بوونی داهاتی ئێران لە سەر بنەمای دابەشکردنی یەکسانی داهات دەبێت بە دەستکەوتێکی گرنگ بۆ خۆی, بەلأم ڕەوتی ڕوداوەکان زۆر لەوە خێراتر کە ئەو چاوەڕێی دەکرد دەچویە پێشەوە, ڕۆژی (١٧ ئەسفەند), واتە ڕۆژێك دووای کوشتنی ڕەزم ئارا) و پێش ئەوەی کە سەرۆك وەزیری نوێ هەڵبژێردرێت, لیژنەی نەوتی پەڕلەمان بە کۆی دەنگ بڕیاری لە سەر خۆماڵیکردنی نەوتی دا لە سەرانسەری ولأت دا, بۆ ئامادە کردنی پرۆژەیاسایەکی تایبەت بە جێبەجێکردنی ئەم بڕیارەش داوای دوو مانگ مۆڵەتی لە پەڕلەمان کرد, پەڕلەمان لە (٢٤ ئەسفەند و ئەنجومەنی سەناش لە ٢٩ ئەسفەند ١٣٢٩)هەتاوی دا دەگیان بۆ خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران دا, حکومەتی نوێش کە بە سەرۆکایەتی (حسەین عەلا) پێکهاتبوو, هیچ بووارێکی بۆ دانوستان لەگەڵ ئینگلیزەکان دا لە بارەی نەوتەوە لە بەر دەستدا نەبوو...)[1].

** ** **

لە ساڵی پڕ قەیرانی ١٣٢٩ هەتاوی دا ڕوداوێکی گرنگی دیکە لە ژیانی تایبەتی (شا) دا ڕوی دا, ئەویش ئەنجامدانی دووەمین هاوسەرگیری ئەو بوو لەگەڵ کچێکی خێڵی بەختیاری دا کە ناوی (سورەییا) بوو, ڕاڤەی ئەم عەشقبازی و هاوسەرگیریەو سەرئەنجامە تاڵەکەی بۆ خۆی بە شێکی جیاوازە, کە دووای باسکردنی ڕوداوەکانی پەیوەست بە حکومەتەکەی (د. موسەددەق) و خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران دێت.

---

[1] محمود طلوعی: بازی قدرت. چاپ دووم, نشر علم, ص ١٧٢ _ ١٧٤.

# محەمەدڕەزاشا و دوکتۆر موسەددەق

**پیلانێك کە بوویە بڵقی سەر ئاو، پیلانێکی نهێنی ئامێز لە هەڵبژاردنی دوکتۆر موسەددەق بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران، محەمەدڕەزاشا دان دەنێت بە دەسەلأت و خۆشەویستی دوکتۆر موسەددەق لە نێو خەڵکدا، دەستلەکار کێشانەوەی دوکتۆر موسەددەق و دوبارە گەڕانەی ئەو بۆ دەسەلأت، دوکتۆر موسەددەق شاژنی دایك و خوشك و براکانی محەمەدڕەزاشا لە ئێران دەردەکات، دوکتۆر موسەددەق چۆن چۆنی زەمینە سازی ڕوخانی حکومەتەکەی خۆی کرد؟.**

ڕەزم ئارا دەیویست نەورۆزی ساڵی (١٣٣٠ك.ھ) بە جێگیر کردنی ڕژێمێکی نوێ دەست پێبکات، ئەو مۆدێلی حکومڕانیەشی کە لە بیری دا بوو شتێکی هاوشێوەی ئیسپانیای (فرانکۆ) بوو، واتە دەیویست لە پۆستێکدا بە ناوی (پێشەوا) ، (نە شا و نە سەرۆك کۆمار)، لە ئێراندا دەسەلأت بگرێتە دەست و دیاری کردنی کاری کۆتایی ڕژێم دواتر تاوتوێ بکات، پلانی بنەڕەتی ئەو بۆ حوکمڕانی لە ئێراندا کە زەمینەی جێبەجێکردنەکەی لە بار بوو، گۆڕینی ئێران بوو بۆ حکومەتێکی فیدراڵی لە خۆ بەڕێوەبەرێتی ویلایەتەکان و گواستنەوەی پایتەخت لە شاری تارانەوە بۆ یەکێك لە شارەکانی باشوری ئێران[1] ، بەلأم بە یەك فیشەك هەمو ئەم بەرنامانە بوونە بڵقی سەر ئاو، ئێرانیش ساڵی (١٣٣٠) لە لوتکەی لوتبەرزی دا دستپێکرد.

---

[1] دەربارەی ئەم گەلأڵە نامەیەی ڕەزم ئارا بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی فیدراڵ لە ئێراندا، یەکێك لە هاوڕازەکانی ڕونکردنەوەیەکی دوورودرێژی لە کتێبێکدا بە ناوی (سراب زندگی) نوسیووە،

ئەو گۆڕانکاریەی لە ئێراندا ڕویدا ئینگلیزەکانی تووشی شۆك کرد و گێجی کردن, ئەو بەڵگانەی کە دوای تێپەڕ بوونی (٣٠) بەسەر خۆماڵیکردنی نەووتی ئێراندا بلاٌو بوونەوە, ئەوە نیشان دەدەن کە خودی ئینگلیزەکانیش ئاگایان لەم پلانەی (ڕەزم ئارا) بۆ ئەنجامدانی کودەتا لە شەوی نەورۆزی ساڵی (١٣٣٠ك,ھ)دا نەبووە, وە لەوەش کە (ڕەزم ئارا) پێشنیارە نوێ و سەخاوەتمەندانەکانی ئەوان بۆ چارەسەر کردنی پرسی نەوت و زیاد کردنی بەرھەمی ئێران بۆ سێ ئەوەندەی ڕابردو ئاشکرا ناکات, حەپەسابوون, (ڕەزم ئارا) وا بیری دەکردەوە کە نەك تەنھا ئینگلیزەکان بەڵکو ڕوسەکانیش پێشوازی لە کودەتاکەی ئەو دەکەن, لەبەر ئەوە پێشتر لە (باغ سبزی) بە مۆسکۆی نیشان دابوو, وە ڕزگار کردنی سەرانی حیزبی تودە لە زیندان دا بە یەکێك لە نیشانەکانی ئامادەیی ئەو بۆ سازش کردنی بۆ سۆڤیەتیەکان دەھاتە ھەژمار, لەگەڵ ئەوەی کە لەئەم کۆتاییانەدا پەیوەندیەکانی لەگەڵ ئەمریکیەکاندا بەرەو سارد بوونەوە چوبوو, دڵنیا بوو لەوەی کە ئەمریکیەکانیش پێشوازی لە حکومەتێکی نیزامی و بەھێز دەکەن لە جێگای حکومەتە لەرزۆکەکەی محەمەدڕەزاشا, وە ئەگەریش پێشوازی نەکەن ھەڵوێست و پەرچەکردارێکی خراپ و نابەجێیان نابێت.

بەلاٌم فیشەکێك ڕێڕەوی مێژوی ئێران و تەواوی ڕۆژھەلاٌتی ناوەڕاستی گۆڕی, لەبەر ئەوە سەرجەم ئەو ڕوداوانەی لە دەیەی ساڵانی (١٣٣٠) بەدواوە لە ئێران و ڕۆژھەلاٌتی ناوەڕاست ڕویاندا, وەك ھەڵویستی خۆماڵیکردنی نەووتی ئێران و حکومەتی دوکتۆر موسەددەق, دەرھاویشتەی ئەون, ناسیۆنالیستی ئێرانی بە پیلانێکی ھاوبەشی نێوان ئەمریکا و ئینگلیز بۆ سەرنگون کردنی دوکتۆر موسەددەق و جێگیر کردنی حکومەتی دیکتاتۆری شا, سەرکوت کرا, بەلاٌم کاریگەریەکانی ئەو لە سەرانسەری ناوچەکەدا ڕەنگی دایەوە, سەرنگونکردنی ڕژێمەسەڵتەنەتیەکان لە (میسر و عێراق) بە شەپۆلەکانی دواتر ئەو ڕوداوە دێنە ھەژمار, حکومەتی ڕەھایی شا چارەکە سەدەیەك بەردەوام بوو, بەلاٌم سەرەنجامی ئەو شۆڕشێك بوو کە چارەنوسی ئێران و ڕۆژھەلاٌتی ناوەڕاستی گۆڕی و دونیای لەگەڵ ڕوداوو ئایدۆلۆژیایەکی نوێ دا کە ( بوونیادگەری ئیسلامی) بوو, ڕووبەڕوو کردەوە.

ڕاڤەی بابەتەکانی پەیوەست بە دەورانی خۆماڵیکردنی نەوت و حکومەتی موسەددەق, خۆی بۆخۆی دەتوانێت کتێبێکی سەربەخۆبێت, کە بەشدار بووانی ئەم

ڕوداوه و لێکۆڵەران و نوسەرەبیانیەکان چەندین کتێبیان لەم بارەیەوه نوسیوه, له بەرئەوه ئێمه لێرەدا تەنها ئاماژه به گرنگترین ڕوداوەکانی ئەو سەردەمه دەکەین, لەکاتێکدا که به هەستیارترین و پڕ ڕوداوترین ماوەی سەڵتەنەتی محەمەدڕەزاشا له پێش شۆڕشی ئیسلامی ئێران دێته هەژمار, نوسەر پێشتر بەوردی له کتێبێکدا به ناوی (داستان انقلاب) باسی له ڕوداوەکانی ئەو سەردەمه کردوه, لێرەدا پوختەیەکی ئەو بابەته باس دەکەین بۆ ئەو خوێنەرانەی که دەستیان به کتێبی ناوبراو (داستان انقلاب) نەگەیشتوه, لەبەر ئەوه به بێ باسکردنی ئەم بابەته, بەشێکی زۆری نهێنیەکانی دەورانی سەرۆکایەتی دوکتۆر موسەددەق که پێشتر له هیچ سەرچاوەیەکدا باسی لێوه نەکرابوو به نەوتراوی مابوویەوه.

شایانی وەبیر هێنانەوەیە که کاتی دەنگدانی خۆماڵیکردنی نەووتی ئێران له پەرلەماندا, حکومەتی ئینگلیستان له دەستی (حیزبی کرێکاران) دا بوو, که خۆی ژمارەیەکی زۆری پیشەسازیەکانی له ئینگلیستاندا خۆماڵیکردبوو وه له دەستی کۆمپانیا تایبەتیەکانی دەرهێنابوو, لەگەڵ ئەوەی که دەوڵەتی کرێکارانی بەریتانیا هەر له سەرەتاوه کەوته دژایەتی کردنی پەسەند کردنی خۆماڵیکردنی نەووتی ئێرانی له پەرلەمانی ئێراندا و ئەم بڕیارەی به نایاسایی و هەڵوەشاوه دادەنا, کۆمپانیای نەووتی (ئێران–ئینگلیز) بۆ ڕاکێشانی ڕەزامەندی دەوڵەتی نوێی ئێران ڕێکەوتنێکی نوێی لەگەڵ ئێراندا واژۆ کرد که پەیوەست بوو به دەستکەووتی نیوه به نیوەی نەوت, یان لەسەر بنەمای (پەنجا به پەنجا) که له کۆتاییەکانی حکومەتەکەی (ڕەزم ئارا)دا پێشنیارکرابوو, دیار خرا, له بەرواری (٢٥ ئەپرێلی ١٩٥٢ز , ٥ ئۆردیبەهەشتی ١٣٣٠ك.ه) پێشنیارێکی سێ مادەیی نوێی دایه حکومەتەکەی (عەلا) که ناوەڕۆکەکەی بنەمای نیوەبه نیوه بوو, لەگەڵ پێدانی بەشێکی کارەکانی کۆمپانیا به ئێرانیەکان و ئەندام بوونی بەڕێوەبەره ئێرانیەکان له دەستەی بەڕیوەبردنی کۆمپانیای نەوت دا, لەگەڵ ئەوەی که ئەمه جیاوکێکی نوێ بوو بۆ ئێرانیەکان بەلاَم پێچەوانەی بنەمای خۆماڵیکردنی نەوت بوو, لەبەر ئەوه گرنگی پێنەدرا و به پێداگری دوکتۆر موسەددەق کۆمیسیۆنی نەوت سەرلەبەیانی هەمان ڕۆژی (٦ ئۆردیبەهەشتی ١٣٣٠ك.ه) پرۆژەیاسای خۆماڵیکردنی نەووتی به زۆرینەی دەنگ پەسەند کرد, که له (٩) ماده پێکهاتبوو:

-بە پێی مادەی یەك: لیژنەیەکی هاوبەش لە نوێنەرانی هەردو مەجلیس و وەزیری دارایی بۆ چاودێری کردنی جێبەجێکردنی یاساکە پێکهێنرا.

-بە پێی مادەی دووەم: دەوڵەت ڕاسپێررا کە بە چاودێری لیژنە هاوبەشەکە دەستی دەوڵەتی (بەریتانیا) داماڵێت لە کۆمپانیای (پێشو)ی نەوتی ئێران-ئینگلیز.

-بەپێی مادەی سێیەم: دەوڵەت ڕادەسپێردرێت (ناچار دەکرێت) لێکۆڵینەوە لە داخوازیە ڕەواکانی دەوڵەت و داخوازیە ڕەواکانی کۆمپانیاکە بکات و ئەنجامەکەی بەڕاپۆرتێك بدات بە پەرلەمان.

-بە پێی مادەی چوارەم: ئەوەی ڕونکردوەتەوە کە لە بەرئەوەی لە بەرواری (٢٩ ئەسفەندی ١٣٢٩ك.ھ)ەوە ئەنجومەنی (سەنا)ش خۆماڵیکردنی نەوتی پەسەند کردوە، سەرجەم داهاتی نەوت و پێکهاتە نەوتیەکان مافی ڕەوای گەلی ئێرانن، دەوڵەت ناچارە بە چاودێری لیژنە هاوبەشەکە بەدواداچون بۆ حیسابەکانی کۆمپانیا بکات و دەبێت لیژنە هاوبەشەکەش بە وردی لە بەرواری جێبەجێکردنی ئەم یاسایەوە هەتا دیاریکردنی دەستەی کرێکاران وکردنەوەی چاودێری بکات.

-بەپێی مادەی حەوتەم: چۆنیەتی فرۆشتنی بەرهەمە نەوتیەکانیش بەم شێوەیە پیشبینی کرابوو ( سەرجەم کڕیارانی بەرهەمە کانزاییەکان لە کۆمپانیای پێشوی نەوتی (ئێران-ئینگلیز)، هەر بڕە نەوتێکیان کە لە سەرەتای ساڵی مەسیحی ١٩٤٨ ەو تا بەرواری (٢٩ ئەسفەندی ١٣٢٩ك.ھ ,٢٠ مارس ١٩٥٢ز) ساڵانە لەو کۆمپانیایەیان کڕیوە، لە ئێستە بە دواوە دەتوانن بە نرخی دادپەروەرانەی نێو دەوڵەتی ساڵانە هەمان بڕ بکڕن، وە بۆ زیاد کردنی ئەو بڕەش بە شێوەی ڕێکەوتنی مەرجەکان لە کڕیندا مافی پێشکەوتنیان هەیە).

ڕۆژێك دوای پەسەند کردنی گەلاڵەنامەی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران کە ناوەڕۆکەکەی داماڵینی دەستوەردان بوو لە کۆمپانیاینەوتی (ئێران-ئینگلیز)، باڵوێزی ئینگلیز لە دوتوێی نامەیەکی دا بۆ سەرۆك وەزیران ڕەخنەی لەو بڕیارە گرت و ڕایگەیاند کە ئێران بە پێی بەڵێنی خۆی لە پەیماننامەی ساڵی (١٩٣٣ز) دا مافی خۆماڵیکردنی نەوتی نیە، هەروەها باڵوێزی ئینگلیز لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنوسی دا لە تاران، بە ئاوازێکی هەڕەشە ئامێزەوە پەرلەمانتارانی ئێرانی لە پەسەند کردنی پرۆژە یاسای پەیوەست بە چۆنیەتی جێبەجێکردنی یاسای خۆماڵیکردنی نەوت

ئاگادار کردەوە, داوای لە سەرۆك وەزیران (حسەین عەلا) کرد کە پەرلەمانتاران لە سەرەنجامی دژواری پەسەند کردنی ئەو پرۆژە یاسایە ئاگادار بکاتەوە, لەلایەکی دیکەشەوە باڵویزی ئینگلیز فشاریکی توندی خستبوویە سەر (شا) بۆ لەکار خستنی (حسەین عەلا) و دانانی (سەید زیائەدین تەباتەبایی) لە پۆستی سەرۆك وەزیردا, لە بەرئەوەی لە ماوەی مانگو نیویکی سەرۆك وەزیرانی (حسەین عەلا) دا ئینگلیزەکان لەوە تێگەیشتبوون کە ئەو پیاوی ململانیّ لەگەڵ دوکتۆر موسەددەق و ئەو لافاوەی کە هەستابوو, نیە, بە بۆچونی ئەوان تەنها کەسێك کە لەو بارودۆخەدا دەتوانێت لە بەرامبەر ئەو لافاوەدا ڕاوەستابا, (سەیدزیائەدین) بوو.

حسەین عەلا ڕۆژی هەینی (٧ ئۆردیبەهەشتی ١٣٢٩ك,ه) لە سەر داواکاری (شا), کە خۆیشی لەلایەن ئینگلیزەکانەوە فشاری خرابوویە سەر, دەستی لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی کێشایەوە, (سەید زیائەدین)یش بەیانی ڕۆژی شەممە (٨ی ئۆردیبەهەشت) بۆ گفتوگۆ دەربارەی پێکهێنانی کابینەی حکومەتی داهاتو سەردانی کۆشکی سەڵتەنەتی کرد, لە هەمان ڕۆژدا پەرلەمانیش بۆ دەنگدان بە سەرۆك وەزیری داهاتو بانگهێشتی پەرلەمان کرابوون, لەبەر ئەوە لەو کاتەدا نەریت وابوو کە بەر لە دەرکردنی فەرمانی سەرۆك وەزیرانی, لە پەرلەماندا ڕاوێژو گفتوگۆ ئەنجام دەدرا و زۆرینەی پەرلەمانتاران دەنگیان بۆ هەرکەسێك بدابا, دواتر فەرمانی سەرۆك وەزیرانی بەو ناوەوە دەردەکرا, لەم قۆناغە هەستیار و قەیراناویەدا (شا) وەك کارەکتەرێکی پرکەین و زیرەکانە ڕۆڵی بینی و بە دواخستن و هێشتنەوەی (سەیدزیائەدین) لە کۆشکی سەڵتەنەتیدا, بەهۆی نۆکەرانی خۆیەوە لە پەرلەماندا زەمینەی دەنگدانیان بۆ سەرۆك وەزیرانی (دوکتۆر موسەددەق) فەراهەم هێنا و ئینگلیزەکانی ڕووبەڕووی کارێکی ئەنجام دراو کردەوە, بەڵام بەر لەوەی کە ئاماژە بە هۆکارەکانی ئەم کارەی (شا) و نهێنیەك (ڕازێك) کەپێدەچێت ئەمە یەکەمین جار بێت پەردەی لەسەر لا دەرێت بکەم, خراپ نیە چۆنیەتی هەڵبژاردنی (دوکتۆر موسەددەق) بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی لە زمانی خودی خۆیەوە ببیستین:

(( ڕۆژی سێشەممە (٨ ئۆردیبەهەشتی ١٣٣ك,ه) کە ڕۆژی دانیشتنی پەرلەمان نەبوو, بانگ کرام بۆ پەرلەمان, زۆربەی ئەندامانیش ئامادە بوون و دەیانویست لە دانیشتنێکی تایبەتیدا ڕاوێژ بکەن و ئارەزومەندی خۆیان بۆ دیاریکردنی سەرۆك

وەزیران بگەیەنن خزمەتی (شا)، ئەوەی کە دەوترا جەنابی (حسەین عەلا) دەستی لەکار کێشاوەتەوە سەرم سوڕما ,چونکە شەوی (٦ ئۆردیبەهەشت) هاتبوو بۆ ماڵی من و دەیویست دەربارەی بابەتێك لەگەڵ مندا ڕاوێژ بکات, لەم بارەیەوە هیچی نەوت, بەو پێیەی کە بەر لەم دیدارە من لە لیژنەی نەووتی پەرلەماندا بووم, کە پرۆژە یاسا (٩) مادەییەکەی زۆرێك لە پەرلەمانتاران بۆ خۆماڵیکردنی نەوت لە لیژنەکەدا دەنگی لەسەر درابووو, سەرۆك وەزیرانم لەو ڕوداوە ئاگادار کردەوە و داوام لێکرد کە ڕۆژی یەك شەممە (٩ ئۆردیبەهەشت) لە دانیشتنی فەرمی پەرلەماندا ئامادەبێت و ڕەزامەندی حکومەت لە مەڕ پرۆژە یاسای ناوبراو ڕابگەیەنێت, دواتر لە هەمان دانیشتن دا لە بارەی ئەو بابەتەی کە دەیویست ڕاوێژ بکات کەوتینە گفتوگۆ و کە لەسەری ڕێکەوتین لە ماڵی من ڕۆیشتن.

هۆکاری دەستلەکارکێشانەوەی سەرۆك وەزیرانم لە هەندێك لە پەرلەمانتاران پرسی, یەکێك لە دۆستان ووتی: بەڕێزان, کە مەبەستی ئینگلیزەکان بووو, وا بیریان کردۆتەوە کە کارێك لەئەم سەرۆك وەزیرانە و ئەمسالی ئەو بە دەست نایەت, دەیانەوێت جەنابی (سەید زیائەدین تەباتەبایی) کە ئێستا هاتوەتە خزمەتی (شا) و بە چاوەڕوانی بەدەست هێنانی دەنگی پەرلەمان لەوێ دانیشتوە, بخەنە سەرکار, دانیشتن دەستی پێکرد, گفتوکۆ دەستی پێکرد, لەبەر ئەوەی زۆرینەی پەرلەمانتاران وای بۆ دەچون کە ڕاسپاردنی (سەید زیائەدین) بۆەتە هۆکارێك کە هەمان کەین و بەینی کودەتای ساڵی (١٢٩٩ك,ه) دوبارە بووەتەوە, نە زاتی ئەوەیان دەکرد ناوی کەسێکی دیکە ببەن بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە و نە پێویستیەکانی ڕۆژگاریش مۆڵەتی دەدا کە دەنگ بە کاندیدەکانی سیاسەتی بێگانەکان بدەن, لەبەر ئەوەی قسەکان تێکگیران و گفتوگۆکە درێژەی کێشا, بۆ خێراکردنی کار و کۆتایی هێنان بە گفتوگۆکان, یەکێك لە پەرلەمانتارەکان کە چەند ڕۆژێك بەر لە کوشتنی (ڕەزم ئارا)ی سەرۆك وەزیر هاتبوو بۆ ماڵی من, لەلایەن (شا)وە منی بۆ ئەم ڕاسپاردەیە بانگهێشت کردبوو وە هەرگیز باوەڕی نەدەکرد کە بۆ وەرگرتنی ئەو کارە ڕازی ببم, ناوی منی برد و منیش دەست بەجێ ڕەزامەندیم دەربڕی و ئەم پێشهاتەش بوویە هۆی ئەوەی کە پەرلەمانتاران لەو ئاستە بێنە دەرەوە و هەمو پێکەوە چەپڵە لێبدن و پیرۆزبایی لە من بکەن.

ڕازی بوونی منیش لەبەر ئەوە بوو کە پێشنیاری پەڕلەمانتاران پەیوەست بە خۆماڵیکردنی نەوت لە نێو نەچێت و لە پەڕلەماندا دەنگی لەسەر بدرێت, لەبەر ئەوەی ئەگەر (سەیدزیائەدین) ببوایە بە سەرۆك وەزیران, ئیدی پەڕلەمانێکی نەدەهێشتەوە تا من بتوانم پێوشوێنی ئەم بابەتە بگرم, منیشی لەگەڵ چەندان کەسی دیکەدا دەستگیر دەکرد یان دوری دەخستینەوە, بە کورتی بە تەواوی مەملەکەتی پاوان دەکرد تا لە هیچ شوێنێکەوە هیچکەس دەنگی بەرز نەبێتەوە و ئەو کاری خۆی تەواو بکات, ئەگەر کەسێکی دیکەش ئەم پۆستەی پێ بسپێردرایە دیسان من نەمدەتوانی پیشەسازی نەوت چارەسەر بکەم, مەگەر من لە خولی چواردەی پەڕلەماندا دەنگی یەکەمینی تارانم بەدەست نەهێنا, وتارێکم ئامادە نەکردبوو تا ئەو کاتەی کە ڕەوشەکە مۆڵەت دەدات و ئەو لە دانیشتنێکی ئاسایی پەڕلەماندا بخوێنمەوە و کۆمەڵگە ئاگادار بکەمەوە لە زیانەکانی ڕیکەوتن نامەی (ڕەزاشاهی), کە ڕەوشی پەڕلەمان مۆڵەتی نەدا بچوکترین قسانێك لەو بارەیەوە بکەم, چونکە پەرلەمانتارانی ئەو خولە جگە لە چەند کەسێکیان نەبێت سەرجەمی ئەوانی دیکە بە دەست لە پشت دانی سیاسەتی بێگانەکان هاتبوونە پەڕلەمان و هیچکامیان ئامادە نەبوون لە بارەی ئەو ڕێکەوتن نامەیەوە وشەیەك بدرکێنن و بۆچونێك دەر ببڕن, کاتێك کە (کافتارزادە) لەلایەن سۆڤیەتەوە هات بۆ تاران و زۆربەی پەڕلەمانتارانیش ئامادەی ئەوە نەبوون کە ناڕەزایی لە بەرامبەر داواکاریەکانی ئەودا دەر ببڕن, یەکێك لە پەڕلەمانتاران داوای لە من کە لە کەمینە بووم کرد کە لەم بارەیەوە بۆچونی خۆم دەر ببڕم, ئەوە بوو کە سودم لەو هەلە وەرگرت و سەرەتا باسێکم لە زیانەکانی کرد و بە بەڵگەو ژمارە ئەوەم سەلماند, کە پەڕلەمان بەوپەڕی ناچاریەوە ئارامی گرت, دواتر لەبەر ڕۆشنایی هەمان ئەو بەڵگانەدا دژایەتی پێدانی جیاوکی نەوتم کرد ئەگەر بە هەر وڵاتێك بدرێت, ئەگەر (کافتارزادە) سەرکەوتو ببوایە لە وەرگرتنی ئەو جیاوکەدا, گەلی ئێران هەرگیز نەیدەتوانی بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم جیاوکە کە لە باکور و باشوردا درابوو بچوکترین هەنگاو هەڵبهێنێت و لە دو سەنگەرەوە ململانێ لەگەڵ دو سیاسەت دا بکات, سەلماندنی زیانەکانی پێدانی ئەم جیاوکە بەجۆرێك کاردانەوەی لە کۆمەڵگە دا هەبوو کە زەمینەی بۆ خۆماڵیکردنی نەوت سازکرد و ئەم کارەش لە خولی شازدەی پەڕلەماندا ئەنجام درا, هۆکاری کاریگەری منیش لەو پۆستەدا ئەوە بوو کە لە

هیچکەس و هیچ خاوەن پۆستێك كارم وەرنەگرتوه و تەنها بەوتنی (ڕازیم) و پیرۆزبایکردنی پەرلەمانتاران بوومەتە سەرۆك وەزیر.

بەرەچاوکردنی ئەوەی کە دەنگدان بەو شێوەیە پێشینەی نەبوو, بە پێی پێشنیارێکی خۆم دانیشتنی فەرمی پەرلەمان بەبێ سەیرکەر ئەنجام درا و پەرلەمانتاران بە شێوەیەکی نهێنی لە سەر وەرەقە دەنگی خۆیانیان دا, لەگەڵ ئەوەی کە زیاتر لە (٢٠) کەس لەو کەسانەی کە چەپڵەیان لێدابوو دەنگیان بە من نەدا و وەرەقەکەیان بە سپیەتی گەڕاندبوویەوە, دیسان هەر دەنگی زۆرینەم بەدەست هێنا, خاوەن شکۆ شاهنشا یش بە پێی بۆچونی خۆم خۆی بووارد لە دەرکردنی فەرمانی سەرۆك وەزیرانی تا یاسای خۆماڵیکردنی نەوت لە پەرلەماندا پەسەند کرا, ئەگەر لە پێش دەنگدان فەرمانەکە دەرکرابووایە و دەوڵەت پێکبهاتایە, ئەو دەستەیەی پەرلەمانتارانی دژ ئەوەندە قسەیان لە لێنەهاتووی هەندێك لە وەزیرەکان دەکرد تا من نا ئومید ببم و برۆمە کەنارەوە, دیسان لە ڕوی بەرگریکردنیشەوە بەرامبەر بە گەلاڵەنامەی پەرلەمانتاران لەبارەی خۆماڵیکردنی نەوتەوە ئەوەندە قسەیان دەکرد دژایەتی خۆیانیان نیشان دەدا کە بابەتەکە بە تەواوی نەرێ بکریت و هەر لەسەر وەرەقە شکست بێنێت))[1].

بەکەمێك سەرنجدان لەم نوسینەی دوکتۆر موسەددەق چەند خاڵێکی گرنگ ڕون دەبێتەوە:

١- چەند ڕۆژێك بەر لە کوشتنی (ڕەزم ئارا), (شا) پێشنیاری سەرۆك وەزیرانی داوە بە (دوکتۆرموسەددەق), سەرباری ئەوەش ئارەزومەندی ئەو بۆ سەرۆك وەزیرانی (دوکتۆر موسەددەق) دەخاتە ڕوو, ئەم بڕیارەی (شا) ئاماژە بە کەنارخستن یان لەناوبردنی (ڕەزم ئارا) دەکات.

٢- ئەو کەسەی کە لەلایەن (شا)وە پێشنیاری سەرۆك وەزیرانی بۆ (دوکتۆر موسەددەق) کردوە هەمان ئەو کەسە بووە کە لە پەرلەماندا ئەوی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی پێشنیار کردوە, بەدان پێدانانی ئەم بابەتە لەلایەن (دوکتۆر موسەددەق)ەوە, ڕونکردنەوەی ئەو ڕوداوەیە کە (جەمال ئیمامی) بە شێوەیەکی

---

[1] دکتر محمد مصدق: خاطرات و تالمات مصدق, انتشارات علمی, چاپ اول, ص١٧٧-١٧٩.

ڕێکەوت یان بەو بۆچونەی کە (دوکتۆر موسەددەق) خۆی دەبووێرێت لە وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران، ئەم پێشنیارەی نەکردوە و بە ئامادەسازی سەرەتایی پێشوتر و بۆ جێبەجێکردنی بۆچونی (شا) ئەم پێشنیارەی کردوە.

٣- دوکتۆر موسەددەق بە دڵنیابوون لە پشتگیریکردنی (شا) بۆ سەرۆك وەزیرانی ئەو، داوای بەستنی دانیشتنی فەرمی دەنگدانی نهێنی بۆ سەرۆك وەزیرانی خۆی کردوە و زۆربەی ئەو پەرلەمانتارانەشی کە گوێڕایەڵی دەربار بووون دەنگیان داوە بۆ سەرۆك وەزیرانی ئەو، (شا) ڕازی بە سەرۆك وەزیرانی (دوکتۆرموسەددەق) نەبووبا و ئارەزومەندی ئەو بۆ دەنگدان بە سودی (دوکتۆرموسەددەق) بە پەرلەمانتاران ڕانەگەیەندرایە، بەدەست هێنانی نزیکەی (٨٠٪)ی دەنگی پەرلەمانتاران بۆ سەرۆکایەتی ئەو شتێکی مەحاڵ بوو.

ئێستا دەگونجێت ئەم پرسیارە بکرێت کە بۆچی (شا) یان (دوکتۆر موسەددەق) لە کاتەکانی دواتردا لەو هەلە گونجاوانەی کە بۆیان دەڕەخسا ئەم بابەتەیان ئاشکرا نەکردوە، وە یان (جەمال ئیمامی) کە لەو نێوەندەدا ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە قسەیەکی دەربارەی هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو پێشنیارەی کە کردی بۆ (دوکتۆر موسەددەق) بۆ پۆستی سەرۆك وەزیری نەکردوە، بەبۆچونی نوسەر وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە کە:

یەکەم: (شا) لە تەواوی ماوەی سەڵتەنەتی خۆیدا هەراسان بوو لە دوژمنایەتیکردنی ئینگلیزەکان لەگەڵیدا، هەرگیز نەیدەویست دان بنێت بە ڕۆڵی خۆیدا لە هێنانە سەرکاری (دوکتۆرموسەددەق) و ئەو کێشانەی کە دواتر ئەو بۆ ئینگلیزەکانی دروستکرد، بە پێچەوانەشەوە بەو هێرش و ڕەخنە توندانەی کە دوای کەنار خستنی (دوکتۆرموسەددەق) لەوی دەگرت، هەوڵی دەدا کە ئەم خاڵە لاوازەی خۆی لە ئینگلیزەکان بشارێتەوە.

دووەم: خودی (دوکتۆر موسەددەق) کە ماوەیەکی کەم دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری لەگەڵ (شا) دا تێکچو، هەرگیز نەیدەویست سەرۆك وەزیرانەکەی خۆی بە قەرزداری (شا) بزانێت و دواتر تاوانبار بکرێت بە کەسێکی سپڵە.

بەڵام لە بارەی (جەمال ئیمامی)ەوە دەبێت ئەوە بووترێت کە ئەویش بە ویستی (شا) هەرگیز پەردەی لەسەر ئەم ڕازە هەڵنەداوەتەوە و بۆ سوپاسگوزاری ڕازداریەکەشی گەیشتوە بە پۆستی باڵوێز، بەڵام دەبێت ئەوەش بووترێت کە ئەم ڕازە

ئەگەر لای میللەتی ئێران بە شاراوەیی مایەوە, لای ئینگلیزەکان شاراوە نەبوو, وە لاپەڕەیەکی خراپی دیکەی لە سەر پەروەندەکەی (شا) لە وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیز و دەزگای سیخوڕی ئەو وڵاتەدا زیاد کرد.

بەڵام ئەوەی کە بۆچی (شا) لەو ڕەوشەدا دژایەتی سەرۆك وەزیرانی (سەیدزیائەدین تەباتەبایی) دەکرد و هانی (دوکتۆر موسەددەق)ی دەدا بەسەر ئەودا, وەڵامی ئەم پرسیارە ڕونە: (شا) لەگەڵ ئەو ترسەی کە لە ئینگلیزەکانی هەیبوو, وە زیائەدینیش بەو پشتیوانیەی کە لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لێی دەکرا, بە مەترسیەکی گەورەتر و بەگوڕتری لە (موسەددەق) بۆ سەر خۆی دەزانی, وە لەوە دەترسا کە (سەید) دوای بەدەستەوە گرتنی دەسەڵات, هەمان ئەو شێوەیەی کە (دوکتۆر موسەددەق)یش ئامارەی بۆ کردوە, پەرلەمان دابخات و نەیارەکانیشی فڕێ بداتە زیندانەوە و دەسەڵات پەیدا بکات و سەرەنجام تۆڵەی باوکی لەو بکاتەوە, (شا) تا ئەو کاتەی کە (سەید زیائەدین) لە ژیاندا بوو حسابی بۆ دەکرد و لە دیداری هەفتانەی خۆیدا کە لەگەڵ ئەودا هەیبوو, وای نیشان دەدا کە گرنگی بە ئامۆژگاری و ڕاسپاردەکانی ئەو دەدات, تائەوەی دوای مردنی (سەید) زاتی ئەوەی پەیدا کرد کە ڕەخنەی لێبگرێت, لەوانەش لە کۆمەڵە چاوپێکەوتنێکی خۆیدا لەگەڵ (کارانجیا)ی ڕۆژنامە نوسی هیندی دا, (سەید زیائەدین)ی بە بڕبڕەی پشتی سیاسەتەکانی ئینگلیز لە ئێراندا ناساندووە[1].

شا لەگەڵ ئەو ڕق و مەترسیەی کە لە ئینگلیزەکان هەیبوو, لە دەستپێکی حکومەتەکەی (موسەددەق)دا, لەوانەشە ڕاستگۆیانە و بێ مەرام بووبێت, پشتگیری ئەوی دەکرد و وا گومانی دەبرد کە دەتوانێت بە دەستی ئەو ڕیشەی دەسەڵاتی ئینگلیزەکان لە ئێراندا لە بێخەوە دەر بهێنێت, وە یا هیچ نەبێت بە شیوەیەکپێگەکەیان لاواز بکات کە ئیدی هیچ مەترسیەك بۆسەڵتەنەتەکەی ئەو دروست نەکەن, هەڵبەتە (دوکتۆر موسەددەق) تا ئەو کاتەی کە لە پشتگیریەکانی (شا) بەهرەمەند بوو, بە مەترسی بۆ خۆی (شا) نەدەهاتە هەژمار, ئەم سەردەمە (تەبابوون) زیاتر لە ساڵێك درێژەی نەکێشا, خودی (شا) دەربارەی پەیوەندیەکانی

---

[1] The Mind of a Monarch. P 36.

خۆی لەگەڵ (موسەددەق)دا لە سەرەتاکانی سەرۆك وەزیرانی (موسەددەق) دا دەنووسێت:

( کاتێك کە (موسەددەق)م کرد بە سەرۆك وەزیران, هیچ کەس نەبوو کە بتوانێت لە بەرامبەری ئەودا بووەستایە و ڕکابەری لەگەڵدا بکردایە بۆ وەرگرتنی ئەو پۆستە, ئیدی ئێستا هەلێکی گەورە بۆ (موسەددەق) ڕەخسابوو, زیاتر لەوەی کە گومانی دەکرد بە خەیاڵ و ئارەزو ئاواتەکانی خۆی گەیشتوە و بە خەیاڵەئومێد بەخشەکانی خۆی و هاوکارەکانی بەختەوەر بووە, ماوەی نزیکەی دو ساڵی لە بەردەم دا بوو وە دەیتوانی بە ڕادەی پێویست لەم هەلەی بۆی ڕەخسابوو سود وەربگرێت لە پارێزگاری و پشتیوانی من, لەگەڵ ئەوەی کە وەها پشتیوانیەك بۆ من خەم هێنەر بوو, بەهرەمەند ببێت)[1].

حەمە ڕەزاشا دواتر باس لە هۆکارەکانی پەشیمان (خەفەتباری) خۆی دەکات لە پشتیوانیکردنی (دوکتۆر موسەددەق)دا, وە بیری ڕقناوی ئەو و هەنگاوە ناشی و سەربەخۆکانی (موسەددق) بە هۆکاری دروست بوونی ناکۆکی نێوان خۆی و ئەو دەزانێت, لەگەڵ ئەوەی کە (شا) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە دوکتۆر (موسەددەق) لە ڕوداوی دەست داماڵین (دەست وەرنەدان) لە کۆمپانیای پێشوی نەوتی (ئێران-ئینگلین) و ڕووبەڕوو بوونەوەی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی دا, لە پشتیوانی (شا) بەهرەمەند بووە, دوای ئاماژەدان بەو بابەتە کەکاتێك (دوکتۆر موسەددەق) بۆ پێوشوێنگرتنی سکاڵای ئێران لە ئەنجومەنی ئاسایش ڕۆیشت بۆ نیۆیۆرك, تەلگرافێکی هاندان و سور بوونی بۆ ناردوە, دەقی وەڵامەکەی دوکتۆر موسەددەق بۆ تەلگرافەکەی ئەو بەم شێوەیە دەخاتە ڕوو:

*لە نیۆیۆرکەوە, ٢١ ئۆکتۆبەری ١٩٥١*

*بارەگای اعلیحچرت خاوەن شکۆ شاهنشاهی – تاران*

*دەستخەتی تەلگرافی بەرز و پیرۆزی بەڕێزتان گەیشت, زیاتر لەوەی کە گومان دەکرا بوویە هۆی سەرفرازی و سوپاسگوزاری ئێمە, لە خودای گەورە*

---

[1] محمد رزا پهلوی: ماموریت برای وطنم, شرکت سهامی کتابهای جیبی, چاپ سوم, ١٣٥٠, ص١١٥.

*داوای سەلامەتی و تەمەن درێژی و ڕۆژبەڕۆژ سەرکەوتنی زیاتری اعلیحضرت خاوەن شکۆ شاهنشاهیم کردوە، ئەوە لە خزمەتتاندا ڕادەگەیەنم کە هەر بەرەو پێشچون و سەرکەوتنێك لە هەرشوێنیك و لە هەر بابەتێکدا بە دەست بهێنرێت لە سایەی ئامۆژگاری و سەرنجەکانی زاتی پیرۆزی شایانەوەیە، کە هەمیشە دەوڵەتی بەهێزو بەگوڕ کردوە و ڕابەرایەتی کردوە، بەو شێوەیەی کە لە ڕێگەی جەنابی بەڕێز وەزیری دەربارەوە بە خزمەتی بەڕێزتان گەیشت ڕۆژی دوشەممە بۆ فیلادلفیا و بەیانی سێشەممەش بۆ واشنگتۆن دەچین، لە هەمان جێگادا ڕوداوەکان دەنێرمە خزمەتی بارەگای پیرۆزی بەڕێزتان، داوا دەکەم یەکجاری دیکە لە خزمەتتاندا سوپاسگوزاری لە سەرنج و ئامۆژگاریە تایبەتیەکانی شاهنشای لاوی خۆم بکەم..... دوکتۆر موسەددەق*[1].

لە ڕوداوەکانی خۆماڵیکردنی نەوتدا، هەم (شا) و هەم (دوکتۆرموسەددق)یش ئومێدەوار بوون بە پیشتیوانی ئەمریکا، ئەم باوەڕەش تا ڕادەیەکی زۆر (هنری گریدی) باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران لە ڕەووتی ململانێکانی خۆماڵیکردنی نەوت و سەرەتاکانی حکومەتەکەی (موسەددەق)دا دروستی کردبوو، (گریدی) لە یەکەم ساڵی حکومەتەکەی (موسەددەق) دا لەلایەن ئینگلیزەکانەوە لە ئێران دا فشاری توندی دەخرایە سەر و بە بلاّوکردنەوەی چەندان وتار لە چاپکراوەکانی ئەمریکادا بە ئاشکرا ڕەخنەی لە سیاسەتەکانی ئینگلیز لە ئێراندا دەگرت، (جۆرج مەك گی) یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئەمریکایش لە ڕەخنەگرانی سیاسەتی ئینگلیز بوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ پرسی نەووتی ئێران و لە دانوستانەکانی خۆی لەگەڵ ئینگلیزەکاندا، هەوڵی زۆری دا بۆ پەسەند کردنی ڕیشەی خۆماڵیکردنی نەوت، سەرەنجام ئینگلیزەکان خۆماڵیکردنی نەوتیان پەسەند کرد، بەلاّم ئەو مەرجانەی کە بۆ چاك کردنی پێشنیارەکە هەیانبوو هێشتا بەردەوامی چاودێری و دەستوەردانی ئەوان لە ئیدارەی پیشەسازی نەوت و پاراستنی جیاوکە تایبەتیەکانی خۆیان بەدی دەکرا، وەکو لێسەندن و وەرگرتنی بژاردنێکی قورس و زۆر لە ئێرانیەکان لە بەرامبەر

---

[1] ماموريت براى وطنم: ص ١١٨-١١٩.

پێدانەوەی دامەزراوە نەوتیەکان بە ئێران, کە دەوڵەتی ئێران ئامادە نەبوو پەسەندی بکات.

باسکردنی وردەکاری دانوستانەکانی تایبەت بە نەوت لە سەردەمی حکومەتی (موسەددەق)دا و هۆکارەکانی بێ ئەنجام بوونی ئەو دانوستانانە, بەدەرە لە بابەتی ئەم کتێبە و تەنها بە شێوەیەکی کورت و پوخت ئەوە وەبیر دێنمەوە کە دوای شکستی دەورەی یەکەمی دانوستانەکان لە تاران, کە بە ناوبژیوانی ئەمریکیەکان ئەجام درا, دوکتۆر موسەددەق سودی لە هەلی سەفەرکردنی بۆ ئەمریکا بۆ ئامادەبوونی لە دانیشتنەکانی ئەنجومەنی ئاسایش دا وەرگرت و بە بیانوی خۆچارەسەرکردن ڕۆیشت بۆ واشنگتۆن و ماوەی نزیکەی مانگێك لەو شارەدا مایەوە, بۆ ئەوەی بتوانێت ئەمریکیەکان ڕازی بکات تا لە بەرژەوەندی ئێراندا بە تەواوی دەستوەربدەنە نێو ئەم بابەتەوە, بەچاو خشاندنێك بە یاداشتەکانی (دین ئەچسن)ی وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئەمریکا و (مەك گی) جێگریدا, کە لەلایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە دانوستانیان لەگەڵ (موسەددەق)دا دەکرد لە ماوەی مانەوەی لە واشنگتۆندا, دەتوانین ئەوەمان دەست بکەوێت کە ئەم دانوستانانە گەیشتبوونە ئەنجامێك و دەوڵەتی (کرێکاران)ی ئینگلیزیش لەگەڵ (موسەددەق)دا لە ڕێکەوتن نزیك بووبوونەوە, بەڵام ڕاگەیاندنی کۆتایی دەوڵەتی ئینگلیز بەسترابوویەوە بە ئەنجامەکانی هەڵبژاردنەوە کە لەو کاتانەدا لە ئینگلیستان بەڕێوە دەچو, سەرکەوتنی پارێزگاران و گەڕانەوەی (چەرچڵ) بۆ دەسەلاَت لە کۆتایی هەڵبژاردنەکاندا, هەمو ڕێسراوەکانی کردەوە بە خوری.

دوای گەڕانەوەی پارێزگاران بۆ سەر دەسەلاَت لە بەریتانیادا لە کۆتاییەکانی (ئۆکتۆبەری ١٩٥١ز) دا, کە زیاتر دەرەنجامی شکست و دۆش دامانی حکومەتی کرێکاران بوو لە بەردەم قەیرانی خۆماڵیکردنی نەووتی ئێراندا, بەریتانیا لە دو لاوە حکومەتی (دوکتۆر موسەددەق)ی خستە ژێر فشارەوە, لەلایەکەوە ئینگلیزەکان فشاریان خستەسەر ئەمریکاییەکان بۆ سیاسەتێکی سەرسەختانەتریان هەبێت لەبەرامبەر ئێراندا وە دیاریکردنی باڵوێزێکی لایەنگری ئینگلیز لە جیاتی (گریدی) باڵوێزی پێشوی ئەمریکا لە ئێران یەکێك بوو لە ئەنجامەکانی ئەو سیاسەتە, لەلایەکی دیکەوە ئینگلیزەکان بەهۆی بەکرێگیراوەکانیانەوە لە نێو خۆی ئێراندا, کە هەندێ لە

کەسە نزیك و هاوڕازەکانی (شا)یش لە نێو ئەوانەدا بوون, دەستیان دایە جوڵانەوە و ئاژاوەگێڕی دژی (موسەددەق)[1], ئەم جوڵانەوانە لە کاتی هەڵبژاردنەکانی خولی حەڤدەیەمی پەرلەماندا سەریان کێشا بۆ دروست بوونی گرژی و ئاڵۆزی و ڕوداوی خوێنینی لێکەوتەوە, بە ڕادەیەك کە دوکتۆر (موسەددەق) ناچار بوو ئەم هەڵبژاردنە بە نیوەکارەیی ڕابگرێت و خولی حەڤدەیەمی پەرلەمان تەنها بە ئامادە بوونی (٧٠) پەرلەمانتار بکاتەوە, لەم نێوەندەشدا نوێنەرانی بانکی نێو دەوڵەتیش بۆ خستنە ڕوی پێشنیارێکی نوێ بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نەوت هاتن بۆ ئێران, بەڵام پێشنیارەکانی ئەوانیش بۆچونەکانی ئێرانی مسۆگەر نەکرد و سەرەنجام ساڵی (١٣٣٠ك,هـ) بە بێ ئەوەی هەنگاوێك لە چارەسەر کردنی کێشەی نەوتدا چونە پێش هەبووبێت, کۆتایی پێهات, سەختی ڕەوشی ئابووری ئێران بە هۆی بڕینی دەستکەوتە نەوتیەکان و خۆ بوواردنی ئەمریکا لە پێدانی قەرز و هاوکاری ئابووری بە ئێران, ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر حکومەتەکەی (موسەددەق)ی دەخستەژێر فشارەوە.

بۆ پەی بردن بە ڕۆڵی (شا) لەو سەردەمەدا, کە بە دەرکەوتنی یەکەمین ناکۆکی توند لە نێوان ئەو و موسەددەق دا و بە دەستلەکار کێشانەوەی (دوکتۆر موسەددەق) لە پۆستی سەرۆك وەزیران ئەنجام درا, سەرەتا ئاماژە بە بەشێك لە یاداشتەکانی خودی (شا) لەو سەردەمەدا دەکەین, دواتر ئەو ڕوداوانەی کە دوای دەستلەکار کێشانەوەی (دوکتۆر موسەددەق) ڕوی دا, دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە, (شا) دەنووسێت:

( لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٣٣٠ك,هـ) دا بانکی ئاوەدانی و گرنگی پێدانی نێودەوڵەتی وەك ناوبژیوانێکی دڵسۆز بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیە پێشهاتوەکان قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵی, لە جاری یەکەمدا وا گومان دەکرا کە لە دانوستانەکان بەرەو پێشچونێك بەدەست بهێنرێت و خودی (موسەددەق)یش بە پێشنیارەکانی بانك ڕازی بوو, بەڵام ڕاوێژکارەکانی ئەو بەهۆی چەند هۆکارێکەوە کە خۆیان ئاگایان لێیبوو

[1] لەو بەڵگەو نوسینانەی کە دواتر لە وتەکانی بەشداربووانی ڕوداوەکانی دەورانی حکومەتی (موسەددەق) بڵاو بوویەوە, براکانی ڕەشید و گروپێکی بەناوی خوازراوی (بدامن) کە ئەسەدوڵای عەلەم و شاپور ڕیپۆرتر ئەندامانی سەرەکی بوون, بەناوی پیلانگێرانی دژی موسەددەق ناسێنران.

ئەویان لە ڕەزامەندی دەربڕین پەشیمان کردەوە و دانوستان بە تەواوی وەستا, لەهەمان کاتدا دەوڵەتی (موسەددەق) فەرمانی دەرکرد کە سەرجەم کونسوڵخانەکانی ئینگلیز لە ئێراندا دابخرێن, دوای کردنەوەی خولی حەڤدەیەمی پەرلەمان کە هێشتا (موسەددەق) خۆشەویست بوو دوبارە کاندیدی وەرگرتنەوەی پۆستی سەرۆك وەزیران بوو, ئەو لە سەرەتای هاوینی ساڵی (١٣٣١ك.ھ) دا ڕایگەیاند هەتا دەسەڵاتی تەواوی پێنەدرێت توانای ئەنجام دانی ئەو کارەی نیە, لەبەر ئەوەی لە بەرامبەر سیاسەتەکانی خۆیدا گوێی بە نارەزاییەکانی پەرلەمان و خەڵك نەدەدا, داوای کرد کە دەسەڵاتی تەواوی پێبدرێت و تا ماوەی (٦)مانگ بە بێ گەڕانەوە بۆ پەرلەمان کارەکانی خۆی ئەنجام بدات, هەروەها داوای ئەوەشی کرد کە وەزارەتی جەنگیش بخرێتە ئەستۆی ئەو, ئومێدەوار بوو بەو هۆیەوە ئەو دەسەڵاتەی کە دەستور وەك فەرماندەی هەمو هێزەکانی ئێران بە منی دابوو, لەبار ببات.

ڕێگریم کرد لە جێبەجێکردنی داواکاریەکانی ئەو, لەبەرئەوەی دڵنیابووم بەرهەمی ئەم دەسەڵاتە ئەوەیە کە کۆمۆنیستەکان زیاتر بێنەنێو کاروبارەکانەوە, هەروەکو چۆن ڕوداوەکانی داهاتو ئەوەیان سەلماند کە بۆچونەکەی من ڕاست بووو, (موسەددەق) ڕۆژی (٢٥ مانگی تیر) دەستی لە سەرۆك وەزیرانی کێشایەوە و منیش بە پێچەوانەی ناخی خۆم ئەحمەد قەوام (قەوام سەڵتەنە) کە لە ڕابردو دا سەرۆك وەزیران بوو لە جێگەی ئەودا دیاریمکرد بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, لەبەرئەوە بەگومانی هەندێك کەس دەیتوانی لە بەرامبەری چەپگەراکاندا بەرگری بکات.

بەهاتنە سەرکاری (قەوام سەڵتەنە) دەست بەجێ حیزبی تودە تێکەڵی لایەنگرانی (دوکتۆر موسەددەق) بوون و دەستیان دایە خۆپیشاندان و ئاژاوەگێڕی و دەستور ویاسا پێشێل کرا و دەوڵەتەکەی (قەوام)یش لە بەرامبەر ئاژاوەگێڕ و توندڕەوەکاندا دۆش داما و دەستەوسان وەستا, لە وتارێکیدا کە (قەوام) لە ڕادیۆدا پێشکەشی کردو تیایدا دژایەتی خۆی لە بەرامبەر هەستی خرۆشاوی خەڵکی لە بارەی خۆماڵیکرنی نەوتەوە ڕاگەیاند و ڕەوشەکەی ئاڵۆز و دژوارتر کرد, قەوام بە هۆی زۆری تەمەنیەوە زۆر بێتوانا و نەخۆش بوو, زۆربەی کات لەکاتی گفتوگۆی سیاسی گرنگدا خەوەنوچکە دەیبردەوە, هەرچەندە لە ڕاستیدا بۆ چارەسەرکردنی

کێشەکان باوەڕی بە بەکارهێنانی هێز هەبوو بەڵام من ویژدانەن نەمدەتوانی مۆڵەتی جێبەجێکردنی وەها کارێك بە کەسێکی ناتواناى وەکو ئەو بدەم, ناچار دواى چوار ڕۆژ سەرۆك وەزیری (بە بەگونجاو زانینی من) دەستی لە پۆستی سەرۆك وەزیری کێشایەوە, ئەوە ڕون بوویەوە کە لەو ڕۆژگارانەدا هیچکەس تواناى ڕووبەڕوو بوونەوەى لەگەڵ (موسەددەق)دا نیە, ڕۆژى (٣٠ تیر) بە مەبەستی ڕێگری کردن لە هەڵایسانی شەڕى ناوخۆ بە ناچارى بە مەرجەکانی (موسەددەق) ڕازى بووم و دوبارە ئەوم کردەوە بە سەرۆك وەزیران, لەهەمان کاتیشدا دادگاى لاهاى دەربارەى پرسی سکاڵاکەى ئینگلیز لە دژى ئێران دەنگی خۆى دا, دادوەرى ئینگلیزى (داگاش) بۆ بەرژەوەندى ئێران دەنگی دا, بەڵام نوێنەرى ڕوسیا خۆى بووارد لە دەنگدان و لە ڕاستیشدا هیچ کاتێك ئامادەى دانیشتنی دادگا نەبوو.

دەرکردنی ئەو بڕیارەى دادگاى نێودەوڵەتی لاهاى بوویە هۆى خۆشی و شادى و ڕەزامەندى ئێرانیەکان, بەڵام خودى ئەو بڕیارە ناوبراوە هیچ جۆرە کێشەیەکی چارەسەر نەکرد و تەنها وەك یەکێکی دیکە لە سەرکەوتنە سەرەڕۆییەکانی موسەددەق هەژمار دەکرا, خەڵکی لە خۆشیدا خرۆشابوونە نێو شەقامەکان و (موسەددەق)یش خۆى بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنێکی دیکە خۆى ئامادە دەکرد)[1].

لێکۆڵینەوە لەم بەشەى نوسینەکانی (شا) لەسەردەمی دەسەڵات و سەڵتەنەتی خۆیدا بڵاو کراوەتەوە, چەند بابەتێك ڕون دەکاتەوە: ئەوانیش ئەوەیە کە (شا) لەگەڵ ئەو هەمو ڕق و دژایەتیەى کە لە کاتی بڵاو کردنەوەى ئەم نوسینەیدا کە لە بەرامبەر (موسەددەق) دا هەیبوو, حاشاى خۆشەویستی (موسەددەق) و دەسەڵاتی قوڵاى ئەو لە نێو کۆمەڵگەى ئێرانیدا ناکات و جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەو ڕۆژانەدا هیچکەسێك تواناى ڕووبەڕووبوونەوەى لە بەرامبەر (موسەددەق)دا نەبووە, لە هەمان نوسیندا نارەزاى ئەو بۆ دانانی (قەوام سەڵتەنە) لە پۆستی سەرۆك وەزیران لە جێگاى (موسەددەق)دا بە تەواوى ڕونە و ئەو هەواڵانەشی کە دەربارەى هەوڵەکانی ئەو بۆ دانانی کەسێکی دیکە بۆ جێگرتنەوەى (موسەددەق) بڵاو بووبوونەوە, پشتڕاست دەکاتەوە.

---

[1] ماموریت براى وطنم: ص ١٩٩-١٢٠.

حسەینی مەکی لە کتێبەکەیدا (وقایع ۳۰ تیر ۱۳۳۱) کە تایبەتە بە باسکردنی وردەکاریەکانی ئەو ڕوداوانەی کە بە دەستلەکار کێشانەوەی (دوکتۆر موسەددەق) لە پۆستی سەرۆك وەزیری و دانانی (قەوام سەڵتەنە) لە جێگەی ئەودا کۆتایی هات, دوای گواستنەوەی نوسینە توندەکانی (قەوام و شا) کە بە وەرگرتنەوەی نازناوی (جناب اشرف) لە (قەوام) تەواو بوو, دەنووسێت: ( بە سەرنج دان لەو نوسین و بەڵگانەی کە ئاماژەیان بۆ کرا و باس لە پەیوەندیە تەماویەکانی (دەربار و قەوام) دەکات, بە تەواوی ڕون و ئاشکرایە کە ئەگەر لەلایەکەوە فشارەکانی سیاسەتی دەرەکی و لەلایەکی دیکەشەوە نیگەرانیەکانی دەربار لە حکومەتەکەی (موسەددەق) نەبوونایە, لەوانەبوو هەرگیز (شا) ڕازی نەدەبوو کە دەنگ بە حکومەتی (قەوام) بدات, بەڵام لەبەر ئەوەی ماوەیەك لەوەو پێش (ئەمریکا و ئینگلیز) ڕێکەوتبوون لەسەر کەنار خستنی (موسەددەق) و لەگەڵ (قەوام)یشدا دانوستان و شازشیان بۆ یەکدی کردبوو, تەنانەت پرسی نەوتیشیان بە جۆرێك لە نێوان خۆیاندا چارەسەر کردبوو کە دوای هاتنە سەر کاری (قەوام) دەست بەجێ ناردنە دەرەوەی نەوت بۆ دەرەوە دەست پێبکات, بەهەر حاڵ سەرجەمی ئەم سیاسەت و ڕوداوانە بوویە هۆی ئەوەی کە دوای دەستلەکار کێشانەوەی (دوکتۆر موسەددەق) بەخێرای شانۆی بڕیاری ڕەزامەندی نایاسایی ئامادە بکرێت و دەستبەجێیش فەرمانی سەرۆك وەزیرانی بە نازناوی (جناب اشرف)ەوە کە پێشتر لێی وەرگیرابوویەوە بۆ (قەوام سەڵتەنە) دەربکرێت)[1].

ئەو ڕوداو کارەساتانەی کە لە نێوان (۲۵ هەتا ۳۰ مانگی تیر) دا ڕوی دا و بە دەستلەکار کێشانەوەی (قەوام) لە پۆستی سەرۆك وەزیری و دوبارە گەڕانەوەی (موسەددەق) بۆ دەسەڵات کۆتایی پێهات, بە کورتی بەم شێوەیە یە:

( ڕۆژی (۲۵ ی تیر) دوکتۆر موسەددەق دوای دانیشتنێکی دوورودرێژ لەگەڵ (شا)دا, بەهۆی ئەوەی کە (شا) خۆی لادا لە ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر داواکەی ئەو بۆ پێدانی پۆستی وەزارەتی جەنگ, بۆیە دەستی لە پۆستی سەرۆك وەزیری کێشایەوە.

---

[1] حسین مکی: وقایع ۳۰ تیر ۱۳۳۱, بنگاه ترجمه و نشر کتاب, چاپ ۱۳۶۰, ص۱۷٦.

ڕۆژی (٢٦ ی تیر) دانیشتنی نائاسایی پەرلەمان بە ئامادە بوونی (٤٢) پەرلەمانتار بۆ دەنگدان لەبارەی سەرۆك وەزیری داهاتو بەسترا, (٤٠) کەس لە پەرلەمانتارانی ئامادە بوو لەو دانیشتنەدا دەنگیان بۆ سەرۆك وەزیری (قەوام سەڵتەنە) دا.

ڕۆژی (٢٧ی تیر فەرمانی سەرۆك وەزیرانی (قەوام) بە نازناوی (جناب اشرف)ەوە کە پێشتر لێی وەگیرابوویەوە دەرکرا, دوای نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ (قەوام) لە درێژەی ڕاگەیەندراوێکی توند دا, دوای تاوانبار کردنی حکومەتەکەی (موسەددەق) بە (بێ پلانی) لە پرسی نەوت و پەیمان دانی چارەسەر کردنی ئەم پرسە ( بەشێوەیەك کە بەرژەوەندی مادی و مەعنەوی ئێران بە تەواوی دەستەبەر بکرێت). ناڕاستەوخۆش بۆ سەر (ئایەتولا کاشانی) بەم ناوەڕۆکەی خوارەوە: ( بەهەمان ئەو ڕادەیەی کە لە چەواشەکاری لە کاروبارە سیاسیەکاندا بێزارم, لە پرسە مەزهەبیەکانیشدا دژی ڕیاکاری و زمان لوسیم), کەسانێك بە بیانوی ململانێ لەگەڵ سنور شکێنە سورەکاندا ڕەشێتی کۆنەپارێزی بەهێز دەکەن, گورزێکی کوشندەیان لە ئازادی داوە, ڕەنجی باخەوانانی مەشرتەیان لە نیوسەدەوە تا ئێستا بە فیڕۆ داوە, بۆیە من لەگەڵ ڕێزمدا بۆ مەزهەبەکانی ئیسلام دین لە سیاسەت دور دەخەمەوە و ڕیگری دەکەم لە بلاو بوونەوەی خورافات و بیرو باوەڕی دواکەوتو), بەم ڕستانە ڕاگەیەندراوەکەی خۆی کۆتایی پێ هێنا: ( گەلی ئێران! لەسەر داوای پارێزگاری ئێوە و نوێنەرەکانی ئێوە بەم پۆستە ڕازی بووم و ئامانجی کۆتاییم خۆشبەختی و خۆشگوزەرانی ئێوەیە, سوێند دەخۆم کە ئێوە خۆشبەخت دەکەم, ڕێگە بدەن من بە دەستکراوەیی دەست بەکارەکانم بکەم, وای بۆ حاڵی ئەو کەسانەی کە هەنگاوە چاکسازیەکانی من بشێوێنێت, یان لەمپەر لەو ڕیگایەی کە لە بەردەستم دایە دروست بکات, یان ڕێکخستنی گشتی تێك بدات, بەم شێوەیە ئاژاوەگێڕەکان ڕووبەڕووی توندترین پەرچەکرداری من دەبنەوە و هەر بەو شێوەیەی کە لە ڕابردودا نیشانم داوە و بە بێ خۆبوواردن لە کەسێك و ڕەچاو کردنی پۆست پێگەی دژەکان, تۆڵەی کردارەکانیان دەخەمە کەناریانەوە, تەنانەت لەوانەشە تا جێگایەك بڕۆم کە بە دەنگی زۆری پەرلەمان دەست بە پێکهێنانی دادگای کودەتاچیان بکەم و ڕۆژی سەدان تۆبەکار لە سەرجەم چین و توێژەکان بە هۆی بڕیاری وشك و بێ میهرەبانی یاساوە

لەناو ببەم و ڕۆژێکی تاریك دروست بکەم، هەموان ئاگادار دەکەمەوە کە دەورانی یاخی بوون تێپەڕیوە و ڕۆژی گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی حکومەت گەیشتوە)[1].

ڕۆژی (٢٨ی تیر) ئایەتوڵا کاشانی لە وەڵامی ڕاگەیەندراوەکەی (قەوام سەڵتەنە)دا، ڕاگەیەندراوێکی توندی بڵاو کردەوە و تیایدا نوسی: ( سیاسەتێك کە ماوەی چەندین سەدەیە دەوڵەتی بەکرێگیراو دێنێتە سەر کار، سەرەنجام حکومەتی (دوکتۆر موسەددەق) بە گەورەترین لەمپەری بەردەم ستەمەکانی خۆی دەزانێت و لە کاری خست و لە بیری هێنانی ڕەگەزێکە کە لە دامێنی دیکتاتۆری و سەرکوتکەریدا پەروەردە کراوە و مێژوی ژیانی سیاسی ئەو پڕیەتی لە ناپاکی و ستەم و چەرمەسەری و چەندین جار تاقیکردنەوەی خۆیی ئەنجام داوە و دادگای نەتەوەیی سزای مەرگ و کۆتایی ژیانی سیاسی ئەوی دەرکردوە، بۆ سێیەمین جار بە خزمەتکارە ڕاستەقینەکانم وتبێت، من نامەوێت لەمە زیاتر دەربارەی لێنەهاتویی (ئەحمەدقەوام) قسان بکەم، بەڵام ڕاگەیەندراوەکەی ئەو لە یەکەم ڕۆژی وەرگرتنی پۆستەکەیدا بە باشی نیشانی دەدات کە چۆن چۆنی بێگانەکان لە بیری ئەوەدان بە هۆی ئەوەوە پلار بدەن لە پیشەی دین و ئازادی و سەربەخۆی مەملەکەت و جارێکی دیکە زنجیری ئەسیری بخەنە گەردنی میلەتی موسڵمانەوە، پیلانی جودا کردنەوەی دین لە سیاسەت کە چەندین سەدەیە سەردێڕی بەرنامەکانی ئینگلیز بووە و لە هەمان ڕێگاوە دەستی میلەتی موسڵمانیان لە دیاریکردنی چارەنوسی کاروبارە دینی و دونیایەکەی خۆی دورخستوەتەوە، ئەمڕۆش سەردێڕی بەرنامەکانی ئەم پیاوە پۆست ویستەیە، من ڕاشکاوانە دەڵێم کە پێویستە لەسەر سەرجەم برا موسڵمانەکان کە لە پێناوی ئەم (جیهاد)ە گەورەیەدا قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵن و بۆ دوایین جار بە پەیڕەوکارانی سیاسەتی داگیرکەران بسەلمێنن کە هەوڵەکانیان بۆ بەدەست

---

[1] حەسەن ئەرسنجابی کە یەکێك بوو لە هاوڕازەکانی قەوام سەڵتەنە لە یاداشتەکانی خۆیدا لەمەڕ حکومەتی چەند ڕۆژەی قەوام و ڕوداوەکانی ٣٠ی تیری ١٣٣١ ەوە (مورخ دەولە سپهر) بە نوسەری ڕاگەیەندراوە توندەکەی قەوام ناساندوە، بەڵام (ئەحمەد سەمیعی) کە یەکێك بووە لە هاوڕازەکانی (مورخ دەولە) لە زمانی (مورخ)ەوە ئەم تۆمەتە بەدرۆ دەخاتەوە، بڕوانە کتێبی (٢٧ سال.....،٨٦-٨٧.

هێنانەوەی دەسەلآت و سەڵتەنەتی جاران پوچەڵە, چیدی گەلی موسڵمانی ئێران مۆڵەتی هیچ بێگانەیەك نادات كە بە دەستی بەكرێگیراوە تاقیكراوەكان سەربەخۆیی ئەوان لەناو ببات و ناوی بە شكۆ و پڕ لە شانازی كە گەلی ئێران لە ئەنجامی ململانێی پیرۆزی خۆیدا بەدەستی هێناوە بگۆڕدرێت بە سەرشۆڕی و زەبوونی).

ڕۆژی (٢٩ی تیر), لە كاتێكدا خۆپیشاندان و توڕەیی جەماوەر لە تاران و شارەكانی دیكەدا دژی حكومەتەكەی (قەوام) دەستی پێكردبوو, ئایەتوڵاّ (كاشانی) لە كۆنگرەیەكی ڕۆژنامە نوسیدا كە بە ئامادە بوونی پەیام نێرانی ناوخۆو دەرەوە ئەنجام درا, ووتی: ( ئەحمەد قەوام كە لە ڕوی ڕۆحی و جیسمی و ئەخلاقیەوە شیاوی حوكمداری نیە بە زۆری ئینگلیزەكان هەڵبژێردراوە, قەوام سەرباری ئەو دۆسێیانەی كە لە پەڕلەماندا بوونیان هەیە مافی یاسایی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی نیە, ئەگەر گەلێك ئەویان نەوێت, فەرمانی (شا) و دەنگی (پەڕلەمانیش) بۆ ئەو بن كاریگەری نابێت).

لە هەمان كۆنگرەی ڕۆژنامە نوسیدا (ئایەتوڵاّ كاشانی) بۆ پشتیوانی ڕاگەیەندراوەكەی (جەبهەی میلی) دەربارەی پشوی كار و خۆپیشاندانی گشتی ڕۆژی (٣٠ی تیر), ووتی: ( هەتا خوێن لە شادەماری من و ئەم میلەتەدا هەبێت, بەوە ڕازی نابین كە (قەوام) بەسەر ئێمە و میلەتدا حكومەتداری بكات, سبەینێ تاران و هەمو ئێران پشوی گشتی یە, ئەگەر پێویستیش بێت دەڵێم كە دو سبەیش تاران و هەمو ئێران بكەنە پشوو)[1].

حەسەن ئەرسنجابی كە یەكێك بوو لە هاوڕازەكانی (قەوام سەڵتەنە) و بەردەوام لە ڕوداوەكانی (٢٥ هەتا ٣٠ی مانگی تیر) لەلای ئەو بوو, لە یاداشتەكانی ڕۆژی یەك شەممە (٢٩ی تیر ١٣٣١ك,هـ)ی خۆیدا دەنووسێت, قەوام ڕەزامەندی (شا)ی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەڕلەمان بەدەست هێناوە و فەرمانی دەستگیر كردنی (ئایەتوڵاّ كاشانی) داوە, ئەرسنجابی لە دەمی (قەوام)ەوە دەنووسێت: ( داوە شارەوانی (سەید ئەبوولقاسمی كاشانی) بەند بكەن, ئەمڕۆ ئەو دەستگیر دەكەن و ئێوە دەیبینن كە چ كاریگەریەكی لەسەر بارودۆخەكە دەبێت, وتم كاشانی ئەندامی پەڕلەمانەو پاراستن

---

[1] حسین مكی: وقایع ٣٠ تیر ١٣٣١, ص١٨٩-١٩٠.

(حەصانە)ی هەیە, وا بیر ناکەیتەوە کە بەرپەرچدانەوە (ڕووبەڕوو بوونەوە) دروست ببێت؟ ووتی مەملەکەتی ئاگر داوە و لە پەنای حەصانەدا دانیشتووە, من ئەم سنورە دەشکێنم ئەوانە ڕووبەڕووی دادگا دەکەمەوە تا ئەو ڕاستیە دەر بکەوێت کە ئایا ئەوانە مافی ئەوەیان هەیە کە ولأت بخەنە ئەم ڕۆژەوە, ئەوپەڕەکەی هەتا نیوەڕۆ ئەو دەستگیر دەکەن و بڕیارم داوە هەر پەرلەمانتارێك کە بەردەوام بێت لەسەر بزواندنی خەلك فەرمانی بەند کردنی دەربکەم, ڕووبەڕووی دادگایان بکەمەوە بۆ ئەوەی تێبگەن کە نابێت یاری بە سەربەخۆیی مەملەکەت بکەن), ئەرسنجابی درێژەی دەداتێ, هێشتا فەرمانەکە جێبەجێنەکرابوو کە بیستمان ڕادیۆ (لەندەن) ئەم هەواڵەی بلأوکردوەتەوە, (ئەم هەواڵە ئێمەی توشی شۆك کرد, چ کەسێك فەرمانەکەی (قەوام سەڵتەنە)ی ئاشکرا کردوە, ئەی چۆن گەیشتوەتە ڕادیۆ لەندەن؟ گومانی تێدا نیە کە بەرپرسانی پۆلیسیش هەواڵیان بە (کاشانی) و شوێنەکانی دیکەش دابوو, پەرچەکرداری جێبەجێنەکردنی فەرمانەکەی (قەوام) بوویە هۆی ئەوەی کە (کاشانی) و کەسانی دیکەش چالاکیەکانی خۆیان زیاد بکەن, ڕاگەیەندراوێکی (کاشانی) بۆ سەرباز و ئەفسەران بلأو بوویەوە کە بانگهێشتی کردن کە بە گوێی فەرماندەکانی خۆیان نەکەن).

هەر زو سەرلە بەیانی ڕۆژی (٣٠ی تیر) خۆپیشاندان لە تاران و سەرانسەری ولأتدا بۆ دژایەتیکردنی حکومەتەکەی (قەوام) و دروشمی گەڕانەوەی (دوکتۆر موسەددەق) دەستی پێکرد و تا کاتژمێر (١٠)ی بەیانی تەواوی شەقامەکانی ناوەندی شار لە بازاڕ هەتا مەیدانی بەهارستان پڕبوو لە خەلك, گوللە تەقاندن ڕووبەڕووی خۆپیشاندەران لە کاتژمێر (٧)ی سەرلە بەیانیەوە لە شەقامەکانی دەوروبەری بازاڕ دەستی پێکرد و تا کاتژمێر (٢)ی پاش نیوەڕۆ دەنگی گوللەی تفەنگ و شەستیر (ڕەشاش) لە تەواوی شەقامەکانی ناوەندی شار, بەتایبەتی دەروبەری مەیدانی بەهارستان دەهاتە بەر گوێ, (شا) براکەی خۆی (شاهپور عەلیڕەزا) بۆ ئاگادار بوون لە ڕەوشی شار نارد بۆ سەر شەقامەکان, خەڵکی کە ئەویان ناسیبوو بە هێرشیان کردبوویە سەر ئۆتۆمبیلەکەی و (شاهپور عەلیڕەزا) بەسەرو گوێلاکی خوێنینەوە گەڕایەوە بۆ لای (شا) و ووتی: ولأت لە سەروبەندی شۆڕشدایە. ئەو هەوالأنەشی کە لە شارەکانی دیکەوە دەگەیشت, ئەوەی ڕون دەکردەوە کە ولأت ئالۆز بووە و

کۆنترۆڵی ڕەوشەکەش لە شارە گەورەکاندا لە دەستی هێزەکانی پۆلیس و ئاسایش دا نەماوە, سەرەنجام (شا) گەیشتە ئەو بڕوایەی کە بە دان پێدانانی خۆی: (هیچکەس توانای ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ موسەددەقدا نیە), عەسری هەمان ڕۆژ (شا) قەوامی ناچار بە دەستلەکار کێشانەوە کرد و (عەلا)ی وەزیری دەرباری نارد بۆ پەرلەمان بۆ ئەوەی لە کاتی ڕاگەیاندنی دەستلەکار کێشانەوەی (قەوام), بۆچونی پەرلەمان دەربارەی سەرۆك وەزیری داهاتو بزانێت, لە کۆی (٦٤) ئەندام پەرلەمانی ئامادە بوو لە دانیشتنەکەدا, (٦١) پەرلەمانتار دەنگیان بۆ دوبارە وەرگرتنەوەی پۆستی سەرۆك وەزیرانی لەلایەن (دوکتۆر موسەددەق)ەوە دا, (شا)یش لەگەڵ دەربڕینی ڕەزامەندی بۆ سەرجەم داواکاریەکانی (موسەددەق), لە نێویاندا پێدانی پۆستی وەزارەتی جەنگ بە (موسەددەق), دوبارە فەرمانی سەرۆك وەزیرانی (دوکتۆر موسەددەق)ی دەرکردەوە.

دوکتۆر موسەددەق ڕۆژی (١ی موردادی ١٣٣١ك,هـ)دا ڕونکردنەوەیەکی لە پشتی قورئانێکەوە نوسی و ناردی بۆ (شا), بۆ ئەوەی نیگەرانیەکانی (شا) بڕەوێنێتەوە دەربارەی مەبەستی خۆی بۆ گۆڕینی ڕژێم, دەقی نوسراوەکەی موسەدەق بەم شێوەیە بوو: ( دوژمنی قورئان بم ئەگەر بمەوێت پێچەوانەی دەستور هەر کارێك بکەم, وە هەروەها ئەگەر دەستور پێشێل بکەن و ڕژێمی مەملەکەت بگۆڕن من بە سەرۆك وەزیرانی ڕازی ببم)[1], دوکتۆر موسەددەق هاوکات لەگەڵ ناردنی ئەو نوسینە بۆ (شا) فەرمانی هەڵپەساردنی (داخستنی) دیوانە (نوسینگە) تایبەتیەکانی براو خوشکەکانی (شا) و دەرکردنیان لە ئێران دا, دەرکرد, هەروەها (دوکتۆر موسەددەق) ناوی وەزارەتی جەنگی گۆڕی بۆ وەزارەتی بەرگری نەتەوەیی و لە یەکەم بڕیاری خۆیدا لەو پۆستەدا (سپەهبەد یەزدان پەنا)ی وەك فەرماندەی لەشکر دیاری کرد, ئەم دانانە بۆ دڵنیاکردنەوەی (شا) بوو, بەڵام کاتێك کە (موسەددەق) داوای کرد هەندێك لە بەرپرسەکانی لەشکر خانەنشین بکات, (یەزدان پەنا) ئامادە نەبوو ئەم فەرمانە دەر بکات, بەڵام بڕیاری خانە نشین کردنی سەدان کەس لە ئەفسەرانی لەشکر دوای کەنار خستنی (سپەهبەد یەزدان پەنا) دەرکرا.

---

[1] دکتر محمد مصدق: خاطرات و تالمات مصدق, انتشارات علمی, ص٢١١.

خولی دووەمی فەرمانڕەوایی (دوکتۆر موسەددەق) لەگەڵ ڕاگەیاندنی بڕیاری دادگای لاهای بۆ بەرژەوەندی ئێران دەستی پێکرد, (موسەددەق) بە وەرگرتنی دەنگی لە ڕادەبەدەری پەڕلەمان بەهرەمەند بوو بە دەسەڵاتێکی بێ پێشینە لە پۆستی سەرۆک وەزیریدا و هەنگاوی سەرسەختانەتری لە بابەتی نەوتدا دەنا, هەڵبژاردنی (ئایەتوڵا کاشانی) بۆ سەرۆکی پەڕلەمان پێگەی (موسەددەق)ی زیاتر لە جاران بەهێز کرد و ئینگلیزەکانیش بە پەیڕەو کردنی ڕەوشێکی ئاشتیانە تر لە بارەی پرسی نەوتەوە لە بیری چارەسەر کردنی ناکۆکیەکانی خۆیان دا بوون لەگەڵ ئێراندا, لە سەرەتاکانی مانگی (شەهریوەری ١٣٣١ک,ھ)دا (ترومن)ی سەرۆکی ئەمریکا و (چەرچڵ)ی سەرۆک وەزیرانی ئینگلیستان نامەیەکی هاوبەشیان بە ناونیشانی (دوکتۆر موسەددەق پێشنیاری نوێ بۆ چارەسەرکردنی پرسی نەوت) بۆ ئەو نارد, بەڵام ئەم پێشنیارانەش بەهۆی ئەو مەرجانەی کە لە بارەی پێدانی غەرامەوە دیاریکرابوو کە لەلایەن ئێرانەوە بدرێت بە کۆمپانیای پێشوی نەووتی (ئێران-ئینگلیز), لەلایەن ئێرانەوە ڕەتکرایەوە.

بەپێی ئەو بەڵگەو دەستکەوتانەی کە دواتر بلاو کرانەوە, ئینگلیزەکان دوابەدوای ڕەتکردنەوەی پێشنیارە هاوبەشەکەی (ترومن و چەرچڵ) لەلایەن (موسەددەق)ەوە, بەوردی لە بەرنامەی لە سەرکار لادانی (موسەددەق)یان کۆڵیوەتەوە و چالاکیە گوماناویەکانی باڵوێزخانەی ئینگلیز لە تاران بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە, لەلای دەوڵەتی ئێران کە بە وردی چاودێری چالاکی و هاتوچۆکانی ئەندامانی باڵوێزخانەی ئینگلیزیان دەکرد, ئەم بەرنامەیە شاراوە نەبوو, (دوکتۆر موسەددەق) دوای بەدەست هێنانی هەندێك ڕاپۆرتی پەیوەست بە چالاکیەکانی باڵوێزخانەی ئینگلیز, بڕیاری بچڕاندنی پەیوەندی سیاسی لەگەڵ دەوڵەتی بەریتانیا و داخستنی باڵوێزخامەکەیانی لە ئێراندا دا, ئەم بڕیارەش لە ڕۆژی (٣٠ مانگی میهری ١٣٣١ک,ھ)دا کەوتە بوواری جێبەجێکردنەوە, چەند ڕۆژێك دوای بچڕاندنی پەیوەندیەکانی نێوان ئێران و بەریتانیا, هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی کۆمار لەمریکادا ئەنجام درا و بە هەڵبژاردنی (ژەنەراڵ ئایزەنهاوەر) بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەرچەیەکی نوێ بە ڕوی پەیوەندیەکانی ئێران و ئەمریکادا کرایەوە.

(باری ڕوبین)ی توێژەری ئەمریکی کە پێشتر ئاماژە بە نوسینەکانی ئەو لە بارەی ئێرانەوە کراوە, دەربارەی هەنگاوە نهێنیەکانی ئینگلیزەکان بۆ سەرنگونکردنی حکومەتی (موسەددەق), لە پێشتر و دوای هەڵبژاردنی (ئایزەنهاوەر)یش بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا, دەنووسێت: ( ئینگلیزەکان بەر لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماریی ئەمریکا لە ساڵی (١٩٥٢ز) دا, کە بە سەرکەوتنی کۆماریەکان و هاتنە سەر کاری (ئایزەنهاوەر) کۆتایی هات, لە ئامادەسازی کودەتایەکدا بوون بەسەر (موسەددەق)دا, (کرمیت ڕۆزفێلت) کە لە بەرپرسە دیارەکانی سی ئای ئەی (سیا) بوو ماوەیەکی کەم بەر لە هەڵبژادنی سەرۆك کۆماری بانگهێشتی (لەندەن) کرا, ئینگلیزەکان لەبارەی پێشنیارێکەوە کە بە ناوی (ئاجاکس) ناو نرابوو لەگەڵ ئەودا گفتوگۆیان کرد, (ڕۆزفێلت) ئەو پێشنیارەی کە بۆ ڕێکخستنی کودەتایەك لە ئێراندا بە مەبەستی ڕوخاندنی حکومەتەکەی (موسەددەق) ئامادە کرابوو, لەگەڵ خۆیدا بردی بۆ واشنگتۆن و لەگەڵ (ئالان دالاس) کە لەو کاتەدا جێگری سەرۆکی (سیا) بوو خستیە بەر باس و لێکۆڵینەوەوە, هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لەمریکا تازە ئەنجام درابووو, (دالاس) پێی باش بوو کە دەبێت ئەم پێشنیارە هەتا دەست بەکار بوونی (ئایزەنهاوەر) بە بێدەنگی بمێنیتەوە, (هندەرسووّن) باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران کە بەر لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمریکا گەڕابوویەوە بۆ ئەمریکا, لە کۆتاییەکانی ساڵی (١٩٥٢ز) گەڕایەوە بۆ ئێران و دانوستان و گفتوگۆیەکی نوێی لەگەل (دوکتۆر موسەددەق) دا دەستپێکرد, بۆ ئەوەی هەتا بەر لە گۆڕانی حکومەت لەمریکادا ڕێگەچارەیەکی گونجاو بۆ پرسی نەوت بدۆزنەوە, ئەم دانوستانانە کە هەتا کۆتاییەکانی حکومەتی (ترومن) درێژەی کێشا نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك, ڕاپۆرتی باڵوێزی ئەمریکا دەربارەی بێ ئەنجام مانەوەی ئەم دانوستانانە زەمینە سازیەکی باشی بۆ گۆڕینی سیاسەتی ئەمریکا لە ئێراندا فەراهەم هێنا, ڕۆژی (٣ فەبریوەری ١٩٥٣ز , ١٤ بەهمەنی ١٣٣١ك.هـ), دوهەفتە دوای دەستبەکار بوونی (ئایزەنهاوەر) شاندێکی دەوڵەتی ئینگلیز بەمەبەستی دیدار و گفتوگۆ لەگەڵ (جان فۆستەر دالاس)ی وەزیری نوێی دەرەوەی ئەمریکا و (ئالن دالاس)ی برای کە لەم حکومەتە نوێیەدا پۆستی سەرۆکایەتی ڕێکخراوی (سیا)ی وەرگرتبوو, سەردانی واشنگتۆنیان کرد, بابەتی دانوستانەکەش پیلانی سەرنگون کردنی (دوکتۆر موسەددەق) بوو,

لەگەڵ ئەو زەمینە سازیەی کە پێشتر بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە ئامادە کرابوو هیچ کێشەیەك لە نێوان ئەمریکا و ئینگلیزدا نەبوو, پێشنیاری سەرپەرشتی کردنی ئەم چالاکیە لەلایەن ئەمریکاوە و دانانی (کیم ڕۆزفێلت) بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیەش لەلایەن خودی ئینگلیزەکانەوە بووو, لەو کاتانەدا هیچکەس پێشبینی نەدەکرد کە ڕۆڵی ئەمریکا لەم ڕوداوەدا چۆن چۆنی دواتر لە دژی خودی ئەمریکا دەبێتەوە, ڕاپۆرتە سیخوڕیەکان کە لەم دانیشتنەدا خرانە بەردەس ئەوەی دەردەخست کە ڕەوشی ئێران بەرەو سەرکەوتنی کارەکەیانە, ئەگەر (شا) لای خۆیەوە چەند هەنگاوێك بۆ کەنار خستنی (موسەددەق) هەڵبهێنێت ئەوا لەشکر و زۆربەی خەڵکی پشتیوانی لە (شا) دەکەن, لەگەڵ ئەم ئەنجامەدا بڕیار درا کە پێشتر (ڕۆزفێلت) سەردانی ئێران بکات و بەر لە دەستپێکردنی چالاکیەکە بەوردی لە ڕەوشەکە بکۆڵێتەوە)[1].

دەربارەی ئەو ڕوداوانەی کە بە کودەتای (مورداد ی ١٣٣٢ك.هـ , ١٩ی ئابی ١٩٥٣ز) و ڕوخانی حکومەتەکەی (موسەددەق) کۆتایی هات, شتانێکی زۆر وتراون و نوسراون کە لێرەدا مەجالی باسکردنی هەمویان نیە, بەڵام هێنانی بەشێك لە یادەوەریەکانی (ئایزەنهاوەر) سەرۆکی ئەوکاتی ئەمریکا دەربارەی پەیوەندیەکانی نێوان (ئێران_ئەمریکا) لە مانگەکانی کۆتایی حکومەتەکەی (موسەددەق) و زەمینەسازیەکان بۆ کودەتای (٢٨ی مورداد, ١٩ی ئاب), کە تائێستاش لە ئێراندا بڵاو نەکراونەتەوە, بۆ مێژوو وە بۆ ئەو کەسانەشی کە خوازیارن و دەیانەوێت لێکۆڵینەوە لە بارەی ئەو ڕوداوانەوە ئەنجام بدەن, بە گرنگ دەزانم, ئایزەنهاوەر لە یاداشتەکانی خۆیدا بە ناونیشانی (ساڵانی من لە کۆشکی سپیدا), کە دەقە فەرەنسیەکەی لە بەردەستی نوسەردایە, دوای باسکردنی مێژویەکی کورت لە بارەی پیشەسازی نەوتی ئێران و ڕوداوەکانی خۆماڵیکردنی نەوت, بەم شێوەیە دەنووسێت:

پرسی نەوتی ئێران, تەنانەت پێش بوونیشم بە سەرۆکی ئەمریکا سەرنجی منی بۆلای خۆی ڕاکێشابوو, کاتێك کە سەرۆکی زانکۆی (کۆڵۆمبیا) بووم, بە شای

---

[1] باری روبین: جنگ قدرتها در در ایران, ت, محمود طلوعی, ص٧٦-٧٨.

لاوی ئێران (حەمە ڕەزاشا) ئاشنا بووم, هەرلەو کاتەوە و دوای ئەو پەیوەندیانەی کە لەگەڵ (شا)دا پێکمهێنا, ئەوم بە ڕێبەرێکی شایستە دەزانی بۆ گەلەکەی خۆی, ماوەیەك دواتر, لەسەرەتاکانی (ژانویەی ۱۹۵۳ز) هێشتا کە ژیانم لە دەروبەری زانکۆدا دەگوزەراند, تەلگرافێکم لەلایەن (دوکتۆر موسەددەق)ەوە بەدەست گەیشت, لەو کاتەدا (موسەددەق) بە فەرمانی دەوڵەتی و دەنگدان بۆ فەرمانەکە سەرۆکایەتی حکومەتی وڵاتەکەی دەکرد[1], لە تەلگرافە سێ لاپەڕییەکەی خۆیدا کە بۆ منی ناردبوو, دوای پیرۆزبایی لێکردن بۆ هەڵبژاردنم بە سەرۆکی ئەمریکا, نوسیبووی کە دەیەوێت بەر لە دەستپێکردنم بە کار لەو پۆستەدا و بۆ ڕێگری لە کاریگەری ڕاپۆرتە نادروستەکانی دواتر کە پێدەچێت لەبارەی ڕەوشی ئێرانەوە بە من بدرێت, لەگەڵ مندا باس لە پرسەکانی ئێران بکات, دوکتۆر موسەددەق لەو تەلگرافەدا نوسیبووی:

(من بەداخم لەوەی بەر لە دەستپێکردنی کارەکەت, کە بۆ پۆستێکی گرنگ و کاریگەر هەڵبژێردراویت, لەکەڵ تۆدا باس لە پرسەکانی وڵاتەکەم دەکەم, ئەم کارەی من هەم لەبەر خێرایی و گرنگی پرسەکانی وڵاتەکەم و هەمیش لەبەر ئەوەشە کە ترسم لەوە هەیە ڕاپۆرت گەلێك بخەنە بەردەستی تۆ کە ڕاستیەکانی پەیوەست بەم وڵاتەو ئەو مەترسیانەی کە لە بەردەم داهاتوی ئێراندان, بەڕاستی نەگەیەنن بە تۆ, من ئومێدەوارم ئەو حکومەتەی کە لە داهاتودا تۆ سەرۆکایەتی دەکەیت, هەست بە گرنگی ململانێکانی گەلی ئێران بکات, وە بۆ گەیشتن بە ئارەزوەکانی (کە جگە لە سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری شتێکی دیکە نیە) هاوکاری بکات, نزیکەی دو ساڵە کە گەلی ئێران, تەنها بەهۆی ڕق و چاوچنۆکی کۆمپانیایەکەوە, کە بە بانگەشەی خۆی بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە نامەشروعەکانی خۆی لە ئێراندا لە لایەن دەوڵەتی بەریتانیاوە پشتگیری لێدەکرێت, دوچاری فەلاکەت و دژواری و هەژاریەکی لە ڕادە

[1] جەختکردنەوەی ئایزەنهاوەر لە سەر ئەوەی کە موسەددەق بە فەرمانی دەوڵەتی و دەنگدان بۆ ئەو فەرمانە حکومەتەکەی پێکهێنابوو, بۆ سەرنجدانە لە هەنگاوەکانی دواتری ئەمریکیەکان لە ئامادەسازی بۆ کودەتا دژی حکومەتەکەی موسەددەق و وەبیر هێنانەوەی ئەوەی کە دوکتۆر موسەددەق ڕەچاوی هاوسەنگی دیموکراسی لە دەوڵەتەکەی خۆیدا نەکردووە,

بەدەر بووە و بێبەشکراوە لە مافی سروشتی و یاسایی خۆی کە سود وەرگرتنە لە سەروەت و سامانی وڵاتەکەی خۆی).

دەست بەجێ لەوەڵامی (دوکتۆر موسەددەق)دا تەلگرافێکم ناردەوە و لەوە دڵنیام کردەوە کە بە بێلایەنی پرسی ئێران پێوشوێن دەگرم و پێداگریم لەوەش کرد کە هەتا ئێستا هیچکەس هەوڵی نەداوە لەو بارەیەوە من بخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە, لە هەمان تەلگرافدا هیوام خواست کە پەیوەندی تایبەتی داهاتوی ئێمە دور بێت لە هەمو دودڵی و گومان خراپییەك, لە کۆتایدا نوسیم کە خۆشحاڵم بە بۆچونەکانی ئەو لە بارەی ئەو پرسانەی کە پەیوەندی بە بەرژەوەندیەکانی هەردولاوە هەیە.

لە ژانویەی ١٩٥٣ز دا پەرلەمانی ئێران دیکتاتۆریەتی (موسەددەق)ی بۆ ماوەی ساڵێکی دیکە درێژ کردەوە و سەرەنجامی ئەوەش (موسەددەق) بە ئاشکرا (شا)ی یاسایی وڵاتی تاوانبار کرد بەوەی کە هاوکاری و هاودڵی هەیە لەگەڵ چالاکی بێگانەکاندا لە دژی دەوڵەتەکەی ئەو, لە ژێر فشاری (موسەددەق)دا (شا) ڕۆژی (٢٨ فەبریوەر , ٩ ئەسفەند) بڕیاری کەنارگیری لە پۆستی سەڵتەنەتداری ئێران داو ڕایگەیاند کە بۆ چارەسەری پزیشکی دەچێتە دەرەوەی وڵات, ڕاگەیاندنی ئەم بڕیارەی (شا) ئاڵۆزیەکی توندی بە دوادا هات, لایەنگرانی (شا) و هەوادارانی (موسەددەق) لە نێو شەقامەکاندا کەوتنە گیانی یەکتری و سەرەنجام (شا) لە بڕیارەکەی خۆی لە دەستلەکار کێشانەوە و دەرچون لە وڵات پەشیمان بوویەوە, ئەم ڕوداوە بە شکستێك بۆ (موسەددەق) دەهاتە هەژمار.

لەم نێوەندەدا, (لوی هندرسون) باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران پێشنیارگەلێکی نوێی بۆ چارەسەر کردنی پرسی نەوت خستە بەردەمی (دوکتۆر موسەددەق), بە پێی ئەو پێشنیارە (کنسرسیۆم)ێك لە کۆمپانیا نەوتیەکان جێگەی کۆمپانیای پێشوی نەوتی (ئێران–ئینگلیز)ی دەگرتەوە نەوتی ئێران دەنێردرایە بازارەکانی جیهانەوە, (موسەددەق) بە ئاوازێکی هەڕەشە ئامێزەوە ئەم پێشنیارەی ڕەتکردەوە و ئەو کارەی بە ( ڕێگەیەکی نوێ بۆ بەتاڵان بردنی سەروەتی ئێران) ناوبرد.

ڕۆژی (٢٨ مەی , ٧ خورداد ١٣٣٢ك.ھ) سەرۆك وەزیرانی ئێران لە نامەیەکی نوێیدا بۆ من, سەرباری ئاماژەدانی بە نامەکەی پێشوی نوسیبووی: (نزیکەی چەند

مانگێك بەسەر نامەی پێشودا دەگوزەرێت, گەلی ئێران چەندین تاقیکردنەوەی سەختیان ئەنجام داوەو لە ململانێیەکی سەرسەختدا لەگەڵ چالاکیەکانی کۆمپانیای پێشوی نەووتی (ئێران_ئینگلین) دەستەو یەخەبوون, بۆ نمونە کڕیارانی نەووتی ئێرانیان خستوەتە ژێر فشارەوە و ڕێگای نایاساییان گرتوەتە بەر بۆ ڕێگرتن لە فرۆشتنی نەووتی ئێران, لەگەڵ ئەوەی کە دادگاکانی (ئیتالیاو ژاپۆن) ڕایانگەیاندوە کە کڕینی نەووتی ئێران ئازادەو هیچ ڕێگریەکی نیە, ئینگلیزەکان وازیان لە کارە نایاساییەکانی خۆیان نەهێناوە و هێشتا ڕێگری دەکەن لە فرۆشتنی نەووتی ئێران.

ئێمە ئومێدەوار بووین کە لە سەردەمی حکومەتەکەی بەڕێزتاندا بەخشین و سەرنجی زیاتر لە ڕەوشی ئێران بدرێت, بەڵام بەداخەوە وەها دێتە بەرچاو کە هێشتا هیچ جۆرە گۆڕانکاریەك لە بۆچونەکانی دەوڵەتی ئەمریکادا سەبارەت بە ئێران بەدەست نەهاتووە.

لە ئەنجامی ئەو کارانەی کە لەلایەن کۆمپانیای پێشو وە دەوڵەتی ئینگلیستانەوە ئەنجام دراوە, گەلی ئێران ڕووبەڕووی کێشەی سیاسی و ئابووری بووەتەوە, ئەگەر ئەم ڕەوشە بەردەوامی هەبێت, سەرەنجامێکی مەترسیدار لە ڕوی نێودەوڵەتیەوە دێنێتە پێشەوە, وەئەگەر هاوکاری خێراو باش پێشکەش بەم وڵاتە نەکرێت, ئەوا ئەو هەنگاوانەی کە دواتر بۆ قەرەبوو کردنەوەی کەمتەرخەمی و ئاسانکاریەکانی ئەمڕۆ دەنرێن, زۆر درەنگ دەبێت).

دواتر (موسەددەق) ڕاستەوخۆ ڕوی لە من کردبوو نوسیبووی: (گەلی ئێران ئومێدەوارە بە هاوکاری و یارمەتی دەوڵەتی ئەمریکا ئەو ڕێگریانەی کە لە بەردەم فرۆشتنی نەووتی ئێراندان وەلا بنرێن, وەئەگەر لە ئێستادا دەوڵەتی ئەمریکا توانای لادانی ئەم ڕێگریەی نیە ئەوا دەتوانێت بە هاوکاریەکی کاریگەری پێویستی دارایی ڕوی گەلی ئێران بکاتەوە بەڕوی سەرچاوەیەکی دیکەی خۆیدا, ئەم وڵاتە سەرچاوەی سروشتی دیکەی لە بەردەستدا هەیە, کە چالاك کردنی ئەو سەرچاوانە کێشە هەنوکەییەکانی ئێران وەلا دەنێت, بەڵام ئەم کارە بەبێ هاوکاریەکی گەورەی دارایی جێبەجێ ناکرێت, لە کۆتایدا من داوا لە بەڕێزتان دەکەم کە ئێستا زیاتر ئاگاتان لە ڕەوشی مەترسیداری ئێران هەیە و ئومێدەوارم کە بەئەو جۆرەی کە شایستەیە سەرنجی ئەو خاڵانە بدەن کە لەم نامەیەدا ئاماژەی بۆ کراوە).

لەبەر ئەوە من لە تەخشان و پەخشان کردنی پارەی ئەمریکا بە ولاّتێك کە لەکاتی کولاّندا بوو, ئەویش لەبەر خاتری دەربازکردنی (موسەددەق) لەو ڕەوشە دژوارەی کە خۆی بە ڕەتکردنەوەی بچوکترین سازش بۆ بەریتانیەکان دروستی کردبوو, خۆم بووارد, ڕۆژی (٢٩ ژوئێن , ٨ تیر ١٣٣٢ك,ه) وەلاّمم دایەوە کە: ( نەگەیشتنی ئێران و ئینگلیستان بە جۆرێك لە ڕێکەوتن, دەستی ئەمریکای لە هاوکاریکردنی ئێران بەستوە, لە ولاّتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا, تەنانەت لە نێو ئەو کەسانەشی کە هەستێکی زۆر دۆستانەیان بەرامبەر بە ئێران و ئێرانیەکان هەیە, ئەم بۆچونە بەهێزە چەسپاوە, کە کاتێك ئێران دەتوانێت بە ڕێکەوتنێکی گونجاو لە بارەی باجەوە نەوتی خۆی بە نرخێکی باش لە بازارەکانی جیهاندا بفرۆشێت, زیاتر کردنی هاوکاری دارایی ئەمریکا بۆ ئێران سەپاندنێکی نا دادپەروەرانەیە بەسەر کۆڵی باجدەرە ئەمریکیەکانەوە, هەروەها زۆرێك لە هاوولاّتیانی ئەمریکی بە تەواوی دژن لەگەڵ کڕینی نەووتی ئێران لەلایەن ئەمریکاوە, بەبێ ڕێگەچارەیەکی گونجاو بۆ گەیشتن بە ڕێکەوتنێك بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نەوت.

من بەتەواوی لەگەڵ ئەوەدام کە ئەوە مافی دەوڵەتی ئێرانە کە بەسەربەخۆیی دەربارەی سیاسەتە نێوخۆیی و دەرەکیەکانی و ئەوەی کە پەیوەستە بە بەرژەوەندی خەڵکی ئێرانەوە بڕیاری لە سەر بدات, مەبەستی من لە بارەی ئەو بابەتانەی کە لەم نامەیەدا خراوەتە ڕو دیاریکردنی ڕێگەیەك نیە بۆ دەوڵەتی ئێران لە بەدەست هێنانی بەرژەوەندیەکانی خۆیدا, تەنها مەبەستی من ڕونکردنەوەی ئەو بابەتەیە کە بۆچی دەوڵەتی ئەمریکا لەم ساتەوەختەدا نە دەتوانێت هاوکاری زیاتری دەوڵەتی ئێران بکات وە نە دەشتوانێت نەوتی ئێران بکڕێت).

قەیرانەکانی ئێران لەگەڵ بڕیاری (موسەددەق) بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ئەنجامدانی ڕیفراندۆم لە ڕۆژی (٢ ئوت) توندتر بوو, ئەو زانیاریانەی کە لەپەسا بە دەستی ئێمە دەگەیشت ئەوەی دەردەخست کە (موسەددەق) زیاتر لەجاران لە کۆمۆنیستەکان نزیك دەبێتەوە و چاوەڕوانی دەستخستنی (٢٠ ملیۆن دۆلار)ە لەلایەن سۆڤیەتەوە وەك هاوکاریەکی دارایی بۆ دەستەبەر کردنی خەرجیەکانی (٢ تا ٣) مانگی ئایندەی خۆی, حیزبی تودە لە کۆتاییەکانی (مانگی ژوئیە) بە ئاشکرا پشتیوانی خۆی بۆ (دوکتۆر موسەددەق) ڕاگەیاند, ئەنجامی ڕیفراندۆم بە دەنگی

(٩٩,٤٪) بۆ بەرژەوەندی (موسەددەق) ڕاگەیەندرا, ڕۆیشتنی ئێران بەرەو دیکتاتۆرێکی کۆمۆنیستی زیاتر گوژمی دەدا[1].

ئایزەنهاوەر یاداشتەکانی خۆی دەربارەی ڕوداوەکانی ئێران دوای جەختکردنەوە لە سەر مەترسی داکەوتنی ئێران بۆ باوەشی کۆمۆنیستی, بەردەوام دەبێت لەسەر باسکردنی ڕوداوەکانی کودەتای (٢٨ مورداد , ١٩ ئاب) بە بێ ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ باس لە ڕۆڵی ئەمریکا لە ئەنجامدانی ئەم کودەتایەدا بکات, تەنها لە بەشێك لە یاداشتەکانیدا بە هێنانی ئەم ڕستەیە: ( من پێوشوێنی ڕەوشی ئێرانم دەگرت لە دانیشتنە ڕۆژانەکانی خۆم لەگەڵ نوێنەرانی وەزارەتی دەرەوە و وەزارەتی بەرگری و (سی ئای ئەی) دا, وە ڕاپۆرتی کاربەدەستە نێوچەییکانی خۆمان کە چالاکانە هاوکاری لایەنگرانی (شا)یان دەکرد دەمخوێندنەوە), بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دان بە ڕۆڵی ئەمریکادا لەو ڕوداوانەدا دەنێت, هەڵبەتە ئەم بابەتەدوای بلاّو بوونەوەی کتێبی یاداشتەکانی ئایزەنهاوەر, لەلایەن خودی (کرمیت ڕۆزفێڵت) کە ڕاسپێردراوی جێبەجێکردنی پێشنیاری کودەتای (٢٨ مورداد) لە ئێراندا بوو ئاشکرا کرا, ئینگلیزەکانیش لەپەسا دانیان دەنا بە ڕۆڵی خۆیاندا کە لەم ڕوداوەدا هەیانبوو.

لە شیکردنەوەیەکی وردتردا دەربارەی ئەو ڕوداوەی کە بە کودەتای (٢٨ مورداد ١٣٣٢ك,هـ) و ڕوخانی حکومەتی (موسەددەق) کۆتایی هات, دەبێت ئاماژە بە ڕوداوەکانی کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٣١ و جودابوونەوەی (ئایەتولاّ کاشانی) و هاوڕێ دێرینەکانی دیکەی (موسەددەق) کۆتایی هات, بکرێت, (دوکتۆر بەقایی) بەر لە هەموان زمانی ڕەخنەی لەی موسەددەق کردەوە و دوای ئەویش (حسەینی مەکی), کاتی داواکاری (موسەددەق) بۆ درێژکردنەوەی دەسەلاّتی لە ڕادەبەدەری ئەو بۆ ماوەی ساڵێك, بەئاشکرا (موسەددەق)ی خستە بەردەم هێرشی ڕەخنە لێگرتنەوە, لە درێژەی وتارێکی دا لە پەرلەماندا بەقایی وتی: بەم ڕەوشەوە دەست لەکاری پەرلەمان دەکێشمەوە, ڕۆژی (٢٨ دی ١٣٣١ك,هـ)یش (ئایەتولاّ کاشانی) لە درێژەی نامەیەکی دا بۆ پەرلەمان ئەوەی خستە ڕو کە لایحەی درێژکردنەوەی دەسەلاّتی

[1] Dwight Eisenhower- Mes annees a la maison blanche Tome 1 pp, 196-200.

(دوکتۆر موسەددەق) پێچەوانەی دەستورە و دەبێت پەرلەماناتاران دەنگی پێنەدەن, لە دوای ڕاگەیاندنی دژایەتی (کاشانی) بۆ لایحەی درێژکردنەوەی دەسەلأتی موسەددەق, خۆپیشاندان لە تاران و شارەکانی دیکە دا ئەنجامدرا و سەرەنجام پەرلەمان دەنگی بۆ دریژکردنەوەی دەسەلأتی (موسەددەق) دا.

** ** **

هەفتەیەك دوای پەسەند کردنی داواکەی ( موسەددەق) لەلایەن پەرلەمانەوە, حەمە ڕەزاشا بڕیاری دا ئێران بەجێبهێلێت, دەستوەردانەکانی ئایەتولاَ کاشانی بۆ ڕێگرتن لە سەفەرەکەی شا بۆ دەرەوەی ولأت بوویە هۆی دروستبوونی ناکۆکیەکی توند لە نێوان (موسەددەق و کاشانی)دا, دەربارەی ڕوداوی سەفەرکردنی شا بۆ دەرەوەی ولأت لە (ئەسفەندی ١٣٣١ك,ه) دا و ئەو خۆپیشاندانانەی کە بۆ ڕێگرتن لەو سەفەرەی شا لە بەردەم کۆشکی شاهنشاهیدا ئەنجام درا چەندین بابەتی جۆراو جۆرو دژبە یەکی لە بارەوە نوسراوە, لە نێو ئەوانەشدا خودی محەمەدڕەزاشا دەلێت: ( ڕۆژی ٩ ئەسفەندی ١٣٣١ هەتاوی موسەددەق پێی وتم کە بۆ ماوەیەکی کاتی لە ولأت بڕۆمە دەرەوە, لەبەرئەوەی ئازادی لە بۆ جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەی کە گرتبوویە بەر فەراهەم بێنم و تا ڕادەیەکیش دور بم لە فێلّ و دەسیسەکانی ڕەزامەندیم لەسەر پێشنیارەکەی دەربڕی, موسەددەق پێشنیاری ئەوەشی کرد کە ئەم بەرنامەی سەفەر کردنە بە شاراوەیی بمێنێتەوە, ئەوەشی وت کە فەرمان بە (فاتمی) وەزیری دەرەوە دەکات کە خودی خۆی سەرجەم بەلگەنامەکانی سەفەر کردنی خۆم و هاوسەرەکەم و هاوڕێکانم دەربکات, ئەوەی جێگای سەرنج بوو کە موسەددەق بە گوڕوتینێکی تایبەتیەوە داوای ئەوەی دەکرد کە بەفڕۆکە لە ئێران دەرنەچم, لەبەر ئەوە دەیزانی کە خەلکی ئێران دژایەتی ئەو بڕیارەی دەکەن و لە فڕۆکەخانە کۆدەبنەوە ڕێگری لە فڕینی فڕۆکەکەم دەکەن, هەربۆیە لەمبارەیەوە پێشنیاری کرد کە بە شێوەیەکی نەناسراوی تا سنوری ولأتەکانی عێراق و بەیروت سەفەر بکەم, ڕەزامەندیم لەسەر ئەم پێشنیارەشی دەربڕی, بەلأم ئەم نهێنیە ئاشکرا بوو, خۆپیشاندانێکی وەفادارانە بۆ شا ئەنجام درا لەلایەن ژمارەیەکی بیشوماری خەلکەوە

و به ڕادەیەك دڵسۆزانەو بڕوا پێکەربوو کە بە زۆر لە بڕیاری بە جێهێشتنی وڵات پەشیمان بوومەوە)[1].

بەڵام دوکتۆر موسەددەق لە بارەی ئەم ڕوداوەوە گێڕانەوەیەکی دیکەی هەیە و بە کورتی و سادەیی ئاماژەی پێدەکات کە دوای ڕوداوەکەی ۳۰ مانگی تیر ( سەرلە بەیانی ڕۆژێك ئاغای (عەلا)ی وەزیری دەربار لەکاتی سەردانمدا ئەوەی ڕاگەیاند کە خاوەن شکۆ دەیەوێت سەفەرێك بۆ دەرەوەی وڵات بکات, لێم پرسی هۆکاری ئەم سەفەرکردنە چیە؟ وتیان کە خاوەن شکۆ لە بێکاریدا هیلاك بووە, وتم چ کارێك هەیە لەم وڵاتەدا کە بەڕێزیان سەرقاڵ بکات, هەمیشە دەوڵەت کارەکانی خۆی ئەنجام داوە و ئەو کارانەشی کە پێویستی بە ڕەزامەندی دەربار هەبووە نێردراونەتە خزمەتی..), دواتر دوکتۆر موسەددەق ئاماژە بە سەفەرەکەی شا لە (۹ ئەسفەند)دا دەکات و دوای خستنە ڕوی ئەوەی کە نیازی سەفەرکردنی خاوەن شکۆ لەلایەن وەزیری دەربارەوە لە ڕۆژی (۵ ئەسفەند)دا لەگەڵ ئەودا باسی لێوە کراوە, ئەوش دەخاتە ڕو کە ( سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر من چومە خزمەتی (شا) کە چوار کاژێر درێژەی کێشا, بۆچونی خاوەن شکۆ ئەوە بوو کە مانەوەیان لە ئێراندا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێك کەس هاتوچۆی دەربار بکەن و ئەم هاتوچۆیەش ببێتە هۆی ئەوەی کە لە نێو کۆمەڵگەدا بە هەڵە لێك بدرێتەوە, لە بەر ئەوە بەرژەوەندی خۆی و وڵاتیش لەوەدایە سەفەرێك بۆ دەرەوەی وڵات بکات کە لە دو مانگ زیاتر نەخایەنێت بە مەبەستی پشودان و چارەسەری پزیشکی, بە تایبەتیش وتیان کە ئەم گفتوگۆیە دەبێت دەبێت بە ڕادەیەك شاراوە بێت کە هیچکەسێك ئاگادار نەبێت, بۆ ئەوەی بە تەواویش بە شاراوەیی بمێنێتەوە بە فڕۆکە سەفەرەکەی ئەنجام نادات)[2].

دواتر دوکتۆر موسەددەق دەنووسێت: ( لەگەڵ ئەوەی کە خاوەن شکۆ جەختی لەسەر بە شاراوەیی هێشتنەوەی سەفەرکەی دەکردەوە بەڵام تا ڕۆژی ۹ ی ئەسفەند کە وادەی دیاریکراوی سەفەرەکەی بوو خەڵکانێکی زۆر ئاگاداری ئەو سەفەرەبوون و لە نێو ئەوانەشدا بەیانی ڕۆژی شەمە ۹ ئەسفەند (حەزرەتی ئایەتوڵا بەهبهانی) لە

---

[1] ماموریت برای وطنم. ص ۱۲۳_۱۲٤.

[2] د.محمد مصدق: خاطرات و تالمات مصدق, انتشارات علمی, ص۲۱۱_۲۱۳.

ڕێگەی تەلەفونەوە پرسیاری لێکردم کە ئایا خاوەن شکۆ دەیەوێت سەفەر بۆ دەرەوەی وڵات بکات؟ چارەیەکم نەبوو جگەلەوەی کە بڵێم وام بیستوە, ووتی ئەی بۆچی ڕێگری لێ ناکەیت؟ وەڵامم دایەوە وتم دەوڵەت ناتوانێت ڕێگری لە بڕیارەکانی خاوەن شکۆ بکات, خۆتان لەگەڵ دەربارد گفتوگۆ بکەن)[1].

دوای ئەم ڕوداوە پەیوەندیە ئاڵۆزەکەی نێوان (محەمەدڕەزاشا و دوکتۆر موسەددەق) ئاڵۆزتر بوو, ئیدی هیچ دیدارێك لە نێوان ئەو دوانەدا ئەنجام نەدرا,بەڵام لێرە بەدواوە دوکتۆر موسەددەق سەرباری ئەوەی لەبەرامبەر شا و دوژمنە بیانیەکانی خۆیدا دەجەنگی دەست و پەنجەشی لەگەڵ دۆست و یارانی پێشینی خۆشیدا نەرم دەکرد کە لێی جودا بووبوونەوە و ڕۆشتبوونە بەرەی دژی موسەددەقەوە, لە مانگی ئۆردیبەهەشتی ١٣٣٢ هەتاوی دا (سەرتیپ ئەفشار توس)ی سەرۆکی شارەوانی ڕفێندراو چەند ڕۆژێك دواتر تەرمەکەیان لە گردەکانی لشکرگ دۆزرایەوە, (سەرلەشکر زاهیدی و دوکتۆر بەقایی) لە نێو تاوانبارانی پیلانی کوشتنی (ئەفشار توس) بوون, (سەر لەشکر زاهیدی) بە ڕەزامەندی (ئایەتولاَ کاشانی) کە تا ئەو کاتیش سەرۆکایەتی پەرلەمانی لە دەستدا بوو لە پەرلەماندا پارێزرا, وەزیری داد لە دوتوێی نامەیەکی دا بۆ پەرلەمان بە فەرمی (دوکتۆر بەقائی) بە هاوکار لە کوشتنی سەرۆکی شارەوانیدا تاوانبار کرد و داوای لێسەندنەوەی مافی پارێزگاری (حەصانە)ی ئەوی کرد, دوکتۆر موسەددەق داوای لە لایەنگرانی خۆی لە پەرلەماندا کرد ڕێگری بکەن لە دوبارە هەڵبژاردنەوەی (ئایەتولاَکاشانی) بۆ سەرۆکی پەرلەمان, سەرەنجام (دوکتۆر عەبدولاَ موعەزەمی) لە دانیشتنی ڕۆژی (١٠ ی تیری ١٣٣٢ هەتاوی) بە بەدەست هێنانی (٤١) دەنگی پەرلەمانتاران بۆ سەرۆکی پەرلەمان هەڵبژێردرا, لەم دانیشتنەدا (٣١) پەرلەمانتار دەنگیان بۆ دوبارە هەڵبژاردنەوەی (ئایەتولاَ کاشانی) دا.

ڕۆژی (٢٠ تیر) یەکێك لە پەرلەمانتارە نەیارەکانی (علی زهری) داوای لێپرسینەوەی لە دەوڵەتەکەی دوکتۆر موسەددەق کرد, دوکتۆر موسەددەقیش وا هەستی کرد کە زۆرینەی خۆی لە پەرلەماندا لە دەست داوە و کەوتە بیری

---

[1] خاطرات و تالمات مصدق: ص ٢١٤.

هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان, سەرەتا (٢٠)کەس لە پەرلەمانتارانی فراکسیۆنی (نهضت ملی) دەستیان لە کار کێشایەوە و دواتر (موسەددەق) پرسی ڕیفراندۆمی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان هێنایە کایەوە, سەرباری نارەزایی محەمەدرەزاشا, دوکتۆرموسەددەق ڕیفراندۆمی بۆ هەڵوەشاندنەوەی خولی هەڤدەیەمی پەرلەمانی ئەنجام داو ڕۆژی (٢٠ مورداد) لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەنجامی ڕیفراندۆمەکەدا هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانیش ڕاگەیەندرا.

** ** **

دەربارەی ڕودانی ڕوداوەکانی (موردادی ١٣٣٢ک.ھ) کە بە ڕوخانی حکومەتەکەی (دوکتۆر موسەددەق) کۆتایی هات, بابەتانێکی زۆر بەتایبەتیش لە ساڵانی دوای شۆڕشی ئیسلامیدا بلاوکراونەتەوە, بەلام تەواوی ڕاستیەکان لە بارەی ئەم ماوە گرنگ و هەستیارەی مێژوی هاوچەرخی ئێران نەخراونەتە ڕو, هێشتا هەندێك ڕاستی لە پشتی پەردە نهێنیەکانەوە حەشار دراون و ماونەتەوە, ڕاستی حاشاهەڵنەگر ئەوەیە کە پێشنیاری کەنارخستنی حکومەتەکەی دوکتۆر موسەددەق لە لەندەن و واشنگتۆن ئامادە کراوە و ئامادەکارو جێبەجێکاری ئەم پێشنیارەش (کرمیت ڕۆزفێڵت)ی ئەندامی ڕێکخراوی (سی ئای ئەی) بوو, کە ڕۆژی (٧ ژوئی ١٩٥٣ز , ١٦ تیری ١٣٣٢ک.ھ) لە ڕێگەی سنورەکانی وڵاتی عێراقەوە ڕۆشتە خاکی ئێران[1], لە نیوەی دوەمی مانگی تیردا چالاکانە سەرقاڵی ئامادەو جێبەجێکردنی سەرەتاکانی ئەم پێشنیارە بوو, لە بەرامبەر ئەوەشدا بڕیارەکەی (دوکتۆر موسەددەق) بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ئەنجامدانی ڕیفراندۆم کە بوویە بەهانەی لادانی خۆی لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی و دەرکردنی فەرمانی سەرۆك وەزیرانی بۆ (فەزلوڵای زاهیدی), هۆکارێکی کاریگەر نەبوو لە ڕوداوەکانی دواتردا, خاڵێکی شاراوەی دیکە لە ڕوداوەکانی مانگی (موردادی ١٣٣٢ک.ھ) ڕۆڵی ڕاستەقینەی شایە لە سەرجەم ڕوداوەکاندا, یەکێك لە وردترین و نوێترین توێژینەوەکانی کە دەربارەی ڕۆڵی

---

[1] وەرگیراوە لە لە وتەکانی جیمز بیل شارەزای کاروبارەکانی ئێران, وەرگیراوە لە: جیمز بیل, ویلیام راجر لوئیس: مصدق, نفت, ناسیونالیسم ایرانی, ت. عبدالرچا هوشنگ مهدوی, کاوە بیات, نشر نو, ص٤٥٩.

ئەمریکاو ئینگلیز لە کودەتای (٢٨ مورداد ,١٩ ئاب ١٩٥٣ز) ئەنجامدراوە و لە ساڵی (١٩٨٧ز) لەلایەن زانکۆی ویلایەتی (لویزیانا)ی ئەمریکاوە بلاْوکراوەتەوە, تاڕادەیەك ئەم خاڵە شاراوە ڕۆشن دەکاتەوە, لەم توێژینەوەیەدا کە بە وەرگێردراوی فارسیش بلاْوکراوەتەوە, هاتوە, کە پرسی کەنارخستنی (موسەددەق) و دیاریکردنی (زاهیدی) بۆ جێگرتنەوەی ئەو, یەکەمجار لە دیداری ڕۆژی (٣٠ مەی , ٩ خورداد ١٣٣٢ك,ه) نێوان (هندرسۆن) باڵوێزی ئەمریکا و (محەمەدڕەزاشا)دا لەلایەن باڵوێزەکەی ئەمریکاوە خرایە ڕوو, (شا) ئارەزومەندی لە بۆ ئەم کارە نیشان نەدا, لە کۆتاییەکانی مانگی ژوئی (سەرەتاکانی مانگی مورداد) یشدا, چەند هەوڵێك لە چەندین ڕێگەی جیاوازەوە درا, یەکێك لەو هەولاْنەش لەلایەن (ئەشرەف) خوشکە هاوسکەکەی (دوانە) شا وە بوو بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەندی و هاوکاری شا بۆ پێشنیاری کەنارخستنی (موسەددەق), بەلاْم دیسان (شا) ئەوەشی ڕەتکردەوە, دواتر ژەنەڕاڵ (شوارتسکف) ڕاوێژکاریئەمریکایی پێشوی ژاندارمیری کە لە نزیکەوە دۆستایەتی لەگەڵ (شا)دا هەبوو بۆ ڕازیکردنی (شا) بۆ هاوکاریکردنی جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە سەردانی (تاران)ی کرد, (سوارتشکف) دیداری لەگەڵ (شا)دا ئەنجام دا, (بەلاْم هێشتا (شا) ئامادە نەبوو هاوکاری ئەو بەرنامەیەی (سی ئای ئەی) بکات, ئەمجا (سوارتشکف) ئامۆژگاری (ڕۆزفێڵت)ی کرد کە خودی خۆی سەردانی (شا)بکات, ڕەشیدیەکان ئەم پەیوەندی و سەردانەیان ڕێکخست, سەرەنجام (شا) دوای پشتگیریەکی فەرمی ئەمریکاو بەریتانیا کە لە ڕێگەی پەیامێکی تایبەتی ڕادیۆییەوە ڕاگەیەندرا, ڕازی بوو کە پشتیوانی جێبەجێکردنی بەرنامەی کودەتا دژی (موسەددەق) بکات, بە بەدەست هێنانی هاوکاری (شا) دەستەی (ڕۆزفێڵت) ئامادەی دەستپێکردنی چالاکیەکە بوو, فەرمانی کەنارخستنی (موسەددەق) و دانانی (زاهیدی) ئامادە کراو لەلایەن (شا) وە واژۆ کرا, شەوی (١٥ ئوت , ٢٤ مورداد) سەرهەنگ (نیعمەتولاْی نەسیری) فەرماندەی گاردی شاهنشاهی فەرمانی کەنارخستنەکەی گەیاندە دەستی (موسەددەق), بەلاْم (موسەددەق) کە پێشتر لە چۆنیەتی پیلانەکە (لەوانەیە بە هۆی حیزبی تودەوە) ئاگادار بوو, فەرمانەکەی بە نایاسایی داناو فەرمانی دەستگیر کردنی (نەسیری)دەرکرد, لەم کاتەدا هێزە لایەنگرەکانی موسەددەق لە شوێنە جیاوازەکانی شاردا جێگیر بوون, پەرلەمانتارە

دژەکان و ئەفسەرە گومان لێکراوەکان بە هاوکاری لە پیلانەکەی (زاهیدی) دا و وەزیری دەربار دەستگیر کران, هەراوهوریایەکی فراوانیش بۆ دەستگیر کردنی (زاهیدی) دەستی پێکرد و بڕی (١٠٠٠٠٠) سەد هەزار ڕیاڵ وەك دیاری بۆ دەستگیر کردنی ئەو دیاری کرد, سەرەنجام هەوڵەکانی ئەو بەشەی هێزەکانی (زرهی) کە بڕیار بوو لەگەڵ ڕاگەیاندنی فەرمانی کەنارخستنی (موسەددەق) دا دەست بەسەر شاری تاران دا بگرن شکستی هێنا, محەمەدڕەزاشا بە بێ ئەوەی دەستەی (ڕۆزفێڵت) ئاگاداری بڕیارەکەی خۆی بکات بە هەراسانی ولاّتی بەجێ هێشت, ئەو سەرەتا بۆ شاری (بەغداد) و دواتر هەڵهات بۆ (ڕۆم)[1].

ڕوداوانێك کە دوای شکستی یەکەمی کەنارخستنی حکومەتی (موسەددەق) تا ڕۆژی (٢٨ مورداری ١٣٣٢ك.ھ)یش ڕویان دا خاڵی نیە لە نهێنپارێزی و خاڵی شاراوە: دوای ڕاگەیاندنی هەواڵی (شکستی پیلانی کودەتا) لە لایەن دەوڵەتەوە و هەڵهاتنی (شا) لە ئێران, لە ڕۆژی (٢٥ مورداد) خۆپیشاندانی لە ڕادەبەدەری خەڵك لە شاری تاران و شارەکانی دیکە بۆ لایەنگری حکومەتەکەی (موسەددەق) دەستی پێکرد کە تیایدا تودەییەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان گێڕا, لەلایەکی دیکەوە دژەکانی (موسەددەق) لەگەڵ شکاندنی فەرمانی (شا) بە کەنارخستنی موسەددەق و دانانی زاهیدی لە پۆستی سەرۆك وەزیری دا, موسەددەقیان بە ئەنجام دانی کودەتاو شکاندنی فەرمانی (شا) تاوانبار دەکرد و حکومەتەکەیان بە نایاسایی ناودەبرد, لە ڕۆژانی (٢٦ و ٢٧ ی مورداد) ئەو خۆپیشاندانەی کە بۆ لایەنگری حکومەتەکەی (موسەددەق) ئەنجام درا زیاتر ڕەنگ و بۆنی کۆمۆنیستی دەدا و دروشمەکانیان بە لایەنگیری جێگیربوونی کۆماری دیموکراتی, کە هەمان دروشمی باوی کۆمارەکانی کۆمۆنیستیە, بەرز دەکردەوە, لەئەو توێژینەوەیەی کە ئاماژەی بۆ کراوە, خودی نوسەر لەگەڵ دەستەیەك لە ئەندامانی (سی ئای ئەی) و ئەو ئەندامانەی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کە ڕاستەوخۆ لە نێو کارەکانی بەرنامەی کەنارخستنی (موسەددەق) دا بوون, دیدار وچاوپێکەوتنی ئەنجام داوە, ڕۆڵی (سی ئای ئەی)یی لە

---

[1] مارك.ج.گازیورسکی: کوتای ٢٨ مرداد ١٣٣٢, ت. سرهنگ غلامرزا نجاتی, شرکت سهامی انتشار, ص٣٤_٣٥.

کەنارخستنی (موسەددەق)دا ئاشکرا کردوە و دەنووسێت: بەکرێگیراوە ئێرانیەکانی (سی ئای ئەی) ((کە نوسەر ئەوانی بە ناوی خوازراوی (نرن و سیلی) ناساندوە)), پارەیان داوە بە چەند دەستەیەك و ڕۆژی (١٧ ئوت ,٢٦ مورداد) بە هوتاف کێشان و وتنەوەی دروشمەکانی حیزبی تودە و هەڵگرتنی ئەو ئارمانەی کە تیایاندا سوکایەتی و سەرزەنشت کردنی بە (شا) لە خۆ گرتبوو, کەوتنە خۆپیشاندان لە شاری تاراندا, ئەم کۆمەڵە تودەیی کراوانە کە عەسری ڕۆژی پێشو بڕی (٥٠) هەزار دۆلار وەك کرێی ئەوان لە ڕێگەی یەکێك لە فەرمانبەانی (سی ئای ئەی)ەوە درابوو بە (نرن و سیلی), ئەمانە ئەرکی ئەوەیان پێ سپێردرابوو کە بە هۆی مەترسی دروستبکەن بە دەسەلآت گەیشتنی تودەییەکان, پێگەی (زاهیدی) بەهێزبکەن, زۆری نەبرد کە ئەندامە ڕاستەکانی حیزبی تودە, بێئاگا لە ڕۆڵ و ئامانجی (سی ئای ئەی) لە دروستکردنی ئەم خۆپیشاندانەدا, چونە ریزی خۆپیشاندەرانەوە و لەگەڵیاندا هاوئاواز بوون, ئەوان پەیکەرەکانی (شا) و باوکیشیان هێنایە خوارەوە و هێرشیان کردە سەر گڵکۆی (ڕەزاشا), ئەم خۆپیشاندانە ڕۆژی دواتریش درێژەی کێشا, بەجۆرێك کە (هندرسون)ی باڵوێزی ئەمریکا لە تاران داوای کرد کە هێزەکانی پۆلیس کە لە بارەگاکانی خۆیانەوە چاودێری ڕەوشەکەیان دەکرد بجوڵێن بۆ بلآوە پێکردنی خۆپیشاندەران,لەم کاتەدا (دوکتۆر موسەددەق) بڕیارێکی دەرکرد کە سەرەنجامەکەی شوم و چارەنوس ساز بوو, ئەو بڕیارەش دەربڕینی ڕەزامەنی بوو بە داواکەی باڵوێزی ئەمریکا بۆ بلآوەپێکردنی خۆپیشاندەران, سەرانی حیزبە تودەش ئەندامەکانی خۆیان لە شەقامەکانی تاراندا بلآوە پێکرد, ڕۆژی (٢٨ مورداد) زۆرێك لە پۆلیسەکان ڕۆشتنە ڕیزی خۆپیشاندەرانەوە, تودەییەکانیش ئەندامەکانی خۆیان لەو هەرایە دورخستەوە و شەقامەکانیان چۆڵکرد, بەم شێوەیە هیچ هێزێك نەمایەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی لایەنگرانی (زاهیدی) کە لەو ڕۆژەدا هاتبوونە سەر شەقامەکان.[1]

ژزار دو ویلیە ی نوسەری فەڕەنسی کە پێشتریش ئاماژە بە هەندێك بابەتی کتێبەکەی ئەو لە بارەی (شا)وە کراوە, دەربارەی دیداری (هندرسون)ی باڵوێزی ئەمریکا لەگەڵ (دوکتۆر موسەددەق) دا لە ڕۆژی (٢٧ مورداد) باسێکی دورودرێژە

---

[1] گازیورسکی: کودتای ٢٨ مرداد ١٣٣٢, ترجمه, غلامرزا نجاتی, ص٣٥_٣٦.

نوسیوە و دوای ئاماژەدان بەوەی کە دوکتۆر موسەددەق لەو ڕۆژەدا دوچاری حاڵەتێکی شێواوی و گێژبوون و قەیرانێکی قوڵ بووبوویەوە, دەنووسێت: کاتێك کە (هندرسون) مەترسی تەواوی دەسەڵات گرتنەدەستی تودەییەکان و سەرەنجامی کارەسات باری ئەوانی بۆ ئێران باسکرد و داوای لە موسەددەق کرد کە ڕێگری بکات لە بەردەوامی خۆپیشاندنەکان و دەستوەردانەکانی حیزبی تودە, دوکتۆر موسەددەقیش, لەوانەیە بەو ئومێدەی کە بە وەڵامدانەوەی داواکەی باڵوێزی ئەمریکا زەمینەیەك بۆ گۆڕانکاری سیاسەتی ئەمریکا لە ئێران دا بسازێنێت, دەست بەجێ داواکەی پەسەند کرد و بە ئامادەیی باڵوێزی ئەمریکا فەرمانی کۆتایی پێ هینانی خۆپیشانی تودەییەکانی دەرکرد, هندرسون لە کاتی گەڕانەوەی لە ماڵی دوکتۆر موسەددەق لەکەڵ کیم ڕۆزفێڵت (جێبەجێکاری بەرنامەی کەنار خستنی موسەددەق) و زاهیدی سەرۆك وەزیرانی دانراوی (شا) دیدارێکی ئەنجام دا و هەرسێکیان گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی کە کاتی دەستپێکردنی کارەکە گەیشتوە, دو ویلیە بۆی زیاد دەکات و دەنووسێت کە کەمێك دوای دیداری هندرسۆن لەگەڵ موسەددەقدا, (لاوەرنیتف)ی باڵوێزیسۆڤیەت, کە لەو ڕۆژگارانەدا لە هەمو باڵوێزەکان زیاتر لەگەڵ دوکتۆر موسەددەق دا تێکەڵ بوو, تەلەفونی بۆ کرد و دەربارە بابەتی دیداری باڵوێزی ئەمریکا لەگەڵ ئەودا پرسیاری لێکرد, لەو تەلەفونەدا دوکتۆر موسەددەق لەگەڵ ئەوەی کە دڵنیا بوو لە هەبوونی جاسوسانی سۆڤیەتی لە ماڵەکەی خۆیدا, خۆی بووارد لە ئاشکرا کردنی بابەتی گفتوگۆکەی لەگەڵ باڵوێزی ئەمریکادا و ووتی: کارێکی گرنگ نەبووە[1]!.

بابەتێکی گرنگی دیکە کە گومانی زیاتر دەخاتە سەر بابەتەکە ئەوەیە کە دوکتۆر موسەددەق نەك تەنها بە دەرکردنی فەرمانی ڕێگری لە بەردەوامی خۆپیشانانی تودەییەکان, ئەوانی لە ڕۆژی چارەنوس سازی (٢٨ مورداد, ١٩ ئابی ١٩٥٣ز) لە تەختی شانۆکە وەدەرنا, بەڵکو داوای لە لایەنگرانی خۆیشی کردبوو کە لەو ڕۆژەدا لە ماڵەکانی خۆیاندا بمێننەوە و نەیەنە دەرەوە, دوکتۆر ئەنوەر خامەیی لە خەلیلی مەلەکی کە یەکێك بووە لە دۆست و لایەنگرە توندەکانی موسەددەق,

---

[1] Gerard de Villiers, pp. 241- 242.

دەگوازێتەوە و دەنووسێت: (موسەددەق فەرمانی بە سەرجەم لایەنگرانی خۆی کردبوو کە بچوکترین پێشڕەوی نەکەن, تەنانەت لە ماڵیش نەیەنە دەرەوە, چونکە ئەو ئاگای لەو پیلانە هەیە و بەهۆی هێزی سەربازیەوە پێشیان پێ دەگرێت و کودەتاکە شکست پێدەهێنێت, مەلەکی بەپێی ئامۆژگاریەکانی موسەددەق سەرجەم ئەندامانی حیزبەکەی خۆی ناردە دەرەوەی شار و جگە لە یەك دو پاسەوانی بارەگای حیزب کەسی نەهێڵابوویەوە, بۆچی موسەددەق وەها فەرمانێکی دەرکردبوو..؟ ئەمە مەتەڵێکە کە هێشتا بۆ من شیکار نەکراوە).[1]

تەنانەت دوکتۆر موسەددەق ئەو دەست پێشخەریەشی کە ئایەتوڵا کاشانی لە هەستیار ترین ساتەکاندا بۆ ئەوی درێژکرد ڕەت کردەوە و مەترسی و هۆشداریەکانی ئەوی لە بارەی هەرچی زوتری مەترسی ڕودانی کودەتاوە لە بەرچاو نەگرت, ئایەتوڵا کاشانی لە نامەیەکیدا کە لە بەرواری (٢٧ مورداد ی ١٣٣٢)دا بۆ دوکتۆر موسەددەقی ناردووە ئاماژەی بە مەترسی (ڕودانی کودەتایەك) کردووە, تیایدا بانگهێشتی هاوکاری کردنی موسەددەق بۆ چارەسەر کردنی ئەم مەترسیە دەکات. لەبەر گرنگی ئەم نامەیە وەك بەڵگەنامەیەك دەقەکەی لە خوارەوە دەنوسین:

*٢٧ مورداد–, حەزرەتی سەرۆك وەزیرانی پایە بەرز جەنابی ئاغای دوکتۆر موسەددەق*

*پێتان ڕادەگەیەنم, هەرچەندە کاتی وتەکانیشم نەماوە بەڵام بەرژەوەندی ئاینی و نەتەوەیی بۆ ئەم خزمەتکارەی ئیسلام لە سەرو هەمو ویستێکی تایبەتیەوەیە, سەرەڕای دژایەتی کردنەکان و هەڵاو هوریای ڕاگەیاندنەکان, ئێوە خۆتان لە هەمو کەس باشتر ئەوە دەزانن کە گرنگی دان و خەم خواردنی من بۆ پاراستنی دەوڵەتەکەی بەڕێزتانە کە خۆتان ئارەزوی مانەوەی ناکەن, لە ئەزمونەکانی هاتنە سەر کاری قەوام و چەلەحانێکانی ئەم دواییە بۆ من ڕون و ئاشکرایە کە ئەتانەوێ وەك ڕوداوی (٣٠ تیر) جارێکی دیکە میللەت بە تەنهایی بە جێبهێڵن و خۆتان وەك پاڵەوان بۆی دەرباز بن, وتەکانی بەندەت لە بارەی پێداگریم لە سەر ئەنجام نەدانی ڕیفراندۆم گوێ پێنەداو منت کردە*

[1] از انشعاب تا کودتا (جلد سوم خاطرات انور خامەای), انتشارات هفته١٣٦٣– صفحه٤٣٨.

*پەڵەیەکی پیس و ڕسوا، ماڵەکەمتان بەر باران و هاوەڵان و منداڵانمتان زیندانی کرد، ئەو ئەنجومەنەی (پەرلەمان) کە ترست هەبوو لە سەر کار لات بدەن داخست و ئێستاش نە ئەنجومەنێك هەیە و نە پەناگەیەکت بۆ ئەم میللەتە هێشتوەتەوە، (زاهیدی) کە من بە زەحمەت خستبوومە ژێر چاودێری و کۆنترۆڵم کردبوو بە فرتو فێڵ کردتە دەرەوە و ئێستاش بەوشێوەیەی کە دەردەکەوێت لە هەوڵی کودەتادایە، ئەگەر نەخشەی بەڕێزتان نیە کە وەك (٣٠ تیر) پاشەکشە بکەیت و بە ڕواڵەت بە پاڵەوانی زەمانە بمێنیتەوە، ئەگەر گومان و بۆچونی من ڕاست نیە هەروەك لە کۆتا دیدارم لە (دزاشیب) بە ئێوەم وتبوو، هێنابووشم بە گوێی (هندرسۆن) دا کە ئەمریکا هاوکاری ئێمەی کرد لە وەرگرتنەوەی نەوت لە ئینگلیزەکان، ئێستا خراپە کە بەڕێزتان وەك نەتەوەیی و دونیا ویستی دەتانەوێت ئەم سامانە بخەنە ژێر چنگی خۆتانەوە، ئەگەر بەڕاستی ناتەوێت لابچیت ئەوا ئەم نامەیە بەڵگەیەك دەبێت لە مێژوی گەلی ئێراندا کە سەرڕای هەمو ئەو خراپانەی کە بەرامبەر من کردوتە، ئێوە لە ڕودانی کودەتایەکی حەتمی لە لایەن (زاهیدی)ە وە کە یەکانگیرە لەگەڵ نەخشەی خۆتاندا ئاگادار دەکەمەوە بۆ ئەوەی سبەی ڕۆژ ڕێگای هیچ پاساوێك نەبێت، ئەگەر بەڕاستی لەم بیرکردنەوەدا من هەڵە دەکەم ئەوا بە ویستی ئێوە (سەید مستەفا و ناسر خانی قەشقائی) بەمەبەستی وتووێژ دەنێرمە لاتان. خودا ڕەحم بە هەمولایەکمان بکات، ڕۆژگارتان پڕ لە خۆشی بێت. سەید ئەبوولقاسمی کاشانی.*

لە وەڵامی ئایەتوڵا کاشانی دا، دوکتۆر موسەددەق وەڵامێکی کورت و سوکایەتی ئامێزی بەم شێوەیە نوسیوە و بە هەمان ئەو کەسەی کە نامەکەی کاشانی بۆ هێنابوو بۆی ناردەوە: (٢٧ مورداد–، *نوسراوی بەڕێزتان بە هۆی ئاغای (حسن سالمی) گەیشت، بەندە چاوەڕێی پشتیوانی گەلی ئێرانم، والسلام، دوکتۆر محەمەد موسەددەق).*

نامەکەی کاشانی بۆ دوکتۆرموسەددەق، (هەرچەندە دەربارەی ڕاستێتیەکەی چەند گومانێك هەیە)، هەلێکی گونجاو بوو بۆ دوکتۆر موسەددەق کە لەو کاتەهەستیارەدا جارێکی دیکە دەستی هاوپەیمانی و دۆستایەتی بدایەوە بە ئایەتوڵا

کاشانی و بە سود وەرگرتن لە دەسەڵاتی مەعنەوی ئەو, پیلانی دوژمنان لە بار ببات, گوێنەدان بەم نامەو فەرمانی بەرگری نەکردنی لایەنگرانی ئەو گومانە بە هێز دەکات کە دوکتۆر موسەددەق بێباك بووە لە سەرەنجامی ئەم کارە, یان ئیدی ئومێدی بە سەرکەوتنی ئەو بەرنامەیە نەبوو کە گرتبوویە بەر, خودی دوکتۆر موسەددەق دەربارەی کۆتا ڕووداوەکانی حکومەتەکەی خۆی دەنووسێت: ((هەموان دەزانن کە عەسری ڕۆژی ٢٧ مورداد فەرمانم دەرکرد کە هەرکەسێك باس لە دەوڵەتی کۆماری بکات, ئەوا سزا بدرێت, بەرنامە وابوو کە داوا لە خاوەن شکۆی پایەداری شاهنشاهی بکرێت کە هەرچی زوترە بگەڕێتەوە بۆ ئێران و هەرچۆنێك کە دەیەوێت شورای سەڵتەنەتی دیاری بکات, تا کارەکان نەوەستن و کاری ئاسایی و سروشتی خۆی بەڕێ بکات...)).

دوای ئەم ڕونکردنەوەیە دوکتۆر موسەددەق دەنووسێت: (من نەك بە کۆماری دیموکراتی بەڵکو بە هیچ ناوێکی دیکە ڕازی نەدەبووم, چونکە گۆڕینی ناوی ڕژێم نابێتە هۆی پێشکەوتنی گەل و وڵات, هەتا گەلێکی هوشیار و پیاوی دانا نەبێت ئیش و کاری وڵات بە هەمان ڕێچکەی خۆی دەڕوات, چەندە زۆرن وڵاتانێك کە سیستمی فەرمانڕەواییان کۆمارییە بەڵام ئازادیان نیە, وە چەندە زۆرن ئەو وڵاتانەی کە فەرمانڕەوایی دەستوریان هەیەو لە ئازادی و سەربەخۆیی بە تەواوی بەهرەمەندن, بۆ من و کەسانێکی وەکو من بێگانە هەر بێگانەیە, لە هەر ڕواڵەت و پۆشەرێکدا بێت, بەڵام دەتوانین چی بکەین کە سەرجەم دەستە بەکرێ گیراوەکانی بێگانە دەیانەوێت شوێنکەوتوانی خۆیان بکەنە فەرمانڕەوایی ئەم مەملەکەتە و کەسانی وەکو منیش لەناو ببەن)[1].

ئەگەر بڕوا بەم وتەیەی موسەددەق بکەین, وە بەڵگەیەکیشمان نیە کە ڕەتی ئەمە بکاتەوە, بەتایبەت بە جەخت کردنەوەی دوبارەی لەسەر ئەوەی کە ( من نە ویستومە سیستمی پشتاوپشتی پاشایەتی بگۆڕم وە نە ڕژێمی دەستوریش بە کۆماری, ئەویش کۆماری دیموکراتی!)[2]. تەنانەت لە کاتی شکستی کودەتا دژی

---

[1] دکتر محمد مصدق: خاطرات و تالمات مصدق, انتشارات علمی, ص ٢٧٢_٢٧٣.

[2] دکتر محمد مصدق: خاطرات و تالمات مصدق, ص٢٧٣.

موسەددەق و مانەوەی لە پۆستی سەرۆك وەزیرانیش دا, دوکتۆر موسەددەق زەمینە سازی گەڕانەوەی ڕژێمی پاشایەتی و خودی (حەمە ڕەزاشا)ی بۆ ئێران فەراهەم دەکرد, چ جا ئەوەی کە محەمەد شا لە ڕەوشێکی گونجاوتر پەسەند کردنی ئەسڵی سەڵتەنەت نەك حکومەت دەگەڕایەوە بۆ وڵات, و ئەو گەندەڵیانەی کە لە ئەنجامی دەستوەردانی بێگانەکان لە هێنانەوەی محەمەد شا و گەیاندنەوەی بە دەسەڵات ئەنجام دەران, ڕویان نەدەدا.

بە هەر حاڵ, لە ڕۆژی چوار شەممە (٢٨ مورداد ١٣٣٢ , ١٩ ئاب ١٩٥٣ن) دا دوکتۆر موسەددەق خۆی دایە دەستی چارەنوس, ئەو خۆپیشاندانانەی کە لە ئەنجامی چەند گروپێکی سەدان کەسیەوە لە شەقامەکانی تاران دا دەستی پێکردبوو, کە (نوسەر) خۆم شاهیدی بێ بایەخی خۆپیشاندانی کاتژمێرەکانی سەرەتایی ئەو بەیانیە بووم لە شەقامەکانی ناوەندی شاردا, تا نیوەڕۆی ئەوڕۆژە گۆڕدرا بۆ خۆپیشاندانێکی چەند هەزار نەفەری و لە کاتژمێرەکانی دوای نیوەڕۆدا لەگەڵ چونە ناوەوەی پۆلیس و سەربازەکان بۆ نێو خۆپیشاندەران دەست گیردرا بەسەر ڕادیۆ و شارەوانی و سەرجەم ناوەندە هەستیارەکانی دەوڵەتی و سەربازی, لەو دەیان و سەدان وهەزاران خۆپیشاندەرانەی کە ڕۆژانی پێشوتر دەڕژانە سەر شەقامەکان و دروشمیان بۆ لایەنگری موسەددەق دەوتەوە, لەو ڕۆژەدا لەسەر شەقامەکاندا نەدەبینران, وە ئەمەش خواستی خودی دوکتۆر موسەددەق بوو, تەنها لە ماڵەکەی موسەددەقداپارێزەرە تایبەتیەکانی ئەو لەبەرامبەر هێرش بەراندا بەرگریان دەکرد, کە ئەویش چەند کاژێرێك زیاتر درێژەی نەکیشا, کاتی داهاتنی شەو لەو خانوەی کە پێش دوو ساڵ چەقی قورسایی سیاسەتی ئێران و بگرە جیهانیش بوو, جگە لە وێرانەیەك هیچی دیکەی لێ بەجێ نەمابوو.

ڕۆڵی ئەمریکا لە گەڕانەوەی محەمەد شا بۆ تەختی سەڵتەنەت گەندەڵکاریەکی هێنایە بوون کە سەرەنجامەکەی بیست و پێنج ساڵ دواتر بە شۆڕشی ئیسلامی ئێران و روخانی ڕژێمی شاهنشاهی کۆتایی پێ هات, چڵەپۆپەی ئەمگەندەڵیانە باوەڕی شا بوو بە ئەمریکیەکان و ڕۆژ بەڕۆژ وابەستە بوونی زیاتری ئەو بوو بە سیاسەتی ئەمریکاوە, خراپەکاریەکی دیکە ئارەزومەندی شا بوو بۆ بە پیرەوە چونی حکومەتێکی ڕەها و خۆ سەپێن, کە بە درێژایی کات سەرجەم ئەو خراپەکاریانەی کە

حکومەتە سەرکوتکەرەکان لە دەرونی خۆیاندا پەروەردەی دەکەن ئەنجامی دا, بهێلەو شۆرشەی کە لە سالی (١٣٥٧ هەتاوی ,١٩٧٩ز) دا بلێسەی سەند پێیگەیاند,(لەناوی برد).

# سورەییا و یاداشتەکانی

**عەشقە ئەمریکیەکەی شا, هەڵبژێردراوەکانی دیکە بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ (شا) دا, سورەییا چۆنیەتی ئاشنایی و هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ (شا) دا باس دەکات, دەربارێکی ژنانە!, تایبەتمەندیەکانی ڕەوشتی (شا) لە زمانی سورەییا وە, هەژاری و بێ پارەیی شا لە سەردەمی حکومەتی موسەددەق دا!, سورەییا تەنها عەشقی ڕاستەقینەی شا بوو, پەیوەندی شا و سورەییا دووای لێك جودابوونەوەیان...,**

لە ساڵی (١٣٢٤) هەتاویەوە تا (فەوزیە) ئێرانی بە جێهێشت, هەتا ساڵی (١٣٢٩)هەتاوی کە (شا) ژنی دووەمی هێنا, دەنگۆ گەلێکی زۆر دەربارەی ژیانی تایبەتی (شا) و پەیوەندی لەگەڵ ژنان دا لە بابەتە گەرم و گوڕەکانی چاپەمەنیە بیانیەکان بوو, ئەم دەنگۆیانە بە تایبەت دووای سەفەرەکەی (شا) وە بۆ ئەمریکا زیاتر پەرەی سەند, وەناوی هونەرمەندە دیارەکانیش لەم مەیدانەدا کەوتە سەر زمان, دیارترین عەشقی (شا) پێش هاوسەرگیری لەگەڵ سورەییا دا, کە خودی سورەییاش لە یاداشتەکانی خۆیدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ کردووە, عەشقی (شا) بووە بۆ (روت –ستیڤنس/Ruth Stevens), کە ڕۆژنامە و گۆڤارە دیارە ئەمریکیەکانی وەك (تایم) دا ڕەنگی داواتەوە, گۆڤاری (تایم) لە ژمارەی مانگی ژوئێن ١٩٥٠ز خۆی دا, وێنەیەکی (روت–ستیڤنس)ی بلاّو کردووەتەوە و ئەوی بە کچێك لە خانەوادەیەکی ناوداری ئەمریکی ناساندووە, کە کاتی سەفەری (شا) بۆ ئەمریکا لە مەجلیسێکی میوانداری فەرمی دا پێی ناسێنراوە, گۆڤارەکە ڕونکردنەوەی زیاتری لە بارەی چۆنیەتی ئاشنا بوونی (شا)ی لەگەڵ ئەو کچەدا نەداوە, بەلاّم لە کتێبێکدا بە

نێوی (واشنگتن – محرمانە) کەپێشتر ئاماژەی بۆ کراوە, ڕونکردنەوەیەکی دووروودرێژی دەربارەی ئەم جۆرە ئاشنایەتیە بە ڕواڵەت ڕێکەوتەی نوسیوە, نوسەرانی ئەم کتێبە, لە هەمان ئەو بەشەی کە ئاماژەیان بۆ خۆشگوزەرانیەکانی (شا) لەمریکا و بەخشینی موستیلەیەکی زمرودی (۲۰۰۰۰) دۆلاری بە دیاری لەلایەن (شا) وە بۆ کچێکی ئەمریکی داوە, دەنوسن: وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بۆ میوانە پلە بەرزە بیانیەکان ژنانی گەنج و جوانیان هەیە کە نازناوی (کچانی دەوڵەتی)یان لێنراوە, ئەم کچانە لە ڕێوڕەسمە میوانداریە فەرمیەکان یان تایبەتەکان دا بە میوانەکان دەناسێنرێن, یان لەلایەن فەرمانبەرانی پێشوازیەوە دەنێردرێنە خزمەت میوانەکان, بەگشتی کاری سیخوڕی و هەاڵگریشیان لە ئەستۆدا هەیە, لە کاتێکدا کە بتوانن پەیوەندی زیاتر و درێژتر لەگەڵ میوانەکان دا دروست بکەن, ئەوا زیاتر بە ئەنجامدانی کارەکەیان بەهرەمەند دەبن, بەڕواڵەت (روت – ستیڤنس)یش یەکێك بووە لەو کچە دەوڵەتیانە, کە لە هونەری دڵرفێنی دا ناوبانگێکی باشی هەبووە, بەڕادەیەك (شا) مەفتونی خۆی دەکات کە دووای یەك دوو دیدار ئەو کچە دەعوەت دەکات بۆ تاران.

ژرار دوو ویلیە ی نوسەری فەرەنسی داستانی عەشقە ئەمریکیەکەی (شا) بە وردی لە کتێبەکەی خۆیدا تۆمار کردووە و دەنووسێت: (شا بە ڕادەیەك شەیدا و دڵدۆڕاوی ئەم کچە ئەمریکیە خۆ ساچێنە بوو بوو کە لە دووەم دیداریان دا باسی هاوسەرگیری هاتە کایەوە, چاپەمەنیەکانی ئەمریکاش لە زمانی خودی (ستیڤنس)ەوە ئەم بابەتەیان بڵاو کردەوە, بەزمی (شا) و ئەم کچە ئەمریکیە لە پێش گەڕانەوە (شا) بۆ ئێران, کە پێدەچێت لە ڕێگەی دەزگا هەواڵگریەکانی ئینگلیزە وە بووبێت, گەیشتەوە دەربار, ئەشرەف پەهلەوی خوشکە (شا) دایکی سەرگرتنی ئەو هاوسەرگیریەیان بە گورزێکی کوشندە دەزانی بۆ سەر بنەماڵەی سەڵتەنەتی, بە ناردنی پەلگرافێکی خێرا بۆ (شا), ئەویان لە سەرەنجامی ترسناکی ئەم کارە ئاگادار کردەوە, بە گەیشتنی ئەم تەلگرافە (شا) کەوتە بیرکردنەوە و لە بڕیارەکەی ورد

بوویەوە و خۆی بووارد لە بیری دەعوەت کردنی ئەو کچە بۆ تاران تا پرس و ڕاوێژی پێویست لەو بارەیەوە بکات.[1]..

هەتا گەڕانەوەی (شا) بۆ تاران, شاژنی دایك و شەمس و ئەشرەف خوشکانی (شا) و دەربارەیەکان هەریەکیان لە لایەکەوە کەوتنە خۆیان بۆ دۆزینەوەی شۆخە کچێك وەك هاوسەری داهاتوی (شا), بۆ ئەوەی بیری هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کچە ئەمریکیەدا لەبیر بەرنەوە, گەلێك کاندیدیان خستەڕو, کە یەکێك لەوانە (ئێران خانم) کچی (حسەین عەلا) بوو, یەکێکی دیکە لە بنەماڵەیەکی ناودار کە ناوی (نینا) بوو, بەڵام (شا) هیچ یەك لەوانەی بەدڵدا نەچو, ژنەکەی عەلا کە دووای تەڵاق دانی فەوزیە, کچەکەی خۆی دانابوو بۆ هاوسەرگیری لەگەڵ (شا) دا و ببێتە خانمی ئێران, کاتێك کە شا ئارەزوی هاوسەرگیری نەبوو لەگەڵ کچەکەیدا, ژنی عەلا پەیوەندی لەگەڵ دەرباردا بڕی و لەگەڵ ئەوەی کە مێردەکەی ساڵانێك وەزیری دەرباری شا یان سەرۆك وەزیران و هاوڕازی شا بوو, هەرگیز لە بۆنە میوانداریەکان و ڕێوڕەسمەکانی دەربادا ئامادە نەدەبوو.

یەکێك لە دۆستەکانی لە شەهریوەری ۱۳۲۹ هەتاوی دا, چەندین وێنەی شۆخە کچێکی دوو ڕەگی (ئێرانی _ ئەڵمانی) کە ناوی (سورەییای ئەسفەندیاری) بوو, هێنا بۆ شاژنی دایك, سورەییا لە باوکێکی ئێرانی و دایکێکی ئەڵمانی بوو, سورەییا لە شاری ئەسفەهان هتبووە دوونیاو تەمەنی منداڵی لەو شارەدا بەسەر بردبوو, بەڵام دوواتر ڕۆشتبووە ئەڵمانیا و لەوێ نیشتەجێ بووبوو, دایکی (شا) ئەم وێنانەی نشانی کوڕەکەی دا, بەڵام (شا) داوای وێنەی نوێی لێکرد و دووای گەیشتنی وێنەکان (شەمسی) خوشکی نارد بۆ لەندەن بە مەبەستی دیدارو چاوپێکەوتن لە (سورەییا) دا, (لەو کاتانەدا (سورەییا) بۆ تەواو کردنی زمانی ئینگلیزی لە لەندەن دەژیا).

شا لە کتێبی (مأموريت براى وطنم)ی خۆیدا, کە ساڵانێك دووای تەڵاق دانی سورەییا و چەند ساڵێکیش دووای ئەنجامدانی سێیەمین هاوسەرگیری خۆی بڵاو کرایەوە, زیاتر لە دوو ژنەکەی دیکەی (فەوزیە و فەرەح) باس لە بارودۆخی سورەییا

[1] Gerard de Villiers. P. 181.

و دەورانی ژیانی ژن و مێردایەتی خۆی لەگەڵ ئەودا دەکات, پاش چەندین ساڵ لە جودابوونەوەیان هیچ خۆی نەبواردووە لە دەربڕینی هەستی عاشقانەی خۆی بۆ سورەییا, سەروبەندی هاوسەرگیری (شا و سورەییا) و ڕوداوەکانی دەورانی ژن و مێردایەتیان کە نزیکەی حەوت ساڵی خایاند, سەرەتا لە زمانی خودی (شا) وە دیگێڕینەوە و دوواتر لە یاداشتەکانی سورەییاوە وەریدەگرین.

شا دەربارەی چۆنیەتی ئاشنایی و هاوسەرگیری لەگەڵ سورەییادا و ڕوداوەکانی دەورانی ژن و مێردایەتیان بەو شێوەیە دەنووسێت: (دووای تەلاق دانی (فەوزیە) ماوەی دوو ساڵ بە بێ هاوسەر ژیانم بەسەر برد, سەرباری ئەوەی کە لەو ماوەیەدا ناوی چەندین کیژۆڵەیان بۆ هێنام بڕیاری هاوسەرگیریم نەدا, تائەوەی کە سەرەنجام لە ساڵی (١٣٢٩)هەتاوی دا ناوی (سورەییا ئەسفەندیاری)م بیست, بەهۆی کاریگەری ئەو زانیاریانەی کە لەبارەی ئەوەوە پێیان دەدام هۆگری بووم, ماوەیەك دوواتر (شەمس پەهلەوی) خوشکمم بۆ دیداری کە لەو کاتەدا ئەو لە بەریتانیا دەژیا نارد بۆ لەندەن, خوشیکیشم وەسفێکی وردی لە بارەی ڕەوشتی خانومانی ئەوە وە بۆ من نوسی, بە هەرحاڵ لە کۆتاییەکانی هەمان ساڵ دا, وەك شاژنی ئایندەی ئێران بە فەرمی بوویە دەستگیرانم.[1]

باوکی سورەییا یەکێك بوو لە سەرۆکەکانی هۆزی گەورەی بەختیاری و دایکیشی خەڵکی ئەڵمانیا بوو, لەبەر ئەوەی کە پێشتر هۆزەکانی ئێران خویان گرتبوو بە سوکایەتی و ستەم کردن لە خەڵکانی دی, باوکم هەموویانی چەك کردوو خستنیە ژێر چاودێری حکومەتی ناوەندیەوە, لە ئەنجامدا سەرۆك هۆز و دەرەبەگەکان دەسەڵاتەکانی خۆیانیان لەدەست دا و هەندێکیشیان کە بە ستەمکار و یاخیناوبانگیان دەرکردبوو, خرانە زیندانە ناوەندیەکانەوە, بەهۆی ئەوەی کە دەرەبەگ و سەرۆك هۆزەکان لە بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆی هۆزەکانیاندا خاوەنی دەسەڵات و چەندین موڵك و گوندی ئاوەدان و ولاخ و مێگەلی گەورە بوون, زۆربەیان

---

[1] شا لە یاداشتەکانی خۆیدا دووچاری هەڵەی زۆر بووەتەوە لە تۆمار کردنی بەرواری ڕوداوەکان دا, بەرواری دستگیرانی لەگەڵ سورەییا شدا یەکێکە لەو هەڵانە, سورەییا لە ناوەڕاستی ساڵی (١٣٢٩ هەتاوی, ١٩ی میهر) بوویە دەستگیرانی شا و لە (٢٣ بەهمەن ١٣٢٩) زەماوەندیان ئەنجام دا.

(تەنانەت هەندێك لە خانمانیشیان) خاوەنی زانیاری و خوێندەواری باش بوون، بەگشتی مندالآنی خۆیانیان بۆ بەدەست هێنانی زانیاری و هونەر دەناردە ولآتانی دەرەوە.

ئاغای ئەسفەندیاری باوکیسورەییاش لە هەرەتی لاوی دا بە مەبەستی خوێندن نێردراوە بۆ ولآتی ئەلْمانیا، لەویٚ لەگەلْ هاوسەری ئێستەی خۆیدا ئاشنایەتیان پەیدا کردووە و هاوسەرگیریان ئەنجام داوە، ماوەیەك دوواتر ئەسفەندیاری لەگەلْ هاوسەرەکەیدا دەگەرێتەوە بۆ ئێران و لە شاری ئەسفەهان نیشتەجیٚ دەبن، نۆبەرەی ئەم دووانە کە بوویە هاوسەری من لە سالْی (١٣١١)هەتاوی دا لە ئەسفەهان چاوی بە دوونیا هەلْهێناوە، دووای چەند سالْێکی تر کورێکیشیان دەبێت، لەگەلْ ئەوەی کە سورەییا لە ئەسفەهان دەنێردرێتە قوتابخانەیەکی ئەلْمانی و لە مالْیشدا بە زۆری بە زمانی ئەلْمانی لەگەلْیدا دەدووان، بەلآم سەردەمی مندالْی ئەو وەك کچێکی تەواو ئێرانی تێدەپەری.

لەنێو شارە گەورەکانی ئێران دا، شاری ئەسفەهان لە هەموان زیاتر روخسار و لانکەی ئێرانی کۆنە، ئەم کچە لاوە لەم شارە و لە ژینگەیەك دا کە چەندین سەدە لە شارستانیەتی و فەرهەنگی ئێران شوێنەواری تێدا بە جیٚ هێشتوە، رۆژانی خوێندنی خۆی تێدەپەراند، لەگەلْ ئەوەی کە دایك و باوکی چەندین جار ئەویان بردبوو بۆ ئەوروپا، بەلآم ئەوەی کە لە دەرونی ئەودا کاریگەری قولْی بەجیٚ هێشتبوو، نیشتەجێبوون لە ئەسفەهان و ئەو سەفەرانە بوو کە باوکی و ئەندامانی هۆزەکەی لە کاتی کۆچکردن دا (لە دەوروبەری ئەسفەهان) دەیانکرد بۆ گوند و مولْکەکانی خۆیان، پاش ماوەیەك دایك و باوکی بەوەبەستی بەدەست هێنانی زانیاری زیاتر ئەویان نارد بۆ سویسرا، هەمان ئەو ولآتەی کە باوکم منی بۆ خوێندن نارد بۆ ئەویٚ، لەو ولآتە ماوەی دوو سالْ کەوتە کۆکردنەوەی زانیاری، لەکاتەدا سورەییا بە بەتەواوی لە زمانەکانی (فارسی، ئەلْمانی، فەرەنسی)دا شارەزا بوو، کەمێکیشی لە زمانی ئینگلیزی دەزانی، بەلآم لەبەر ئەوەی ئارەزومەندی تەواو فێر بوونی زمانی ئینگلیزیشی هەبوو بریار وابوو کە هاوینی سالْی ١٣٢٩ هەتاوی لە بەریتانیا دا بەسەر ببات، لەو کاتانەدا بوو کەخوشکەکەم سەردانی کرد، دووای ئەم دیدارە سورەییا گەرایەوە بۆ ئێران و هەوالْی هاوسەرگیری ئێمە بلآو بوویەوە، ئاواتی ئێمە

ئەوە بوو کە ڕێوڕەسمی مارەبڕین گواستنەوەمان بە خێرایی تەواو ببێت, بەڵام لە ناکاو دەستگیرانە جوانەکەم توشی گرانەتا بوو ڕۆژ بە ڕۆژیش نەخۆشیەکەی توندتر دەبوو, هەمومانی توشی نیگەرانی کرد, سەرەنجام ڕێوڕەسمی هاوسەر گیریەکەمان دووا کەوت هەتا دووای خۆشبوونەوەی سورەییا, لە کۆتاییدا زەماوەندەکەمان لە ڕۆژێکدا بە سادەیی ئەنجام دا,[1] لەو کاتەدا بووکی بێچارە ئەوەندە لاواز بووبوو کە نەیدەتوانی داوێنی پۆشاکی بووکێنیەکەی خۆی بەرز بکاتەوە و زۆری نەمابوو لە ڕێوڕەسمەکەدا لە هۆش خۆی بچێت.

لە مانگی (دی ١٣٢٩)هەتاوی من و تازە بووکەکەم لە کۆشکی زستانەی خۆمدا نیشتەجێ بووین[2], لە ئێران دا ڕۆیشتن بۆ سەفەری مانگی هەنگوینی لە ئاداب ڕسومی ئێمە نیە, عادەت وایە کە کەسوکاری بووک ئەو هەتا ماڵی زاوا ڕەوانەدەکەن و خۆیان دەگەڕێنەوە بۆ ماڵیخۆیان, بەڵام من و سورەییا ئەوەندە ئاگامان لە جیهانی شارستانیەتی دوونیا هەبوو کە بمانەوێت بۆ مانگی هەنگوینی سەفەرێکی کورت بکەین, بەڵام ئەم بڕیارە لەگەڵ چارەنوس دا ڕێك نەکەوت, هەربۆ یە لە ئەنجامی ئەو گرژیانەی کە لە وڵاتەکەماندا ڕویان دابوو ئەو سەفەرەمان نەکرد.

چەند ڕۆژێك دووای هاوسەرگیریەکەمان (ڕەزم ئارا)ی سەرۆك وەزیران کوژرا, (د. موسەددەق) شوێنی گرتەوە[3], هێزە بیانیەکان ئایندەی ئێرانیان خستە مەترسیەوە, سەرەنجام لە باتی سەفەری مانگی هەنگوینی ڕەوشێك هاتە پێش کە من و هاوسەرەکەم ئێران مان بەجێ هێشت و سەرفەرمان بۆ بەغداد و ڕۆما کرد, بەڵام ئەم سەفەرە کۆتایی بە سەردەمی خۆشگوزەرانی موسەددەق و هاورێکانی کە دەیان ویست بووکە خان لە باوەشی شا دەربهێنن!!! هێنا, لەبەر ئەوە لە ماوەی ئەم سەفەرە

---

[1] ڕون نیە کە مەبەستی (شا) لەوەی کە دەڵێت ڕێوڕەسمەکە بە شێوەیەکی سادە ئەنجام درا چیە, زەماوەند بە تەواو بە تەیاری و بەشکۆوە بوو, ژمارەیەکی زۆریش لە میوانانی بیانی بەشدار بوون.

[2] دیسانەوە (شا) لە نوسینی بەروارەکەیدا هەڵەی کردووە, لەبەر ئەوە لە پەرەگرافی دوواتردا دەڵێت: چەند ڕۆژێك دووای هاوسەرگیری ئێمە (ڕەزم ئارا) کوژرا, بەرواری هاوسەرگیری (شا و سورەییا) ٢٣ بەهمەن ١٣٢٩ بوو, ڕەزم ئارا لە ١٦ ئەسفەند ١٣٢٩هەتاوی دا کوژرا.

[3] هەڵەیەکی دیکە..! (شا) بوون سەرۆك وەزیرانی (حسەین عەلا)ی لە دووای ڕەزم ئارا لە بیر کردووە.

کورتەدا, کە دوو ساڵ و نیو دووای زەماوەندەکەمان ئەنجام درا, گەلی نەتەوە خوازی ئێران لە سەرەنجامی ئازاراوی سیاسەتەکەی موسەددەق بە ئاگا هاتنەوە و موسەددەق و هاوڕێکانیان سەرنگون کرد.

لەو دوو ساڵ و نیوەی کە بەسەر زەماوەندەکەی ئێمەدا تێپەڕی, ڕەوشی ناهەمواری وڵات کاریگەریەکی قوڵی لە ژیانی ژن و مێردایەتی ئێمە کرد, بێگومان ئەو سەردەمانە بۆ من و هاوسەرەکەم و تێکڕای گەلی ئێران بە ڕۆژانێکی ناخۆش دێتە هەژمار, لەم کاتەدا هەموان ئومێدی ئەوەیان هەبوو کە موسەددەق سیاسەتێکی باش پیادە بکات, بەلاَم هەر مانگێك کە تێدەپەڕی و ئەو ڕاپۆرتانەی کە لە دەرەنجامی خەونە تاڵەکانی ئەوە وە بە من دەگەیشت, نیگەرانکەرتر بوون, پێشکەوتنی کاروباری ئابووری و کۆمەلاَیەتی وڵات وەستا, خەڵکان نیگەران و ترساو و بێ هیوا, ڕێکخراوە دووژمن و مەترسیدارەکان درزیان خستبوویە نێو کاروباری نەتەوەیی و تا ڕادەیەك سەرانسەری وڵاتیان خستبوویە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە, بە بۆچونی من لەهەمو بابەتەکان سەخت تر ئەو ئارامی و ئۆقرەییە بوو کە دەبوو بمگرتایا بۆ گەیشتن بە ڕێگەچارەیەکی گونجاو و کارکردن لە بەرامبەر ئەو ڕەوشەدا, سات لە دووای سات لە هەمولایەکی وڵاتەوە ڕاپۆرتم لە بارەی ئەو ڕەوشە ناهەموارەی کە توشمان بووبوو, پێدەگەیشت, من بە باشی لە قەبارەی ئەو مەترسیەی کە هەڕەشەی لە ئێمە دەکرد تێدەگەیشتم, بەلاَم ئەو ڕەچاو کردنی کات و قۆستنەوەی هەل کە باوکم بەتەواوەتی شارەزای بوو, شتێکیش بۆ من مابوویەوە, دەمزانی کە هەر هەنگاوێکی کوێرانە پێدەچێت دەرەنجامێکی زیان بەخشتری بەدوواوە بێت, وە ئەگەر پێشتر لە کاتی گونجاوی خۆی هەر هەنگاوێك هەڵگیرابا,وەك ئەوە وابوو کە بەڵگەی نابوود بوونی وڵات کە بەرەو لەناوچوون دەچوو واژۆ بکردایە....[1].

---

[1] سەرباری ئەوەی کە شا یەکێك لە درێژترین بەشەکانی پێشوی کتێبەکەی تایبەت کردووە بە باسکردنی سەردەمی حکومەتەکەی موسەددەق و چەندین تۆمەتی ناڕەوای داوەتە پاڵ, لەم بەشەشدا کە تایبەتە بە ژنان و هاوسەرەکانی خۆی, دەستی لەسەر موسەددەق هەڵنەگرتوە و لاپەڕەیەکی دیکەی بۆ سەرزەنشت کردنی ئەو سەردەمە تایبەتکردووە, کە لێرەدا پێویست بە نوسین ناکات.

هاوسەرەکەم ئەوەندە پەیوەندی بە سیاسەتەوە نەبوو, زیاتر سەرقاڵی ئەوە بوو کە هاوڕێیەکی ژیانی من بێت, هەر ئەوەندەی کە ڕەوشی ئێران ڕوی لە باشی کرد, چەندین سەفەر بۆ من و سورەییا فەراهەم هات, یەکێك لەوانە سەفەری فەڕمی ئێمە بوو بۆ وڵاتی ڕوسیا, کە لە ساڵی (١٣٣٥)هەتاوی ئەنجام درا, لەو سەفەرەدا ئاغای (خرۆشۆف و پێشەوایانی ڕوسیا) زۆر بە دڵسۆزیەوە پێشوازیان لە ئێمە کرد, چەندین سەفەری دیکەشمان بۆ وڵاتانی (ئەمریکا, هیندستا, ئیسپانیا, تورکیا, لوبنان) و زۆرێك لە وڵاتانی دیکە ئەنجام دا, هەرچەندە مەبەستی سەردانەکانمان جێگیر کردن و بەهێز کردنی پەیوەندیە دۆستانەکانمان بوو لەگەڵ وڵاتانی دۆست و هاوسێمان, بەڵام بۆ خۆی وەك مانگی هەنگوینی بوو کە دووای ماوەیەك بەنسیبی ئێمە بوو.

سورەییا وەکو سەرجەم کەیبانووەکانی دیکە سەلیقەیەکی تایبەتی لە ڕێکخستنی کەلوپەلەکانی نێوماڵەکەماندا هەبوو, ڕەوشی کۆشکە تایبەتەکەمان واتە ماڵی شاریی ئێمە, بە بۆچەنی من زۆر باش بوو, بەڵام سورەییا دەیویست بە زەوقی خۆی هەندێك لە بەشەکانی نویێ بکاتەوە, ئەو مەبەستی بە هەدەردانی پارە بۆ کڕینی کەلوپەلی جوانکاری و گرانبەها نەبوو, بەڵکو دەیویست هەمو شوێنێك پاك و بە تەرتیب و ڕەنگێکە نوێی هەبێت, هەمان سەلیقەی لە کۆشکی هاوینەشدا بەکار دەهێنا, لە ماوە حەوت ساڵی ژن و مێردایەتی ئێمەدا,ڕۆژبە ڕۆژ ئارەزوی سورەییا بۆ خزمەتی کۆمەڵایەتی زیادی دەکرد, باش لە بیرمە کە ڕۆژێك سەردانی یەکێك لە ناوەندە پەروەردەکارە کۆنەکانی کردبوو, ڕەوشی خراپ و شپرزەیی منداڵانی بێ باوکی ئەویێ کاری لێکردبوو, مات و نیگەران بە چاوی فرمێسکاویەوە داوای لە من کرد کە دەست بەجێ کار بۆ چارەسەر کردنی بارودۆخی ئەو بێ باوکانە بکەم, منیش دەستبەجێ بڕیارم دا کە ناوەندی ناوبراو وەربگرن و بە خێرایی بە شێوەیەکی نوێ چاکی بکەنەوە, سەرپەرشتی و چاودێریشی بخرێتە سەر دەزگای خێرخوازی سورەییا...

لەگەڵ ئەم هەمو میهر و خۆشەویستیەدا, کاتێك بە هۆکارێکی پەیوەست بە بەرژەوەندی گەل و وڵاتەوە, تەڵاق دانی سورەەییا یەکلای بووبوویەوە, مایەی ناڕەحەتی و بێزاری هەردووکمان بوو, لە ماوەی ساڵانی ژن و مێردایەتیمان دا

منداڵێکمان نەبوو, لای خۆمەوە ڕۆژ بە ڕۆژ لەسەر ئەوە سورتر دەبووم کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی وڵاتی ئێران, هەبوونی جێگر (شازادە)یەك پێویستە, هەرچەندە هەندێك کەس ئامۆژگاری میرەبانی و هاودەردەی یان دەکردم کە لە ژیانی مرۆڤەکان دا مانەوەی هاوسەرداری لەسەروی هەمو شتێکەوەیە, لای منیش گومانی تێدا نەبوو کە دەبێت بەرپرسیارێتی پاراستنی مەترسی سەڵتەنەت لە سەرو هەمو شتێکەوە بێت, سەرەنجام ڕاوێژکارەکانی منیش هەمان بۆچونی منیان پەسەند کرد و لە مانگی (ئەسفەندی ١٣٣٧) هەتاوی ناچار لەیەکتر جودا بووینەوە.[1] ..!.

ئەوەی کە خوێندتانەوە داستانی ڕاستەقینەی هاوسەرگیری و تەڵاق دانی سورەییای ژنی دووەمی (شا)یە, کە بە پێنوسی خۆی و لەکاتێکدا کە کوڕێکی لە (فەرەح)ی ژنی سێ یەمی هەبوو, کە بە ڕواڵەت لە ژیانی نوێی ژن و مێردایەتی خۆی ڕازی یە, نوسراوە, ئاوازی (شا) لەم نوسینەدا کەم تا زۆرێك عەشقی بۆ ژنە لە دەست چوەکەی تێدا ڕەنگی داوەتەوە, بەڵام ئەوەی کە سورەییا لە ژینگەیەکی ئازاد تر و بێ کۆت و بەند کە لە چاو (شا)دا هەیبووە لە دەربڕینی هەست و سۆزی خۆیدا, خستویەتیە سەر کاغەز, بە باشی ئەو ڕاستیە دەخاتە ڕوو کە (شا) عاشقانە ژنی دووەمی خۆی خۆش ویستوە, لەوانەشە تەنها عەشقی ڕاستەقینەی (شا) سورەییا بووبێت.

سورەییا تا پێنج ساڵیش دووای جودا بوونەوەی لە (شا) بێدەنگی لە بارەی باسکردنی ژیانی خۆی و شا وە هەڵبژاردبوو, لەو ماوەیەدا دەنگۆی ئەوە بڵاو بوویەوە کە شا مانگانەیەکی زۆر دەدات بە سورەییا لە بەرامبەر بێدەنگ بوونی ئەودا, لەو ماوەیەدا سورەییا هەوڵی دەدا خۆی لە چاوی کامێراکان دوور بخاتەوە, بەڵام ڕۆژنامە وگۆڤارەکانی ئەوروپا بە تایبەت چاپەمەنیەکانی ئەڵمانیا دەستیان لەسەر ئەو هەڵنەدەگرت, هەر ڕۆژەو دەنگۆیەکی نوێ یان لەبارەوە بڵاو دەکردەوە, سەرەنجام سورەییا ناچار بوو بێدەنگی خۆی بشکێنێت و لە ساڵی (١٩٦٣ز) دا بە بڵاو

---

[1] محمد رزاشا: ماموریت برای وطنم. ص ٣٠١ _ ١٠٦. (لە ڕستەی کۆتاییدا دیسانەوە (شا) دووچاری هەڵەیەکی دیکە بووەتەوە, تەڵاق دان لە ساڵی ١٣٣٦ دا نەنجام درا نەك ١٣٣٧, هەڵبەت ئەمەیان هەڵی چاپیش بێت, چون ئەوە لە کتێبێکدا کە بە قەڵەمی نوسرابێت مایەی سەر سوڕمانە.!.

کردنەوەی یاداشتەکانی، هەم کۆتایی بەو ئەفسانانە هێنا کە لەبارەی ژیانی ڕابردووی ئەوە وە دەوترا و هەمیش ڕەتی ئەو دەنگۆیانەی کردەوە کە لە بارەی ژیانی تایبەتی ئەو و پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی دیکەدا کەوتبووە سەر زار، سەرەتا بڵاوکردنەوەی ئەم یاداشتە بە زمانی ئەڵمانی و لە ئەڵمانیادا چاپ کرا، دوواتر بۆ زیاتر لە (٢٠) زمانی دوونیا وەرگێردراو بڵاو کرایەوە، سودێکی دارایی زۆریشی بۆ سورەییا هەبوو، زەمینەی سەفەرە گەشتیاری و پڕخەرجیەکانی ئەوی بۆ شوێنە جیاوازەکانی دوونیا فەراهەم هێنا، لە کتێبەکەیداسورەییا ئەوە بە درۆ دەخاتەوە کە(شا) لە بەرامبەر بێدەنگی ئەودا مانگانەیەکی باشی پێدابێت و دەنووسێت: ئەو نەیویستوە کێشە بۆ شا دروست بکات لە کاتێکدا کە (شا) لە بیری هاوسەرگیریەکی نوێدا بووە، وە ئەگەریش چاپەمەنیەکان ئەو هەمو جەنجاڵیەیان لە بارەی ژیانیەوە دروست نەکردبا ئارەزوی ئەوەی دەکرد کە بەردەوامی بەو بێدەنگیەی خۆیبدات.

یاداشتەکانی سورەیا، کە چاپە ئینگلیزیەکەی لە بەردەستی نوسەردایە، بە ناوی (اتوبیوگرافی والاحضرت شاهزاده خانم ثریا / ئۆتۆبیۆگرافی پایەبەرز شازادە خانم سورەییا)[1]،وەیە و سورەییا ڕونکردنەوە لە بارەی ئەو نازناوە وە دەات کە (شا) لە کاتی تەڵاق دانیدا پێی داوە، بەشی یەکەمی ئەو کتێبە کە پێشەکیەکەیەتی، تایبەتی کردووە بەو کێشە و دەردی سەریانەی کە دووای جودا بوونەوەی لە (شا) ڕوبەوڕی بووەتەوە، بەتایبەت چاپەمەنیەکانەوە کە ئارامییان لێ هەڵگرتبوو، سورەییا بە ئاوازێکی داخوازی کارانەوە داوا لە چاپەمەنیەکان و وێنەگرەکان دەکات کە ئەوەندە دەست وەرنەدەنە ژیانی تایبەتی کەسانی دیکەوە، وە ماف بەوانە کەسانەی کە سەردەمانێك ناوبانگێکیان هەبووە ئەو ژیانەی کە ماویانە بە ئارامی بەسەری ببەن، سورەییا باسی ژیانی خۆی لە بەشی دووەم دا لە ژێر سەردێڕی (کچی دوو دوونیا) کە تێکەڵەیەکە لە ڕەگەزی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دەست پێدەکات، دووای وەباس هێنانی یاداشتەکانی خۆی لە سەردەمی منداڵی و خوێندنی لە ئێران و ئەوروپا، لە بەشی سێیەمی کتێبەکەیدا بە سەردێڕی (چارەنوسێك لە پاریس) باس لە چۆنیەتی

[1] The Autobiography of H.I.H. Princess Soraya – Arthur Barker LTD London 1963.

دیداری لەگەڵ (شەمس پەهلەوی) خوشکی (شا) و سەفەری بۆ تاران دەکات, سورەییا ڕۆژی (٧ ئۆکتۆبەر , ١٥ میهر ١٣٢٩هەتاوی) لەگەڵ شەمس بە فڕۆکە بەرەو تاران بەڕێ دەکەون و ڕۆژی دوواتر دەعوەتی کۆشکی شاژنی دایك دەبن, بۆیەکەمجار (شا) بە ئامادەبوونی دایکی دیدار لەگەڵ سورەییا دا ئەنجام دەدات, دوواتریش دووبەدوو بۆ ماوەیەك پێکەوە قسان دەکەن,سورەییا هەمان شەو لە مەجلیسێکی تایبەتی میوانداری دا ئاشنای ئەندامانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی دەبێت, کاتێك کە دەگەڕێتەوە بۆماڵی مامی کە بۆ مانەوەی لە تاران لەبەرچاو گیرابوو, باوکی لێی دەپرسێت: بۆچونت لە بارەی ئەو (شا) چیە؟ سورەییا دەڵێت: بە دڵم بوو, دووبارە باوکی لێی دەپرسێتەوە: ئامادەی هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجام بدەیت؟ سورەییا دەڵێت: دەبێت هەر ئێستا وەلأم بدەمەوە؟ باوك دەڵێت: بەڵێ, (شا) هەرئێستە تەلەفۆنی بۆ کردم و داوای وەلأم دەکات, سورەییا دەنووسێت: ئیدی دوودڵی گونجاو نەبوو, وتم ئامادەم, ڕۆژی دوواتر بەر لەوەی کە ڕێوڕەسمی مارەبڕینی ئێمە ئەنجام بدرێت, وێنەی من لە لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکانی تاران دا چاپ کرا, سێ ڕۆژ دوواتر ڕێوڕەسمی مارەکردن ئەنجام درا, ڕۆژی (٢٧ دیسامبەر ,٤ دی ١٣٢٩ هەتاوی) بۆ زەماوەند دیاریکرا.[1]

بە هۆی نەخۆش کەوتنی سورەییا وە زەماوەند دووا دەخرێت و سەرەنجام ڕۆژی (١٢ فەبریوەر, ٢٣ بەهمەن ١٣٢٩ هەتاوی) ئەنجام دەدرێت, سورەییا باسێکی تێروتەسەلی دەربارەی زەماوەندەکەیان کە (شا دەڵێت بە سادەیی ئەنجام درا) نوسیوە, تیایدا هاتووە: (دووهەزار کەس لەو زەماوەندە دا کە لە کۆشکی گوڵستان ئەنجام درا ئامادە بوون), سورەییا دوواتر ئاماژە بە سەفەری دووای زەماوەندیان بۆ باکور دەکات و دەنووسێت: (لە ماوەی دوو هەفتەدا کە ئێمە لە باکور بووین قەیرانی سیاسی لە تاران ئاڵۆزتر دەبوو, ڕۆژانە چەند کەسێك لە دەربارییەکان و پلەدارانی دەوڵەت بۆ ڕاپۆرت دان لە بارەی ڕەوشەکەو فەرمان وەرگرتن دەهاتن بۆ بابلسەر, سێ

---

[1] The Autobiography of H.I.H. Princess Soraya – Arthur Barker LTD London 1963 . p 49.

ڕۆژ دووای گەڕانەوەمان بۆ پایتەخت (ڕەزم ئارا)ی سەرۆك وەزیران کوژرا, ئەوت خۆماڵیکرا, مانگێك دوواتر (د. موسەددەق) هەڵبژێردرا بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران.[1]

سورەییا ماوەیەکی کورت دووای هاوسەر گیری لەگەڵ (شا), ئاشنای جموجوڵەکانی نێوخۆی دەربار دەبێت و دەنووسێت: (نزیکترین دۆست و هاوڕازی من لە دەربار دا (فروغ زفر)ی ماموٚژنم بوو, کەیەکم جار وێنەی منی پیشانی شاژنی دایك داوە و زەمینەی ئاشنایی و هاوسەرگیری منی لەگەڵ (شا) دا فەراهەم هێناوە, بەڵام تەنها شەش هەفتە دووای هاوسەرگیری ئێمە نزیك نیوەڕۆ (شا) پێی وتم: (ئیدی من نامەوێت فروغ زفر بێت بۆ ئێرە!), بەسەر سامیەوە پرسیم: (بۆچی, مەگەر ئەو چی کردووە؟)؟, شا ووتی: (ئێمە وا بیر دەکەینەوە کە ئەو لێرە سیخوڕی دەکات!). ئەم قسەیە بەڕادەیەك گاڵتە ئامێز بوو کە من بەبێ ئەنقەست پێکەنیم و وتم: (ماموٚژنی من دەگونجیت شیخوڕی بۆ کێ بکات؟). (شا) وەڵامێکی ناڕونی دایەوە و ووتی: (بەداخم کە ئیدی ناتوانم زیاتر لەم بارەی ئەم بابەتەوە بدووێم), بەو شێوەیە پێی (فروغ زفر)ی باشترین هاوڕێ و هاودەمم لە دەربار بڕدرا, دوواتر تێگەیشتم کە (شا) بە داوالێکردنی دایك و خوشکی ڕێگری لە هاتوچۆی ئەو کردووە.[2]

بەشێك لە یاداشتەکەی سورەییا تایبەتکراوە بۆ تایبەتمەندیە ئەخلاقیەکانی (شا) و تیایدا سەرباری ئاماژەدان بە دژبەیەکی کاراکتەری (شا) لەگەڵ ڕەزاشا ی باوکیدا, دەنووسێت:

(کاراکتەر و تایبەتمەندی ئەخلاقی حەمەڕەزا, بە تەواوی جیاواز بوو لەگەڵ ئەوەی کە من دەربارەی باوکی بیستبووم. باوکی (شا) ناوبانگی بە بێ منەتی و توڕەیی هەبوو, یەکێك لە سەختیەکانی ئەو لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا, ڕەتکردنەوەی ویست و داوا ناڕەوا زۆرەکانی ئەوان بوو وە دەروبەرەکەشی زۆر سودی خراپیان لەو لایەنە لاوازەی (شا) وەردەگرت, هەرکاتێك (شا) بیویستایە کەسێك لە لە پۆستە دەوڵەتی یان دەرباریەکەی لابردایە, خۆی کەنار دەگرت لە ڕاگەیاندنی بڕیارەکەی و هەوڵی دەدا ئەم بڕیارە لە ڕێگەی کەسانی دیکەوە ڕابگەیەنێت, ئەو نەیدەتوانی سەیری ڕوخساری کەسانێك بکات کە لەسەر کار لای دەبردن, خەفەتی بۆ نیگەرانی

---

[1] Soraya: pp. 60.٥ - 8

[2] Soraya: pp. 65 – 66.

ئەوان دەخوارد!!, هەڵبەتە (شا)دەربارەی لەکارخستن و وەلانانی کەسەکان وەکو باوکی لە ناکاو و لە ڕوی توڕەبوونەوە بڕیاری نەدەدا, وە دووای بە دوواداچون و ڕاوێژکردن توێژینەوە لە سەرجەم لایەنەکانی, بڕیاری دەردەکرد.[1].!.

سورەییا لەگەڵ باسکردنی ڕەوشی نێو خۆی دەرباری پەهلەوی دا, ئامازەی بۆ ڕۆڵی ژنان لە دەربار دا کردووە و دەنووسێت: (بە پێچەوانەی سەردەمی (ڕەزاشا) کە ژنان هیچ ڕۆڵێکیان لە دەرباردا نەبوو, دەرباری کوڕەکەی دەربارێکی ژنانە بوو, دروستە کە ژنان بە فەرمی هیچ ئەرکێکیان لە ئەستۆدا نەبوو, بەلأم لە ڕاستیدا بە هەزاران فرتوفێڵ بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی خۆیان بەرگی کارییان دەپۆشی و منیش ناچار بووم لە نێو کوانوی ئەم فێڵ و پیلانانەدا, کە شاژنی دایك هەڵسوڕێنەری بوو, خۆم لە پرشکەکەی بپارێزم..., ئەڵبەتە نابێت ئەو خەیاڵە دروست ببێت کە ژنانی دەرباری بەڕاستی شتێك لە دوونیای سیاسەت دەزانن, نەخێر, ڕادەی زانیاری و ئاگاداریەکانی ئەوان زۆر سنور دار بوو, وە تەنها شتێك کە تیایدا لێهاتو بوون پیلان گێڕان و فاتوفیت بوو, شاژنی دایك ڕۆژانەچەند ژنێکی لە دەوری خۆی کۆدەکردەوە و چەندین کاژێری لەگەڵدا بە چایی خواردن و زەم کردنەوە بەسەر دەبرد, لەوانەیە من کە هەرگیز لەو دانیشتنانەیاندا ئامادە نەدەبووم, یەکێك بوویم لە بابەتەکانی قسەکردنیان.

هەردوو خوشکەکەی (شا), (شەمس و ئەشرەف) چاودێر و دووژمنی یەکدی بوون و ئەم ڕقەش ڕیشەی منداڵی هەبوو, بەپێچەوانەی ئەو دەنگۆیەوە کە بلأو بووەتەوە (ئەشرەف) کچی بەناز پەروەردەو جێگای گرنگی پێدانی (ڕەزاشا) نەبوو, (ڕەزاشا) زیاتر سەرنج و گرنگی بەلای (شەمس)ی کچیەوە هەبوو, داستانی بە مێرد دانی ئەم دووخوشکەش باشترین گەواهی دەریئەم بانگەشەیەیە, پێدەچێت ئەم چیرۆکە زۆر مایەی سەرسوڕمان بێت, بەلأم من دەتوانم سوێند بخۆم کە بە ڕاستی ڕاستە:

ڕۆژێك کە هەردوو خوشکەکە (شەمس و ئەشرەف) گەورە دەبن و گەیشتونەتە تەمەنی بە مێرد دان, ڕەزاشا هەردووکیان بۆ ئیدارەکەی خۆی بانگ دەکات و

---

[1] Soraya: pp. 68 – 69.

کچەکانی بە دوو کوری لاو کە لەلای ئەو بوون دەناسێنێت و دەڵێت: (ئەوانە مێردی داهاتوی ئێوەن و بەئومێدم پێکەوە خۆشبەخت بن, ئەو پیاوە لاوانەش یەکێکیان (عەلی قەوام) و ئەوی دیکەیان (فەرەیدوون جەم) بوون, ڕەزا شا (عەلی قەوام)ی بۆ (شەمس) و (فەرەیدوون جەم)یشی بۆ (ئەشرەف) دیاری کردبوو, بەڵام پێش ئەوەی کە مارەبڕین ئەنجام بدرێت (شەمس) دەچێت بۆ لای باوکی و دەڵێت: (من خۆشم لە فەرەیدوون جەم (دانراو بۆ ئەشرەف) دێت!!), ڕەزاشا دەڵێت: (قەیدی نیە ئالوگۆڕیان پێ دەکەین!!), سەرەنجام (شەمس) لەگەڵ دەزگیرانەکەی (ئەشرەف)دا کە لەوەی خۆی خۆش قیافەتر بوو هاوسەرگیری ئەنجام دەدات و (ئەشرەف)یش بە پێچەوانەی ئارەزوی خۆیەوە دەبێت بە هاوسەری (عەلی قەوام), ئەڵبەتە هەردوو هاوسەر گیریەکە شکستی خوارد و هەردوو خوشکەکە لە هاوسەرەکانیان جودا بوونەوە.[1] .

بەشێکی تەواویش لە یاداشتەکانی سورەییا دا تایبەت کراوە بە باسکردنی ڕوداوەکانی سەردەمی حکومەتی (د. موسەددەق), لەبەر ئەوەی بەتاڵ نیە لە کینەو زیاتر کەوتۆتە ژێر کاریگەری باسکردنەکانی (شا) وە دەربارەی (موسەددەق), شیاوی نوسین نیە, تەنهالایەنێك کە لەم بەشەدا مایەی تێڕامانە, داستانی هەڵهاتنی (شا و سورەییا)یە لە ئێران لە ڕۆژی (٢٥ مورداد ١٣٣٢)هەتاوی دا و ئەو نیگەرانی و دوودڵیانەیە کە سورەییا بە باشی باسیکردووە, سەرنجێکی دیکە کە ڕاست و دروستی بۆ نوسەر ڕۆشن نیە, باسکردنی هەژاری و بێ پارەیی (شا)یە لەم سەفەرەدا و ئەو بانگەشەیەی (سورەییا)یە کە گوایا ئەو هیچ پۆشاکێکی لە دەرەوە نەبووە, سورەییا دەنووسێت: (لە سەردەمی حکومەتەکەی (د. موسەددەق) دا (شا) لە هەمو لایەکەوە بەسترابوویەوە و تەنانەت جارێکیان بۆ ئامادە کردنی هەندێك خەرجی پێویست کەوتە بیری فرۆشتنی دیاریەکانی زەماوەندەکەمان!!)[2], سورەییا لە سەری

---

[1] Soraya: pp. ٧١ – 72 .

[2] لەم بارەیەوە داستانێکی هاوشێوەم بیستوە لە ئاغای (حسەینی مەکی) کە لە سەردەمی حکومەتەکەی (د. موسەددەق) دا زۆر هاتوچۆی دربارەی دەکرد, ئاغای مەکی دەیوت: (ڕۆژێك لەکاتی گفتوگۆم لەگەڵ (شا) ئامارژەم بۆ قالیچەکەی ژێر پێمان کردوو وتم جوتێك لەم قالیچەیان لە مەشهەد بە شەست هەزار تمەن فرۆشت, (شا) ووتی: بەڵام ئەم قاڵیچەیە بە چل و پێنج هەزار تمەن

دەڕوات و دەڵێت کە (شا) لەکاتی فڕین بەرەو ڕۆم دەیوت: ئێمە تا هەفتەیەکی دیکە دەگەڕێینەوە, کاتێك کە لێم پرسی بە چ هیوایەکەوە ئەم قسانە دەکەیت, ئاماژەی بە هەمان وتە کۆنەکانی خۆی کردەوە کە گوایە دەستێکی غەیبی پارێزگاری لێ دەکات!![1].

بەشێکی دیکە لە کتێبی یاداشتەکانی (سورەییا) لە ژێر سەردێڕی (لەکۆشکی سپیەوە تا کرملن) تایبەتکراوە بە سەفەرە دەرەکیەکانی خۆی لەگەڵ (شا)دا, کە تۆمار کردنی بەشێکی کە تایبەتە بە یاداشتەکانی سەفەریان بۆ سۆڤیەت بە پێویست دووزانرێت, سورەییا لە بارەی روداوەکانی ئەو سەفەرەیانەوە کە لەسەردەمی (خرۆشۆف) دا ئەنجام دراوە دەنووسێت: بەدرێژایی ماوەی مانەوەمان لە مۆسکۆ (خرۆشۆف) زۆر عاشقی من بووبوو وە لە نێو داواکاریەکانی خۆیدا لە (شا) بە منی دەوت: ئەم شتانە ئێوە بە (شا)ی بڵێن, ژنێکی جوانی وەك ئێوە دەتوانێت هەمو شتێك بەدەست بهێنێت!,.

سورەییا لەهەمان بەشی یاداشتەکانی تایبەت بە سەفەری سۆڤیەت دەنووسێت: پۆلیسی نهێنی سۆڤیەت تەواوی چاودێری سەرجەم وردەکاری و جوڵە و گفتوگۆ و هاتوچۆکانی ئێمەیان دەکرد, هەمو ئەوانەی بە نێوی ڕێنیشاندەر یان خزمەتکار خستبوونیان لەگەڵ ئێمە ڕاسپێردراوی پۆلیسی نهێنی سۆڤسەت بوون, ڕۆژێك کە من و شا دووبەدوو لە شوێنی نیشتەجێ بوونمان لە کۆشکی کرملن دا قسانمان دەکرد, بە (شا)م وت زۆر ناوبانگی شانۆی سۆڤیەتی ئەوانم بیستوە دڵم ئارەزوی ئەوەدەکات کە شەوێك بەرنامەی ئەوانمان ببینیایە, چەند کاژێرێك دواتر کەسێك بە فەرمی لە بەشی پێشوازی (کۆشکی کرملن)ەوە هاتە لای ئێمە و ووتی: ئایا شا و شاژن ئارەزوی ئەوە دەکەن ئەمشەو سەیری بەرنامەی بالەی (جۆرێکە لە سەما) شانۆی سۆڤیەتی بکەن..؟, ئێمە ئەمەمان بە ڕێکەوت زانی, ڕۆژی دوواتر باس

---

زیاتر لە من ناکرێ, وتم: خاوەن شکۆ مەگەر نیازی فرۆشتنی قالیچەکانت هەیە؟ (شا) لەکاتێکدا کە فرمێسك لەچاوەکانی دا پەنگی خواردبوویەوە ووتی: چی بکەم؟ مەگەر من خەرجیم نیە, کە ئەم (د. موسەددەق)ە خەرجی پێویستی خۆشمانمان پێنادات!..). مەکی باوەڕی وابوو کە ئەم ئەزمونە تاڵە, لەدووای کودەتای (٢٨ مورداد)ەوە (شا)ی بۆ ئەو گەندەڵیە هانداوە.

[1] Soraya: pp. 93 – 97 .

لەکڕینی ڕیکۆتێکی ئاوریشمی هاتە پێش، و ڕۆژی دوواتر ڕیکۆتێکی ئاوریشمی جوان لەلایەن دەوڵەتی سۆڤیەتەوە بە دیاری درا بە من!، من و شا بە گوێی یەکماندا چرپاند و وتمان بەدڵنیاییەوە کە میکرۆفۆنێکی شاراوە لە شوێنی حەسانەوەمان دا دانراوە و بڕیارمان دا ئەم بابەتە تاقی بکەینەوە.

شەو کاتێك لەگەڵ (شا) دا ویستمان بخەوین (شا) ووتی: من زۆر حەزم لەو فڕۆکە بچوکەیە بوو کە ئەمڕۆ لە نمایشە هەواییەکەدا پێیان نیشاندایین، نازانم دەتوانین یەکێك لەو فڕۆکانە بۆ خۆمان بکڕین..؟!، من لە وەلاّم دا وتم: باوەڕ ناکەم لەو فڕۆکانە بە ئێمە بفرۆشن و ئەگەریش بیفرۆشن زۆر گرانن..، بەیانی ڕۆژی دوواتر دەوڵەتی سۆڤیەت یەکێك لەو فڕۆکانەی بە دیاری دا بە (شا)!!، هەڵبەتە ڕوسەکان زۆر شەنسیان هێنا کە ئێمە دەمانویست ڕۆژی دوواتر بگەڕێینەوە بۆ تاران، دەنا ئەم سەفەرەی ئێمەیان بە گران بۆ تەواو دەبوو!![1].

سورەییا لە باسی ڕوداوی جودا بوونەوە خۆی و شا دا کە بە شێکی سەربەخۆی یاداشتەکانی بۆ ئەم بابەتەیە دەنووسێت: لە سالأنی هاوسەرگیریمان دا کەهاوکات بوو لەگەڵ هەلأیسانی قەیرانی خۆماڵیکردنی نەوت و حکومەتی (د. موسەددەق)، زۆر بیرمان لە بابەتی منداڵ بوون نەکردەوە، بەلاّم دووای ڕوخانی حکومەتەکەی موسەددەق و بەهێزتر بوونی پایەکانی سەڵتەنەتی ئێران، ئەم بابەتە بە شێوەکی توندووتۆڵ لە دەرباردا پەیدا بوو، شاژنی دایك هەمیشە ئەم بابەتەی لەگەڵ کوڕەکەیدا باس دەکرد، (شا) هەتا مانگی (ئۆکتۆبەری ١٩٥٤ز , ١٣٣٣ هەتاوی) ئەم بابەتەی لەگەڵ مندا باس نەکرد، تا ئەوەی لەو بەروارەدا خۆمان ساز دەکرد بۆ سەفەرێکی فەرمی بۆ ولأتی ئەمریکا، ڕۆژێك پێی وتم: (کاتێك کە دەچین بۆ نیویۆرك من دەمەوێت تاقیکردنەوەیەکی تەواوی پزیشکی بۆ خۆم بکەم، وا باشترە تۆیش ئەم کارە بکەیت..)، من سەرەتا تێنەگەیشتم لەوەی کە ئەو دەیویست بیڵێت و وتم: (من خۆ هیچم نیە..!)، (شا) دووبارە کە نەیدەویست ڕاستەوخۆ مەبەستی خۆی بڵێت ووتی: (بەلاّم دەبێت لە مەبەستی من تێگەیشتبی..!)، لێرەدا بوو کە زانیم دەیەوێت چی بڵێت، بۆ ڕەزامەندی دەربڕین سەرێکم لەقاند.

---

[1] Soraya: pp. 142 – 149 .

شا پێشتر منداڵی هەبوو هەربۆیە بە ڕواڵەت هیچ گرفتێکی نەبوو, شیکارییە ورد و تێروتەسەلەکانی منیش هیچ شتێکی نا سروشتی دەر نەدەخست, دووای دەرچونی ئەنجامی شیکاریەکان لە مانگی (دیسەمبەری ١٩٥٤ن)دا کە لە نیویۆرك ئەنجام درابوو[1], بەرپرسی دەستەی پزیشکی بە ئێمەیان ووت: (هەردووکتا لەوپەڕی تەندروستی باش دان و تەنها دەبێت ئارام بگرن), ئێمە ئاراممان گرت و چەند ساڵێك تێپەڕی, چەندین تاقیکردنەوەی جیاوازی دیکە بۆ من ئەنجام درا, کە ئەنجامی هەموویان ئەوە بوو کە هیچ گرفتێك بۆ منداڵ بوون نیە, بەهەرحاڵ بەهەرهۆیەك بێت کە بۆ دوکتۆرەکان نەدەدۆزرایەوە من منداڵم نەدەبوو.

لەساڵی شەشەمی هاوسەرگیریمان دا, ئیدی تا ڕادەیەك بڕابوویەوە کەسورەییا منداڵی نابێت, مەرگی (عەلیڕەزا)ی برای دایك و باوکی (شا) لە کارەساتێکی هەوایی دا, کەهەندێك ئەوەیان بە پیلانی بۆمبڕێژ کردن لێکدایەوە, پرسی جێنشینی (شا)ی دژوارتر کرد, شاژنی دایك لەبەر ئەوەی کە زۆر (عەلیڕەزا)ی خۆشدەویست و بە هەبوونی ئەو زۆر نیگەرانی پرسی جێگرەوەی (شا) نەبوو, دووای مەرگی (عەلیڕەزا) کەوتە فشار خستنە سەر (حەمەڕەزاشا)ی کوڕی کە دەبێت لە بیر بۆ ئایندەی تاج و تەختەکەی بکاتەوە, لەلایەکی دیکەوە ڕۆژ لە دووای ڕۆژ سورەییا گۆشەگیر کرا و ئەو

[1] دەربارەی تاقیکردنەوە پزیشکیەکانی دیکە کە بۆ سورەییا ئەنجام دراوە بابەتێکم خوێندووەتەوە لە کتێبی (دالاس) لە نوسینی (لیۆنارد ماسلی) نوسەری بە نێو بانگی ئینگلیز, کە زیاتر لە گاڵتە دەچێت تا لە ڕاستی, لەم کتێبەدا کە تایبەتە بە ژیانی براکانی (دالاس), ئاماژە بە ژیان و چالاکیەکانی (ئالان دالاس)ی سەرۆکی بە ناوبانگی (سی ئای ئەی) و یەکێك لە راسپێردراوەکانی ئەو ڕێکخراوە لە ئێران بەنێوی (کیم ڕۆزفێڵت) کراوە, وە دووای باسکردنی ڕوداوی (٢٨ مورداد), (کودەتاکەی دژی موسەددەق), کە بە هۆی (سی ئای ئەی)ەوە ڕێکخرا, هاتووە کە دوواتر (ڕۆزفێڵت) پەیوەندی نزیکی لەگەڵ (شا)دا پەیدا کردووە و پزیشکێکی پسپۆڕی ئەمریکی ناردە لای سورەییا بۆ دەرخستنی هۆکاری منداڵ نەبوونی, دووای ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی پێویست پزیشکی (سی ئای ئەی) بە سورەییا دەڵێت: پێدەچێت هۆکاری منداڵ نەبوونی ئێوە ئەوە بێت کە زۆر لەگەڵ یەك ناخەون!؟, سورەییا لە وەڵامدا دەڵێت: هەندێ کات (شا) ڕۆژانە شەش جار ئەو کارە دەکات, بە بۆچونی تۆ ئەوە بەس نیە؟!.

*Dulles – By Leonard Mosley . p, 326.

فشارانەی بنەماڵە بە تایبەت شاژنی دایك و ئەشرەفی خوشكی كە دەخرانە سەر (شا)، ڕەوشێكی سارد و ناجێگیری لە ژیانی ژن و مێردایەتی ئەوان دا دروست كرد.

سورەییا لە یاداشتەكانیدا دەنووسێت: لەو ڕۆژانەدا هەندێك كات من بیرم لە خۆم دەكردەوە كە ئایا (شا) ئەوەندە منی خۆش دەوێت كە لەبەر خاتری عەشقی من وەك (دووك ئۆف ویندسور/Duke of Windsor)ی پاشای پێشوی ئینگلیستان چاو لە تەخت و تاجەكەی خۆی بپۆشێت؟ بەڵام دوواتر تێگەیشتم كە هەرچۆنێك نەبێت ئەو پیاوێكی ڕۆژهەڵاتیە و لەوانەیە هەرگیز هەنگاوی وەها فیداكارییەك هەڵنەنێت، سەرەنجام ڕۆژێك (شا) پێی وتم: تۆ زۆر نەخۆش دەردەكەویت، باشترە ماوەیەك بۆ گەشت و پشودان بڕۆم بۆ (سن مۆریتن)، بە وریایی خۆم لەوە تێگەیشتم كە ئەو دەیەوێت ئەو بڕیارەی كە خۆی زاتی وتنی بە من نیە، لە ڕێگەی كەسانی دیكەوە پێم ڕابگەیەنێت،.... هیچم نەوت، پێشنیارەكەیم پەسەند كرد، لەو ماوەیەی كە تا بەڕێكەوتن بۆ سەفەرەكەم هەمبوو هەندێك لە كەلوپەلە تایبەتیەكانی خۆم و ئەو كەلوپەلانەی پێم خۆشبوون ئامادە كرد، سەدان نامەی تایبەتی و ئەو بەڵگانەی كە نەمدەویست بكەوێتە دەستی كەس سەتاندنم، ڕۆژی (١٣ فەبریوەر ١٩٥٨ز ، ٢٤ بەهمەن ١٣٣٦ هەتاوی) واتە نزیكەی حەوتەمین ساڵوەگەڕی هاوسەرگیریمان بە ڕێوڕەسمێكی فەرمی بەڕێكردن لەلایەن (شا) و بەرپرسە دەوڵەتیەكانەوە تارانم بە جێ هێشت، لە چركەساتی خوداحافیزی دا پێدەچو جگە لە من و خودی (شا) هیچكەس نەیدەزانی كە ئیدی ئێمە هەرگیز یەكتری نابینینەوە.

چەند ڕۆژێك دوواتر (شا) لە تەلەفون دا پێی وتم كە لیژنەیەك بۆ بە دووادا چونی پرسی جێنشینی پێكهاتوە، وە ئەویش پێشنیاری كردووە كە (غوڵامڕەزا یان عەبدوولڕەزا) وەك جێنشین دیاری بكەن، بۆ ئەوەی ئێمە بتوانین بەبێ هیچ پەژارەییەك پێكەوە بژین، بەڵام هێشتا نەمان توانیوە لەم بارەیەوە بگەینە ئەنجامێكی یەكلاكەرەوە، ڕۆژی٢٢ فەبریوەر) باوكم لە (كۆلن)ەوە تەلەفونی كرد كە خرتكەی پێی شكاوە و گیراوەتەوە، ئیدی چاوەڕێی هەواڵی تاران نەبووم و بەپەلە باری سەفەرم پێچایەوە و لەگەڵ دایكم بەرەو ئەڵمانیا چوین، دووای من (شا) چەند جارێك تەلەفونی كردبوو وتبووی كە لیژنەیەكی سێ كەسی بۆ گفتوگۆ لەگەڵ مندا دەنێرێت، ئەندامانی ئەو لیژنەیە بریتی بوون لە (ئەسعەد بەختیاری مامم، سپەهبەد یەزدان

پەنا, د.ئەیادی) چەند ڕۆژێك دوواتر گەیشتنە (کولن), وتیان ئەو لیژنەیەی کە بە فەرمانی (شا) بۆ چارەسەر کردنی پرسی جێنشینی پێکهاتبوو, پێشنیاری دانانی یەکێك لە براکانی خاوەن شکۆی وەك جێنشین ڕەت کردووەتەوە, وتم: ئەی خاوەن شکۆ بۆچی ئێوەی بۆ ئێرە ناردووە...؟, دوکتۆر ئەیادی ووتی: ئێمە لیژنەی چارەسەرکردن و دۆزینەوەی (کۆتا ڕێگەچارەین)!!, وتم: ئەو کۆتا ڕێگە چارەی کە ئێوە دەیڵێن چییە؟, وتیان: بە پێی دەستوری ئیسلامی خاوەن شکۆ دەتوانێت هاوسەرێکی دیکە بهێنێت بۆ ئەوەی کە جێنشینێکی بۆ بهێنێتە دوونیاوە, ئەگەر تۆ بە ئەم کارە ڕازی بیت ئەوا پایەو پێگەی تۆ وەك هاوسەری یەکەمی خاوەن شکۆ و شاژنی ئێران دەپارێزرێت.

من بە توڕەییەوە سەیری ڕوخساریانم کرد و وتم: ئێوە چۆن ڕێگە بە خۆتان دەدەن وەها پێشنیارێك بۆ من بکەن, لە کاتێکدا کە خۆتان دەزانن من هەرگیز بە ڕێگە چارەیەکی وەها ڕازی نابم؟!!.

سپەهبەد یەزدان پەنا ووتی: دایکی خاوەن شکۆیش مۆڵەتی بە مێردەکەی داوە کە دووای ئەو دوو ژنی دیکە بهێنێت.

وتم: زەمانە گۆڕدراوە و من بە جۆرێکی دیکە بیر دەکەمەوە.

مامم لێرەدا هاتە نێو قسان و ووتی: بەڵام پایەو پێگەی ئێوە هیچ گۆڕانکارییەك ناکات.

دیسانەوە وەڵامی نەخێرم دایەوە, بە ڕواڵەت ئەندامانی لیژنەکە ئەنجامی گفتوگۆکەیان بە بێ سود دەبینی و سەرەنجام سپەهبەد یەزدان پەنا ووتی: (بۆچی خودی شاژن ناگەڕێتەوە بۆ تاران هەتا خۆتان ئەم بابەتە لەگەڵ خاوەن شکۆدا چارەسەر بکەن؟), ئەوانیش بۆچونەکەی ئەویان پەسەند کرد, بەڵام من وەڵامم دانەوە کە: (ئێمە پێشتر کاتی زۆرمان بۆ گفتوگۆ کردن لەم بارەیەوە هەبوو, گفتوگۆی زیادەش هیچ شتێك چارەسەر ناکات...).

دووای گەڕانەوەی لیژنەکە بۆ تاران, بۆ دووایین جار ڕۆژی (٥ مارس, ١٤ ئەسفەند ١٣٣٦)هەتاوی (شا) تەلەفونی بۆ کردم و داوای لێ کردم کە زیاتر و باشتر بیر لە پێشنیاری ئەو لیژنەیە بکەمەوە, منیش وتم باش بیرم کردۆتەوە و ناتوانم بە بڕیارەکەی خۆمدا بچمەوە, ڕۆژی (١٤ مارس, ٢٣ ئەسفەند) بە بێ ئەوەی کە (شا)

جارێکی دیکە تەلەفونم بۆ بکاتەوە بڕیاری خۆی بۆ جودابوونەوە لە من ڕاگەیاند، چەند ڕۆژێك دوواتر نامەیەکی ئەوم بەدەست گەیشت، کە تیایدا دڵتەنگی و پێناخۆش بوونی لەو بڕیارەی خۆی دەربڕیبوو، من وەڵامی ئەو نامەیەم نەدایەوە و لەو باوەڕەشدا نەبووم کە ئەو چاوەڕوانی وەڵامی من بێت.[1]

دەقی ئەو ڕاگەیەندراوەی دەربارەی تەڵاق دانی سورەییا کە لە ڕۆژی (٢٣ ئەسفەند ١٣٣٦)هەتاوی لە تاران دا بڵاو کرایەوە بەو شێوەیە بوو:

*لەبەرئەوەی بەرژەوەندی باڵای گەلی ئێران و پاراستنی ئاییندەی سەڵتەنەت بە مەرجی پشتاوپشت و خۆلادان لە هەر جۆرە سەختی و پەشێوییەك لە ئاییندەدا پێویستی دەکات کار بۆ دیاریکردنی جێنشین بکرێت، لە دانیشتنێکی ڕاوێژکاری دا کە ڕۆژی (٢٧ بەهمەن ١٣٣٧) هەتاوی لە خزمەتی هومایۆنی بەئامادەبوونی سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی هەردوو ئەنجومەن (پەرلەمان و سەنا) و وەزیری دەربار و ئاغایان ئیبراهیم حەکیمی، ئەسعەد بەختیاری، مەحمود جەم، دوکتۆر مەتین دەفتەری، سپەهبەد یەزدان پەنا، سپەهبەد عەبدوولا هیدایەت، سپەهبەد ئەمیر ئەحمەدی، لە دەربارڎا پیکهێنرا، ئەم بابەتە لەلایەن شاهنشاوە خرایە ڕوو وە بەشداربووانیش بە لەبەرچاو گرتنی بەرژەوەندیە باڵاکانی وڵات بە کۆی دەنگ بۆچونیان وابوو کە دەبێت جێنشینی ئێران ڕاستەوخۆ لە وەچەی خودی حەمە ڕەزا پهلەوی بێت.*

*لەبەر ئەوەی لە دانیشتنی دوواتری ڕۆژی (١٠ ئەسفەند ١٣٣٦)یش دا دووبارە لەم بابەتە کۆڵرایەوە، پشتیوانی ئەوە کرا و کە لەلایەن شاهنشاوە نوێنەرێك نێردرا بۆ خزمەتی شاژنە سورەییا پەهلەوی و لەم بابەتەوە ئاگادار کرایەوە، لە گەڕانەوەیاندا ئامادەیی شاژنیان بۆ ڕەزامەندی دەربڕین لە هەر جۆرە فیداکاریەك لە ڕێگەی بەرژەوەندیە باڵاکانی گەل و پاراستنی ئاییندەی سەڵتەنەتی ئێران ڕاگەیاند، لە ئەنجام دا لە سێیەمین دانیشتنی ڕاوێژکاری دا لە ڕۆژی (١٩ ئەسفەند ١٣٣٦) هەتاوی، شاهنشا لەگەڵ دەربڕینی ئەوپەڕی دڵگرانی و بێتاقەتی، وە بە بیر هێنانەوەی ئەوەی کە شاژنە سورەییا پەهلەوی*

[1] Soraya: pp. 153 – 158 .

*لە تەواوی ماوەی هاوسەرداری شاهنشا دا, کەمتەرخەمی لە هیچ جۆرە خزمەتکردن و خۆشەویستی و خێرخوازی لە بەرامبەر گەلی ئێراندا نەکردووە و لە سەرجەم بابەتەکاندا شایستەگی پلەو پایەی بەرزو بڵندی خۆیی هەبووە و لەم بارەیەشەوە لەگەڵ ئەوپەڕی سۆزو خۆشەویستی کە لە نێوانیاندا هەیە, ئامادەیی خۆی بۆ ڕازی بوون بە هەر بڕیارێك کە لەلایەن زاتی مەزنی شاهانەوە دەر بچێت, ڕاگەیاندووە, بە چاوپۆشین لە هەستە تایبەتیەکانی خۆی لە بەرامبەر بەرژەوەندیە باڵاکانی گەلی ئێران و بە ڕەزامەندی دەربڕین لەسەر بۆچونەکانی دەستەی ڕاوێژکاری بڕیاری خۆی بە جودابوونەوە دەرکرد.*

سورەییا لە کتێبی یاداشتەکانی خۆیدا نوسیویەتی کە لە بەرواری جودا بوونەوەی لە (شا) لە ساڵی (١٩٥٨ز) هیچ جۆرە پارەیەکی لەو دەست نەکەوتووە و بە سەروەت و داهاتی خودی خۆی ژیانی بەڕێ کردووە, ئەم بابەتە پێدەچێت لە کاتی بڵاو کردنەوەی یاداشتەکانی ئەو لە ساڵی (١٩٦٣ز) ڕاستیەکی هەبووبێت, بەڵام چەندین بەڵگە لە بەر دەستدا هەیە کە بەردەوام سورەییا پارە یان دیاری لە (شا) وە پێدەگەیشت, لە نێو ئەو بەڵگانەی کە لەم بارەیەوە هەیە, یاداشتەکانی (عەلەم)ی وەزیری دەرباری (شا) یە کە لەم دووایانەدا لە لەندەن بڵاو کرایەوە, لەم یاداشتەدا ئاماژە بە دوو نمونە لەبارەی سورەییاوە دەکەین:

دووشەممە (٢٢ دی ١٣٥٤)هەتاوی..., سورەییای شاژنی پێشو نامەیەکی نوسیوە و داوای کردووە کە ئاپارتمانێکی لە پاریس بۆ بکڕین, (شا) ڕەزامەندی دەربڕی و فەرمانی بە من کرد کە پێویستیەکانی ڕێك بخەم....

دووشەممە (٣٠ ئابان ١٣٥٥)هەتاوی,,, هەواڵم دا کە شاژنە سورەییا بارودۆخێکی دارایی سەختی هەیە و داوای مانگانەیەکی زیاتر لە شەش حەوت هەزار دۆلار کردووە, (شا) وتی چی بەو هەموە پارەیەی کردووە؟, لەم ماوەپێشوەدا بوو کە ملیۆن و نیوێك دۆلارم بۆ ناردووە, ئەو باوکە ناکەسە موفت خۆرەیەتی کە هەرچی پارەی ئەو هەیە لێی زەوت دەکات و کاتەکانی ئەو بۆ خۆشگوزەرانی لەناو دەبات..., ئاگاداری بکەنەوە کە ئەم ڕەوشە ناتوانرێت بۆ هەمیشە بەردەوام بێت...)

ڕێك لە ناوەڕۆکی ئەم دوو چەند دێڕەدا یاداشتەکە چەند خاڵێك ڕون دەکاتەوە:

یەکەم ئەوەیە کە هەرچەندە دەگونجێت کە بانگەشەکانی سورەییا بۆ وەرنەگرتنی مانگانەیەکی دیاریکراو تا ساڵی (١٣٥٥)هەتاوی, ڕاست بووبێت, بەڵام دیاری و ژمارەی گەورەی وەك ئاپارتمانێك لە پاریس و ملیۆن و نیوێك دۆلاری لە (شا) وەرگرتوە, کە ناتوانرێت هیچ ناوێکی دیکەی لێ بنرێت جگە لەکرێی بێدەنگ بوون.

دووم لە ساڵی (١٣٥٥)هەتاوی کە تەمەنی بەرەو سەرەوە ڕۆیشتوە بە وتەی (عەلەم) ڕەوشی دارایی خراپ بووە, ڕازی بووە بە وەرگرتنی مانگانەیەکی شەش حەوت هەزار دۆلاری و سەرەنجام ئەو خاڵەی کە لە دەربڕیەنەکانی (شا) دا سەرنج ڕاکێشە ئەوەیە کە ئەو لەوەی کە (باوکە موفت خۆرەکەی هەلی خۆشگوزەرانی بەو نادات), نیگەرانە!!.

سورەییا کە ئێستا نزیکەی شەست ساڵ تەمەنیەتی, وەکو هەمو جوانە بەناوبانگەکانی دیکە کە دەیانەوێت ستایشکەرەکانیان هەمان ڕوخسارە بەشەوقەکەی ئەوانیان لە یاد دا بێت, خۆی لە دەرکەوتنی لە نێو خەڵکدا دەشارێتەوە و ئەگەریش بە مەبەستی گەڕان و گەشت یان بە مەبەستی کڕین بڕۆن بۆ شوێنێك هەوڵدەدات کەس ئەو نەناسێتەوە, ساڵانێکە کە ئیدی وێنەو هەواڵی ئەو لە چاپەمەنیەکاندا بڵاو نەبووەتەوە, وە کۆتا جار بە بڵاو کردنەوەی کتێبێك بە نێوی (کاخ تنهائی) ناوی سورەییا دووبارە کەوتەوە سەر زار, لە ڕاستیدا ئەم کتێبە هەمان یاداشتەکەی سورەییایە کە ئەو بە زیاد کردنی چەند ڕوداوێکی عاشقی خۆی نوێ سازی تیادا کردووە و نوسەرێکی فەرەنسی بەنێوی (لویس ڤالانتاین/ Louis Valentin) بە شێوەی ڕۆمان نوسیویەتیەوە, هەرچەندە ئەم کتێبە لە ئێراندا تاڕادەیەك خوێنەری هەبووە و دوو شێوازی وەرگێڕدراوی لێ بلاّ کراوەتەوە, بەڵام لە فەرەنسا دا خوێنەری زۆری نەبووە, لەبەر ئەوەی ئیدی خەڵکی ئەوروپا سورەییا یان لە بیر چوەتەوە.

سورەییا کە وادیارە لە هەمان ئاپارتمانە بە دیاری پێدراوەکەی (شا) لە پاریس دا ژیانی بەسەر دەبات, لەم کتێبەدا وای دەردەخات کە هەرچەندە حەوت ساڵ شاژنی ئێران بووە و دووای ئەویش هەمو توانیی و پێداویستیەکانی گەشت و خۆشگوزەرانی لە بەردەست دا بووە, بەڵام ژنێکی خۆشبەخت نەبووە.

لەبەرامبەر ئەوەشدا سورەییا لەم کتێبەدا دەنوسێت تەنها عەشقی ڕاستە ڤینەی ئەو دووای (شا)، دەرهێنەرێکی لاوی ئیتالیایی بووە بەنێوی (فرانکۆ – ئیندڤینا/ Franco Indevina) کە پێش ئەنجامدانی هاوسەرگیریان ئەو لە کارەساتێکی هەوایی دا گیانی لەدەست داوە.

# دیکتاتۆری شاهانه......!

**شای بێ دەسەڵات.....! ئەمریکیەکان پشکی خۆیان لە نەوتی ئێران دەوێت, شا چۆن چۆنی پێویستیەکانی لادانی (زاهیدی) لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی فەراهەم دێنێت؟ ڕووداوی عەشق وعاشقی (شەهنان) و (ئەردەشێری زاهیدی) نامەی تایبەتی (شا) بۆ (جمال عبدالناصر) , هەموار کردنەوەی دەستورو سەرەتاکانی حکومەتی ڕەهای (شا) , پێکهێنانی حیزبی چاودێر و نمایشی دیموکراسی....**

(ڕیچارد کاتم) ڕاسپێردراوی پێشووی دەزگای (سی ئای ئەی) لە ئێران, کە دواتر پەیوەست بوو بە ڕیزی ڕۆشبیران و لیبراڵەکانی ئەمریکاوە, بە نوسینی کتێبێك بە ناو و نیشانی (ناسیۆنالیسم در ایران) دا, بەرگری لە حکومەتی (د.موسەددەق) و ڕەخنە لە سیاسەسەتەکانی ئەوکاتی ئەمریکا لە ئێران دا دەگرێت, لەو کتێبەی کە ئاماژەی بۆ کرا سەردەمی دوای کودەتای (٢٨ مورادادی ١٣٣٢هەتاوی, ١٩ ئابی ١٩٥٣ ز) لە ئێران دا بە (دیکتاتۆری شاهانە / Royal Dictatorship) دەزانێت, ئەم زاراویەش لەزۆر سەرچاوەی دیکەشدا بەکار هاتووە, لەگەڵ بەکارهێنانی ڕەهایی (دیکتاتۆری شاهانە) بە تەواوی بیست وپێنجساڵی حکومەتی (شا) لە ساڵی (١٣٣٢ تا ١٣٥٧) ڕاست نیە, لە ماوەی ئەو چارەکە سەدەیەدا (شا) چەندین کات دەسەڵاتی ڕەهای لە دەست داوە, لەو ماوەیە دەسەڵاتی ئەو لە حکومەتدا هەمیشە بێ سنوور نەبووە.

حەمەڕەزا لەیەکەم قۆناغی گەڕانەوەیدا بۆ ئێران لە (شەهریوەری ١٣٣٢ی هەتاوی) کەم تا زۆرێك هەمان (شا) ی بێ دەسەڵات و لاوازی پێش (٢٨ ی مورداد)

بوو لەگەڵ ئەو جیاوازییەی پێش (٢٨ ی مورداد) ناچاربوو لە بەرامبەر پیاوێکی نەتەوەیی و سەربەخۆ و پاڵ پشت بە شەقامی ئێرانی سەری خۆبەدەستەوەدانی دانەوێنێت, ئەم جارەیان ناچارە لە بەرامبەر کەسێکدا سەر شۆڕ بکات کە بە پارەو هێزی بێگانە گەیشتۆتە دەسەڵات, لە کاروباری وڵاتیشدا گوێی پێ نەدەدا, لە فیلمێکی دیکۆمێنتاریدا دەربارەی چالاکیەکانی دەزگای (سی ئای ئەی) لە دوونیادا, کە بەشێکی تایبەت بوو بە کارەکانی لە ئێراندا, هەندێك چاوپێکەوتنی پلەدارەکانی (سی ئای ئەی) م بینی, وەك (کرێمت رۆزفیلت)ی ڕێکخەری ئەمریکی کودەتای (٢٨ ی مورداد) , کە بە ڕاشکاوی قسەی دەربارەی وردەکاری ئەو چالاکیانە دەکرد کە بوونە هۆی ڕوخانی حکومەتەکەی (د.موسەددەق) , ئەو لە وتەکانیدا بە ئاوازێکی پڕ لە سوکایەتی دەیوت (شا) هەراسان بوو لە جێ بەجێکردنی ڕۆڵی خۆی لەم چالاکیەدا, دوای سەرکەوتنی کودەتاکەش دەترسا کە بگەڕێتەوە بۆ ئێران, سەرئەنجام بە پێدانی گرەنتی و پێداگری ئێمە گەڕایەوە بۆ خاوەنداری تاج وتەختەکەی خۆی[1], حەمەڕەزا تا چەند مانگێك دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران بە شێوەیەکی پراکتیکی هیچ ڕۆڵی لە حکومەتدا نەبوو, تەواوی پلە دارانی لەشکری حکومی بە بێ ڕاوێژ کردن بەو دیاری دەکران.

بڕیارە گرنگەکانی حکومەتەکەی زاهیدی, وەك دووبارە دروستکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ بەریتانیا, دەستپێکردنەوەی دانوستانەکانی نەوت, بەستنی پەیمان نامەی (کنسرسیۆم) , دادگایی کردنی (موسەددەق) یش, بە بێ ڕاوێژکردن بە (شا) ئەنجام دران, دادگایی کردنی موسەددەق یەکێك لە گەورەترین هەڵەکانی حکومەتەکەی (زاهیدی) بوو, لەبەر ئەوەی ئەم دادگاییە کە لە دوو دانیشتن و

---

[1] لە فیلمی (سی, ئای, ئەی) , کە زنجیرەیەکی دۆکۆمێنتاری تەلەفزیۆنی (بی بی سی) ە, زۆرێك لە کارە شەرمهێنەرەکانی (سیا) لە ناوچە جیاوازەکانی دوونیادا, لە زمانی پلەدارو بەرپرسەکانی خودی (سیا) وە ئاشکرا بووە, لە ڕاستیدا ئینگلیزەکان بەم کارەیان هیچ ئابڕویەکیان بۆ ئەو ڕێکخراوە نەهێشتۆتەوە , لە بەشی تایبەت بە ئێران دا, سەرباری کرمیت رۆزفێلت, چاوپێکەوتن لە گەڵ چەندان کەسی دیکەی وەك (ڕیچارد کاتم, سەرهەنگ یاتسویچ (کە ڕۆڵێکی دیاری هەبووە لە هێنانە سەرکاری حکومەتی حەسەنعەلی مەنسوردا), دەریاسالار ترنر) سەرۆکی ڕێکخراوی (سیا) لە سەردەمی حکومەتی (کارتەر) دا, ئەنجام دراوە.

بەشێوەیەکی ئاشکرا و بەئامادەبوونی پەیامنێری ڕۆژنامەکان لە دادگای سەربازییدا بەڕێوە چوو, موسەددەق مەیدانێکی بۆ وتاردان و خستنەڕوی بیروباوەڕەکانی خۆی بەدەست هێنا, لەڕاستیدا ئەم دادگاییە دادگایی کردنی ڕژێم بوو, هەرچەندە لەکۆتاییدا د. موسەددەق بە سێ ساڵ زیندانی سزادرا, بەلاّم زۆرێك لە ڕووداوەکانی پشت پەردە بۆ خەڵکی ڕوون کرانەوە و پایەکانی ڕژێمی هەژاند.

حەمەڕەزا لەو هەنگاوانەی کە نرابوون بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نەوت و دووبارە دروستکردنەوەی پەیوەندی لەگەڵ ئینگلستان, هیچ ڕۆڵێکی نەبوو, سەردەمانێك کە حکومەتەکەی موسەددەق لە ئێراندا لە سەرکار بوو, گومان لەوە دەکرا کە ڕێگری سەرەکی بۆ چارەسەرکردنی پرسی نەوت خودی د.موسەددەقە و بەڕووخانی ئەو و لادانی لەسەر تەختی شانۆی دەسەلاّت, ئەم پرسە بە ئاسانی چارەسەر دەکرێت, لە کاتێکدا کەبەو شێوەیە نەبوو, ڕاستە کە د.موسەددەق لە بزوتنەوەی خۆماڵی کردنی نەوتدا ڕۆڵێکی دیاری هەبوو, سەرسەختی ئەو لە گەیشتن بە ئامانج و مەبەستەکانی خۆماڵیکردنی نەوت و ڕێگرتن لە دەستگرتنی بێگانەکان بەسەر ئەم سەرچاوە گرنگەی داهاتی نەوتی ئێراندا, ڕێگرییەکەی دیار بوو لە بەرامبەر سازش کردن بۆ بەریتانیەکان, یان بە وتەی ڕۆژئاواییەکان بۆ (گەیشتن بە ڕێگەچارە و چارەسەرێکی گونجاو) , بەلاّم ڕاست و دروستی کار ئەوەیە کە بنەمای خۆماڵیکردنی نەوت, لەگەڵ ئەو دژایەتیەی کە بەرامبەر حکومەتەکەی موسەددەق دەکرا هەتا کۆتایی حکومەتەکەی ئەو, تەنانەت دوای ڕوخاندنیشی, بەهرەمەند بە پشتیوانی زۆرینەی گەلی ئێران, ڕق لێبوونی ئینگلیزەکانیش هێشتا ئەوەندە قوڵ و سەرسەختانە بوو کە ڕێگەی گەڕانەوەیان نەدەدا بە (شا) و حکومەتی جێگرەوەی موسەددەق بۆ سەر تەختی شانۆی دەسەلاّتی ئێران.

کێشەیەکی گەورەی دیکە کە بووژانەوەی پیشەسازی نەوتی ئێران و دووبارە هەناردنەوەی نەوتی ئێران بۆ بازاڕەکانی دوونیا, زۆربوونی کتوپڕی بەرهەم هێنانی نەوت بوو لە سەرچاوەکانی دیکەی ولاّتانی کەناری کەنداوی فارسی و پڕکردنەوەی کورتهێنانی بەرهەمی نەوتی ئێران لە بازاڕەکانی دوونیادا, سەرچاوە دەوڵەمەندە نەوتیەکانی ولاّتی (کوێت) کە لە سالی (١٩٥٠ان) کەمێك زیاتر لە (١٧) ملیۆن تەن نەوتی تێدا دەرهێنرا بوو, لە ساڵی (١٩٥١ان) یەکەم ساڵی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران

و هەناردەنەکردنی بۆ بازارەکانی دوونیا بوو, زیاتر لە (٢٨) ملیۆن تەن نەوتی بەرهەم هێنا, بەرهەمی نەوتی (کوێت) لە ساڵی (١٩٥٢ن) لە (٣٧) ملیۆن تەن تێپەڕی کرد, لە ساڵی (١٩٥٣ن) گەیشتە (٤٢٦٥٤٠٠٠) چل و دوو ملیۆن و شەش سەد و پەنجاوچوار هەزار تەن, کە بە بەراورد بە بەرهەمی ساڵی (١٩٥٠ن) زیاتر لە (٢٥) ملیۆن تەن نەوت بەرهەمی زیادی کرد, لە هەمان ماوەدا بەرهەمی نەوتی عەرەبستانی سعودی لە (٢٦) ملیۆن تەنەوە گەیشتە نزیکەی (٤١) ملیۆن تەن, کە بەرهەمەکەی نزیکەی (١٥) ملیۆن تەن زیادی کرد, بەرهەمی نەوتی عێراقیش کە لە ساڵی (١٩٥٠ن) کەمتر لە (٧) ملیۆن تەن بوو, لە ساڵی (١٩٥٣ن) دا (٢٧) ملیۆن تەنی تێپەڕاند, کە نزیکەی (٢٠) ملیۆن تەن بەرهەمی نەوتی زیادی کرد بوو, سەرجەمی بەرهەمی زیادەی هەرسێ وڵاتی بەرهەمهێنەری نەوت (کوێت, سعودیە, عێراق) لە ماوەی ساڵانی (١٩٥٠تا١٩٥٣ن) نزیکەی (٦٠) ملیۆن تەن بوو, ئەم بەرهەمە زیادەیە کە نەك جێگای (٣٠) ملیۆن تەن بەرهەمی نەوتی ئێرانی لە ساڵی (١٩٥٠ن) دا لە بازارەکانی دوونیادا پڕ دەکردەوە, بەڵکو زیادەی بەکارهێنانی ساڵانەی نەوتیشی لە بازارەکانی دوونیادا دابین دەکرد.

لەگەڵ ئەم پێشەکیەی کۆمپانیاکانی نەوتدا, بە تایبەت کۆمپانیا نەوتیەکانی ئەمریکا کە پشکی تایبەتیان هەبوو لە قازانجی زیاد بوونی بەرهەمی نەوتی کوێت و عێراق و سعودیە, ئارەزوومەندی بە خێرایی چارەسەرکردنی کێشەی نەوتی ئێران دووبارە هەناردنەوەی نەوتی ئێران بۆ بازارەکانی جیهان نەبوون, لەبەر ئەوە دووبارە بە هەنارده کردنەوەی نەوتی ئێران بۆ بازارەکانی جیهان, بە ناچاری بەرهەمی نەوتی وڵاتانی دیکە کەمی دەکرد, وە ئەگەریش دووبارە نەوتی ئێران بکەوتایەتەوە دەست بەریتانیا ئەوا کۆمپانیا نەوتیە ئەمریکیەکان توشی زیان دەبوون, بەڵام ئینگلیزەکان لەلایەك بە ئومێدی گەڕانەوەی پێگەی لە دەست چوی خۆیان لە ئێران و لە لایەکی دیکەوە بە تەماحی وەرگرتنی بژاردنی زیانەکانیان, پێداگری زۆریان لە سەر هەرچی زووتر چارەسەر کردنی کێشەی نەوت دەکردەوە, کێشەی گەورەی ئینگلیزەکان ئەوە بوو کە یەکەمجار پەیوەندی سیاسی نێوان بەریتانیا و ئێران کە لە سەردەمی حکومەتەکەی (د.موسەددەق) دا پچڕا بوو وە هەلی پەیوەندی ڕاستەوخۆ لە نێوان هەردوو وڵاتدا بۆ دانوستان دەربارەی نەوت نەدەڕەخسا ئاسایی بکەنەوە, دووەمیش هەستی دژایەتی کردنی ئینگلیز لە ئێراندا تا ئەو کاتەیش ئەوەندە بەهێز بوو کە

حكومەتە جێگرەوەکەی موسەددەقیش هەر لە سەرەتای کاریدا نەیدەتوانی بە سانایی و بەبێ ئامادەکاریەکی گونجاوی پێشوەختە لە گەڵ بەریتانیەکاندا بکەوێتە دانوستانەوە, لەگەڵ ئەوەی کە ئەمریکیەکان ڕۆڵیان هەبوو لە ڕوخانی حکومەتەکەی موسەددەقدا, وە ئەو دەسەڵاتەش کە لە نێو حکومەتی نوێی ئێران و خودی (شا) یش دا بەدەستیان هێنا بوو, بەبێ بەشداری پێکردن و دەستوەردانی ئەمریکیەکان چارەسەر کردنی کێشەی نەوت بەباشی نەدەهاتە بەرچاو, تەنانەت نوێکردنەوەی پەیوەندییەکانی ئێران و بەریتانیاش وابەستە بوو بەو زەمینە سازییەی کە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە ئامادە دەکرا.

لەلایەکی دیکەوە لەگەڵ ئەوەی کۆمپانیا گەورەکانی نەوتی ئەمریکا بە ڕواڵەت ئارەزومەندی خۆیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەوتی ئێران نیشان نەدەدا, ئەو ئارەزوەی خۆشیان نەدەشاردەوە کە ئەگەر بڕیار بێت نەوتی ئێران دووبارە بگەڕێتەوە بۆ بازارەکانی جیهان ئەوا دەبێت پشکێکیش لەبەر چاو بگیردرێت بۆ ئەوان, چاپەمەنیەکانی ئەمریکاش کە لە ژێر دەسەڵات یەکێتی کۆمپانیا نەوتیەکاندا بوون, لەو ڕاپۆرت و ڕاڤانەی کە لەلایەن پەیامنێرەکانیانەوە لە ئێرانەوە بڵاویان دەکردەوە ئەوەیان دەخستە ڕوو کە هەستی ناسیۆنالیستی و دژە ئینگلیزی لە ئێراندا لەگەڵ ئەوەی کە حکومەتەکەی موسەددەقیش لەسەرکار نەماوە, هێشتا زۆر بە هێزە و ئێرانیەکانیش جارێکی دیکە ناچنەوە ژێر باری دووبارە پێدانەوەی جیاوکی نەوت بە ئینگلیزەکان, یان فرۆشتنەوەی سەرجەم بەرهەمی نەوت بە ئینگلیزەکان.

سەرباری پرسی نەوت, پاراستنی دەسەڵات و پێگەی خۆیان و وەلانانی مەترسی دەسەڵاتی کۆمۆنیزم لە ئێراندا, گرنگیەکی زۆری لای ئەمریکیەکان هەبوو, ئەمریکیەکان زۆر بە توندی نیگەران بوون لە بەهێز بوونی دەسەڵاتی حیزبی تودە لە سەردەمی حکومەتەکەی مەسەددەق دا, کەم تا زۆریش ئاگاداری هەبوونی شانەیەکی بەهێزی ئەفسەرە تودەییەکان بوون لە لەشکری ئێراندا, هەر لەبەر ئەوە پێش ئەوەی بکەونە بیری چارەسەر کردنی پرسی نەوت, (هندرسۆن) ی باڵوێزی ئەمریکا لە ئێران لە سەرەتاکانی سێپتێمبەری ١٩٥٣ز دا, واتە کەمتر لە سێ هەفتە دوای ڕوخانی حکومەتکەی موسەددەق, ڕەزامەندی دەوڵەتی ئەمریکای بە پێدانی بڕی (٤٥) ملیۆن دۆلار بە ئێران نیشان دا, وەبیریشی هێنایەوە کە ئەم هاوکاریە بۆ چارەسەرکردنی

پێویستیە هەنوکەیی و تەنگانەکانی ئێرانە، دەوڵەتی ئێران دەبێ دەست بەجێ هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی پرسی نەوت ودابینکردنی پێویستیە داراییەکانی خۆی هەڵبگرێت لە ڕێگەی بەرهەم هێنان و فرۆشتنی نەوتی خۆیەوە.

دووەمین هەنگاوی ئەمریکا بۆ چارەسەر کردنی کێشەی نەوتی ئێران ناردنی (هربرت هۆڤیر / Herbert Hoover ) کوڕی سەرۆك کۆمارێکی پێشوی ئەمریکا و ڕاوێژکاری (دالاس) ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بوو بۆ تاران، هۆڤیر کە پەیوەندی نزیکیشی هەبوو لەگەڵ کۆمپانیا گەورەکانی ئەمریکا، ڕۆژی ١٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٣ز (٢٥ ی مهری ١٣٣٢ی هەتاوی) گەیشتە تاران و لەگەڵ بەرپرسە نوێ یەکانی دەوڵەتی ئێراندا کەوتە دانوستان، ئەرکی (هۆڤیر) سەرباری ئامادەسازی بۆ چارەسەری پرسی نەوت، فەراهەم هێنانی زەمینەیەکی لەباریش بوو بۆ دووبارە دەستپێکردنەوەی دانوستانە سیاسیەکان لە نێوان ئێران و بەریتانیادا، بە پێی ئەو گفتوگۆیانەی کە پێشتر لە نێوان واشنگتۆن لەندەن دا ئەنجام درا بوون، سێ ڕۆژ دوای گەیشتنی هۆڤیر بۆ تاران، واتە ڕۆژی ٢٠ ی ئۆکتۆبەری ١٩٥٣ز (٢٨ی مهری ١٣٣٢ی هەتاوی) ، (ئایدن) ی وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لە وتارێکیدا لە پەرلەمانی وڵاتەکەی ووتی: (ئومێدەوارم کە وەرزێکی نوێ لە مێژووی ئێران کرابێتەوە، لەو وڵاتەدا دەوڵەتێکی نوێ هاتۆتە سەرکار، دەوڵەتی شاژنی پاشای ئینگلستانیش لە ناخی دڵەوە ئارەزومەندە کە دەستی دۆستایەتی خۆی بەرەو ئەو دەوڵەتەو گەلی ئێران درێژ بکات، دووڵەتی ئێران ئاگادارە لەوەی کە ئێمە ئارەزومەندی سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی پەیوەندییە سیاسیەکانی خۆمانین لەگەڵ ئەو ووڵاتە دا، ئەگەر ئەم کارە پراکتیکی بکرێت ئێمە زیاتر دەتوانین پێکەوە دەربارەی پرسی ئاڵۆزی نەوتی ئێران گفتوگۆ بکەین، حەز ئەکەم ئەوەش بلێم کە لەم بارەیەوە دەوڵەتی ئەمریکاش بە دڵسۆزییەوە هاوکاریمان دەکات) .

دوو ڕۆژ دوای ئەم ڕاگەیاندنەی وەزیری دەروەی بەریتانیا، (چەرچڵ) ی سەرۆك وەزیری بەریتانیاش بابەتێکی بەهەمان ناوەرۆکەوە لە پەرلەمان (ئەنجومەنی پیران) دا پێشکەشکرد، هیواداری دەوڵەتی بەریتانیای بۆ دووبارە ئاسایی کردنەوەی پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوان ئێران و بەریتانیا ڕاگەیاند، بەڵام لەلایەن دەوڵەتی ئێرانەوە وەڵامێکی گونجاو بۆ ئامادەکارییەکانی بەریتانیا نەدرایەوە، لەبەر ئەوەی

دەوڵەتی ئێران دەیویست بەر لە ئاسایی کردنەوەی پەیوەندیە سیاسیەکانی لە گەڵ بەریتانیادا, لە گەڵ ئەمریکادا بگاتە ڕێکەوتنێك لە بارەی چارەسەر کردنی پرسی نەوتی ئێران, بە بۆچونێکی بەهێزیش ئەوە خودی ئەمریکیەکان بوون کە دەیانویست پێش ئاسایی بوونەوەی پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوان ئێران و بەریتانیا و ئەنجامدانی دانوستانی ڕاستەوخۆ لە نێوان هەردوو وڵاتدا, بە گێڕانی ڕۆڵی ناوبژیوان, بەرژەوندی کۆمپانیا نەوتیەکانی ئەمریکا بپارێزن.

هۆڤێر ماوەی نزیکەی دوو مانگ لە نێوان (لەندەن و تاران و واشنگتۆن) دا لە هاتوچۆدا بوو هەتا سەرکەوتوو بوو لە ڕەزامەندی وەرگرتن بە پێکهێنانی کنسرسیۆمێکی نێودەوڵەتی بۆ پێدانی نەوتی ئێران بە بەریتانیەکان, ئینگلیزەکان لە سەرەتادا بە هیچ جۆرێك ڕازی نەدەبوون کە لە کاتی بەرهەم هێنانی نەوتی ئێراندا جگە لەوان نەوت بە هیچ کەسێکی دیکە بفرۆشرێت, بەڵام کاتێك کە پێیان وترا ئێرانیەکان هەرگیز ناچنەوە ژێرباری وەها چارەسەرێك, کۆمپانیا ئەمریکیەکانیش پێداگری زۆر دەکەنەوە لە سەر هەبوونی پشکی خۆیان لە نەوتی ئێراندا, هەر بۆیە ئینگلیزەکان بە ناچاری ڕێگە چارەکەیان پەسەند کردبەمەرجی ئەوەی کە بژاردنێکی گونجاو لە لایەن دەوڵەتی ئێران و کۆمپانیا نەوتیە نوێ یەکانی ئێرانەوە بدرێت بە ئینگلیزەکان.

لەم نێوەندەدا زەمینەی ئاسایی کردنەوەی پەیوەندی سیاسی نێوان ئێران و ئینگلیز فەراهەم هات, لە نیوەڕۆی ڕۆژی (٥ ی دیسامبەری ١٩٥٤ ز, ٥ ی ئازەری ١٣٣٢ ی هەتاوی) , ڕاگەیەندراوێکی هاوبەش لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا ڕاگەیەندرا, *کە ئەمە دەقەکەیەتی:*

*(هەردوو دەوڵەتی ئێران و ئینگلستان بڕیاریاندا پەیوەندییە سیاسیەکانی نێوان خۆیان ئاسایی و دەست پێبکەنەوە, هەریەکەیان بە زوترین کات باڵوێزی خۆیان بنێرنەوە بۆ وڵاتی بەرامبەر, دواتر لە نزیکترین کاتدا کە مایەی ڕەزامەندی هەردوولا بێت, لە بارەی چارەسەرکردنی ناکۆکیەکانی تایبەت بە پرسی نەوت کە لەم دواییانەدا بوویە هۆی ساردی پەیوەندی نێوان هەردوولا , دانوستانەکان دەست پێ بکەنەوە و لەم ڕێگەیەوە دۆستایەتی لە مێژینەی خۆیان بە هێزو بتەو بکەن, هەردوولا دڵنیان لەوەی کە بە نیەت*

*پاکی دەتوانرێت بگەن بە چارەسەرێك کە ئومێد و ئارەزووەکانی گەلی ئێران بە تایبەت لە سەرچاوە سروشتیەکانی ولاتەکەیان بە سەربەرزییەوە بهێنێتە دی، سود و بەرژەوەندی هەروڵاش بە کارکردن لە سەر بنەمای دادپەروەری دابین دەکرێت...).*

ڕۆژێ دوای بلاوکردنەوەی ئەم ڕاگەیاندنە کۆنفراسێك لە دوورگەی (بەرموّدا) لە نێوان (ئایزەنهاوەر) ی سەرۆك کۆماری ئەمریکا و سەرۆك وەزیرەکانی بەریتانیا و فەرەنسا دا بەسترا، بەر لە بەڕێکەوتنی بۆ بەشداری کردن لەو کۆنفراسەدا (ئایزەنهاوەر) ڕایگەیاند کە پرسی نەوتی ئێران و نۆکەندی سوێس گرنگترین ئەو بابەتانەن کە لە نێوان خۆی و سەرۆك وەزیرەکانی بەریتانیا و فەرەنسا دا باسی لێوە دەکرێت، ڕێککەوتن نامەی کۆتایی دەربارەی پێکهێنانی (کنسرسیۆمی)[1] نەوتی ئێران، کە سەرباری ئەمریکی و بەریتانیەکان، هۆڵەندی و فەرەنسیەکانیش بوون بە شەریك، لەو کۆنفراسەدا ڕێککەوتن و دە ڕۆژ دواتر واتە (١٦ ی دیسامبەری ١٩٥٣ ز) یەکەمین دانیشتنی هاوبەش لە نێوان بەرپرسانی کۆمپانیای نەوتی (ئێران–ئینگلین) و پێنج کۆمپانیای ئەمریکی کە بریتبوون لە (ئوستادارد ئویلْ نیوجرسی، کۆمپانیای نەوتی تەکساس، سوکنی واکیۆم، ئوستاندارد ئویلْ کالیفۆرنیا، گاڵف ئۆیل) و کۆمپانیای (ڕۆیالْ داچ شل) ی هۆڵەندی–ئینگلیزی و کۆمپانیای نەوتی فەرەنسا، بۆ ئامادەکردنی کنسرسیۆمی نەوتی ئێران لە لەندەن ئەنجام درا.

لە کنسرسیۆمی نوێی نەوتی ئێراندا، کۆمپانیای پێشوی نەوتی (ئێران–ئینگلین) توانی تەنها ٤٠٪ (لەسەدا چل) ی پشکەکان بۆ خۆی مسۆگەر بکات، لەسەدا چلی دیکەی بەر کۆمپانیاکانی ئەمریکا کەوت، ئەو لەسەدا بیستەی کە مایەوە لە نێوان کۆمپانیای (ڕۆیال داچ شل) ی (هۆڵەندی – ئینگلیزی) و کۆمپانیای نەوتی فەرەنسا دا دابەشکرا، دانوستانەکانی ئێران و کنسرسیۆم لە (٢٥ ی فەروەردینی

---

[1] کنسرسیۆم: کۆمپانیایەکی گەورەیەو لە چەند کۆمپانیایەك پێك دێت، بۆ پاوانکردنی شمەکێك یان بەرهەمێکی کانزایی پێکدەهێنرێت. وەك کنسرسیۆمی پەمو، کنسرسیۆمی خەڵوزی بەردین، کنسرسیۆمی نەوت...هتد. بڕوانە: د. محمد معین: فەرهەنگی فارسی معین. (وەرگێڕ)

١٣٣٢ ی هەتاوی) دەستی پێکرد و سەرئەنجام ڕۆژی (٩ ی شەهریوەر) ی هەمان ساڵ پەیمانێکیان بەست بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ و دەتوانرێت بۆ سێ خولی پێنج ساڵیش درێژ بکرێتەوە ئەگەر بیانەوێت, هەرچەندە ئەم پەیمانناممەیە لە چوارچێوەی یاساکانی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران و لەسەر بنەمای بە یەکسانی دابەشکردنی داهات ڕێکخرا بوو, بەڵام بە ڕادەیەك جیاوکی بۆ پەیماننامەکانی پێشوو هەبوو کە نەیتوانی ئامانجەکانی خۆماڵیکردنی نەوت بپێکێت, کۆمپانیا نەوتیەکانیش بە بیانوی ئەوەی کە ناتوانن جیاوکی زیاتر لە وڵاتانی دیکەی بەرهەم هێنەری نەوت بە ئێران بدەن, خۆیان لە پێدانی بەشێکی زۆری داواکاریە ڕەواکانی ئێران دزییەوە.

دەوڵەتی (زاهیدی) هاوکات لەگەڵ دانوستانەکانی نەوتدا هەڵبژاردنی پەرلەمان و ئەنجومەنی سەناشی بەڕێوە برد, پەیماننامەی نوێی نەوت لە ڕۆژی (٢٩ ی میهری ١٣٣٩ ی هەتاوی) لە خولی هەژدەی پەرلەمان و لە ڕۆژی (٦ ی ئابان) لە خولی دووەمی ئەنجومەنی سەنادا دەنگی لەسەر درا و پەسەندکرا, لەم کاتانەدا دادگا سەربازیەکان بەخێرای سەرقاڵی دادگایی کردنی ئەفسەر و پلەدارانی ئەندامی شانە سەربازییەکانی حیزبی تودە و بەرپرسەکانی دووڵەتی (موسەددەق) بوون, شانەی سەربازی حیزبی تودە, کە سەدان ئەفسەر و پلەداری لەشکر و ژاندارمری و شارەوانی تێیدا ئەندام بوون لە شەهریوەری ١٣٣٣ ی هەتاوی دا ئاشکرا بوون, یەکەم دەستەی دە کەسییان لە (٢٧ ی میهر) دا گوللە باران کران, بەدرێژایی مانگی (ئابانی ١٣٣٣ ی هەتاوی) چوار دەستەی دیکەی ئەفسەرانی تودەیی گوللە باران کران, ئەوانی دیکەی کە مانەوە بە زیندانی درێژخایەن سزا دران, لە نێو وەزیرەکانی حکومەتی (موسەددەقیشدا) تەنها (د.فاتمی) بەفەرمانی لە سێدارەدان سزادرا لە ڕۆژی (١٩ ی ئابانی ١٣٣٣ ی هەتاوی) دا گوللە باران کرا.

**   **   **

دوای چارەسەرکردنی پرسی نەوت و پەسەند کردنی پەیماننامەی کنسرسیۆم لە لایەنی پەرلەمانەوە, (شا) کە نیگەران بوو لە دەسەڵاتخوازی و زیادەڕۆییەکانی (زاهیدی), هەربۆیە کەوتە بیری بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی, هەندیك لەو باوەڕەدان کە (شا) بە دەستی ئەنقەست بەشداری لە دانوستانەکانی تایبەت بە نەوت و بەستنی پەیماننامەی کنسرسیۆم دا نەکردووە, لەبەر ئەوە نەیدەویست لە بەستنی ئەو

پەیماننامەیەدا کە شەقامی ئێرانی دژی بوو, بەرپرسیارێتی بکەوێتە ئەستۆ, (شا) بە پێچەوانەی ئەو بۆچونانەی کە لە دەرەوە دەربارەی هەبوو, زۆر گرنگی بە ڕای گشتی دەدا, یان بە جۆرێکی دیکە بڵێین ڕای گشتی لەبەر چاو دەگرت, لاوازی (شا) لە بەرامبەر (د.موسەددەق) یشدا لە هۆشیاری ئەو و پێگەی بەهێزی موسەددەقەوە لە نێو شەقامی ئێرانیدا سەرچاوەی گرتبوو, ئەگەریش لەگەڵ ئەو پێداگری و فشارانەی ئەمریکا بۆ واژۆ کردنی لادانی موسەددەق, خۆی دزیەوە هەتا کۆتا ساتەکانی ناچاری, لە ترسی دژایەتی و پاشەکشەکردنی تواناکانی خۆی بوو لە نێو جەماوەردا, گومانێکی دیکە لە خۆ دزینەوەی (شا) و دوواخستن و دوودڵی ئەو لە واژۆی فەرمانی لەکارخستنی (موسەددەق) و دانانی (زاهیدی) لە پۆستی سەرۆك وەزیری دا, ترسی (شا) و بەدگومانی لە خودی (زاهیدی) بوو, ئەمریکیەکان زاهیدیان هەڵبژارد بۆ جێگرتنەوەی موسەددەق, هۆکاری ناشنایی و پەیوەندی زاهیدی لەگەڵ ئەمریکیەکاندا بەبۆنەی (ئەردەشێری) کوڕیەوە بوو, کە لەوکاتەدا لە ئیدارەی (بەندی چوار)ی ئەمریکادا کاری دەکرد, سەرباری ئەوەی کە (شا) نەیدەویست کەسانی دیکە سەرۆك وەزیری بۆ دیاری بکەن, لە پێشینەی دووژمنایەتی زاهیدی لەگەڵ باوکیشیدا نیگەران بوو[1], زاهیدی لەسەردەمی جەنگیشدا بەتۆمەتی هەبوونی پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانیەکان و پیلانی ئەنجامدانی کودەتا, لەلایەن هاوپەیمانانەوە دەستگیرکرا و دوورخرایەوە بۆ فەلەستین, لەسەروبەندی حکومەتی (موسەددەق) یشدا وەزیری ناوخۆی کابینەکەی ئەو بوو, بەم پێشینەوە و ئەو پەیوەندیە نزیکەی دواتر (زاهیدی) لەگەڵ ئەمریکیەکاندا دروستی کردبوو, حەمەڕەزاشا بەباشی دەیزانی کەئەو سەرۆك وەزیرێکی بەوەفاو گوێڕایەڵ نابێت بۆی.

[1] ڕەزا شا دووجار بەسوکایەتی پێکردن و شەرەمەزارکردنەوە, پلەکانی لە (زاهیدی) داماڵیوە, جاری یەکەم بەهۆی کەمتەرخەمی کردنی لەسەرکوتکردنی شۆرشی عەشایرەکانی پارێزگای فارس (شیراز) , جاری دووەمیش بە هۆکاری ئەنجامدانی شۆڕش لە زیندانی (قەسر) و ڕوداوی هەڵهاتنی (سەید فەرهاد) لە زیندان, زاهیدی کە لەو کاتەدا سەرۆکی شارەوانی تاران بوو, دوای داماڵینی لە پلەکەی زیندانی کرا.

دواتر له (ئەمیرانی) بەڕێوەبەری گۆڤاری (خواندنیها) کە یەکێك بوو لە دۆستە نزیك و هاوڕازەکانی زاهیدی, بیستم که (شا) لەباتی ئەو کەسانی دیکەی لە بەرپرسانی لەشکر وەك (سپەهبەند ئەمیر ئەحمەدی و سپەهبەند یەزدان پەنا) ی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری کاندید کردبوو, بەڵام ئەمریکیەکان دەڵێن کە پەیمانیان لەگەڵ زاهیدی دا تەواو کردووە و فەرمان دەبێت بەناوی ئەوەوە واژۆ بکرێت, هەرلەو کاتانەدا دەنگۆیەکی دیکەم بیست ئەویش ئەوە بوو کە (شا) هیچکام لە فرمانەکانی لەکارخستنی (موسەددەق) لە سەرۆك وەزیرانی ودانانی (زاهیدی) وەك سەرۆك وەزیر واژۆ نەکردووە, بەڵکو هەردووکیان لە لایەن مۆرداری دەربارەوە کاغەزی سپی واژۆ کراوە و خۆشی ڕۆشتوە بۆ باکور و لەکارخستن و دانانیش دواتر لەسەر ئەم کاغەزانە نوسراون, ئەم بابەتەش لە کاتی دادگای کردنی (د.موسەددەق) یشدا باسکرا و ئەو وتی کە گومانی لە ڕاستەقینەیی ئە فەرمانە هەبووەو و ئەگەریش ئەم فەرمانەیان لە کاتی ڕوخاندن و تالآن کردنی ماڵی ئەودا نەدزیبا, دەیتوانی هۆکاری گومانەکەی خۆی ڕوون بکاتەوە.

ئەوەی شیاوی باسە کە (شا) بە ناچاری و بە پێچەوانەی ئارەزوی ناخی خۆیەوە ڕازی بوو بە بوون بە سەرۆك وەزیرانی (زاهیدی) , هەر لەو ڕۆژەوەی کە گەڕایەوە ئێران هەمیشە لە کەمین دا بوو بۆ ئەوەی هەلێکی دەست بکەوێت و لە کاری بخات, بەو هۆکارانەی کە خرانە ڕوو, (شا) نەیدەویست بەر لە چارەسەر کردنی کێشەی نەوت و بەستنی پەیماننامەی کنسرسیۆم دەست بە وەها کارێك بکات, لەگەڵ ئەوەی لە ناخیشیدا ئارەزوی وەها کارێکی هەبوو, بەڵام لەوانە نەبوو لەو بارودۆخەی ئێراندا توانای ئەنجامدانی ئەو کارەی هەبووبێت, دوای پەسەند کردنی پەیماننامەی کنسرسیۆم لەلایەن پەڕلەمانەوە, (شا) دەستی کرد بە زەمینەسازی بۆ لەکارخستنی (زاهیدی) , لە سەفەرێکی فەرمی خۆیشیدا بۆ ئەمەریکا ڕەزامەندی (ئایزەنهاوەر) ی سەرۆك کۆمار و (جۆن فۆستەر دالاس /John FosterDulles) ی وەزیری دەرەوەی ئەمریکای بۆ ئەو بڕیارەی وەرگرت, ئەو بابەتەی کە (شا) لەم سەفەرەیدا باسی کرد, گەندەڵی حکومەتی (زاهیدی) بوو, بەداخەوە ئارەزومەندی هاوکاریەکانی ئەمریکا بوو کە ئەمریکیەکان لەو کاتەدا بەتایبەت لە بارەی بوون بە سەرۆك وەزیرانی (زاهیدی) ە

وە زۆر هەستیار بوون، بەهەر حاڵ ماوەیەکی کەم دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران زەمینەی بۆ ڕەخسا.

(ژرار دو ویلیە) ی فەرەنسی ئارد و ئاوێکی زیاتری بە ڕوداوی لەکارخستنی (زاهیدی) لە پۆستی سەرۆك وەزیرانیدا کردووەو دەنووسێت: (کاتێك کە (زاهیدی) تێگەیشت لەوەی کە نیازی لەکار خستنی ئەوی هەیە، سەرقاڵ بوو بە پیلان گێڕان دژی (شا) ، ئەگەر (شا) کەمێك دواتر بکەوتایە خۆی ئەمجارەیان دژی خودی (شا) کودەتای دەکرد) [1]، ڕاست و دروستی بانگەشەی ئەم نوسەرە فەرەنسیە ڕوون نیە، هەرچەندە سەرچاوەی ڕاستەقینەی ئەم وتەیەی خودی دەربارییەکان بوون، هەرچۆنێك بێت دوای پشوەکانی مانگی فەروەردینی ١٣٣٤هەتاوی، (شا) لە ڕێگەی (عەلەم) ە وە (زاهیدی لە بڕیارەکەی خۆی بۆ لەکارخستنی ئاگادار کردەوە، (عەلەم) یش لە لایەن (شا) وە پەیامێکی بۆ نارد کە خاوەن شکۆ وا بە باش دەزانێت کە خۆت دەست لەکار بکێشیتەوە، (زاهیدی) ڕۆژی (١٦ ی فەروەردینی ١٣٣٤ ی هەتاوی) دوای نزیکەی بیست مانگ لەو پۆستەدا دەستی لەکار کێشایەوە و بوو بە باڵوێزی گەڕۆکی پێشوازییەکانی ئێران لەوریپا، ئەم پۆستە تەشریفاتییە کە بە بۆنەی (زاهیدی) یەوە داهێنرا، زیاتر لەبەر ئەوە بوو کە لە ئێران دوور بێت، ئەمیش بە هۆی ئەو بەرپرسیارێتی یەی کە پێی سپێردرا بوو یان بە ئارەزوی خۆی بوو، هەتا مردنی لە ساڵی (١٣٤٢)ی هەتاوی تەنها جارێك نەبێت ئەویش بۆ بەشداری کردنی لە ڕێوڕەسمی زەماوەندی (ئەردەشێری)ی کوڕی لەگەڵ (شەهنان)ی کچی (شا) کە چەند ڕۆژێکی کەم لە تاراندا مایەوە.نەگەڕایەوە بۆ وڵاتی ئێران.

داستانی هاوسەرگیری (شەهنان)ی کچە تاقانەکەی (شا) لە (فەوزیە)ی ژنی یەکەمی، لە گەڵ ئەردەشێری کوڕی (سپەهبەد زاهیدی) یش شیاوە بۆ خوێندنەوە، (شا) دەیویست کچە تاقانەکەی بدات بە (مەلیك فەیسەڵی دووەم)، پادشای لاوی عێراق، تا ڕادەیەك زەمینە سازیشی بۆ کرا بوو، کە داستانی عەشق و عاشقی (شەهنان) لە گەڵ (ئەردەشێر) هاتە پێش، بە ناچاری (شا) ڕەزامەندی لەسەر ئەو هاوسەرگیریە دەربڕی، لەگەڵ ئەنجام دانی ئەم هاوسەرگیریە دا، (ئەردەشێر) پێگەی

---

[1] Gerard de Villiers.. p. 275

خۆی لە نێو دەربار دا چەسپاند و دوای ماوەیەکی کەم بەبێ هیچ کارێکی لە پێشینەی لە وەزارەتی دەرەوەدا, بوو بە باڵوێزی ئێران لە ئینگلستان, دوای ماوەیەك (شەهناز) بە هۆی نەگونجانیان پێکەوە لە ئەردەشێر جودا بوویەوە, بەڵام بە ئەنجامدانی ئەم هاوسەرگیریە نەگوجاوە لە مەترسی مەرگ ڕزگاری بوو, لەبەر ئەوەی مەلیك فەیسەڵی دووەم کە بڕیار بوو ببێت بە مێردی شەهناز, لە ژوئینی ١٩٥٨ ز, (مانگی تیری ١٣٣٧ ی هەتاوی) دا لە ئەنجامی کودەتایەکی سەربازیدا بە شێوەیەکی نەگونجاو کوژرا, ئەگەر زەماوەندی ئەو لەگەڵ شەهنازدا سەری بگرتایە, ئەویش دووچاری هەمان چارەنوس دەبوویەوە.

** ** **

یەکەمین کاری (شا) دوای لەکارخستنی (زاهیدی) , لادانی (د.علی ئەمینی) وەزیری دارایی کابینەکەی ئەو بوو لە سەرۆکایەتی شاندی نوێنەرایەتی ئێران لە کۆنفرانسی (باندوونگ) و دیاری کردنی (د.جەلال عەبدە)بوو بۆ سەرۆکایەتی ئەو شاندە, کۆنفرانسی (باندوونگ) کە لە سەر بانگهێشتی (د. سوکارنۆ) ی سەرۆك کۆماری ئەو کاتی ئەندەنوسیا دەبەسترا, لەو ڕوانگەیەوە گرنگی هەبوو کە بە یەکەمین کۆبوونەوەی سەرانی وڵاتانی ئاسیا و ئەفریقای دوای جەنگی جیهانی دووەم دەهاتە هەژمار, وەئامادە بوونی کەسانی خاوەن پێگەی وەك (جەواهیر ئال نەهرۆ)ی سەرۆك وەزیرانی هیندستان و, (چوئین لای) سەرۆك وەزیرانی چین, (جەمال عەبدوولناسر) سەرۆك کۆماری میسر, لەم کۆنفرانسەدا ئامادە بوون, قورساییان بەو کۆنفراسە بەخشیبوو, (شا) لەگەڵ ئەوەی یادگاریەکی خۆشی لەگەڵ (د.جەلال عەبدە) دا نەبوو بە هۆی ئەو توندڕەویانەی لە کاتی دادگایی کردنی (موختاری) سەرۆکی شارەوانی سەردەمی (ڕەزا شا) و هاوڕێکانی دا نواندی[1], هەروەها هاوکاری دڵسۆزانەی ئەو لەگەڵ (د.موسەددەق) دا لە کاتی سەفەری ئەو بۆ ئەمریکا, ئەمیش بۆ (شا) هەر

---

[1] د.جلال عەبدە دادوەری ئەو دادگایە بوو کە موختاری و هاوکارەکانی ئەوی دادگایی کرد, د.عەبدە بەهۆی ئو ناوبانگیەی کە لەو دادگایکردنەدا بەدەستی هێنا بوویە ئەندامی پەرلەمان وەك نوێنەری شاری تاران, کاتێکیش کە وەك سەرۆکی شاندی ئێران بۆ بەشداری کردن لە کۆنفرانسی باندوونگ دا دیاری کرا, نوێنەری هەمیشەیی ئێران بوو لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان.

مایەی خۆشحاڵی نەبوو, بەڵام (د.عبدە) ی وەك گونجاوترین كەسایەتی بۆ سەرۆكایەتی ئەو شاندەی ئێران لە (باندووگ) دیاری كرد, (شا) بەر لە ڕێكەوتنی شاندەكە بۆ (باندۆنگ) لەگەڵ ئەندامانی شاندەكەدا كۆبوونەوەی ئەنجام دا, یەكێك لە ئامۆژگارییەكانی بۆ (د. عبدە) ئەوە بوو كە لە میانی كۆنفرانسەكەدا دیدار لەگەڵ (جەمال عەبدوولناسر) دا ئەنجام بدات و بەشێوەیەكی تایبەت بانگهێشتی بكات بۆ تاران, (شا) ووتی زانیاری پەیدا كردووە كە عەبدوولناسر لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا لە ئەندەنوسیاوە چەند ڕ ڕۆژێك دەبێتە میوانی دەوڵەتی ئەفغانستان, ئەگەر ئارەزوی هەبێت ئێمەش بەو پەڕی خۆشیەوە لە تاران پێشوازی لێدەكەین, لەو كاتانەدا (عەبدوولناسر) بیرێكی چەپ ڕەوی هەبوو و بە هیچ شێوەیەك مایەی ڕەزامەندی ئەمریكەكان نەبوو, بە سەرنج دان بەو بابەتە, خۆشحاڵی دەربڕینی (شا) بە سەردانی كردنی (عەبدوولناسر) بۆ تاران زۆر گرنگ بوو, (د. عبدە) لە یادشتەكانیدا دەربارەی بەرپرسیارێتی خۆی لە كۆنفرانسی (باندۆنگ) دا دەنووسێت:

بانگهێشتی (جەمال عەبدوولناسر)م لە لایەن (حەمە ڕەزا)وە بۆ سەردانی كردنی وڵاتی ئێران لە ڕێگەی (مەحمود فەوزی) كە لەو كاتەدا وەزیری دەرەوەی میسر بوو گەیاندە خزمەتی (عەبدوولناسر) ودیدارمان لە گەڵیدا ئەنجام دا, بە شێوەی داواكاری سەرۆك كۆماری میسرم دەعوەت كرد, (عەبدوولناسر) زۆر سوپاسی بانگهێشتەكەی (شا) ی كرد و ووتی زۆر ئارەزومەندە كە دوای سەردانی ئەفغانستان سەرێك لە تارانیش بدات, بەڵام بە هۆی كارێكی گرنگەوە دەبێت دەستبەجێ دوای سەردانەكەی ئەفغانستان بگەڕێتەوە بۆ قاهیرە, سەرباری ئەوەش ئارەزو دەكات وەك هاونیشتمانیەك (ئاماژەیە بۆ كەیبانوی عەبدوولناسر كە لە بنەماڵەی كازرونی و ئێرانی نەژاد بوو) سەردانی ئێران بكات و ماوەیەك لەوێ بمێنێتەوە, عەبدوولناسر بنەمای بانگهێشتەكەی پەسەند كرد بەڵام كاتەكەی بۆ ماوەیەكی دیكە دوواخست, بەداخەوە دواتر بە بەشداری كردنی ئێران لە پەیمانی (بەغداد) دا نێوانی ئێران و میسر ڕوی لە گرژی كرد و سەردانەكەی (عەبدوولناسر) بۆ ئێران ئەنجام نەدرا) [1].

---

[1] د. جلال عبده: چهل سال در صحنه (خاطرات دکتر جلال عبده), جلد اول, مؤسسة خدمات و فرهنگی رسا, چاپ اول, ١٣٦٨, ص ٤٧٥.

دوای لەکار خستنی زاهیدی, (شا) حسەین عەلای کردە سەرۆك وەزیران, عەلا یەکێك بوو لە خزمەتکارە دڵسۆز و ڕاستگۆکانی (شا) , بەڵام کەم تا زۆرێك سەربەخۆیی بڕیاری هەبوو, لە دەربڕینی بۆچونەکانی خۆی لە بارەی کاروباری وڵاتەوە ترسی نەبوو, هەرچەندە پێچەوانەی بۆچونەکانی (شا) یش بووایە, زۆربەی وەزیرەکانی کابینەکەی لەلایەن (شا) وە دیاری کران, بەڵام چەند وەزیرێك وەك (عەبدوولاّ نیزام)ی وەزیری دەرەوە و (د.ئەمینی) وەزیری دارایی بە پێداگری و سوربوونی (عەلا) هاتنە نێو کابینەکەیەوە, دیارترین گۆڕانکاری سیاسی لە سەردەمی (عەلا) دا چونە ناوەوەی ئێران بوو لە پەیمانی (بەغداد) دا, پەیمانی سەربازی (بەغداد) وڵاتانی (تورکیا, عێراق, پاکستان, بەریتانیا) ش تێیدا ئەندام بوون, لە ڕاستیدا ئەم پەیمانە پردی بەیەك گەیشتنی پەیمانی باکوری ئەتڵەسی (ناتۆ) و پەیمانی سەربازی باشوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا (سەنتۆ) بوو, هەر لەبەر ئەوەش بوو کە دەوڵەتی سۆڤیەت بە توندی دژایەتی ئەوە پەیمانەی دەکرد, هەوڵی تیرۆر کردنی (حسەین عەلا) لە ڕۆژی (٢٥ ی ئابانی ١٣٣٤ هەتاوی) واتە ڕۆژێك بەر لە ڕێکەوتنی بۆ بەغداد بە مەبەستی بەشداری کردن لە دانیشتنی سەرۆك وەزیرانی وڵاتانی ئەندام لە پەیمانی (بەغداد) دا, درا, ئەم ڕوداوەش بیانویەکی دایە دەست دەوڵەت کە (نەواب سەفەوی) سەرۆکی کۆمەڵەی (فیدائیانی ئیسلام) و ژمارەیەك لە ئەندامانی ئەو کۆمەڵەیە دەستگیر بکات و دوای دادگایی کردنیان لە دادگایەکی سەربازیدا گوللە بارانیان بکات, گولە باران کراوەکان بریتی بوون لە (نەواب سەفەوی, سەید محەمەد واحدی, خەلیل تەهماسبی (ئەو خەلیلەی کە تۆمەتبار بوو بە کوشتنی ڕەزم ئارا) , موزەفەر زولقەدر (تەقەکەر لە حسەین عەلا) , عەبدوولحسەین واحدی جێنشینی نەواب سەفەویش پێشتر لە کاتی لێکۆڵینەوە لە گەڵیدا بە دەستی (تەیمور بەختیار) ی فەرماندەی سەربازی تاران کوژرا بوو.

هاوکات لەگەڵ کوشتن و لە سێدارەدانی ڕێبەرانی کۆمەڵەی (فیدائیانی ئیسلام) دۆسیەی کوشتنی (ڕەزم ئارا) کە پێشتر بە بڕیاری پەرلەمان دەربارەی لێخۆشبوونی

---

(خەلیل تەهماسبی) کۆتایی هاتبوو, دووبارە سەری هەڵدایەوە و دادگای سەربازی ژمارەیەك لە تۆمەتبارانی ئەو دۆسیەی وەك (ئایەتولاّ کاشانی, د.موزەفەری بەقائی, حسەینی مەکی, مەحمود نەریمان, عەبدوولقەدیر ئازاد) ی ئەندامانی پێشوی پەڕلەمانی دەستگیر کرد, حسەین عەلا (شا)ی لە دەرئەنجامی خراپی ئەم کارە ئاگادار کردەوە و دۆسیەکە لە دادگای سەربازیەوە گوێزرایەوە بۆ دادگای مەدەنی, لە کۆتایشدا بە ئاماژەدان بەوەی کە تۆمەتباری سەرەکی ئەم دۆسیەیە پێشتر دادگایی کراوە و سزای خۆی وەرگرتوە, بڕیاری ڕێگرتن لە سزادانی تۆمەتبارانی دیکە دەرکرا.

هەڵبژاردنی خولی نۆزدەی پەڕلەمان لە سەردەمی سەرۆك وەزیرانی (حسەین عەلا) دا ئەنجام درا, بەلاّم هەڵسوڕێنەری سەرەکی هەڵبژاردن (ئەمیر ئەسەدوولاّی عەلەم) ی وەزیری ناوخۆی کابینەکەی (عەلا) بوو, لەگەڵ ئەوەی کە (عەلەم) کەسی یەکەمی وەزارەتی ناوخۆ بوو, بەلاّم بۆ یەکەم جار ئەندامانی پەڕلەمان ڕاستەوخۆ لە لایەن خودی (شا) وە دیاری کران (ناسێنران) , دوای پێکهێنانی خولی نۆزدەی پەڕلەمان, (شا) حسەین عەلای کرد بە وەزیری دەرباری خۆی و (د.منوچەهر ئیقبال) ی وەزیری دەرباری کرد بە سەرۆك وەزیران, سەردەمی (دیکتاتۆری شاهانە) لە ڕاستیدا لە سەروبەندی سەرۆك وەزیرانی (د.مەنوچەهری ئیقبال) دا لە (فەروەردینی ١٣٣٦ ی هەتاوی) دا دەست پێدەکات, لەبەر ئەوە (د.ئیقبال) یەکەم سەرۆك وەزیرانی سەردەمی حەمەڕەزا شا بوو کە جگە لە داڕشتن و جیّ بە جێکردنی فەرمانە شاهانەییەکان, هیچ کار و بەرپرسیاریەتیەکی دیکەی بۆ خۆی نەهێشتبوویەوە, هەر ئەویش بوو کە نازناوە سوك ڕیسواکەرەکانی وەکو (کۆیلەی خزمەتکار) و (حزمەتکاری بنەماڵە) ی شاهەنشاهی بۆ خۆی هەڵبژارد و زەمینەی بۆ حکومەتی ڕهایی (شا) فەراهەم هێنا.

لە سەردەمی حکومەتی (د.ئیقبال) دا کە نزیکەی سیّ ساڵ و نیو درێژەی کێشا, ڕوداوگەلێکی گرنگ لە ئێراندا ڕویان دا, یەکێك لە گرنگترین کارەکانی کە لە مانگی یەکەمی دەست بەکار بوونی دا ئەنجامی دا, دەرکردنی بڕیاری پێکهێنانی لیژنەیەك یان ئەنجومەنێك لە نێوان ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی (پەڕلەمان و ئەنجومەنی سەنا) دا بوو بۆ پێداچونەوەو هەموارکردنەوەی هەندێك لە برگە و

ماددەکانی دەستوری وڵات, هەموار کردنەوەی دەستور لە پاشکۆیەکی فەرمی بۆ تەواو کاری دەستور کە لە ئەنجومەنی دامەزرێنەران لە ساڵی ١٣٢٨ ی هەتاوی پەسەند کرا و دەنگی لەسەر درا بوو, پێش بینی و لەبەرچاو گیرا بوو, بەڵام ئەو ڕەوشەی کە دوای پێکهێنانی (ئەنجومەنی دامەزرێنەران) هاتە پێشەوە هەلی جێ بەجێکردنی ئەم پاشکۆیەی بە (شا) نەدا, بەشێك لەو یاسایانەی کە دواتر هەموار کرایەوە تایبەت بوو بە زیادکردنی ئەندامانی پەڕلەمان و خولی پەڕلەمان لە دووساڵەوە بۆ چوار ساڵ و بڕیارەکانی تایبەت بە چۆنیەتی دیاری کردنی زۆرینە بۆ پەسەندکردنی پڕۆژەیاساکان, بەڵام دیارترین ماددەیەك کە بە تەواوی گۆڕانی بەسەردا هات و ئامانجی (شا) یش لە پێکهێنانی ئەو ئەنجومەنە تایبەتە هەمان بابەت بوو, ماددەی چل و نۆهەمی دەستوری پەسەند کراو بوو, لە ماددەی ژمارە چل و نۆی دەستوری پەسەند کراودا کە گرنگترین ماددەی تایبەت بە سنورداركردنی دەسەڵاتی (شا) لە بەرامبەر پەڕلەماندا دێتە هەژمار, هاتبوو: ( (دەرکردنی بڕیار و فەرمان بۆ جێ بەجێکردنی یاسا مافی پادشایە, بەبێ ئەوەی کە هەرگیز لە جێ بەجێکردنی ئەو یاسایەدا کۆسپ دروست بکرێت, یان بووەستێنرێت), ئەم یاسایە کە ڕێگەی بە (شا) نەدەدا کۆسپ دروست بکات لەبەردەم بڕیارە دەرکراوەکانی پەڕلەماندا, لە ئەنجومەنە تایبەتەکەدا بەم شێوەیە هەموار کرایەوە, ( (ماددەی چل و نۆ, دەرکردنی بڕیار و فەرمان بۆ جێ بەجێکردنی یاساکان لە دەسەڵاتی پاشادایە, بە بێ ئەوەی کە هەرگیز جێ بەجێکردنی ئەو یاسایانە لەمپەری بۆ دروست بکرێت یان بووەستێنرێن). (واتە دەسەڵاتی یاسادانان خراوەتە ژێر دەستی (شا) و خۆی یاساکان دەردەکات, نەك پەڕلەمان یاساکە دەربکات و ئەم فەرمانی جێبەجێکردنی بۆ دەربکات).

لە یاسای پەیوەندیدار بە کاروباری دارایی وڵاتەوە کە لە یاسا تایبەتیەکانی پەڕلەمانە, لە کاتێکدا کە ئەگەر خاوەن شکۆ (حەمە ڕەزا شا) هەست بکات پێویستی بە پێداچونەوە هەیە بۆ باشتر لێکۆڵینەوەی, ئەوا دەیگێڕێتەوە بۆ پەڕلەمان, بەڵام کە پەڕلەمان بە زۆرینەی سێ لە سەر چواری ئەندامانی ئامادەبووی پەڕلەمان لە نێو هۆڵی پەڕلەماندا پەسەندی بکات, دەبێت خاوەن شکۆ یاساکە واژۆ بکات..... بەڵام لە ڕاستیدا ماددەی نوێی هەموارکراوی دەستور بەخشینی مافی ڤیتۆیە بە (شا) لە بارەی یاساکانی داراییەوە, وە تەنها لەبەر ئەوەی لە یاساکانی بوواری داراییدا ( (کە

تایبەتە بە پەرلەمانەوە) ) ئەم مافە بە خاوەن شکۆ دراوە, ئەوەیە کە (شا) بە هۆی هەبوونی ئەنجومەنی (سەنا) وە دەیتوانی رێگری لە هەر یاسایەك بکات کە پێی ڕازی نیە. تەنها لە یاساکانی تایبەت بە بوواری داراییەوە کە بڕیاری کۆتایی لای پەرلەمانەوە دەردەچو و دەست و پێی (شا) ی بەستبوو, ئەویش بە ماددەیەك هەموار کرایەوە.

یەکێکی دیکە لە ڕوداوە گرنگەکانی سەردەمی حکومەتی (ئیقبال) , دروست کردنی دەزگای ئاسایش و زانیاری وڵات (ساواك) بوو, کە سەرلەشکر (تەیمور بەختیار) ی فەرماندەی سەربازی تاران بوو بە بەرپرسی, کە بە زووترین کات و توندترین شێوە سەرجەم دەنگە جیاوازەکانی سەرکوتکرد, هەڵبەت هاوکات لەگەڵ پێکهێنانی (ساواك) دا, باری نائاسایی بڕیارەکانی حکومەتی سەربازی لە تاراندا هەڵگیرا و حکومەتی (ئیقبال) لە ڕاگەیەنراوێکی فەرمی خۆیدا ئەوەی خستە ڕوو کە بە چەسپاندنی ئاسایش لە وڵاتدا, ڕەوشی لەبار و گونجاو بۆ ئازادی قەڵەمەکان و وتارەکان و کۆمەڵگا فەراهەم هێنراوە, بە ڕواڵەت بۆ سەلماندنی هەبوونی ئەم ئازادیە بوو کە (ئەمیر ئەسەدووڵای عەلەم) ی وەزری پێشوی ناوخۆ و هاودەمی ئەشکەوت و هاوڕازی (شا) , وازی لە کاری دەوڵەتی هێناو پارتێکی بە ناوی (مەردووم /خەڵك) دروست کرد. دوای پێکهێنانی حیزبی (مەردووم) کە بە ڕواڵەت نەیار و ڕەخنەگری دەوڵەت بوو, (د.مەنوچەهری ئیقبال) یش بۆ پێکهێنانی پارتێك بەناو (میللیوون) ڕاسپێردرا, ئەم دوو پارتە لە نمایشی هەڵبژاردنی خولی بیستەمی پەرلەمان دا لە بەرامبەر یەکتری بەشداری یان کرد.

لە نێوان ساڵانی (١٣٣٦ – ١٣٣٩ ی هەتاوی) دا (شا) پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ئەمریکادا دروست کرد, وە بە واژۆ کردنی پەیمانی بەرگری دوولایەنی نێوان ئەمریکا و ئێران ڕوبەڕوی هەڵوێستی توندی ڕوسیا بوویەوە و قەیران لە پەیوەندییەکانی ئێران و سۆڤیەت دا ڕویدا, لەم نێوەندەشدا گروپە نەیارەکانی ڕژێمی شاهەنشاهی ئێران لە دەرەوەی وڵات دەستیان دایە چالاکیەکانی خۆیان و لە کۆنگرە و چاپەمەنیەکانی ئەمریکاشدا ڕەخنە لە (شا) گیرا, لەلایەکی دیکەشەوە واژۆکردنی چەند پەیمان نامەیەکی نەوتی لە نێوان ئێران و کۆمپانیا سەربەخۆکانی وەك کۆمپانیای نەوتی (ئیتالیا ڤو)دا, ئێران ڕوبەڕوی کۆمپانیا گەورەکانی نەوت بوویەوە,

ڕاگەیاندنەکانی (د.عەلی ئەمینی) باڵوێزی ئێران لەمریکا دەربارەی ئەوەی کە سەرچاوەکانی نەوتی دوونیا پەیوەستە بە هەمو خەڵکی جیهانەوە و ئەو داهات و دەستکەوتانەی کە لێیەوە بەدەست دەهێنرێت دەبێت لە نیوان جیهانیاندا دابەشبکرێت, (شا) ی زۆر توڕە و نیگەران کرد, د.ئەمینی گەڕایەوە بۆ تاران و بە سود وەرگرتن لەو ئازادیە ڕوکەشەی کە فەراهەم هێنرا بوو بۆ چالاکیەکانی هەڵبژاردن, د.ئەمینی لەگەڵ (سەید جەعفەر بەهبەهانی) کە کەسایەتیەکی بەهێزی هەبوو لە نێو شەقام و روحانیەکانی ئێراندا بەرەیەکی هاوپەیمانی هەڵبژاردنیان پێکهێنا, بەڵام پارتی حکومی (میللیون) نەك تەنها ڕێگەی یەم بەرەیە نەدا, بەڵکو ڕێگری لە چالاکیەکانی پارتی دەرباری (مەردووم) یش دەکرد.

دەست وەردانی ئاشکرای دەوڵەت لە هەڵبژاردنەکانی خولی بیستەمی پەڕلەمان دا کە لەلایەن بەرەی سەربەخۆی (ئەمینی, بەهبەهانی) و پارتی (مەردووم) پەردەی لەسەر هەڵماڵرا, نمایشی هەڵبژاردنی ئازادی شاهانەی ڕیسواکرد و (شا)یش بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەم هەڵەیە (کۆیلەی حزمەتکار) و (خزمەتکاری بنەماڵە) ی خۆی کردە قوربانی, هەڵبژاردنی خولی بیستەم هەڵوەشایەوە و یەکێك لە وەزیرەکانی کابینەکەی (ئیقبال), ئەندازیار (جەعفەر شەریف ئیمامی) وەزیری پیشەسازی و کانزای کابینەی دەست لەکار کێشاوە, ڕاسپێردرا بۆ پێکهێنانی کابینەیەکی گوێڕایەڵ بۆ چارەسەرکردنی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن.

لە هەڵبژاردنی نوێی خولی بیستەم دا, ڕوخسارگەلێکی نوێ چونە پەڕلەمانەوە, یەکەم جار دوایِ کودەتای (٢٨ ی مورداد) چەند کەسێك لە ئەندامانی (جەبهەی میللی) یان لایەنگرانی, کە دیارترینیان (ئیلاهیار ساڵەحی) پەڕلەمانتاری کاشان بوو, چونە پەڕلەمان, هەڵبەتە ئەم دەستەیە کەمینەیەکی بچوك زیاتر هیچی دیکە نەبوون, توێژە ناڕازییەکانی کۆمەڵگا کەوتنە جوڵان و یەکەمین بزوتنەوەی ناڕازیش لەلایەن مامۆستایانەوە بوو.

ڕۆژی (١٢ ی ئۆردیبەهەشتی ١٣٤٠ ی هەتاوی) مامۆستایان بەمەبەستی زیادکردنی مافەکانیان دەستیان بە خۆپیشاندان کرد لە سەرانسەری وڵاتدا, لە تارانیش خۆپیشاندەران لە مەیدانی بەهارستان گرد بوونەوە, شەریف ئیمامی لە باتی ئەوەی بیر لە دابین کردنی مافە ڕەواکانی مامۆستایان بکاتەوە,

خۆپیشاندانەکەی بە نایاسایی لەقەڵەم دا و فەرمانی بڵاوەپێکردنی خۆپیشاندەرانی دەرکرد, لە ئەنجامی تەقە کردنی کارمەندانی پۆلیسەوە مامۆستایەك بەناوی (د.خانعەلی) کوژرا و چەند مامۆستایەکی دیکەش بریندار بوون, ئەم ڕوداوەی تایبەت بە خۆپیشاندانی مامۆستایان, کە لە سەرەتاوە ڕواڵەتێکی ناوچەیی هەبوو, گەرم و گوڕی و فراوانیەکی زیاتری بە خۆپیشاندنەکان بەخشی.

دوای ئەم ڕوداوە شەریف ئیمامی لە پەڕلەماندا ڕوبەڕوی هێرشی ڕەخنەی پەڕلەمانتاران بوویەوە, بەهۆی ئەوەیش کە ئاوازێکی توندی لە وەڵامی پەڕلەمانتاراندا بەکار دەهێنا, سەردار (فاخر حکمەت)ی سەرۆکی پەڕلەمان بە گژیدا چویەوە و پیایدا هەڵشاخا, شەریف ئیمامیش بە تۆراوی لە پەڕلەمان ڕۆشتە دەرەوە و هەمان ڕۆژیش لە (١٤ ی ئۆردیبەهەشتی ١٣٤٠ ی هەتاوی) لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی دەستی لە کار کێشایەوە.

** ** **

گرنگترین ڕوداو لە ژیانی تایبەتی (شا) دا لە سەردەمی حکومەتی (ئیقبال و شەریف ئیمامی) دا هێنانی ژنی سێیەم و لە دایك بوونی کوڕیك بوو لە (فەرەحی) هاوسەری نوێی لە (٩ ی ئابانی ١٣٣٩ ی هەتاوی)دا, کە درێژەی ئەو هاوکات لەگەڵ باسکردنی تایبەتمەندییەکانی سێیەم ژنی (شا) لە بەشێکی جیاواز و سەربەخۆدا دەخرێتە بەر دیدی خوێنەران.

# عەشقە شاهانەییەکان...!

نویێ بوونەوەی یاداشتی سورەییا, شا عاشقی شازادە خانمێکی ئیتاڵی دەبێت, دیداری (پاپا) بەمەبەستی وەرگرتنی ڕەزامەندی بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو شازادەخانمە ئیتالییەدا, داستانی ڕاستەقینەی ئاشنایی و هاوسەرگیری (شا) لەگەڵ (فەرەح) دا, پێشینەی تودەیی بوونی فەرەح, فەرەح جیێ پێی خۆی بەهێز دەکات, ناکۆکیەکانی شا و فەرەح, فەرەح هەڕەشەی جیابوونەوە لە شا دەکات, بۆچی شا لە کۆتاییەکانی سەڵتەنەکەیدا لە فەرەح دەترسا...؟!!.

حەمەڕەزا شا لە سەروبەندی ئەو دەورانەی کە بە(دیکتاتۆری شاهانە) ناسراوە کەوتە بیری خۆشگوزەرانیەکانی سەردەمی لاوێتی خۆی, لەبەر ئەوەی بەهۆی منداڵ نەبوونیەوە (شا) لە سورەییای هاوسەری جودابوویەوە, ئاساییە (شا) بیەوێت بۆ ئەوەی سەڵتەنتداری لە بنەماڵەکەیدا خۆیدا درێژەی هەبێت بە خێرایی ژنێکی دیکە بهێنێت, بەڵام پەلە و تاسەی بۆ دوبارە ئەنجامدانی هاوسەرگیری نەبوو, هەوڵی دەدا کە سود لە دەورانی بێ ژنی و ئەو ئازادیە تەواوەی کە لە ژیانی تایبەتی خۆیدا بەدەستی هێناوە وەربگرێت.

شا لە لاوێك زیاتر وابەستەی دەورانی خۆی بوو, ئێستا کە بە خەیاڵی ئاسودەوە پاڵی بە پایەی سەڵتەنەتەوە دابوو, نیوەی کاتی شەوانە ڕۆژی خۆی بە دیداری ژنانی جوان بەسەر دەبرد, زیاتر شەوانی لەگەڵ ژنە رەشیقە ئەوروپیەکاندا, کە زیاتر لەنێو میوانداری هێلە ئاسمانیەکان هەڵدەبژێردران, ڕۆژی دەکردەو, بەڵام (شا) تەنها بەوە ڕازی نەدەبوو, هەمیشە ژمارەیەك مەعشوقەی چاوڕەشی ئێرانیشی

لەبەردەستدابوو, (ژرارد دو ویلیەی) نوسەری فەرنسی کە بەشێکی کتێبەکەی خۆی بۆ باسکردنی عشقە شاهانەییەکان تایبەت کردوە, تایبەتمەندی هەندێك لە مەعشوقە ئێرانی و بیانیەکانی (شا) ی کە لە خودی دەرباریەکان وەرگرتوە, نوسیوە, لەوانە ناوی هەندێکیان دەبات وەك کچێکی باڵا بەرزی (٢١) ساڵە بەناوی (دوخی), کچێکی زۆر جوان لە بنەماڵەیەکی خانەدان بەناوی (مونیژە), کچێکی جوانی (١٩) ساڵەی خاوەن بڕوانامەی ئینگلستان بەناوی (صفیە), کچێکی جوانی دیکەی (١٨) ساڵە بەناوی (لیلی فلاح) کە لەگەڵ ئەمەیاندا بابەتی هاوسەرگیری باسدەکرێت, لە نێو مەعشوقە بیانیەکانی (شا) دا, نوسەری فەرەنسی تەنها ئاماژە بە هونەرمەندێکی چاوسەوزی جوانی ئەڵمانی بە نێوی (ئەلگا ئەندرسۆن /Elga Anderson) دەکات, کە جوانی سورەییای تاکە عەشقی ڕاستەقینەی (شا)ی لە ڕوخساری ئەودا دیوەو هەر بەو بۆنەیەشەوە ماوەیەکی زۆر مەعشوقەی سورە گوڵی (شا) بووە.

ژرارد دو ویلیە دنووسێت لە کاتی نیشتەجێ بوونی (ئەلگا) لە سویسرا لە ڕێگەی (زاهیدی) وە کە خۆی کەسێکی ژنانی بوو,[1] بە (شا) ناسێنرا و هەموو شەوێك خودی زاهیدی (ئەلگا) ی لە ئوتێلەوە (کە شوێنی نیشتەجێ بوونی بوو) دەبرد بۆ لای (شا), لەوە بەدواوە ئیدی (ئەلگا) لە پەسا دەهات بۆ تاران و لەهەر سەفەرێکیشی دا چەند شەوێك میوانی (شا) دەبوو.

دو ویلیە دواتر بە وردی و درێژی باسێکی دەربارەی چۆنیەتی عاشق بوونی (شا) بۆ کچە شایەکی جوانی ئیتاڵی بە ناوی (ماریا گابرێلا /Maria Gabriella) نوسیوە, کە سەرباری زانیاری و لێکۆڵینەوەکانی خودی خۆی, بەڵگەدار دەبێت بە گۆڤارە فەرەنسی و ئیتالییە بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمە, (ماریا گابرێلا) کچی (ئومبرتۆ) کۆتا پادشای ئیتالیا بوو, کە لە ئەنجامی ریفراندۆمێك بەمەبەستی مانەوە یان هەڵوەشاندنەوەی سیستمی سەڵتەنەتداری لەو وڵاتەدا, لە پۆستەکەی داماڵرا و لە

---

[1] لەم بارەیەوە ژرار دو ویلیە لە کتێبەکەی دا بە هەڵە ناوی ئەردەشێر زاهیدی هێناوە, بەڵام مەبەستی سپەهبەد (زاهیدی) باوکی ئەردەشێر بووە, چونکە ڕاستەوخۆ دوای ئەوە دەڵێت: ئەو نوێنەری ئێران بووە لە مەکتەبی ئەورووپای ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دا, لەو کاتانەدا سپەهبەد زاهیدی پۆستی(باڵوێزی گەڕۆکی ئێران)ی لە ئەوروپا لە ئەستۆدا بوو.

ساڵی (١٩٤٦ ز) به دواوه له وڵاتی (پورتوگال) دەژی, یەکەمین دیداری نێوان (ماریا گابریێلا و حەمەڕەزا شا) له جنێڤ ئەنجام درا, لەو کاتەدا کچی پادشای پێشوی ئیتالیا به مەبەستی خوێندن لەوێ دەژیا, گابریێلا کت و مت ئەو شتە بوو که (شا) دەیویست, زۆر جوان, ڕەشیق, باڵا بەرز, له هەموی گرنگتر له بنەماڵەیەکی سەڵتەنەتی بوو, لەو کاتەدا که (ماریا) تەمەنی (١٨) ساڵ بوو, لەگەڵ (ماری ژوزە) ی دایکی و (ڤیکتۆر ئامانوئیل) ی برایدا بەشداری لەو لەو میوانداریەدا کردبوو, هەر بۆیە هەلێکی گونجاو بۆ (شا) نەڕەخسا تا گفتوگۆی تایبەتی له گەڵدا ئەنجام بدات, بەڵام ڕۆژانی دواتر (شا) سەرکەوتو بوو لەوەی که چەندین جار له یاری خلیسکانی سەربەفر و میوانخانەکاندا دیدار لەگەڵ (ماریا) دا ئەنجام بدات, بەڕاستی به (یەك دڵ نەك سەد دڵ) عاشقی ببێت.

له سەروبەندی ساڵی (١٩٥٩ ز, مانگی دی ١١٣٧ ی هەتاوی) ئومبرتۆی باوکی گابریێلا نامەیەکی له شای ئێرانەوه پێگەیشت که تیایدا (شا) بەفەرمی خوازبێنی کچەکەی کردبوو, ئۆمبرتۆ نامەیەکی نهێنی ئامێزی له وەڵامی (شا) دا نوسی و تیایدا وەبیری هێنابووەیەوه که ئەنجامدانی هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەی ئەودا له ڕووی ئایینیەوه کێشەی هەیه, سەرباری ئەوەش ئەمه کارێکه که دەبێت پێشتر کچەکەی بڕیاری لەبارەوه بدات, ئومبرتۆ به ڕاشکاوی ئەوەی ڕون کردبوویەوه که کچەکەی هیچ شتێکی لەو بارەیەوه بەو نەوتوه, هەربۆیه نازانرێت که خودی ئەو ئارەزوی ئەنجامدانی ئەو هاوسەرگیریه دەکات.

حەمه ڕەزا بەهۆی هۆکارگەلێکەوه که ڕون نیه, پێدەچێت بەهۆی گفتوگۆ تایبەتیەکانیەوه لەگەڵ (گابریێلا) دا, هەستی کردبێت که خودی (گابریێلا) پێشوازی له ئەنجامدانی ئەو هاوسەرگیریه دەکات, هەربۆیه کەوته چارەسەرکردنی کێشه سەرەکیەکه, واته کێشەی ئاینی و دیدارێکی لەگەڵ پاپا (جان) ی بیست وسێ یەمی پێشەوای کاسۆلیکیەکانی جیهان ڕێکخست, لەو کاتەدا پاپا (جان)ی بیست و سێ یەم بەهۆی بیری لیبراڵی خۆی و ئەو گۆڕانکاریانەی که بەسەر دونیای مەسیحیەت دا هێنا بووی, به پاپای شۆڕشگێر ناوبانگی دەرکردبوو, (شا) پێی وابوو که ئەم پاپا ڕۆشنبیر و لیبراڵه لەبارەی شازادە خانمێکی کاسۆلیکی که دەتوانێت ببێت به شاژنی وڵاتێکی ئیسلامی, پێداگری زۆر نەکات و ڕێگه چارەیەك بۆ ئەم بابەته بدۆزێتەوه.

پاپا ڕەزامەندی لەسەر داواکەی (شا) بۆ سەردانیکردنی دەربڕی, حەمەڕەزا لە سەفەرێکی نهێنی دا بۆ (ڕۆما) بەشێوەیەکی تایبەتی دیداری لەگەڵ پاپا دا ئەنجام دا, هیچ کەس زانیاری نیە دەربارەی گفتوگۆکانی نێوان (شا و پاپا) و ئەو ڕێگە چارەیەی کە پێشەوای کاسۆلیکیەکانی جیهان خستبوویە بەردەم شای ئێران, ئەوەی کەزانراوە ئەوەیە کە (شا) دوای ئەم دیدارە کۆڵی لە هەوڵەکانی خۆی بۆ ئەنجامدانی هاوسەرگیری لەگەڵ (گابرێلا) دا نەدا و هەوڵەکان و دەنگۆکانی پەیوەست بەم (عەشقە شاهانە)یە کەم کەم لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەکانی ئەورووپا و بەرگی گۆڤارە جەنجاڵەکانی ڕۆما و پاریسی پۆشی, ڕۆژنامەی (فرانس سوار / France- Soir) بەناوبانگی فەڕەنسی لە ژمارەی ڕۆژی (١٤ ی فیبریوەری ١٩٥٩ ی زاینی, ٢٥ی بەهمەنی ١٣٣٧ ی هەتاوی) خۆیدا, ڕیپۆرتاژێکی تێرو تەسەلی دەربارەی ئەم ڕوداوە لە زمانی نێردراوی تایبەتی خۆیەوە بۆ تارران بڵاوکردەوە و تیایدا نووسی: لە تاران ڕای گشتی بۆ پەسەندکردنی هاوسەرگیری (شا) لەگەل شازادەخانم (ماریا گابرێلا) ئامادە دەکەن, لە بیوگرافیەکی تێرو تەسەلدا کە دەربارەی (ماریا) بڵاوکرایەوە ڕەچەڵەکی (گابرێلا) دەبەستنەوە بە سوڵتان (محەمەدی دووەم) ی ناسراو بە (معتمدلله), کە یەکێکە لە سوڵتانە موسڵمانەکانی ئیسپانیا, لەم بیوگرافیەدا بە بێ ئاماژەدان بەئەگەری هاوسەرگیری (شا) لەگەڵ گابرێلا دا هاتوە کە: گابرێلا لە نەوەی (ئالفۆنسی چوارەم) پاشا (کاستیل)ی ئیسپانیایە, کە هاوسەرە موسڵمانەکەی ئەو شازادە خانم (زلیدا/ Zelida) کچی سوڵتان (محەمەدی دووەم) پادشای موسڵمانی ئیسپانیا بووە...

(دو ویلیە) سەرباری گواستنەوەی ئەو بابەتەی ڕۆژنامەی (فرانس سوار), ئاماژەی بە لێکۆڵینەوەی خۆشی کردوە لەتاران و دنووسێت: شا بەڕادەیەك سور و دڵگەرم بوو لەسەر ئەنجامدانی ئەم کارە, بەفەرمانی خودی ئەو (د.ئیقبال) ی سەرۆك وەزیری ئەو کات پرۆژە یاسای بەخشینی ناسنامەی ئێرانی بەو شازادە خانمە ئیتالیە ئامادە کرد بوو, لەبەر ئەوەی بەپێی دەستوری ئێران دەبێت دایکی شازادە (شازادەی جێنشین)ی ئێران, ئێرانی بێت, بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش لەکاتی هاوسەرگیری حەمەڕەزا لەگەڵ (فەوزیە) ی یەکەم ژنی دا, لە پەرلەماندا پرۆژە یاسایەك پەسەند کرا و شازادە خانمی میسریان بە ئێرانی ناساندبوو.

بەلأم سەرجەمی ئەم پلانانە لە ناکاو بوونە بلّقی سەر ئاو, لەبەر ئەوە گابریّلا لە چاوپیّکەوتنیّکی ڕۆژنامەوانیدا لە (جنیّف), سەرجەمی ئەو دەنگۆیانەی کە دەربارەی نزیك بوونەوەی ئەنجامدانی هاوسەرگیری ئەو لەگەلّ شای ئیّراندا بلأو کرابوونەوە, بەدرۆ خستەوە و ووتی: ڕاستە کە شای ئیّران پیّشنیاری هاوسەرگیری پیّداوە, بەلأم ئەو دوای بیرکردنەوە لەبارەی ئەم بابەتەوە بڕیاری داوە کە داواکەی شای ئیّران پەسەند نەکات, لەبەر ئەوە یەکەم هیچ هەستیّکی بەرامبەر شای ئیّران نیە و ناتوانیّت لەگەلّ کەسیّکدا زەماوەند بکات کە خۆشی نەویّت, دوەمیش ئەگەر بگونجیّت عاشقی کەسیّکی ناکاسۆلیك ببیّت, خۆ لەبەر خاتری ئەو عەشقەی دەست لە ئاین و مەزهەبی خۆی هەلّناگریّت...! لە چاوپیّکەوتنەدا شاژنە (ماریا ژۆزە) ی دایکی (ماریا گابریّلا)ش کە لە کەناری کچەکەیەوە وەستا بوو, ووتی:((سەرباری هەموو ئەو شتانەش, شای ئیّران و گابریّلا جیاوازیەکی زۆری تەمەنیان هەیە, ئەم هاوسەرگیریە گونجاو نیە)).

لەگەلّ ئەوەی کە عەشقی ئەم شازادە خانمە ئیتالیە وازی لە (شا) نەدەهیّنا, ڕۆژی (٣ ی مەی ١٩٥٩ ز, ١٣ ی ئۆردیبەهشتی ١٣٣٨ ی هەتاوی), کاتیّك کە (شا) ڕۆیشت بۆ (جنیّف), بە پیّچەوانەی کاری هەمیشەیی خۆی کە هەمان ئەو شەوەی کە دەگەیشت سەریّکی لە باڕ و مەیخانەکان دەدا, ئەو شەوە لە شویّنی نیشتەجیّ بوونی خۆی نەهاتە دەرەوە, بەیانی ڕۆژی دواتر لەگەلّ (سپەهبەد زاهیدی) دا ڕۆیشت بۆ لای ناسراوترین زەڕنگەری (جنیّف) لە مەیدانی (مولار) و زیّریکی زۆر گرانی لیّ کڕی, پەیامنیّران کە پیّو و شویّنی (شا و زاهیدی) یان هەلّگرتبوو, دوای ڕۆیشتنی (شا) پرسیاریّکی ئالّۆزیان لە زەڕنگەرەکە کرد و وتیان: ئایا (شا) ئەم گەوهەرەی بۆ (ماریا گابریّلا) کڕیوە...؟, گەوهەر فرۆشەکەش بە زەردەخەنەیەکی پڕ واتاوە ووتی: ئەم پرسیارەی ئیّوە دەبیّت خودی شازادە خانم وەلأمی بداتەوە...!

دو ویلیە لە پیّوشویّن گرتنی ئەم بابەتەدا دنووسیّت: (شا) لە کۆتا هەولّی خۆی بۆ دیدار لەگەلّ گابریّلا دا ئەنجامی دەست نەکەوت گابریّلا ئامادە نەبوو پیّشوازی لیّ بکات, (شا) یش دوای بیّ ئومیّد بوونی تەواوەتی گەڕایەوە بۆ تاران, هەفتەیەك دواتر پەیامنیّری هەوالّگری (ڕۆیتەرز) هەوالّیّکی بەم دەقەی خوارەوە لە تارانەوە نارد:

*لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە لەتاران زانیاری بەدەست هاتوە کە شای ئێران لە نیازی هاوسەرگیری لەگەڵ شازادە خانم (ماریا گابرێلا دوساووا) پەشیمان بووەتەوە و بە مەبەستی بەردەوام بوونی سەڵتەنەتی لە بنەماڵەکەی دا، هاوسەرێکی ئێرانی هەڵدەبژێرێت، ئەم بڕیارەش بەهۆی بابەتگەلی مەزهەبییەوە دراوە.*[1]

بەڵام خاڵی نادیار لە ڕوداوی (گابرێلا) دا ئەوەیە، کە دەربارەی مەرجەکانی هاوسەر گیری و ئەوەی کە ڕێوڕەسمەکە بە شێوەیەکی تایبەتی لە (ڤاتیکان) و بە شێوەیەکی فەرمیش لە(تاران) بەڕێوە بچێت، ڕەزامەندی دەربڕدراوە و بابەتەکە یەکلای بووەتەوە؟ کە (پەری سیما)ی هاوسەری (عەبدولڕەزا) لە دیدارێکی تایبەتی لەگەڵ (ماریا گابرێلا)دا وێنەیەکی ترسناکی لەبارەی ژیان لە نێو دەرباردا خستوەتە بەر چاوی، لە بارەی ژنانیەتی کەسیەتی (شا)وە دواوە و ئەوەی دەرخستوە کە هەرگیز ناتوانێت هاوسەرێکی بەوەفا بێت بۆ هاوسەرەکەی، وە چەندین بابەتی بۆ باسکردوەو سەرەنجام شازادە خانمی ئیتالیای لە بڕیاری هاوسەر گیری لەگەڵ (شا) دا پەشیمان بووەتەوە، دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە سی ساڵ بەسەر ئەم ڕوداوەدا، ئاماژەیەکی ڕون لە یاداشتەکانی (عەلەم)ی وەزیری دەربارو هاوڕازی (شا) دا لەم بارەیەوە دەبینرێت، (عەلەم) لە یاداشتەکانی ڕۆژی (١٢ دی ١٣٤٩) هەتاوی خۆیدا بەم شێوەیە دنووسێت:

(لە میوانداری نانی ئێوارەی شاژنی دایك دا ئامادەنەبووم، بەڵام ئەوەم دەزانی کە (پەری سیما)ی هاوسەری (شاپور عەبدولڕەزا) مەبەستی بوو کە هەلێك وەربگرێت و خۆی بەسەر دەست وپێی (شا) دا بخات و بە هۆی ئەو تاوانەی کە لە ڕابردو دا ئەنجامی داوە بەرامبەری داوای لێبووردن بکات، ئەو لە سیازدە ساڵی ڕابردو دا لە دەربار دەرکرابوو، چەند جارێکیش هەوڵمدا لەلایەن ئەوە وە میانگیری بکەم بەڵام

---

[1] تا ئێرە بابەتی پەیوەست بە ڕوداوی عەشقی شا بۆ شازادە خانم (ماریا گابرێلا) لە کتێبەکەی (ژرارد دو ویلیە) لە لاپەڕە (٢٨٧ – ٢٩٠)، وەرگیراوە، (فیردۆست) یش چەند بابەتێکی دەربارەی عەشقی شا بۆ (ماریا گابرێلا) نوسیوە کە هەڵەی زۆری تێدایە، لەنێو ئەو هەڵانەدا بەرواری ئەم ڕوداوەی لە پێش بەرواری هاوسەرگیری (شا و سورەییا) داناوە.

سەرکەوتو نەبووم, لەگەڵ ئەوەشدا بە (شا)م وتوە کە هەرچەندە ئەو بووەتە هۆی سەرنەگرتنی هاوسەرگیری (شا و ماریا گابریلا), بەڵام دەبێت دان بەوەدا بنێین کە خزمەتێکی گەورەی لە بەرامبەر گەلی ئێران دا کردووە, من بە باشی ئاگام لە چۆنیەتی چیانی (گابریلا) هەیە لەوروپا, تەنانەت لە کاتێکدا ئەمەم بۆ (شا) باسکرد, ئەویش حەپەسا.., سوپاس بۆ خودا کە هەرگیز ئەم هاوسەرگیریە ڕیك نەکەوت...).

سورەییاش لە یاداشتەکانی دا ئاماژەی بۆ عەشقی (شا) لە بەرامبەر (ماریا گابریلا) کردوە و دنووسێت: ئەم بابەتە بۆ من مایەی سەرسوڕمانە, کە چۆن چۆنی (شا) لە دیسامبەری (١٩٥٨ز) کەوتۆتە بیری ئەنجام دانی هاوسەرگیری لەگەڵ شازادە خانمێکی ئەوروپی دا, من کەم تا زۆرێك ئەو کچەم دەناسی, ئەو دروستکراوێکی جوان و ئەفسونگەر بوو, بەڵام بە هەمو سەرنج ڕاکێشیەکانی وەك شاژنی وڵاتێکی ڕۆژهەڵاتی دەبوو هەڵوەستەی بکردایەو لە خۆی بپرسیبا کە چ گرەنتیەکی هەیە کە ئەویش دوچاری هەمان چارەنوسی دو هاوسەرە پێشوەکەی (شا) نەبێتەوە؟ لەکاتێکدا کە ئەگەر ئەو ببێتە خاوەنی منداڵیش, لە کوێ دەزانرا کە هەمو منداڵەکانی ئەو کچ نەدەبوون!!؟[1].

** ** **

دوای ڕوداوی (ماریا گابریلا) کە شاژنی دایك و خۆشکەکانی (شا) لە بارەی سەرەنجامەکانی سەرکەوتنی ئەم هاوسەرگیریە لەکۆمەڵگای ئێرانیدا, نیگەران بوون, جموجوڵێکی نوێیان بۆ پەیدا کردنی هاوسەرێکی گونجاو بۆ (شا) دەست پێکرد, لە سەفەرێکی (شا)دا بۆ فەرەنسا لە (٢٧ مەی ١٩٥٩ز, ٤ خورداد ١٣٣٨ هەتاوی) کۆبوونەوەی لەگەڵ کوڕان و کچانی ئێرانی کە لە فەرەنسا خوێندکاری زانکۆ بوون و نیشتەجێی پاریس بوون ئەنجام دا, یەکێك لە خوێندکارە کچەکانی زانکۆ کە ناوی (فەرەحی دیبا) بوو, سەرباری هوشیاری پێدانی (جیهانگیری تەفزیلی) سەرپەرشتی خوێندکارە ئێرانیەکان لە پاریس بەوەی کە لە دەرەوەی بەرنامە گفتوگۆ لەگەڵ (شا)دا نەکەن, هەستا و لەبارەی ڕەوشی خراپی خوێندکارانی هەژاری ئێرانی لە فەرەنسا (کە خۆشی یەکێك بوو لەوان) گفتوگۆی لەگەڵ (شا) دا کرد و سکاڵای خۆی نیشاندا لە

---

[1] Soraya…p. 160.

بەرامبەر کەمتەرخەمی سەرپەرشت و خراپی هاوکاریەکان و کەمی ئەو خەرجیانەی کە بەوان دەدرێت، (شا) دوای گوێگرتن لە وتەکانی ئەم کچە لاوە، فەرمانی بە (جیهانگیر) دا کە بەدوادا چون بکات لە بارەی ڕەوشی خوێندکاران و زیاد کردنی هاوکاری خەرجی یەکانی ئەوان، بەلاَم (جیهانگیر) تاڕادەیەك فەرمانەکەی (شا)ی پشت گوێ خست و بە تایبەت لە بارەی (فەرەحی دیبا)وە کە بە وتەی ئەو فزولی زۆری کردووە، هیچ هاوکاریەکی نەکرد، فەرەح لەهاوینی هەمان ساڵدا گەڕایەوە بۆ تاران، ئەمجارەیان لەڕێگەی هاوڕێیەکیەوە کە ناسراوی (ئەردەشێر زاهیدی) زاوای (شا) بوو، شکاتی جیهانگیری لای ئەردەشێر کرد، ئەردەشێریش داوای لێکرد کە ڕۆژی دواتر بۆ وەرگرتنەوەی وەلاَمەکەی بێتەوە، هەمان شەو (ئەردەشێر) زاوا و (شەهنان)ی کچی (شا) لە کۆشکی تایبەتی خۆیدا میوانی (شا) بوون، ئەردەشێر بە پێی قسەکانی ئەو کچەی کە ئەمڕۆ سەردانی کردبوو وە سکالاَی لە کەمتەرخەمی لە بارودۆخی خوێندکارە ئێرانیەکانی فەڕەنسا کردبوو و دەڵێت: (سەرپەرشتیارەکە گوێ بەفەرمانەکانی شا نادات)، گەیاندە لای (شا)، (شا) پرسی ناوی ئەو کچە چیە؟ ئەردەشێر وتی فەرەحی دیبا، (شا) هەمو ڕوداو و قسەکانی ئەم کچەی لە باڵوێزخانەی ئێران دا لە پاریس بیر کەوتەوە و ووتی: بە دڵنیاییەوە دەبێت بەدواداچون بۆ کارەکانی ئەو بکەن.

ڕۆژی دواتر کە فەرەح بۆ وەرگرتنی وەلاَمەکەی سەردانی ئیدارەکەی ئەردەشێری کرد، شەهنازیش لەوێ بوو، شەهناز ئەوی زۆر بەدڵ بوو هەربۆیە دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە فەرەحی بۆ خواردنەوەی چایی دەعوەت کرد بۆ کۆشکە تایبەتیەکەی خۆی...، تا ئێرەی داستانەکە پوختەیەك بوو لە نوسینەکانی (ژرار دو ویلیە)[1]، ئێستا پاشماوەی ڕوداوەکە لە زمانی خودی (شا) وە ببیستە:

ڕۆژێك شەهنازی کچم، بە چاوانێکەوە کە لە ڕادە بەدەر گزنگی شادی لێ دەدرەوشایەوە، هاتە لای من و وتی کە ئەو و هاوسەرەکەی لەگەڵ کیژۆڵەیەکدا بە ناوی (فەرەحی دیبا) ئاشنا بوون، کە بە بۆچونی ئەوان بۆ وەرگرتنی پلەی شاژنی ئێران لە هەمولایەکەوە شایستەگی هەیە، ماوەیەك بوو کە زاواکەم پەیوەندی لەگەڵ

[1] Gerard de Villiers.. pp. 291 – 292.

کاروباری خوێندکارانی ئێرانی کە لە دەرەوەی ولآت سەرقاڵی خوێندن بوون, دروست کردبوو, وە هەر لەو ڕۆژانەدا لەگەڵ خانم فەرەحی دیبا ئاشنایەتی پەیدا کردبوو کە لەو کاتانەدا (٢١) ساڵ زیاتر نەدەبوو وە بۆ ڕاوێژکردن دەربارەی کاروباری خوێندنی خۆی لە فەڕەنسا سەردانی ئەوی کردبوو.

بەڕاستی من دەمویست شارەزایم لە بارەی پێشینەی بنەماڵەو پەروەردە و پلەی خوێندن و کەسایەتی ئەم خانمەوە هەبێت, دواتر زانرا کە باوکی لە بنەماڵەیەکی کۆنی (تەبرێز)ی و دایکیشی لە بنەماڵەیەکی ئاینی ڕێزداری (گیلان)یە, باپیری باوکی ئەو خوێندنی لە یەکێك لە قوتابخانە سەربازیەکانی ولآتی ڕوسیا تەواو کردوە و لە سەردەمی سەڵتەنەتی (قاجار)یدا لە سوپای ئێراندا خزمەتی کردوە, باوکیشی بەشێکی خوێندنی خۆی لە ولآتی ڕوسیا ئەنجام داوە و دواتر ڕۆشتوە بۆ ولآتی فەڕەنسا و لە بوواری ماف دا خوێندویەتی و بڕوانامەی بەکالۆریۆسی بەدەست هێناوە, لەبەرئەوەی کە ئارەزوی لە خزمەتکردن بووە لە سوپا دا ڕۆشتوەتە کۆلێژی سەربازی (سن سیر)ی فەرەنسا و بڕوانامەی بەدەست هێناوە, لەگەڕانەوەیدا بۆ ئێران لە بەشی یاسایی لەشکری تاران دا خزمەتی کردووە.

تاکە منداڵی ئەو خێزانە (شاژنە فەرەح) لە ساڵی (١٣١٧)هەتاوی لەدایك بووە و لەگەڵ کوڕە خاڵێکی خۆیدا کە هاوتەمەنی خۆی بووە لە یەك ماڵ دا پەروەردە کراوە و ئەم دو منداڵە وەك خوشك و برا پێکەوە گەورە بوون, (شاژنە فەرەح) زۆر هۆگری باوکی بووە و کاتێك کە لە تەمەنی دە ساڵی دا دەبێت بە هۆی نەخۆشی (سەرەتان)ەوە باوکی لە دونیا دەردەچێت و دایکی تا ماوەیەك مەرگی باوکی لەو دەشارێتەوە, وای نیشان دەدا کە بۆ چارەسەر کردن سەردانی فەڕەنسای کردووە, بەڵآم ئەو بە پۆشینی بەرگی ڕەشی خزمانیەوە مەرگی باوکی هەست پێدەکات و خزمەتکارەکانیش ڕاستیەکانی پێ دەڵێن و ئەو دوچاری خەم و پەژارەیەکی زۆر دەکەن.

شا دواتر دو لاپەڕەی تەواو لە کتێبەکەی خۆی تایبەت دەکات بە باسکردنی خوێندنی (فەرەح) لە قوتابخانە ئیتالیەکان و ئامادەیی ڕازی لە تاران تا کۆلێژی تەلارسازی لە پاریس, دوای ئاماژە دان بە زەوق و ئامادەیی فەرەح لە مۆسیقا و وێنەکێشان, بەم شێوەیە بەردەوام دەبێت: ((کیژۆڵە خان بۆ بەسەر بردنی پشوی

هاوینەی خۆی لە ساڵی (١٣٣٨)هەتاوی هات بۆ تاران, لەوکاتانەدا کچەکەم و زاواکەم ئاشنایەتیان لەگەڵ ئەودا پەیدا کردوە, بۆ نان خواردنی ئێوارەش دەعوەتی ئەویان کردوە, ئەوەیان زانی کە کچەکەم و فەرەح خان چەند هاوڕێیەکی هاوبەشیان هەیە, وە لە زۆرێك لە کاروبارەکاندا هاوشێوەییەکی دەرونیان هەیە.

جارێکی دیکە کە دەعوەتی فەرەح خانم کرایەوە, شەهنازی کچم بە شێوەیەك زەمینەسازی کرد کە منیش لەو دەعوەتیەدا بەشداری بکەم, من فەرەح خانم چەند مانگێك پێشتر لە کاتی دیدارێکی گشتی خوێندکارە ئێرانیەکانی زانکۆ لە پاریس دیتبوو, بەلاّم لەبەر ئەوەی کە ژمارەی خوێندکارەکان یەکجا زۆر بوو لەو قەرەباڵخیەدا بە باشی لە بیرم نەمابوو, لەبەرئەوە هەمان دیداریش بۆ ئەو بووەتە بیانوی گاڵتەکردن, بەلاّم لەو میوانداریەی کە لەماڵی زاواکەم دا ڕێکخرابوو زەمینەیەك سازێنرا کە بتوانین پێکەوە گفتوگۆ بکەین.

هەفتەیەك دوای ئەو میوانداریە پێشنیاری هاوسەرگیریم بۆ کرد, ڕۆژنامە نوسانیش عاشقی دروستکردنی هەواڵن, بۆیە لە بلاّوکراوەکانی زۆربەی ولاّتان دا بلاو کرایەوە کە من لەکاتێکدا فەرەح خانم بردوە بۆ گەشت و سەیران لە فڕۆکەکەدا ئەم پێشنیارەم خستوەتە بەردەمی, لەوانەیە هەندێك لە هەواڵنێرانی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان ویستویانە ڕادەی ئارەزومەندی من بە فڕۆکەو ژنەوە پێکەوە گرێ بدەن, بەلاّم ڕاستیەکەی ئەوەیە کە پێشنیاری هاوسەرگیری لە ماڵی زاواکەم هاتە بوون, هەڵبەت دوای ئەم پێشنیارە چەندین جار پێکەوە دیدارمان ئەنجام داوە.

فەرەح خان بڕیاری وا بوو کە پۆشاکی بووکێنی خۆی لە فەرەنسا ئامادە بکات و بۆ هەڵهاتن لە ڕێوڕەسم و پێشوازی زۆر بڕیار درا بە شێوەیەکی نا فەرمی و ئاسایی بڕوات بۆ پاریس, هەتا گەڕانەوەشی چاوپۆشی بکرێت لە ڕاگەیاندنی مارەبڕین و دەستگیرانداری, فەرەح لەگەڵ مام و مامۆژن و خاڵۆ ژنی خۆی دا ڕۆیشت بۆ پاریس, دو ڕۆژ دوای گەڕانەوەی فەرەح بۆ تاران هاوسەرگیری ئێمە ڕاگەیەندرا, نزیکەی سێ هەفتە دواتر ئاهەنگی مارەبڕینی ئێمە بە پێی ڕیوڕەسمی ئاینی ئیسلام لە دوای نیوەڕۆی (٢٩ ئازەر ١٣٣٨)هەتاوی ساز درا, لەهەمان شەو دا خوانی ئێوارەو میوانداریەکی بە شکۆ لە کۆشکی گوڵستان ئەنجام درا, خاوەن پلە جۆراجۆرە سیاسیەکان ئێمەیان ناچار کرد کە سەفەری مانگی هەنگوینی خۆمان بۆ ماوەیەك دوا

بخەین، بەلاّم ماوەیەك دواتر پێکەوە سەفەرێکی کەنارەکانی دەریای خەزەرمان کرد.[1]..)).

فەرەح دە مانگ و دە ڕۆژ دوای ئەنجام دانی هاوسەرگیری کوڕێك بۆ (شا) دێنێتە دونیا، وە بەم شێوەیە نیگەرانیەکانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی لە بارەی بەردەوامی پادشایەتی لە بنەماڵەی پەهلەوی دا ڕەوایەوە، بەلاّم هیچکەس نەیدەزانی کە بەر لە باڵغ بوونی ئەم کوڕە، خودی (شا) لە نێو تۆفانی شۆڕش دا لە ولاّتەکەی وەدەر دەنرێت و تاج و تەختی سەڵتەنەتی لە ئێران دا ژێراوژور دەبێت...

** ** **

فەرەح لە بنەماڵەیەکی مام ناوەند هاتبووە دونیاوە، هەر بەو شێوەیەی کە ئاماژەی بۆ کرا لە کاتی وانە خوێندنی دا لە پاریس لە ڕوی دابینکردنی خەرجی خوێندن شوێنی نیشتەجێبوونی لە پاریس تەواو لە تەنگانەدا بوو، فەرەح لەژێر کاریگەری بارودۆخ و ڕەوشی ژیانی خۆی و بڕەو سەندنی بیرو باوەڕی کۆمۆنیستی لە فەرەنسای ئەو ڕۆژگارانەدا، مەیلی بەلای چەپەکاندا پەیدا کردبوو بە ڕادەیەك کە (ئیحسان تەبەری) لە ڕێبەرەکانی حیزبی (تودە)، ماوەیەك دواتر لە کتێبەکەی خۆیدا (کژراهە) نووسی: لە ناوەندەکانی حیزبی تودە لە پاریسیشدا ئامادە دەبوو، هەمو هاوڕێکانیشی مەیلی چەپڕەویان هەبوو، (ڕەزا قوتبی) کوڕە خاڵیشی کە ئەویش هەر لە پاریس دەیخوێند پەیوەست بووبوو بە گروپە چەپڕەوەکانەوە.

ڕیکخراوە ئاسایشیەکانی ئێران کە تازەبەتازە دروست بووبوو، لەو کاتانەدا دەستە و شانەی تایبەت یان ئەندامی لە دەرەوەی ولاّت دا نەبوو، بۆ ئەوەی بەدوادا چون بۆ پیشینە و چالاکیە سیاسیەکانی (فەرەح) یان بیر و بۆچونەکانی ئەو بکات، هاوڕێ چەپەکانی (فەرەح)یش بەرژەوەندیخۆیانیان لەوەدا دەبینیەوە کە لەو بارەیەوە بێدەنگی هەڵبژێرن تا بە خەیاڵی خۆیان (شاژن)ێکی کۆمۆنیست لە دەرباری پەهلەوی دا ڕیشە دابکوتێت و لە کاتێکی گونجاو دا دەسەلاّت بگرنە دەست، پێدەچێت (فەرەح)یش دوای ئەوەی کە نازناوی شاژنی ئێرانی بەدەست هێنا، بە وتەی پێشینان (بە مەرامی خۆی گەیشت) لەبیری بەردەوام بوون لەسەر بیروباوەڕی

[1] ماموريت براى وطنم: ص ٣٠٦ – ٣١٠.

ڕابردوی خۆی نەبوو, بەڵام بیری کۆمۆنیستی وەك میکرۆبێك وایە کە کاتێك ڕۆشتە جیسمی هەرکەسێك بە ئاسانی و بە بەهێزترینی ئەنتی بایۆتیکەکانیش لە نێو ناچێت و لە شێوەی نەخۆشییەکی درێژخایەن لە جیسمی مرۆڤ دا دەمێنێتەوە, زەمینەکانی ئەم فیکرەیە لە دەرونی (فەرەح)یشدا مایەوە, هەندێك لە هاوڕێیانی سەردەمی خوێندکاری ئەویش کە بەسود وەرگرتن لە پێگەی نوێی ئەو کەوتنە خزمەت لە نێو دەرباردا, کاریگەریان هەبوو لە بەردەوامی دان بە مانەوەی ئەم بیروبۆچونە, یەکیك لە نزیکترین دۆستەکانی سەردەمی خوێندنی (فەرەح) کە بە وتەی فردوست (بکوژ و بڕ)ی ئاوەزی دابڕاوی (فەرەح) دەهاتە هەژمار, (لەیلا ئەرجومەند) بوو, کە هیچ گومانێك لە مەیل و لایەنگیری ئەو بۆ بیری کۆمۆنیستی نەبوو, فردوست دنووسێت: دواتر (ساواك) گومانیان لە چالاکیەکانی (لەیلا ئەرجەمەند و مێرد)ەکەی کە مامۆستای بەشی فیزیا بوو لە زانکۆی تاران و پشکیشی لە ڕۆژنامەی (اطلاعات) دا هەبوو, کرد, وە چەند ڕاپۆرتێك دەربارەی بلاۆو کردنەوەی بیری کۆمۆنیستی لەلایەن ئەوانەوە بە (شا) درا, بەڵام ((فەرەح, هانی حەمە ڕەزا شا ی دابوو کە بلاۆوبوونەوەی بەشێك بیری کۆمۆنیستی لە بەرژەوەندی سەڵتەنەتەکەی ئەوە نەوەك مەترسی بۆ سەر سەڵتەنەت, لەبەر ئەوە لە سەردەمی (فەرەح)دا و بە هاوکاری دیوانی ئیدارەی ئەو بیری کۆمۆنبستی برەوی پەیدا دەکرد و ڕۆشبیرانی کۆمۆنیستی وەك (فەیروز شیروانلو) پەیوەندیان بە دیوانی (فەرەح)ەوە دەکرد, یان لەهەندێ شوێنی ناوەندی پەروەردە کردنی بیری منداڵاْن و لاوان دا دادەنران و ناوەندەکان دەخرانە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی ئەوانەوە))[1].

فەرەح بەو بیروباوەڕ و پێشینەیەوە ڕۆشتە نێو دەرباری (پەهلەوی)ەوە, زۆر زوو هەستی کرد کە ئەو بەو ژینگەیە نامۆیە, لە نێو ئەندامانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی دا, فەرەح پەیوەندی تەنها لەگەڵ (شەهناز)دا کە ببووە هۆی پێناساندنی (شا و فەرەح) بە یەکدی هەبوو, لەگەڵ ئەندامانی دیکەی بنەماڵەی سەڵتەنەتی دا پەیوەندی

---

1 خاطرات ارتشبد سابق حسین فردوست: ص٢١٢ – ٢١٣. (بەشی نێو دو کەوانەکە بەمەبەستی ڕونکردنەوە زیاد کراوە بۆ سەر دەقی ڕاستەقینەی کتێبەکە).

بەهێزی نەبوو، عادەت و ئولفەتی پەیدا کرد، بەتایبەت (شەمس و ئەشرەف) کە بە بۆچونی ئەو دروستکراوانێکی کیناوی و فیرعەون ئاسا بوون کە پێگەیەکی نەك لە خۆیان بەرزتر بەڵکو هاوشانی خۆشیان بۆ (فەرەح) ڕەوا نەدەبینی، لەگەڵ ئەوەدا فەرەح بڕیاری دا هێدی هێدی بجەنگێت و پلەپلە جێگە پێی خۆی بتەو بکات، لە دایك بوونی (شازادەیەك) لە (٩ ئابان ١٣٣٩)هەتاوی دا باوەڕ بە خۆبوونی ئەوی بە تینتر کرد، بەڵام هێشتا ڕێگەیەکی زۆری لە بەردەم دا بوو تا بتوانێت لە نێو دەرباریەکان دا ڕۆڵێکی کاریگەر بۆ خۆی دەست بخات.

من وەك نوسەری ئەم کتێبە یەکەم ڕۆژنامەنوسی ئێرانی بووم کە لە سەروبەندی هاتنە ناوەوەی فەرەح بۆ نێو دەرباری پەهلەوی دیدار و چاو پێکەوتنم لەگەڵدا ئەنجام دا، لەو کاتانەدا من سەرنوسەری گۆڤاری (خواندنیها) بووم، و (ئەمیرانی)ش بەڕێوەبەری گۆڤارەکە بوو کە بە هۆکارێك ناکۆکی لەگەڵ ئەشرەف دا هەبوو ئەم چاوپێکەوتنەی ڕێکخستبوو بۆ ئەوەی پلەو پێگەی فەرەح لە بەرامبەر ئەشرەف دا بەهێز بکات، تەنانەت پێش ئەنجام دانی ئەم چاوپێکەوتنەش ئەمیرانی زۆرجاران بە بیانو سەردێڕی جۆراوجۆر وێنەکانی (فەرەح)ی لە بەرگی گۆڤارەکەدا کە لەو کاتانەدا دیارترین گۆڤاری سیاسی بوو، چاپ دەکرد، ئەم کارەشی بە دەستی ئەنقەست دەکرد.

چاوپێکەوتن لە (ئەسفەندی ١٣٤٠) هەتاوی لە کۆشکی هەمیشەیی (شاری) ئەنجام درا، وە لە ژمارەی نەورۆزی ١٣٤١ هەتاوی دا بڵاو کرایەوە، بەڵام سەرنج ڕاکێشترین بەشەکانی ئەو چاوپێکەوتنە بە هۆکار گەلێك کە هێشتا بۆ منیش ڕون نیە بڵاو نەکرابوونەوە، (فەرەح) کە بەر لە ئەنجام دانی ئەم چاوپێکەوتنە بۆ بۆنەیەك سەردانی باشوری شاری کردبوو، بە پەژارەیەکی قوڵەوە لە بارەی ڕوشی ژیانی خەڵکانی باشوری شار لەگەڵ من دەدوا و ڕستەیەکی بەم ناوەڕۆکەی خوارەوە وت: (من لە نێو خەڵکەوە هەستاوم و دەمەوێت پردێك بم لە نێوان خەڵك و شا دا)، هەڵبەت بابەتەکە لەم ڕستە کورتە درێژتر و سەرنج ڕاکێش تر بوو، کە سی ساڵ زیاتر تێپەڕیوە و هەمو وتەکانم لە بیر نەماوە، بەڵام بابەتەکەم بە شێوەیەك داڕێژابوو کە جیاوازیەکانی شێوازی بیرکردنەوەی (شاژن)ی لەگەڵ سەرجەم دەرباریەکانی دیکەدا بەڕونی دەردەخست، وە بە سەرنجدان لە ناکۆکیەکانی نێوان (ئەمیرانی و ئەشرەف)

گومان دەکەم کە مایەی ڕەزامەندی خودی (ئەمیرانی)ش بوو, بەڵام ئەمیرانی پیش لە چاپدانی چاوپێکەوتنەکە لە گۆڤارەکەدا ووتی: (دەبێت پێشتر ئەو چاوپێکەوتنە بخەمە ڕوو), بەیانی ڕۆژی دواتر چاوپێکەوتنەکە بەبیٚ ئەو بەشە نێردرا بۆ چاپخانە.

فەرەح لە مانگی ئەسفەند ١٣٤١ هەتاوی دا دوەمین منداڵی خۆی بە نێوی (فەرەحناز) و لە مانگی ئۆردیبەهەشتی ١٣٤٥ هەتاوی دا سێیەمین منداڵی بە نێوی (عەلیڕەزا)هێنایە دونیا, ئیدی وردە وردە پێگەی فەرەح بەهێز بوو, لە ساڵی ١٣٤٦ هەتاوی دوای ڕوداوی هەوڵی کوشتنی (شا) لە کۆشکی (مەڕمەڕە) ئاسایشی بۆ خۆی نەدەبینی و بڕیاری دا پرسی جێنشینی خۆی لە دەستوردا یەکلایی بکاتەوە, بۆ هەمان مەبەست لە مانگی (شەهریوەری ١٣٤٦)هەتاوی دا, ئەنجومەنێك بۆ پێداچونەوە و هەموار کردنەوەی بنەماکانی مادە دەستوریەکانی ژمارە (٣٨, ٤١, ٤٤) پێکهێنرا, لە ئەنجامی ئەو چاکسازیانەی کە لە دەستوردا ئەنجام درا بڕیار درا: ئەگەر لەکاتی گواستنەوەی سەڵتەنەتدا, شازادەی جێنشین نە گەیشتبووە تەمەنی یاسایی خۆی کە (بیست ساڵی) بوو, شاژنی دایکی شازادەی جێنشین دەستبەجیٚ بە وەکالەت کاروباری سەڵتەنەت دەگرێتە ئەستۆ, مەگەر لە کاتێکدا نەبێت کە لە لایەن خودی (شا)وە کەسێکی دیکە بۆ (نائیب سەڵتەنە) دیاری کرابێت, نائیب سەڵتەنە لیژنەیەك بە بەشداری سەرۆك وەزیران و سەرۆکەکانی پەرلەمان و ئەنجومەنی سەنا و سەرۆکی دیوانی باڵای وڵات و چوار کەس لە کەسانی شارەزا و لێزانانی وڵات کە خۆی هەڵیان دەبژێرێت پێکدەهێنێت و کاروباری سەڵتەنەت بە پێی دەستور و بە ڕاوێژکردن لەگەڵ ئەو لیژنەیەدا ئەنجام دەدرێت هەتا شازادە تەمەنی دەگاتە بیست ساڵی تەواو.

پێشبینی وەرگرتنی پۆستی سەڵتەنەت بە وەکالەت بە پێی دەستور لەلایەن (فەرەح)ەوە پێگەی ئەوی لە بەرامبەر سەرجەم دەرباریەکانی دیکە و ئەندامانی بنەماڵەی پەهلەوی دا سات لە دوای سات بەهێزتر دەکرد, وە تاوی دا بە ناکۆکیەکانی فەرەح لەگەڵ خوشکەکانی (شا) بە تایبەت ناکۆکی لەگەڵ ئەشرەفی خوشکی (شا)دا, فەرەح دیوانی تایبەتی خۆیشی فراوان کرد و بە کۆکردنەوەی ژمارەیەك لە لاوە چەپگەراکان و ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە دەربارێکی تایبەتی بۆ خۆی پێکهێنا, بەرنامەی ڕابواردن و خۆشگوزەرانیەکانی (شا)یش کە هەرگیز پشوی

نەبوو کەم کەم ئاشکرا دەبوون و پەیوەندی فەرەح لەگەڵ خودی (شا)یشدا ڕوی لە ساردی دەکرد, لەم نیوەندەدا لە نێو (شا و فەرەح)یشدا جارجارانێك چەلەحانی پێشدەهات, کە سەرباری ئاگاداریەکانی فەرەح لە پەیوەندیەکانی (شا) بە ژنانی دیکەوە, لە دەربڕینی بۆچونەکانی فەرەح و بیروڕاکانی دەربارەی وڵات کە زۆربەی کات پێچەونەی بۆچونەکانی (شا) بوو, سەرچاوەی دەگرت.

چاو خشاندنێك بە یاداشتەکانی (ئەسەدولڵای عەلەم)دا تا ڕادەیەك چۆنیەتی ئەم ناکۆکی و جیاوازی بۆچونانە ڕەون دەکاتەوە:

*ڕۆژی شەممە (١٤ ئوردیبەهەشتی ١٣٤٩)هەتاوی, شاژنە فەرەح چوە نێو شاری مەشهەد و ڕاستەوخۆ بۆ زیارەتی حەرەمی پاکی (ئیمام ڕەزا)ع ڕۆیشت, لەویێ سەردانی نەخۆشخانەی نەخۆشی گەڕوگولەکانی کرد, ئەم سەردانە بە ڕادەیەك ئەوی پەشۆکاند کە زارزار دەگریا, ڕێك چەند ساڵێك پێشتریش هەمان ڕوداو ڕوی دا, دەبێت دان بەوەدا بنێین کە ئەم خانمە بەڕاستی کەسایەتیەکی هەستیار و دڵ ناسکە.., لەکاتی گەڕانەوەمان بۆ تاران لە فڕۆکەکەدا (شاژن) ویستی من ببینێت, ماوەی کاتژمێرێك پێکەوە قسەمان کرد, گلەیی هەبوو لە کار و کردەوەکانی خوشکەکانی (شا) و چالاکیەکانی بنەماڵەی پەهلەوی کە بە بۆچونی ئەو لە بەرامبەر شازادە دا دەمارگیر و وشك ئامێزە, لەبەر ئەوەی کە خۆی زاتی ئەوە ناکات کە ئەم پرسە لە بەردەم (شا) دا باس بکات داوای لە من کرد کە (شا) لەم بارەیەوە ئاگادار بکەمەوە.., دواتر ئاماژەی بە ڕەوشی ناسکی پڕوپاگەندە و ڕاگەیاندنەکانی دەوڵەت کرد, گویێ نەدان بەبیروڕای شەقام و ئەوەی کە زۆرێك لەو کارانەی کە دەوڵەت ئەنجامی دەدات جگە لە ڕوکەش هیچی دیکە نیە, بە وتەی ئەو ئەم کارانە تەنها متمانەی خەڵك لە دەوڵەت لاواز دەکات و دایدەماڵێت.*

*ڕۆژی هەینی (٦ شەهریوەری ١٣٤٩)هەتاوی - لەم دواییانەدابۆچونی شاژن بەرامبەر بە شێوەیەکی هەست پێکردو ڕوی لە ساردی کردووە, لەو باوەڕەدام کە ئەو ژنێك نیە بتوانیت بە ئاسانی لێی تێبگەیت, هەڵبەتە ئەو باش ئاگاداری لە پەیوەندی زۆر نزیکی من و شا هەیە, لەوانەشە دەنگۆی نێربازی شەوانەی ئێمەشی بیستبێت.*

ڕۆژی یەك شەممە (٦ دی ١٣٤٩)هەتاوی _ ماوەیەك پێشتر پێشنیارم بۆ (شا) کرد کە خراپ نیە میوانداریەك بۆ نانی ئێوارە ئەنجام بدەین و کۆمەڵێك لە دەستەبژێرەکانی تێکەڵ وەك دیبلۆماتکارە بیانیەکان و سەرمایەدارەکان و خاوەن کارگەکان و هونەرمەندان، بانگهێشت بکەین، (شا) پێشنیارەکەمی بە دڵ بوو، هەوڵم دا ئەمشەو لە کاتی نانی ئێوارەدا هەردو (شا و شاژن) ڕۆژێك بۆ ئەو ڕێوڕەسمە دیاریبکەن، وە هەروەها ڕێکیش بکەون لە سەر لیستی ناوی ئەوانەی کە بانگهێشت دەکرێن، (شاژن) دژی بانگهێشت کردنی سەرمایە دارەکانە، لەبەر ئەوەی بڕوای وایە کە سەرجەمیان پیاوانێکن کە پێگەیەکی لەکەدار و نازناوێکی خراپیان هەیە، (شا) لەم قسانەی فەرەح توڕە بوو وتی: (کێ لە بۆچونی تۆی پرسی؟ من ئەم کارانە ڕێکدەخەم نەك تۆ، عەلەم هەمیشە لە بۆچونی تۆ دەپرسێت کە من لە هۆکارەکەی تێناگەم..)، بەداخەوە بووم کە بوومەهۆی نارەحەتکردنی شاژن.

ڕۆژی دوشەممە (٧ دی ١٣٤٩)هەتاوی _ بە (شا)م وت: (داوا دەکەم ئەوەی کە دەمەوێت بیڵێم لێی بێباك بیت و من ببەخشیت، بەڵام وا هەست دەکەم دوێنێ شەو لە کاتی نانی ئێوارە خاوەن شکۆ زۆر توند قسەکانی کرد، بۆ شاژن سوکایەتیە کە بەو شێوەیە قسەی لەگەڵ بکرێت، بەتایبەت لەلای کەسانی دیکە، ئەو بەڕادەی پێویست کینەی منی لە دڵدا هەیە، ئەم بابەتانە کۆ دەبنەوە و لەوانەیە ڕۆژێك ببێتە هۆی دەردیسەر بۆ خاوەن شکۆ..)، شا وتی: (من لەگەڵ هەمواندا ڕاشکاوانە و بە ڕەقی قسان دەکەم، بەرپرسیارێتی هەموشتێکیش لە ئەستۆی مندایە و هەرکاتێك هەر حەسەن و حسەینێك بیەوێت خۆی لە کارەکانمدا هەڵقورتێنێت و بە من بڵێت چی بکەم یان چی نەکەم..)، وای بۆ دەچم ڕقێکی شاراوە هەبوو وای کرد کە دوێنێ شەو بەو شێوەیە لەگەڵ شاژن دا ڕەفتار بکات کە کردی، لەوانەشەبە وتەی (سەعدی) هەمان ڕوداوی (دو پادشا لەهەرێمێکدا پێکەوە هەڵناکەن) بێت، ئەو هەموار کردنەوەیەی کە لە دەستوردا کرا کە لەکاتێکدا (شا) بەر لە تەمەنی (١٨) ساڵی

*شازاده (جێنشین) بمرێت[1]، ئەوا شاژن دەبێت بە نائیب سەڵتەنە، ئەم پرسە ناکۆکیەکانی نێوان (شا و شاژن)ی ئاشکرا کرد، هەڵبەتە ئەم هەموار کردنەوەیە خودی (شا) بۆ دەستوری زیاد کرد، من لەو باوەڕەدام کە (شاژن) دەیویست بە لەبەرچاو گرتنی دەستور پێگەی خۆی نیشانی (شا) بدات و بە ئاسانی دەتوانێت بزوێنەری خودی ئەو یان جموجوڵی دەروبەرەکەی بێت، دەگونجێت هەستیاری لە ڕادەبەدەری خودی (شا) لەم دوادواییانەدا لەبەر هەمان هۆکار بێت، ، .*

*ڕۆژی دوشەممە (١٤ دی ١٣٤٩) هەتاوی _ دوێنێ (شاژن) لە ناوەندی چاکسازی کۆمەڵایەتی وتارێکی پێشکەش کرد کە من بچوکترین ئاگاداریم لە ناوەڕۆکەکەی نەبوو، ئەمڕۆ ڕادیۆ پازدە دەقیقە بەر لە کاتی پێشکەشکردنی هەواڵەکان دەقی وتارەکەی دایە دەست من، بە بۆچونی من بەشێکی زۆری بابەتەکە هەڵەکاری و پێچەوانەی سیاسەتەکانی (شا) بوو، خودی (شا) لەوێ نەبوو منیش ڕاستەوخۆ فەرمانم دا کە وتارەکە لە ڕادیۆ پێشکەش بکرێت، بەڵام ڕۆژنامەکان دوا بخرێن لە چاپکردنی دەقی ئەو وتارە، کاتژمێرێك دواتر ئاگادار کرام کە نوسەری تایبەتی (شاژن) چەند ڕونوسێکی (نوسخە) لە وتارەکانی (شاژن)ی بەسەر ڕۆژنامەکان دا دابەشکردوە و بە هیچ شێوەیەك نابێت ڕێگری بکرێت لە بڵاو کردنەوەی ئەو وتارە لە ژمارەی ڕۆژی دواتری ڕۆژنامەکان، ئەم بابەتە شەڕێك هەڵدەگیرسێنێت، ، ، ، .*

*ڕۆژی سێ شەممە (١٥ دی ١٣٤٩)هەتاوی _ پێشبینیەکەم ڕاست دەرچوو، بەیانی ئەمڕۆ کە بە خزمەتی گەیشتم، (شا) بەم ڕستەیە دەستی پێکرد: (زۆر ئارەزومەنم کە بزانم بە ڕاستی خاوەن پایە چی دەکەیت؟)، وتم: من خزمەتکار و وەفاداری بەڕێزتانم، هەر کە ئەمەم وت تەقییەوە: (دەی بە یارمەتیت ڕونی بکەرەوە چۆن چۆنی وتاری شاژن بە بێ ڕەزامەندی من لە ڕۆژنامەکاندا بلاو کراوەتەوە؟)، بابەتەکەم ڕون کردەوە و ئەوەی کە هیچ*

---

[1] عەلەم هەڵەی کردووە، مادەی هەموار کراوی دەستور دەڵێت: شازادەی جێنشین دەبێت (٢٠) ساڵی تەواو بێت هەتا بتوانێت کاروباری سەڵتەنەتداری بگرێتە ئەستۆی خۆی.

چارەیەکم نەبووە جگە لەوەی کە دەستی تێوەرنەدەم، وەئەگەریش فەرمانی ڕێگریم لە بڵاوکردنەوەی وتارەکە بدابایا ئەوکات ئابڕو چونەکان زیاتر دەبوو، دەستبەجێ (شا) تەلەفونی بۆ (شاژن) کرد و بەکورتی و ڕاشکاوی پێی وت: کە سەرۆکی دیوانی تایبەتی ئەو لە بەکرێگیراو و پیلانگێڕەکانە، من نەمدەتوانی کە وەڵامەکانی ئەو ببیستم، قسەکانیشیان زۆر کورت بوو، بەڵام دەمتوانی لەوە تێبگەم کە دڵی (شاژن) زۆر بریندار بوو.

دواتر (شاژن) تەلەفونی بۆ کردم و داوای لێکردم کە بەدواداچون بۆ ئەو بابەتە بکەم، منیش وتم: (پێویست بە بەدواداچون ناکات، هیچ گومانێك نیە کە خەتای نوسەر و سەرۆکی دیوانی تایبەتی خۆتە....، )، بەڕاستی جێگای داخە کە لێنەهاتویی دەوروبەرەکەی هۆکاری تیکچونی پەیوەندیەکانی ئەم ژن و مێردە بێت!!، .

ڕۆژی هەینی (١٤ میهر ١٣٥١) هەتاوی _ شا افتتاحی دانیشتنی نوێی پەرلەمانی کردەوە، وتارێکی دوورودرێژ و نائاسایی پێشکەشکرد و ئەو پێشکەوتنانەی دەژمارد کە لە ئێران دەمانبینی، دواتر (شا و شاژن) بە مەبەستی پشودان ڕۆیشتن بۆ ئەو ژورەی کە تایبەت بوو بەم بۆنەیەوە، لەوێ (شاژن) ئاماژەی بەوە کرد کە (شا) لە وتارەکەیدا جگە لە پێشکەوتنەکانی وڵات باسی هیچی دیکەی نەکرد و بچوکترین ئاماژەی بە کەموکوڕیەکانی وڵات نەدا، (شا) زەردەخەنەیەکی کرد و ووتی: (ئێستا کە باسی خۆمان و سەرکەوتنەکانمان دەکەین، پیلانگێران خراپەکاران بە بۆمب و گوللە وەڵاممان دەدەنەوە، وای لە حاڵمان ئەگەر ڕەخنەش لە خۆمان بگرین)، دواتر ڕوی لە (شاژن) کرد و ووتی: (خۆ تۆش بوویتە شۆڕشگێڕ، دڵم هیواخوازە ئەوە ببینێت کە چۆنچۆنی لە کاتی وتنی دروشمی شۆڕشگێرانە و گەندەڵی و خراپەکاریەکانی دەوڵەت دا دەتەوێت ئیدارەی ئەم مەملەکەتە بکەیت، .... بەڕاستی کە ئێستە بوویتە شۆڕشگێڕ، بڵێ بزانم چۆنچۆنیە کە ئەم پۆشاکە شیك و گەوهەرە گرانبەهایانە دەپۆشیت؟!)، ئەم وتانە بە ئاوازێکە گاڵتە ئامێزەوە کران، چونکە (شا) لەوە تێگەیشتبوو کە لەلای من و سەرۆك وەزیران

و سەرۆکی پەرلەمان دا قسان دەکات...، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگر نەبوو لەوەی کە (شاژن) هەتا گەردنی سور بێتەوە، ، ، .

ڕۆژی سێ شەممە (١٨ میهر ١٣٥١) هەتاوی _ ئەمڕۆ کاتژمێر یازدە (شا و شاژن) بەمەبەستی دیدارێکی فەرمی دە ڕۆژە گەیشتنە مۆسکۆ، لە فڕۆکەخانە لە (شاژن)م پرسی مۆڵەت دەدات کە شازادە ببەم بۆ بینینی فیلمی دۆکیۆمێنتاری جەژنەکانی شاهنشاهی ساڵی ڕابردوو؟ لەگەڵ ئەوەشدا پێم وت کە (شا) ڕەزامەنی لەسەر ئەم داوایەم دەربڕیوە، (شاژن) وتی: (لەبەرخاتری خودا دەست لەسەرم هەڵگرە، من هەرگیز نامەوێت ناوی ئێمە بچوکترین پەیوەندی بەو ڕێوڕەسمە وەحشەتناکەوە هەبێت!)، کاتی باسکردنم نەبوو لە بارەی ئەو بابەتەوە تا وەبیری بێنمەوە کە چ بیەوێ یان نەیەوێ، ئێستا ڕێوڕەسمی جەژنەکان بەشێکە لە مێژوی ئێرانە و بەشێوەیەك لە بارەیەوە باسکراوە کە ناتوانین وای دەربخەین کە گوایا هەرگیز ئەم ڕوداوە ڕوی نەداوە، دواتر لە کاتێکدا کە بە بیستنی وتەکانی ئەو توشی شۆك بووبووم پێی وتم: (من و شا لە بارەی هیچ شتێکەوە پێکەوە هاوڕا نین، من تا ڕادەیەك لە بارەی هەمو شتێکەوە لەگەڵ ئەو جیاوازم!)، هەرگیز نەمدیبوو کە (شاژن) زاتی ئەوە بکات بەوشێوەیە بە ڕاشکاوی قسان بکات...، بەهەر حاڵ دەزانێت کە هەرگیز من وتەکانی ئەو بۆ پادشای بەڕێزم ناگێڕمەوە، خۆزگە دەمزانی کە (کازیمودوی پیر)[1] چ شتێکی بە گوێدا خوێندووە؟، خودا کۆتایمان بە خێر بگێڕێت...

ڕۆژی سێ شەممە (٢٢ خورداد ١٣٥٢)هەتاوی _ کچێك بە نێوی (گولیدا)[2] دەنگۆیەکی خستۆتە نێو شەقامی تاران کە گوایا (شا) عاشقی دڵ سوتاوی ئەوە، ئەمەم بە ڕاپۆرتێك گەیاند و ئاماژەم بەوە دا کەسەرم

---

[1] مەبەست لەمیر عەبباسی هوەیدایە.

[2] گولیدا: ئەو کچەی کە ماوەیەك دەنگۆیەك بڵاو بووبوویەوە کە (شا) عاشقی بووە و دەیەوێت هاوسەرگیری لەگەڵدا ئەنجام بدات.

سورِدەمێنێ کە بۆچی خاوەن شکۆ هیچ پەرچەکردارێك نیشان نادات؟ شا وتی: (کچەی دەبەنگ... ئەڵبەتە دەبێت بڵێم کەچەند جار ئەوم دیوە, وە هەروەها بیستومە کە چ شتانێك دەڵێت, ئەم دەنگۆیانەش خەریکە بە شێوەیەکی مەترسیدار بە گوێی (شاژن) دەگات, ئاگاداری بکەنەوە کە ئەگەر کۆتایی بەم یاریانە نەهێنێت ئەوا دەکەوێتە پشت میلەکانی زیندانەوە...).

ڕۆژی شەممە (٣٠ تیر ١٣٥٢)هەتاوی _ ئێوارە لە کۆشکی شاژنی دایك... دیسانەوە خانمی دیبا[1], ویتەویتی دەربارەی دەنگۆی هاوسەرگیری خاوەن شکۆ دەستپێکرد..., وردەوردە خەریك بوو حاڵم تێکدەچو, بەداخەوە دەبێت ئەوە بڵێم کە خراپ دام لە زەوقی...!

ڕۆژی یەکشەممە (٣١ تیر ١٣٥٢)هەتاوی _ وتە پەرتوبڵاوەکانی خانمی دیبام کردە ڕاپۆرتێك بۆ (شا), وتم لەگەڵ ئەوەی تەنانەت جارێکیش باسی تەڵاقی نەکرد, بەڵام قسەی زۆر گرنگی بەو واتایە کرد, کە کچەکەی جوانکاری پەرست نیە, ئەمەش بە تەواوی واتای ئەوەیە کە جودا بوونەوەی کچەکەی لە (شا) نابێتە هۆی سەختی کێشان لە ڕوی داراییەوە, (شا) وتی: (وڕاوە دەکات), دوای گفتوگۆیەکی زۆر ڕێککەوتین لەسەر ئەوەی کە دەبێت بەزوترین کات مێردێك بۆ ئەو کچە نەفرەتیە بدۆزریتەوە کە ئەم دەنگۆیانەی بڵاو کردۆتەوە.

ڕۆژی شەممە (١٠ شەهریوەر ١٣٥٢)هەتاوی _ بە وتەی (شا), (ئیستا (شاژن) لەو باوەڕەدایە ئەو کچەی کە باس دەکرا بڕیارە لەگەڵ ئەو زەماوەند بکات, لە ڕاستیدا پەیوەندی لەگەڵ ئەرتەشبەند (خاتەمی) فەرماندەی هێزی هەوایی دا هەیە, بە بڕوای (شاژن) دادپەروەرانە نیە کە ئەو و شا بەرگەی ئەم دەنگۆ ناڕاستانە بگرن, تەنها لەبەر ئەوەی کە ئابڕوی تیمسار پارێزراو بێت..., لە ڕاستیدا ڕاستە کە (شا) چەند جارێك ئەو کچەی بینیوە, بەڵام دواتر بینراوە کە ئۆتۆمبێل و هەڵی کۆبتەرە دەوڵەتیەکان بۆ ئەملاوئەولا دەڕوات, لە کاتێکدا

[1] مەبەست لە فەریدەی دیبایە دایکی فەرەح.

لەو کاتەدا مەعشوقەی (خاتەمی) بووە نەك (شا)، لەگەڵ ئەوەی کە خەڵکی وایان دەزانی کە ئەو کچە و شا دەزگیرانی یەکترین...، کچێکی زۆر جوانە...، بەڵام زۆریش لە خۆ ڕازی و پۆست و ناوبانگ خوازە، ئەم دەنگۆیانەش پەیوەستن بە خۆیەوە و هیچ کارێك بۆ وەستانەوە ناکات....

ڕۆژی یەکشەممە (١٩ خورداد ١٣٥٣)هەتاوی _ لە کۆشکی نیاوەران بەشداریم لە میوانداریەك دا کرد کە بۆ دیبلۆماتکارە بیانیەکان ڕێکخرابوو، لەسەر مێزەکە من لە تەنیشت (شاژن) و ڕووبەڕووی (شا) دانیشتبووم، وتم (د. فەرەیدون مەهدەوی) وەزیری بازرگانی لە ئیتالیا گەڕاوەتەوە، ئەو وڵاتە لە قەیرانی قوڵی ئابووری و سیاسی دا نوقوم بووە و هەموان دوعا دەکەن کە خوداوەند ڕابەرێکی وەك (شا) بەوان ببەخشێت، شا ووتی: (لەوانەیە بتوانم بۆ ماوەیەك خزمەتەکانم بخەمە خزمەتی ئەوانەوە)، لەم کاتەدا شاژن هاتە نێو قسان و ووتی: (بەو هەموە پێشکەوتنانەوە هێشتا خەڵکی ناڕازییە...، لە سەرو هەموشیانەوە کەمی کەرەستەکانی خواردن و خراپی بەرێوەبردنی ئیداری...)، من ناچار بووم پاڵپشتی بۆچونەکانی ئەو بکەم، بەڵام دەمتوانی ئەوە ببینم کە (شا) چەندە نیگەران بووە.

ڕۆژی شەممە (١٦ ئەسفەند ١٣٥٤)هەتاوی _ کاتی ئێوارە (شاژن) لە ناخی دڵەوە وتی کە دەیەوێت جڵەوی سەگەکەی (شا) کە سەگێکی دێو ئاسای دانیمارکی نەژاد بوو بگرێت، بۆ ئەوەی کەپوی نەخاتە نێو قاپی کەسانی دیکەوە، (شا) لێی پرسی وا بیر دەکەیتەوە خەریکی چ کارێك دەکەیت؟.. شاژن ووتی: (ماستاوچی و چڵکاو خۆرەکان لە هەمو شوێنێك هەن، من پەیڕەوی کەسانی وەها ناکەم، تەنانەت ماستاویش بۆ ئەو سەگە دەکەن، تەنها لەبەر ئەوەی کە سەگی تۆیە!!، تەنها منم کە گرنگی بەو درۆ و دەلەسانە نادەم..)، گومانم هەیە کە (شا) خۆشی لەو وتانە هاتبێت.

ڕۆژی یەکشەممە (٢٤ ئەسفەند ١٣٥٤)هەتاوی _ وەبیری (شا)م هێنایەوە کە نەورۆز نزیکە، خانمی (دیبا) چاوەڕێ دەکات یان بە پێدانی نازناوی شانازی (خاوەن شکۆ)وە شادومان بێت یان ئەوەی کە نازناوی خۆر بەدەست بهێنێت، ژیرانە نیە کە ئەو بێ ئومێد بکەین، شا ووتی: (دەربارەی

ئەم بابەتە قسەم لەگەڵ شاژن کردووە، ئەویش زۆر سەرسامە بە خۆپەسەندی دایکی بە ڕواڵەت دەروێشی..)، شا بەردەوام بوو (وای دابنێین کە من نازناوی خۆرم بەو دا، ئەوکاتە چۆن ئەم بابەتە بۆ دایکم ڕوون بکەمەوە، بە دڵنیاییەوە شەمسی خوشکم ئەو دەبزوێنێت و ئەوکات دیسانەوە جەنگێکی دیکە...!)، ئەمجا وتم (محەممەد عەلی قوتبی) برای خانمی دیباش دەیەوێت نازناوی (باڵوێزی گەڕۆک)ی پێ ببەخشرێت، شا وتی: (هەرگیز...!بڕوا پێکراو نییە..!).

ڕۆژی دوشەممە (٣١ خورداد ١٣٥٥)هەتاوی _ لە کۆشکی مەڕمەڕی ڕامسەردا، لە کاتێکدا کە چاوەڕێی کاتی دیاریکراو بۆ هێنانی میوانەکانمان بووین[1]، لە ناکاو شاژن بە بێ هیچ پێشەکیەك وتی کە نیگەرانی ئەوەیە کە خەڵکی لە دەستی (خۆی و شا) هیلاك بوون، وە (پێناچێت ئەو خەڵکەی کە جاران تاسەی بینینی ئێمەیان دەکرد ئێستاش هەر بەو شێوەیە بن)، شایش وەکو من لە بیستنی ئەو قسانە بە توندی هەڵوەستەی کرد، بەڵام بە توندی بە گژیدا چویەوە، لەم کاتەدا من خۆمم لەنێو قسان هەڵقورتاند، چونکە بە ڕونی دەمتوانی ئەوە ببینم کە خەریکە (شا) لە گێجەنە دەردەچێت، وەبیری شاژنم هێنایەوە کە زۆر بە کەمی دەگونجێت ڕای گشتی خەڵك لەگەڵ ئەودا بێتەوە، خەڵکی زۆر بە دەگمەن خاوەن شکۆ دەبینن، بەڵام هەمیشە لە بینینیان خۆشحاڵ دەبن، ، .

ڕۆژی پینج شەممە (٤ ئازەر ١٣٥٥)هەتاوی _ بە خزمەتی (شا)م گەیاند، دوێنێ لە کاتی بەڕێکەوتنیان بۆ میسر خوداحافیزیم لە (شاژن) دەکرد، بینیم کە وەکو هەمیشە هەمان کەسانی سوك و بێ بایەخ دەوریان گرتووە، دەگونجێت چاوەڕێی ئەوە بکرێت کە سەروکەللەی ئەوانە لە کیش وبیرجند و نەوشەهر و تەنانەت لە عمانیش دەر بکەوێت، بەڵام بەڕاستی لە میسر دا شتێکی دیکەیە، خاوەن شکۆ پەیوەندیەکی تایبەتی لەگەڵ میسر دا هەیە، وە

[1] لەو کاتانەدا ئەنوەر سادات و هاوسەرەکەی میوانی شا بوون.

*ئەم کەسانە بە ئاسانی دەتوانن ئەو پەیوەندیە بخەنە مەترسیەوە...، شا لە وەلأمدا ووتی: (ئاخر من چی بکەم؟ شاژن لە دڵەوە پەیوەندی لەگەڵ ئەوانەدا هەیە، تەنانەت دایکیشی چەندین جار ئەمەی پێ وتووە، بەلأم بە ئاوازێك وەلأمی دایکی داوەتەوە کە فزولی نەکات، ئیدی ئەویش زاتی ئەوە ناکات کە ئەم بابەتە باس بکاتەوە...)*[1].

ئەوەی کە لە چەند لاپەڕەی پێشو دا لە یاداشتە دوبەرگیەکەی (عەلەم)ەوە وەرگیرا، مشتێکە لە خەرواری جیاوازی بۆ چونەکانی (شا و فەرەح) کە (عەلەم) ئاگای لێی بووە، ئەمەش بەڵگەی هەبوونی جیاوازی و چەلەحانێکانی ئەوانە لە کاتێکدا کە هەرخۆیان بووبن، کە بەدڵنیاییەوە توندتر و قوڵتر بووە لەوەی کە هەندێك جار بینراوە، بە لەبەر چاو گرتنی ئەو وتانەی کە لە (عەلەم)ەوە وەرگیران، دەتوانرێت پەی بەم خالأنەی خوارەوە ببرێت:

١- بەو پێشینە چەپگەراییەی فەرەح کە پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، وە لە ژێر کاریگەری ئەو چەپانەی کە لە دەرباری تایبەتی ئەو دا دەسەلأتیان پەیدا کردبوو، لەهەمان کاتیشدا کە هەندێك بۆچونە چەپەکان و (هاوشێوە سۆسیالیستیەکان)ی شا و وە دانانی هەندێك یاسای ناسراو بە (شۆڕشی سپی) بێ کاریگەر نەبووە، کە (فەرەح) هەنگاوەکانی (شا)ی بە پارێزکار و لێنەهاتو دەزانی و ئارەزومەندی گۆڕانکاری بنەڕەتی و (ڕادیکاڵ)انە بووە لە سیاسەتی گشتی ولأت دا، هەربۆیە (شا) هێرشی دەکردە سەر ئەو بۆچونە و بە نێوی (بیری شۆڕشگێڕی)ەوە گاڵتە و سوکایەتی پێدەکرد.

٢- فەرەح ڕازی نەبووە بە گێڕانی بۆنە و ڕێوڕەسمەکانی (٢٥٠٠) ساڵەی شاهنشاهی و جارێکیان لە سەروبەندی سەفەرێکدا بۆ ولأتی سۆڤیەت، بە ئاشکرا بە عەلەم دەڵێت: (من هەرگیز نامەوێت ناوی ئێمە (واتە خۆی و شازادەی جێنشین) بچوکترین بەپوەندیان بەم بۆنە وەحشەتناکەوە هەبێت)، جێگای وەبیر هینانەوەیە لەگەڵ ئەوەی کە فەرەح ناڕازی بوو بە گێڕانی بۆنە شاهنشاییەکان، لەوانەیە لەبەر

[1] امیر اسدالله علم: گفتوگوهای من با شاه (خاطرات محرمانه امیر اسدالله علم)، انتشارات طرح نو، ١٣٧١.

جەختکردنەوە و یادئاوەری بۆنەکان بۆ کەلتورە کۆنەکانی ئێران بوبێت، خۆی داهێنەر و ئامادەکاری بۆ نە هونەریەکانی شیراز بوو، کە بە تەواوی نامۆ بوو بە دابوونەریت و کەلتور و مەزهەبی ئێران و سەرجەمی بیانی بوو.

٣- فەرەح لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ بنەماڵەی (شا) و ئاگادار بوونیشی لە بابەتی پەیوەندیەکانی (شا) لەگەڵ زنانی دیکە دا، کە زۆر جار (عەلەم) بە ڕاشکاوانە و بە بەکار هێنانی زاراوەی (نێربازی) دانی پێدا دەنێت، لەگەڵ مێردەکەیدا ناکۆکی هەبووە تا ڕادەیەك باسی تەلاقیش دەکرا، ڕستەیەك کە عەلەم لە دەمی (فەرەح)ەوە وەریگرتووە، تیایدا دەڵێت: (من و شا لە بارەی هیچ شتێکەوە پێکەوە تەبا نین، تا ڕادەیەك من لە بارەی هەمو شتێکەوە لەگەڵ ئەو جیاوازم)، قوڵایی ناکۆکیەکانی ئەو ژن و مێردە کە تەنها تایبەت نەبووە بە کاروباری خێزانییەوە، نیشان دەدات.

٤- ئەو ڕێگە چارەیەی کە (شا و عەلەم) بۆ چارەسەر کردنی یەکێك لەم ناکۆکیانە دەیگرنە بەر سەرسوڕ هێنەرە: شا پەیوەندی لەگەڵ کچێکدا کە ناوی (گولیدا)یە دەبەستێت، ئەم پەیوەندیەش زیاتر لە عەشقە سەرپێییەکانی (شا) درێژە دەکێشێت و دەبێتە هۆی بلاّو بوونەوەی دەنگۆیەك دەربارەی ئەگەری ئەنجامدانی هاوسەرگیری (شا) لەگەڵ ئەو کچە دا، کار دەگاتە هەڵگیرسانی شەر لە نێوان (شا و فەرەح) دا و بابەتی تەلاّق و تەلاّقکاری دێتە پێشەوە، کە (عەلەم) تەنها ئاماژەی بە لایەنێکی کەمی ئەو بابەتە کردوە ئەویش لە زمانی دایکی فەرەحەوە، سەرەنجام (شا و عەلەم) کە بە وتەی عەلەم پێکەوە نێربازی دەکەن، بڕیار دەدەن (سەرگەرمییەکی) دیکە بۆ (گولیدا) پەیدا بکەن و وای نیشان بدەن کە ئەم بابەتە هیچ پەیوەندیەکی بە (شا) وە نەبووە!، چارەسەری ئەم کێشەیەش دەپێچن بە ئەرتەشبەند (خاتەمی) فەرماندەی هێزی ئاسمانیەوە لە کاتێکدا کە ئەو مێردی خوشکی (شا) یە، بەم شێوەیە (شا) بۆ خۆ دەربازکردنی لەم کێشەیە مەعشوقەکەی ڕادەستی مێردی خوشکەکەی دەکات!!.

٥- ئەو بابەتانەی کە لە یاداشتەکانی (عەلەم) دا دەبینرێن و تایبەتە بە ساڵانی دوای (١٣٣٧) هەتاوی، کە فەرەح جێگە پێی خۆی توند کردوە و بەو گۆڕانکاریانەی کە لە دەستوردا ئەنجام دراون، پێگەی خۆی وەك نائیب سەڵتەنە لە کاتی دەستلەکار

کێشانەوە و کەناگیری یان مردنی (شا) دا چەسپاندووە, دەگونجێت فەرەح لە ساڵانی پێشتردا کەمتر زاتی ڕووبەڕو بوونەوەی (شا)ی هەبووبێت.

٦- لەوانەیە ئەم پرسیارە بۆ خوێنەری یاداشتەکانی (عەلەم) دروست ببێت, کە (شا) بەو سروشتە دیکتاتۆریەی کە هەیبوو, بەتایبەت بەو لەخۆبایی بوونەی کە لە ساڵانی (١٣٥٠ تا ١٣٥٥) بۆ دەست دابوو, چۆنچۆنی بەرگەی توندڕەوی و لە خۆدەرچونی فەرەحی کردوە, تەنانەت دەتوانرێت ئەوەش بووترێت کە کەم تا زۆرێك گرنگی پێداوە, وەڵامی ئەم پرسیارە ڕونە: شا دەیزانی بە جودا بوونەوەی لە هاوسەری سێیەمی کە دایکی چوار منداڵیەتی گورزێکە توند و کوشندە بەر پێگەو ئابڕوی ئەو دەکەوێت لە ناوەوە و دەرەوەی وڵات, لەبەر ئەوە بە پێچەوانەی هەردو تەڵاقدانەکەی پێشو ترەوە کە تا ڕادەیەك جێگای سەرنج،, هیچ بیانویەکی دیاریکراوی بۆ تەڵاقدانی سێیەم لەبەردەستدا نییە, بە دڵنیاییەوە کە شەقام و ڕای گشتی لەم ڕوداوەدا (شا) بە تاوانبار دەزانن, سەرباری ئەوەش (شا) ترسێکی دیکەی لە فەرەح هەبوو کە لەوە دەترسا دوای جودا بوونەوەیان, بەو پەیوەندیانەی کە فەرەح لەگەڵ چاپکراوەکان وبنکە ڕۆشنبیریەکان دا هەیبوو لە دەرەوە, ئەو ریسوا بکات, وە بەو ناوبانگە باشەی کە فەرەح لە دونیادا بە دەستی هێنابوو, بڵاو کردنەوەی بابەتگەلێك لە زمانی ئەوە وە دژی (شا) برینێکی قوڵی ساڕێژ نەکراوی لە جەستەی (شا)دا دروست دەکرد.

فەرەح بە پەی بردن بەم خاڵە لاوازەی (شا), لە ساڵانی کۆتایی (شا)دا ڕوبەڕوی وەستایەوە, دەرباری تایبەتی خۆی گۆڕی بە ناوەندێکی ڕۆشنبیری چەپگەراکان و گوێی بە نیگەرانیەکانی (شا) لەبارەی چالاکیەکانی ئەوانەوە نەدا, لە ماوەی ئەو ساڵانەدا سەرجەمی هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و ناوەندە هەواڵیەکان, لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەوە بیگرە تا بڵاوکراوەکان بە شێوەیەکی پراکتیکی لە دەستی فەرەح و گروپە چەپگەراکانی ئەودا بوو: ڕادیۆ و تەلەفزیۆن بە دەسەڵاتی ڕەهاوە لە ژێر دەستی (ڕەزا قوتبی) کوڕەخاڵی (فەرەح)دا بوو کە جگە لە فەرەح فەرمانی لە هیچکەسەوە وەر نەدەگرت, بڵاو کراوەکانیش بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە ڕێگەی دیوانی تایبەتی (فەرەح)ەوە هاوکاری دەکران, هەواڵ و ڕاپۆرتەکانی تایبەت بە فەرەح لە پێش هەواڵ و ڕاپۆرتەکانی دیکەوە چاپ و بڵاو

دەکرانەوە, لە ماوەی ئەو ساڵانەدا ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و بڵاو کراوەکان گۆڕابوو بە ناوەندی ڕاستەقینەی چالاکی گروپە چەپگەراکان, هەروەکو دەزانین زۆرێك لە کارکەران و نوسەران و پەیامنێرانی ئەم ڕێکخراوانە لە هەمان قۆناغە سەرەتاییەکانی شۆڕشدا پەیوەندیان بە بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکانەوە کرد, هەڵبەت گروپە چەپگەراکان لەم ڕێکخراوانەدا کاریگەریان هەبوو وە ئامانجی جیاواز و هەندێك جاریش دژکارانە یان دەگرتە بەر لە بەرامبەر شۆڕشی ئیسلامی دا, هەر بەو بۆنەیەوە لە هەمان مانگە سەرەتاییەکانی سەرکەوتنی شۆڕشی ئیسلامی دا لە گۆڕەپانەکە وەدەر نران.

# شۆڕشی شاهانه!!!

جۆن کەندی ئەمینی دەسەپێنێت بە سەر (شا) دا!, کەنەدی و شۆڕشی سپی شاهانە, سەرۆك وەزیرانی ئەسەدوولاّی عەلەم, دەستپێکردنی ململانێ ئایەتوڵا خومەینی لەگەڵ حەمەڕەزاشا دا, ژنان لە پەرلەمان, دەستگیر کردن و دوور خستنەوەی ئایەتوڵا خومەینی, کوشتنی مەنسور و سەرۆك وەزیرانی ئەمیر عەباسی هوەیدا, نهێنی مانەوەی هوەیدا, دوووەمین هەوڵی کوشتنی شا, دیداری نهێنی شا و ئەو گەنجەی کە دەیویست بیکوژێت, شا و فراماسونری, داستانی نەوت و پێشەکیەکانی ڕوخانی ڕژێمی پەهلەوی.......,

شا بەر لە ئەوەی کە لە دەورانی حکومەتی (کارتەر)دا لە ساڵی ١٣٥٦ هەتاوی (کەش و هەوای سیاسەتی کراوە) ڕابگەیەنێت و زەمینە بۆ شۆڕسی ئیسلامی ساز بکات, لە ساڵی ١٣٤٠ هەتاوی دا کە (جۆن کەنەدی) تازەبەتازە گەیشتبوو بە پۆستی سەرۆکایەتی کۆماری ئەمریکا, لە ژێر فشاری ئەمریکیەکان دا ڕەوشێکی سیاسی باری ئاسایی دروست کرد, کە سەرەنجامەکەی بە دەستپێکردنی ئاڵۆزی سیاسی و خۆپیشاندانی مامۆستایان و ئاژاوە لە پەرلەمان و کۆتاییەکەی ڕوخانی حکومەتەکەی (شەریف ئیمامی) بوو, لە پشت سەری ئەو بزوتنەوانەوە (د. عەلی ئەمینی) باڵوێزی پێشوی ئێران لە ئەمریکا هەبوو, کە لە کاتی بەرپرسیارێتیەکانی خۆی لە ئەمریکا دا لەگەڵ (کەنەدی) دا کە لەو کاتانەدا سیناتۆری ویلایەتی ماساچۆستی ئەمریکا وکاندیدی بوون بە سەرۆك کۆماری ئەمریکا بوو, زەمینەی دۆستایەتی فەراهەم هێنابوو, ئەمینی دوای پێشکەشکردنی وتارێکی هەڵەشاوی وە لەوانەشە گرنگ لای ئەمریکا, دەربارەی پێویستی دابەشکردنی دەرامەتی دەستکەوتو لە سەرچاوەکانی

نەوتەوە لە نێوان سەرجەم وڵاتانی دوونیا دا, بانگ کرا بۆ ئەمریکا, بەڵام پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ دۆستە ئەمریکیەکانی دا بە تایبەت (کەنەدی) کە شانسی بوون بە سەرۆك کۆماری ئەمریکای هەبوو, پاراست, وە بە شێوەیەکی ڕێکەپێك و بەردەوام لەگەڵ کەنەدی دا نامەیان دەربارەی ئێران بۆ یەکتری دەنارد.

کەنەدی لە بانگەشەکانی هەڵبژاردنی خۆی دا و لە ژێر کاریگەری وتەکانی ئەمینی و ئەو زانیاریانەی کە لە ڕێگەی لایەنەکانی وابەستە بە (جەبهەی میللی)ەوە لە ئەمریکا پێی دەگەیشت, ڕەخنەی لە ڕژێمی (شا)ی ئێران دەگرت و جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە دەبێت ئەمریکا بە پەیوەندیەکانی خۆی دا بچێتەوە لەگەڵ ئەو ڕژێمانەی کە بنەماکانی دیموکراسی و مافی مرۆڤ ڕەچاو ناکەن, ئەم ڕەخنانەش بە شێوەیەکی ڕێکوپێك لەلایەن باڵوێزخانەی ئێرانەوە بە شێوەی ڕاپۆرت دەگەیەنرایە تاران, ئەمەش (شا)ی زۆر نیگەران کردوو بەناردنی هاوکاری دارایی زۆر بۆ سندووقی هەڵبژاردنی نیکسۆن (ڕکابەری کەنەدی لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٦٠ز ئەمریکا) کەوتە جڵەوگیری لە سەرکەوتنی (کەنەدی) لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی کۆماری ئەمریکا دا, لەگەڵ ئەوەی کە (کەنەدی) بەجیاوازیەکی کەمی سەرجەمی دەنگەکان بەرکابەرەکەی خریدا سەرکەوت, وە ڕاپۆرتەکانی تایبەت بە هاوکاریە داراییە نهێنیەکانی (شا) بۆ سندووقی هەڵبژاردنەکانی (نیکسۆن), زیاتر لە جاران کەنەدی لە بەرامبەر بە (شا) و ڕژێمی فەرمانڕەوای ئێران تووڕە و نیگەران کرد[1].

لە هەڵبژاردنەکانی خولی بیستەمی پەرلەمان دا, دوکتۆر ئەمینی یەکێك بوو لە کاندیدەکانی تاران و بەڕواڵەت دەیویست هاوشێوەی (د. موسەددەق) لە ڕێگەی ململانێکانی پەرلەمانەوە بگات بە پۆستی سەرۆك وەزیران, بەڵام ئەم ململانێیکانی لە

---

[1] دەربارەی چۆنیەتی هاوکاریەکانی (شا) بۆ نیکسۆن و بڕی ئەو هاوکاریانە, زانیاریەکی ورد و باوەڕپێکراو لە بەردەستدا نیە, بە ڕواڵەت ئەم هاوکاریە, کە بە وتەی نەیارەکانی (شا) لە ئەمریکا سەری بۆ ملیۆنان دۆلار کێشاوە, لە دەرامەتە نەوتیەکان دەدرا و لایەنی بەخشینیشی کراوە بە ناوێکی دیکەوە, د. ئەمینی کە پێش بونی بە سەرۆك وەزیران پەیوەنیەکی نزیکی لەگەڵ نوسەردا هەبوە, چەندین جار بە دڵنیاییەوە لەم بارەیەوە قسانی دەکرد و لەوانەشە هەواڵی هاوکاریە داراییەکانی (شا) بۆ سندووقی بانگەشەی هەڵبژاردنەکانی نیکسۆن لە ڕێگەی خودی نیکسۆنەوە بە (کەنەدی) گەیشتبوو.

یەکەمین دەوری هەڵبژاردنەکانی خولی بیستەم بە پوچەڵ کردنەوەی هەلبژاردنەکان کۆتایی هات و لە دەورەی دووەمیشدا بە دەستوەردانی ڕاستەوخۆی (شا) ڕێگری کرا لە چونی (ئەمینی) بۆ پەڕلەمان, دوکتۆر ئەمینی دوای شکست هێنای لە هەڵبژاردن دا بە ڕاشکاوی ئەوی بە خەوشدار ناوزەد دەکرد و بە دڵنیا بوون لە پشتیوانیەکانی ئەمریکا بەردەوام بوو لە ململانێکانێکانی, ئەمجارەیان لە نێو توێژە ناڕازیەکانی کۆمەڵگەدا بە تایبەت لە نێو پیشەوەران و بازاڕیان و مامۆستایان دا کەوتە جموجوڵ, یەکێك لە دۆستە نزیکەکانی ئەو لەم ململانێیەدا بریتی بوو لە (محەممەد درەخشش)ی سەرۆکی کۆمەڵەی مامۆستایان, کە بەهاوکاری ئەو زەمینەی بۆ خۆپیشاندانی مامۆستایان فەراهەم هێنا و ئەم ڕوداوە بە درێژی کە لە بەشی پێشودا هاتوە, بە ڕوخانی حکومەتی (شەریف ئیمامی) کۆتایی هات.

دوو ڕۆژ دوای دەستلەکار کێشانەوەی (شەرف ئیمامی), ڕۆژی ١٦ ئۆردیبەهەشتی ١٣٤٠ هەتاوی, (شا) دوکتۆر ئەمینی بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ ڕاسپارد, دیاریکردنی (د. ئەمینی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران بە تەواوی پێچەوانەی خواست و ویستی (شا) بوو, ئەمەش بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەنی ئەمریکیەکان بوو, دوواتر (شا) چەندین بار ئەم بابەتەی ڕاگەیاند کە لە ساڵی (١٣٤٠) بە پێچەوانەی ئارەزومەندی دەرونی خۆمەوە و لە ژێر فشاری ئەمریکیەکان دا (د. ئەمینی)م بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران هەڵبژاردووە, هەرچەندە ئاشکرا کردنی ئەم بابەتە لە زمانی خودی (شا)وە بەڵگەی لاوازی و وابەستەیی (شا)یە لە بەرامبەر ئەمریکیەکان دا, د. ئەمینی بە پشت بەستن بە پاڵپشتی کردنی (کەنەدی) و بەبێ هیچ مەرجێکی پێش وەخت ئامادە نەبوو بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, مەرجی یەکەمی هەڵوەشاندنەوەی خولی بیستەمی پەڕلەمان و مەرجی دووەم دەست واڵا کردنی ئەو بوو لە (ئەنجامدانی چاکسازی و بە گژداچونەوەی گەندەڵی), وە هەروەها سەرپشك کردنی لە دانانی وەزیرەکانی کابینەکەی دا و دەستگیر کردن و سزادانی هەندێك کەس و بەرپرسەکانی دەوڵەتی پێشو, (شا) دەیزانی کە هەناسەی ئەمینی لە شوێنێکی دیکەوە گەرم کراوە, وە لەکاتی پەسند نەکردنی مەرجەکانی ئەودا ڕوبەڕوی دژیەتیکردنی ئەمریکا دەبێتەوە, بۆیە سەرجەمی مەرجەکانی ئەمینی پەسەند کرد.

دوکتۆر ئەمینی لە دیاریکردنی ئەندامانی کابینەکەی دا, سەربەخۆیی بۆچونی خۆی لە بەرامبەر (شا)دا نیشان دا و جگە لە سپەهبەد (نەقدی) وەزیری جەنگ و (قدس نەخەعی) وەزیری دەرەوە کە بە بۆچونی (شا) دانران, سەرجەم وەوزیرەکانی دیکە دانراوی خودی ئەمینی بوون, کە سیان لەوانە بە تەواوی بە پێچەوانەی ڕەزامەندی (شا)وە دانران, ئەو سێ کەسەش بریتی بوون لە (نورەدین ئەلموتی)ی وەزیری داد کە ئەندامی گروپی ناسراو بە (٥٣) کەس و لە دامەزرێنەرانی (حیزبی تودە) بوو, ئەندازیار (فەریوەر)ی وەزیری پیشەسازی و کانزا کە لە لایەنگرانی (جەبهەی میللی) و (د.موسەددەق) هەژمار دەکرا, (حەسەن ئەرسنجابی) وەزیری کشتوکاڵ کە لە هاوڕاز و دۆستە نزیکەکانی (قەوام سەڵتەنە) بوو وە کاتێك کە ڕۆژنامەیەکی بە نێوی (داریا) دەردەکرد بابەتگەلێکی ڕەخنە ئامێزی دەربارەی (شا) و ڕژێمی سەڵتەنەتی نوسیبوو, ئەمینی دوای ناساندنی کابینەکەی بە (شا), فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی ڕاگەیاند, لەم فەرمانەدا کە بە مێژوی (١٩ ئۆردیبەهەشت ١٣٤٠)هەتاوی دەرکراوە, هاتبوو کە: (بەسەرنجدان لەو کارە گرنگەی کە دەستور لە پاراستنی مەشروتیەت و خۆشگوزەرانی و دڵخۆشی گەلی ئێران خستویەتیە ئەستۆی ئێمە, بە لەبەرچاو گرتنی پێویستی بڕیار دان و هەنگاو هەڵنان بۆ ئەنجامدانی زنجیرەیەك چاکسازی بنەڕتی و یەکلاکەرەوە لە سەرجەم لایەنەکانی وڵات دا..., لەم کاتەدا کە دەوڵەتێکی بە توانا و چاکسازی خوازمان بۆ ڕزگار کردنی وڵات لەم کێشانە پێکهێناوە و بڕوامان وایە کە نابێت هیچ جۆرە ڕێگرییەك ببێتە بەربەست لە بەردەم هەنگاوە بنەڕەتیەکان و چاکسازیەکانی دەوڵەت دا...,هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ئەنجومەنی سەنا ڕادەگەیەنین و بڕیار دەدەین کە دەوڵەت بە ئەنجامدانی چاکسازی لە یاسای هەڵبژاردنەکان هەنگاو بۆ دووبارە هەڵبژاردنەوەی پەرلەمان و ئەنجومەنی سەنا هەڵبگرێت)..., دەقی فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ئەنجومەنی سەنا کە تەنها چەند سەردێڕێکی بۆ نمونە هێنراوە, داڕێژراوی خودی (ئەمینی)یە, کە لە ڕاستیدا (شا) ناچار بە واژۆی ئەو دەقە کراوە و لەگەڵ ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ئەنجومەنی سەنا, دەسەلاتێکی لە ڕادەبەدەریش دەدات بە دەوڵەت.

لە ڕاستیدا (شا) بە دیاریکردنی (د. ئەمینی) بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی و ڕەزامەنی دەربڕین لە سەر مەرجەکانی لە نێوان خراپ و خراپتردا

(خراپ)ی هەڵبژارد, لەبەر ئەوە (شا) ترسی هەبوو بەڕازی نەبوون بە مەرجەکانی (ئەمینی) ئەمریکیەکان دەست بدەنە کودەتایەکی سەربازی لە دژی سەڵتەنەتی ئێران, سەفەری (تەیمور بەختیار)ی سەرۆکی (ساواك) بۆ ئەمریکا و دیداری لەگەڵ (کەنەدی)دا کە ئەم دیدارە لە بەرنامەی سەفەرەمەیدا نەبوو, زەنگێکی مەترسیداری دا بە گوێی (شا) دا, هەرچەندە (بەختیار) کەسی لەبەرچاوی ئەمریکیەکان نەبوو بۆ دەستدانە ئەنجام دانی کودەتا, بەختیار کە بەر لە هاتنە سەرکاری (ئەمینی) ئامادەیی خۆی بۆ جێبەجێکردنی بەرنامەکانی ئەمریکا لە ئێران دا دەربڕیبوو, دوای دانانی (ئەمینی)ش لە پۆستی سەرۆك وەزیرانی دا (بەختیار) دەستی لە بەرزفڕینی خۆی هەڵنەگرت و (شا) لە هەلێکی گونجاو دا لەسەر کار لای برد.

دەربارەی ئەم ڕوداوە (بابری ڕوبین) توێژەرو و نوسەری ناسراوی ئەمریکی زانیاری باوڕپێکراوی دەستکەوتوە و لە باسی ڕوداوەکانی ئەو سەردەمەدا دەنووسێت: (لە ڕوداوە جێی سەرنجەکانی سەرەتاکانی دەیەی (١٩٦٠ن) لە ئێران دا لەکار لابردنی (تەیمور بەختیار)بوو لە سەرۆکایەتی ڕێکخراوی (ساواك) و ڕاستەوخۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەو ڕێکخراوەیە لە لایەن خودی (شا)وە, تەیمور بەختیار کە لە پلەی سەرۆکایەتی ڕێکخراوی (ساواك)دا دەسەلأت و هێزێکی زۆری دەستکەوتبوو, لە ڕواڵەت دا بەهۆی جموجوڵ دژی حکومەتەکەی (ئەمینی) لەسەر کار لابرا, بەلأم کەنار خستنی ئەو هۆکار گەلێکی گرنگتر و قوڵتری هەبوو, ئەم بابەتە (کرمیت ڕۆزفێڵت) کارگێڕی کودەتای ساڵی (١٩٥٣ن)ی ئێران دژی (د. موسەددەق), لە چاوپێکەوتنێکی دا لەگەڵ نوسەری ئەم کتێبە (مەبەست باری ڕوبینە) لە (٢٠ مارس ١٩٨٠ن) ئاشکرای کرد, بە ختیار لە سەفەرێکی دا بۆ ئەمریکا پێش هاتنە سەرکاری ئەمینی, پۆشتوە بۆ سەردانی (ئالن دالاس) سەرۆکی ڕێکخراوی (سی ئای ئەی) و (کرمیت ڕۆزفێڵت) و داوای هاوکاری لە ئەوان کردووە بۆ ئەنجام دانی کودەتایەك دژی (شا)... بەختیار لەگەڵ ئەوەی کە لەسەرۆکایەتی (ساواك) لابرابوو بەلأم دەستی لە کارکردن دژی (شا) هەڵنەگرت, تا سەرەنجام بە دەستی سیخوڕەکانی ئەو ڕێکخراوەی کە خۆی دروستی کردبوو لە وڵاتی عێراق کوژرا.[1]

---

[1] باری روبین: جنگ قدرتها در ایران, ت.محمود طلوعی, ص ٩٤.

له یەکەم وتاری دا دوای جێگیر بوونی له پۆستی سەرۆك وەزیران, (ئەمینی) بە توندی هێرشی کردە سەر دەوڵەتەکانی پێشتر و ئەوانی بە بەرپرسی ئیفلاس کردن و شکست هێنانی بوواری ئابووری ولاتەکەی دانا, هەربۆیە فەرمانی دەستگیر کردنی ژمارەیەك له بەرپرسەکانی پێشو دەرکرد, (د. ئیقبال)ی سەرۆك وەزیرانی پێشو بەر له گرتنی ولاتی بەجێهێشت, له نێو ئەو کەسانەی کە دەستگیر کران و خزێنرانە زیندانەوە, (زرغام) وەزیری پێشوی دارایی و (ئیبتهاج) سەرۆکی پێشوی ڕێکخراوی بەرنامە و سپەهبەد (عەلەوی موقەدەم) وەزیری پێشوی ناوخۆ و سپەهبەد (حاج عەلی کیا) سەرۆکی پێشوی کەتیبەی دوو ی لەشکر بوون, دەستگیر کراوەکان ژمارەیەك له بازاریەکانی وەك (مەهدی ئیبراهیمی دریانی) بازرگانی ناسراوی چاییشی تێدا دەبینرا, به بێ دادگایی کردن له زیندان دا مانەوە و کەمتەرخەمی دەوڵەت و دوواخستنی دادگایی کردی ئەوانە خەڵکی توشی گومان کرد له بەرامبەر بانگەشەکانی دەوڵەت بۆ بەگژدا چونەوەی گەندەڵی و ئەنجام دانی چاکسازی ڕیشەیی له ولاتدا. نوسەر (محمود طلوعی) له کۆتایی شەشەمین مانگی حکومەتەکەی ئەمینی دا هەڵسەنگاندنێکم بۆ شەش مانگی حکومەتەکەی ئەمینی بەم شێوەیەی خوارەوە نوسی و له گۆڤاری (خواندنیها)دا بلاو کردەوە: (دەتوانین حکومەتە شەش مانگیەکەی ئاغای (ئەمینی) بۆ سێ سەردەم دابەش بکەین: دەورەی یەکەمی ئەم حکومەتە هەمان یەك مانگی یەکەمی بوو, کە به گەرم وگوڕییەکی زۆرەوە دەستی پێکرد, له نێو خەڵکی تینوی گۆڕانکاری دا ئەنجام دانی چاکسازی و ئومێد گەلێك و چاوەڕوانی زۆری هێنایە بوون, دەورەی دوەمی حکومەتەکەی (ئەمینی), دوومانگی دووەم و سێیەمی سەرۆکایەتی ئەو بوو, کە دەتوانین بە دەورانی دەبەنگی و چاوەڕوانی ناوی ببەین, لەبەر ئەوەی هێشتا کاریگەری هەنگاوە ئومێد بەخشەکانی مانگی یەکەمی سەرۆکایەتی ئەمینی لە بیری خەڵکی دا مابوویەوە و بەڵێنەکانی د. ئەمینی دەربارەی بەردەوامی هەنگاوەکانی چاکسازی و زەمینە سازی بۆ ئەنجام دانی هەڵبژاردنێکی ئازاد له مێشکی خەلك دا مابوویەوە, بەلام دەورەی سێیەمی حکومەتەکەی ئەمینی, کە سێ مانگی کۆتایی دەگرێتەوە, دەورەیەکە کە نە شوێنەواری هەنگاوە گەشاوەکانی مانگی یەکەم دەبینرێت و نە بەڵێنە فریو دەرەکانی دوو مانگی دوواتر خەڵك ئومێدەوار دەکات تا باوەڕی پێ بکرێت.., هەڵبەتە

ئەمریکیەکان لەگەڵ هەبوونی ئەو ناڕزایی و دژایەتیە توندەی خەڵك لە نێوخۆی وڵات دا کە ڕۆژلە دوای ڕۆژ بەرامبەر (د. ئەمینی) توندتر دەبێت, هێشتا پاڵپشتێکی سەرسەختی ئەم دەوڵەتەیە, حکومەتی بەریتانیاش نایەوێت لەم ڕەوشەی ئێستادا ڕوبەڕوی سیاسەتی ئەمریکا بووەستێتەوە لە ڕۆژهەلأتی ناوەڕاست دا و ڕێگەیەکی تەنیا و سەربەخۆ بگرێتە بەر..)[1].

دەربارەی کاتەکانی دیکەی حکومەتەکەی (د. ئەمینی) کە سەرجەمی چواردە مانگ درێژەی کێشا, (باری روبین)ی توێژەر و نوسەری ئەمریکی بەم شێوەیە دەنووسێت: (دوای دیاریکردنی د. ئەمینی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, (شا)ك کە ترسێکی زۆری لە پەیوەندیە نزیکەکانی ئەو لەگەڵ ئەمریکا دا هەبوو, خۆی کەوتە بیری دروستکردنی پەیوەندیەکی نزیك لەگەڵ سەرۆکی نوێی ئەمریکا و لە سەفەرێکی دا بۆ واشنگتۆن ئامادەیی خۆی بۆ ئەنجام دانی چاکسازی بە دڵی ئەمریکیەکان نیشان دا, (جۆن کەنەدی) داوای لە (شا) کرد کەبەشێك لە خەرجیە سەربازیەکانی وڵاتەکەی بۆ چارەسەر کردنی ڕەوشی دارایی وڵاتەکەی خەرج بکات و لە شکرە (٢٤٠٠٠٠) کەسیەکەی لە ماوەی خولێکی (٢ تا ٣) ساڵیدا بۆ (١٥٠٠٠٠) کەس کەم بکاتەوە, پەسەند کردنی ئەم پێشنیارە بۆ (شا) زۆر دژوار بوو, بەلأم بەڕواڵەت ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر چاوخشاندنەوە بە لەشکر و کەم کردنەوەی خەرجیە سەربازیەکانی بۆ ئەوەی لە هەلێکی گونجاودا و لە ژێر باری ئەم بەڵێنەدا شانەی خاڵی بکاتەوە و کاری خۆی بکات.

لە دەستپێکی دووەمین ساڵی سەرۆکایەتی ئەمینی دا, (شا) زەمینەی دوورخستنەوەی ئەوی فەراهەم هێنابوو, سەرەنجام لە مانگی (ژوئیەی ١٩٦٢ز, تیری ١٣٤١هەتاوی) ئەوی لەسەر تەختی شانۆ وەدەر نا, ئەمینی دوای شکست هێنان و لەکار خستنی وای دەزانی ڕوبەڕوی پشت لێکردنی واشنگتۆن و خۆلادانی ئەمریکا لە پێدانی هاوکاریە ئابووری و داراییەکان بە حکومەتەکەی ئەو بووەتەوە, بەلأم ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە (شا) لەبارەی (ئەمینی)ەوە بۆچونێکی باشی نەبوو وە واشنگتۆن یش نەیدەتوانی ئەمینی لە بەرامبەر (شا) دا بپارێزێت, (شا) لەکاتی

---

[1] خواندنیها: شماره ١٤ سال بیست و دوم, سه شنبه ١٦ ابان ١٣٤٠.

لادانی ئەمینی دا پڕۆژە یاسای خۆی بۆ ئەنجام دانی (ڕیفۆرم لە سەرەوە) کە چاکسازی لە بوواری زەویشدا بەشێك بوو لە پڕۆژە یاساکە، ئامادە کردبوو، ئەم پڕۆژە یاسایە کە دوواتر بە سەروسەدایەکی زۆرەوە ڕاگەیەندرا بە (شۆڕشی سپی) ناوبانگی دەرکرد..)[1].

دوکتۆر ئەمینی ڕۆژی (٢٧ تیر ١٣٤١) هەتاوی دەستی لەکار کێشایەوە، ڕۆژی دوواتر (شا) (ئەمیر ئەسەدوولای عەلەم)ی ڕاسپارد بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ، لە نێو هاوکارە نزیکەکانی ئەمینی دا (حەسەن ئەرسنجابی) وەزیری کشتوکاڵ و (ئەحمەد نەفیسی) سەرۆکیشارەوانی تاران لە پۆستەکانی خۆیان دا مانەوە، (شا) حەسەن ئەرسنجابی کە لە کابینەی پێشوی ئەمینی دا هەڵایەکی زۆری لە بارەی بەرنامەی چاکسازی زەوی نایەوە و سەرنجی ئەمریکیەکانی بۆلای خۆی ڕاکێشابوو بە پێویست دەزانی بۆ جێبەجێکردنی پڕۆژەیاسای (شۆڕشی سپی)، (ئەحمەد نەفیس)ی سەرۆك شارەوانی تارانیش کە لە ماوەیەکی کورتی وەرگرتنی ئەو پۆستەیدا جموجوڵێکی زۆری لە شارەوانی دا دروستکردبوو، بۆ جێبەجێکردنی بەرنامە چاکسازیەکانی (مردمی/خەڵکی) و (انقلابی / شۆڕشی) شا، بەسودمەند دەهاتە پێش چاو، لە ڕوخسارە تازەکانی نێو کابینەکەی (عەلەم)، (د. خانلری) بەڕێوەبەری گۆڤاری (سخن / ووتار) بوو، کە لەشوێنی (درەخشش)ی وەزیری جەنجاڵی فەرهەنگی د.ئەمینی وکارگێڕی مانگرتنەکانی مامۆستایان، وەك وەزیری (فەرهەنگ/ ڕۆشنبیری) دیاریکرا و بە ڕواڵەت سەرنجێکی باشی بەکابینەکەی (عەلەم) دا.

لەمانگی شەهریوەردا (لیندوون جانسون) جێگری سەرۆکی ئەمریکا سەردانی ئێرانی کرد و جەختی لەسەر جێبەجێکردنی بەرنامەکانی (شۆڕشی سپی) کردەوە، بە ڕواڵەت یەکێك لەم بەرنامانەی (شۆڕش) کە دەبوو بە پێی بەدوواداچونەکان بۆ بەرنامەی چاکسازیەکانی زەوی جێبەجێ بکرێت، پێکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگاکان و پارێزگارێك بە دەسەڵاتی فراوان و نوێ وە بوو، حکومەتەکەی (عەلەم) پڕۆژەیاسایەکی دەربارەی پیکهێنانی ئەنجومەنی پارێزگاکان و پارێزگار لە

---

[1] جنگ قدرتها در ایران . ص ٩٤ – ٩٥.

پەرلەماندا پەسەند کرد کە بە پێی ئەو پرۆژە یاسایە پێوەری ئیسلام لە مەرجەکانی دەنگ دەران و دەنگ بۆ دراوان سڕاوەتەوە و مافی بەژنانیش دابوو کە دەنگ بدەن و ببنە ئەندامی ئەنجومەنی پارێزگاکان, خاڵێکی دیکە لەم پرۆژەیاسایەدا گۆڕینی سوێند خواردن بوو بە قورئان بۆ ئەندامە هەڵبژێردراوەکانی ئەنجومەنەکان بە سوێند خواردن بە (کتێبە ئاسمانیەکان), کە بەگشتی سەرەتای زەمینە سازی گۆڕینی کۆمەڵگەی ئێرانی بوو بۆ کۆمەڵگەیەکی (لائیك)[1]ی یان کۆمەڵگەیەکی نا ئاینی فەراهەم دەهێنا, وە دەیتوانی زەمینەسازی دووبارەبوونەوەی ئەم ئەزمونە بێت لە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمانیشدا.

ئایەتوڵا خومەینی یەکەمین کەسێك بوو کە پەی بە مەترسیەکانی جێبەجێکردنی ئەم پرۆژە یاسایە و پێشهاتەکانی برد و هوشیاری دا بە زانایانی ئاینی شاری قوم ململانێیەکی بەردەوامی لەگەڵ ئەم بەرنامەیەدا دەست پێکرد, یەکەمین تەلگرافی ئایەتوڵا خومەینی دەربارەی ئەم پرۆژە یاسایە بۆ (شا) نێردرا, دەقی ئەو تەلگرافە کە بە مێژوی (١٧ میهر ١٣٤١)هەتاوی نێردراوە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

*بسم الله الرحمن الرحیم*

*بۆ خزمەتی پیرۆزی خاوەن شکۆی پایەبەرز*

*دوای پێشکەشکردنی سڵاو و نزای خێر, بەو شێوەیەی کە لە ڕۆژنامەکان دا بڵاو کراوەتەوە لە بارەی ئەنجومەنی پارێزگاکان و پارێزگارەکانەوە, ئیسلام نەکراوەتە مەرج بۆ دەنگدەران و دەنگ پێدەران و مافی دەنگدانیش دراوە بە ژنان, ئەم بابەتەش مایەی نیگەرانی زانایانی پایە بەرز و سەرجەم موسڵمانی دیکەیە, لای خاوەن شکۆ ڕون و ئاشکرایە کە بەرژەوەندی مەملەکەت و ئارامشی دڵەکان لە پاراستنی فەرمانەکانی دینی موبینی ئیسلام دایە, داوادەکە م فەرمان بدەن کە ئەو بابەتانەی پێچەوانەی ئاینی ئیسلامی پیرۆز و مەزهەبی فەڕمی وڵاتە, لە بەرنامە دەوڵەتی و*

---

[1] Laic یان Laique بە واتای نائاینی یان نا ڕوحانی دێت, وە بە شێوەی ئەو دەوڵەتانە ڕەها دەبێت کە ئاین و سیاسەتیان لێك جودا کردۆتەوە و ئاینێکی فەڕمی یان نیە.

حیزبیەکان دا بسرێتەوە تا ببێتە هۆی وەڵامدانەوەی نزا و پاڕانەوەکانی گەلی موسڵمان.

الداعی روح الله الموسوی:[1]

شا بروسکەکەی (ئایەتوڵا خومەینی) دەنێرێت بۆ دەوڵەت و بە بروسکەیەکیش وەڵامێکی نهێنی بۆ (ئایەتوڵا خومەینی) دەنێرێت، بەڵام (عەلەم) بەبێ گوێدان بە هوشیاری دانەکانی (ئایەتوڵا خومەینی) و سەرجەم زانایانی ئاینی دیکە، پەیڕەوی لە بەرنامەکانی خۆی دەکات، سەرەنجام (ئایەتوڵا خومەینی) لە بروسکەیەکی دیکەی دا بۆ (شا) دەنووسێت:

(بروسکەکە پشت ئەستورە بەوەی کە خاوەن شکۆ لەهەموان زیاتر تێدەکۆشن بۆ پاراستنی دروشمە مەزهەبییەکان، تەلگرافەکەی بەندەت نارد بۆ دەوڵەت و سەرکەوتنی بەندەت خواستوە بۆ برەودان و گەشانەوەی بنەما و بڕیارەکانی ئیسلام و ڕێ نیشاندەری خەڵك بەگشتی، جێگای ڕێز و قەدر زانینە، هەڵبەتە گەلی موسڵمانی ئێران هەر ئەوە لە خاوەن شکۆ چاوەڕێ دەکەن...، مەخابن لەگەڵ ئەوەی کە ئاغای عەلەمم ئاگادار کردۆتەوە لەو داهێنانانەی کە دەیەوێت بیان خزێنێتە نێو ئیسلام و گەنکاریەکانیم بە گوێیدا دایەوە، ئەو نە گەردنی بۆ پەروەردگاری بە توانا کەچ کرد و نە گوێی بە دەستور داوە و نە فەرمانی شاهانەشی جێبەجێکردووە و نە ئامۆژگاریەکانی زانایانی ئیسلامی گرتوەتە گوێ...،

بەندە بە هۆی خێر ویستیم بۆ گەلی موسڵمان، خاوەن شکۆ ئاگادار دەکەمەوە لەوەی کە لێنەگەڕێن کەسانێك بە ماستاوکردن و دەربڕینی خزمەتکاری و لانەوازی دەیانەوێت سەرجەم کارەکان پێچەوانەی دین و دەستور بکەن و بیدەنە پاڵ خاوەن شکۆ، وە دەستوریش کە پارێزەری بنەما نیشتیمانی و سەڵتەنەتییەکانە تێکەڵ بە پەسەند کراوی پڕۆژە یاسای

[1] صحیفه نور: سازمان مدارك فرهنگی انقلاب اسلامی، جلد اول، ص ٣٧.

*ناپاكانە و دەقی هەڵە بكەن، بۆ ئەوەی پیلانی شومی دووژمنانی گەل و ئیسلام جێبەجێ بكەن..)*[1].

ئایەتوڵا خومەینی چەند بروسكەیەكی توندی دیكەشی بۆ خودی عەلەم نارد، سەرەنجام بە هەوڵی بەردەوام و بەدووادا چونی (ئایەتوڵا خومەینی) و هەڵوێستی دەستەجەمعی زانایانی قوم، دەوڵەت لە (ئازەر ١٣٤٢) هەتاوی دا پرۆژە یاسای تایبەت بە ئەنجومەنی پارێزگاكان و پارێزگارەكانی هەڵوەشاندەوە، بەڵام هێشتا مانگێك بەسەر ئەو ڕوداوەدا تێنەپەڕیبوو كە ئاوازی (شۆڕشی سپی) شا دەنگی دایەوە و (شا) لە ڕۆژی (١٩ دی ١٣٤١)هەتاوی دا كۆنگرەیەكی بە ئامادە بوونی نزیكەی سێ هەزار كەس لە نوێنەرانی جوتیاران و چینە جیاوازەكان لە تاران بەسترابوو، بنەما شەش خاڵیەكەی (شۆڕشی سپی) خۆی ڕاگەیاند و خستیە ڕیفراندۆم (دەنگدانی گشتی)ەوە.[2]

ئایەتوڵا خومەینی دەستورە شەش خاڵیەكەو ئەنجام دانی ڕیفراندۆم بۆ پەسەند كردنی كە ڕۆژی (٦ بەهمەن ١٣٣١) بۆ دانرابوو حەرام كرد و لە تاران و شارەكانی دیكەش دا چەندین خۆپیشاندان لە دژی ڕیفراندۆم و دستورە پێشنیار كراوەكەی (شا) ئەنجام درا.

ڕیفراندۆمەكەی (شا) لە ڕەوشێكی ئاڵۆزدا ئەنجام درا، ئەنجامی ڕیفراندۆمەكەش بە (٥٥٩٨٧١١) دەنگی بەڵێ لە بەرامبەر (٤١١٥) دەنگی نەخێر دا ڕاگەیەندرا!!، یەكەمین بروسكەی پیرۆزبایی دوای ڕاگەیاندنی ئەم (سەركەوتنە گەورە شاهانەییە) لەلایەن (جۆن كەنەدی) سەرۆك كۆماری ئەمریكاوە گەیشتە شاری تاران، (شا) لە وەڵامی (كەنەدی) دا و بە جەختكردنەوە لە سەر ئەوەی كە پێشنیاری

---

[1] صحیفه نور: سازمان مدارك فرهنگی انقلاب اسلامی، جلد اول، ص ٣٥ – ٣٦.

[2] بنەما شەش خاڵیەكەی شۆڕشی سپی شا بریتی بون لە: ١– هەڵوەشاندنەوە سیستەمی دەرەبەگی و خزمەتكاری، لەگەڵ پەسەند كردنی چاكسازی زەوی وزار. ٢– خۆماڵیكردنی جەنگەڵەكان. ٣– فرۆشتنی پشكی كارخانە دەوڵەتیەكان بە مەبەستی پشتوانی كردنی چاكسازی زەوی و زار. ٤– بەشدانی كرێكارەكان لە قازانجی كارخانەكان. ٥– هەموار كردنەوەی یاسای هەڵبژاردنەكان. ٦– دامەزراندنی سوپای زانست.

(چاکسازی ڕیشەیی)ەکەی ئەو بە زۆرینەی نزیکەی سەرجەمی دەنگەکان لەلایەن خەڵکەوە پشتگیری لێ دەکرێت نوسی: (گومانم نیە کە ئێمە لە جێبەجێکردنی پرۆژەیاسا کۆمەڵایەتی و داراییەکانی خۆمان دا دەتوانین باوەڕمان بە نیەت پاکی دۆستە ئەمریکیەکانی خۆمان هەبێت..).

ناکۆکی پیاوانی ئاینی لەگەڵ ڕیفرانۆمەکەی (شا)، کەبە نایاسایی و بێبایەخ ناوزەدیان دەرکرد بەردەوامی کێشا تا ئەوەی کە (شا) مانگێك دوای ڕاگەیاندنی دەرئەنجامی ڕیفراندۆم، لە جوڵانەوەیەکی دا کە زیاتر لایەنی لەچبازی و ڕقابەری لەگەڵ پیاوانی ئاینی دا هەبوو، پێویستی بەشداریکردنی ژنانی لە هەڵبژادنی ئایندەی پەڕلەمان و ئەنجومەنی سەنا دا ڕاگەیاند، وە هەیئەتی دەوڵەتیش ڕۆژی(٩ ئەسفەند ١٣٤١)هەتاوی بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی (شا) بە دەنگی دا لەسەر بەشداریکردنی ژنان لە هەڵبژاردنی ئایندەدا داو بە فەڕمی ڕایگەیاند، ڕووحانیەکانی چینی یەکەمی (قوم) بە دەرکردنی ڕاگەیەندراوێك دیسانەوە ئەم بڕیارەی دەوڵەتیان بە (پێی شەرع بێبایەخ و بە پێی دەستور هەڵوەشاوە) لە قەڵەم دا.

دوو هەفتە دوای بڵاو بوونەوەی ئەم ڕاگەیەندراوە، (شا) کە بە پشتیوانی بەردەوامی ئەمریکیەکان لە بەرنامەکەی بڕوابەخۆبوونێکی زیاتری پەیدا کردبوو، بە ئاوازێکی وردەوردە توندتر و کوشندەتر لە وتارەکەی خۆی لە شاری (قوم) هێرشی کردە سەر ڕوحانیەکان و ئەوانی بە ئاژەڵانێك چواندکە لە پیسایی خۆیاندا خۆیان دەگەوزێنن، (ئایەتوڵا خومەینی) لە وەڵامی (شا) دا بەدەرکردنی ڕاگەیەندراوێك بە ناونیشانی (ئەمساڵ ر ۆحانیەکانی ئیسلام جەژنیان نیە) نەورۆزی ساڵی ١٣٤٢هەتاوی بە پرسەی گشتی ڕاگەیاند، بەشێکی دیکەی ڕۆحانیەکانی تریش لە ڕاگەیاندنی پرسەدا پەیوەندییان کرد بە (ئایەتوڵا خومەینی)ەوە.

لە ڕێو ڕەسمی پێ نانە ساڵی نوێدا بۆ یەکەمجار لە شاری قوم خۆپیشاندان لە دژی ڕژێم و خودی (شا) ئەنجام درا، ڕۆژی دووەمی فەروەردین دەوڵەت بەناردنی هێزێکی کۆماندۆیی بۆ قوم، گردبوونەوەی خۆپیشاندەران و مەجلیسی پرسەگێرانی کە بڕیار بوو لە هەمان ڕۆژدا بەڕێوە بچێت، بڵاوە پێکرد، لە ئەنجامی هێرشیکۆماندۆکان بۆ سەر قوتابخانەی (فەیزییە) ژمارەیەك لە قوتابیان و پیاوانی ئاینی کوژران وبریندار بوون.

شا ڕۆژی شەشی خوردادی ساڵی ١٣٤٢ هەتاوی کە هاوکات بوو بە دەیەی یەکەمی مانگی موحەڕڕەمی ساڵی ١٣١٣ کۆچی لە وتارێکی دا کە لە شاری کرمان پێشکەشی کرد, جارێکی دیکە بە وشەی توند و سوکایەتی ئامێز هێرشی کردە سەر نەیارەکانی بنەماکانی (شۆڕشی سپی) و ڕۆحانیەکانی بە دز و تاڵنچی ناو برد و وتی: (ئەوانە یان دزی ڕۆحین یان کەسانی پیسی بیر خراپ و بەد خوون, کە هەر لە بنەڕەتدا دژی هەمو هەنگاوێکی بەسود و باشن..., ئەوانە لە خۆتان دوور بخەنەوە و بە ڕاستی وەکو ئاژەڵێکی پیس ڕێگەی نزیك بوونەوە لە خۆتانیان پێ مەدەن!!..), ئایەتولاّ خومەینی لە وەلاّمی ئەم وتارەی (شا) دا, لە یەکێك لە توندترین هێرشەکانی خۆی بۆ سەر ڕژێم و (شا), لە ڕۆژی عاشورا (١٣ خورداد ١٣٤٢)هەتاوی دوای پێشکەشکردنی پێشەکیەك دەربارەی ڕیفراندۆم و کارەساتی (فەیزییە) وتی:

*(ئەی ئاغای شا...! ئەی جەنابی شا! من ئامۆژگاری تۆ دەکەم, واز لەم کارانە بێنە, ئاغا خەریکە تۆ بێئاگا دەکەن, من حەز ناکەم کە ڕۆژێك ئەگەر بیانەوێت تۆ بڕۆیت هەموان سوپاسگوزاری بکەن....,*

*ئەوەندە یاری بە گەل مەکە, ئەوەندە دژایەتی ڕۆحانیەکان مەکە..., ئەگەر مایکرۆفۆن دەدەنە دەستت و دەڵێن قسان بکە, بیر لە دەوروبەرەکەی بکەرەوە, بۆچی لە خۆتەوە و بەبێ بیر کردنەوە ئەم قسانە دەکەیت؟!, ئایا ڕۆحانیەتی ئیسلام, ئایا ڕۆحانیەکانی ئیسلام, ئەوانە ئاژەلاّنی پیسن..؟!..., ئەگەر ئەوانە ئاژەڵی پیسن ئەی بۆچی ئەم گەلە دەستی ئەوانە ماچ دەکات؟!, دەستی ئاژەڵی پیس ماچ دەکەن؟ خودا بکات کە مەبەستت ئەوانە نەبێت, خودا بکات کە مەبەستت لەوەی کە دوواکەوتوانی ڕەش وەکو ئاژەڵی پیسن و دەبێت گەل دوور بکەوێتەوە لێیان, زانایانی ئاینی نەبێت, وە گەر نا کاری ئێمە سەخت دەبێت و کاری تۆش سەخت دەبێت, ناتوانی بژیت, گەل ڕێگە نادات بژیت, ئەم کارانە مەکە, ئامۆژگاریەکانم ببیستە, تۆزێك بیر بکەرەوە, تۆزێك ورد ببەرەوە, تۆزێك تێبینی سەرەنجامی ئەم کارانە بکە, تۆزێك پەند وەربگرە, پەند لە باوکت وەربگرە../.*

*ئاغا.. کارێك بکە کە بەم شێوەیە نەبێت, خەریکە هەمو شتێك دەخەنە ئەستۆی تۆ, بێچارە,,,نازانی,,؟ ئەو ڕۆژەی کە دەنگێك بەرز دەبێتەوە یەك*

*نەفەر لە ئەوانەی کە هاورِیّ و دۆستی تۆن, ناتناسن, ئەوانە هەمویان هاورِیی دۆلارِن..!, ئەوانە دینیان نییە,, ئەوانە وەفاشیان نییە,ا ,.*

**وتارەکەی (ئایەتولاّ خومەینی) کە لە رِۆژی عاشورا دا پێشکەشەیکرد رِۆژی دوواتر گەیشتەوە بە (شا) و ئەوی زۆر بە توندی تورِە کرد, فەرمانی دەستگیر کردنی (ئایەتولاّ)ی دەرکرد و سەعات (٤)ی بەیانی رِۆژی (١٥ خورداد ١٣٤٢)هەتاوی لە ماڵەکەی خۆیدا لە شاری قوم (ئایەتولاّ خومەینی) دەستگیر کرا و بەو شەو گەیەنرایە تاران, شەو هەواڵی دەستگیر کردنی ئایەتولاّ بلاّو بوویەوە و خۆپیشاندان لە گزنگی هەمان رِۆژدا لە شاری قوم دەستی پێکرد و دوواتریش نارِزاییەکان گەیشتە تاران, فراوانی خۆپیشاندانەکان لە تاران دا (شا)ی زۆر ترساندبوو, بەلاّم (عەلەم) ئەوی هاندا بۆ نواندنی هەڵوێستی توند و بەو دەسەلاّتەی کە لە (شا) وە وەریگرت هێزە سەربازیەکانی گەیاندە مەیدانەکان و خۆپیشاندەرانی بە توندی و رِژانی خوێن سەرکوتکرد.**

**دوای سەرکوتکردنی رِاپەرِینەکەی (١٥ی خورداد), کە دەستگیر کردنی ژمارەیەکی زۆری رِۆحانیەکانی بەدووادا هات, (شا) بە زاتێکی زیاترەوە کەوتە جێبەجێکردنی بەرنامەکانی خۆی و لە هاوینی (١٣٤٢)هەتاوی دا بە بەستنی کۆنگرەیەك بە ناوی (کۆنگرەی ئازادی ژنان و ئازادی پیاوان) شێوەیەکی نوێی بە هەڵبژاردنی پەرِلەمان بەخشی, ئەم کۆنگرە کاندیدە کانی هەڵبژاردنی خولی بیست و یەکەمی پەرِلەمانی رِاگەیاند کە بۆ یەکەم جار بوو ناوی ژن لە نێو کاندید کراوەکان دا هەبێت, نزیکەی زۆرینەیان بەهۆی ئەم کاندیدانەوە لە سندووقەکان هاتنە دەرەوە, یەکێك لە کارگێرِانی کۆنگرەی ئازادی ژنان و ئازادی پیاوان حەسەنعەلی مەنسوری کورِی رِەجەبعەلی مەنسور (لە سەرۆك وەزیرەکانی سەردەمی رِەزا شا و سەرەتاکانی سەڵتەنەتی حەمە رِەزاشا, کە زیاتر بە ناوی عەلی مەنسور ناوبانگی پەیدا کردبوو), کە رِێبەری دەستەیەکی بە نێوی (کانون مترقی) لەئەستۆ بوو, ئەم گروپە زیاتر لە خاوەن برِوانامەکانی ئەورووپا و ئەمریکا پێکهاتبوو وە مایەی گرنگی پێدانی ئەمریکیەکان بوو, ئامادە بوونی نزیکەی (٤٠)کەس لە کاندیدەکانی ئەم گروپە لە نێو خولی بیست**

---

[1] صحیفه نور: سازمان مدارك فرهنگی انقلاب اسلامی, جلد اول, ص ٩٢ – ٩٤.

و یەکەمی پەرلەمان دا بە باشی دەسەلاتی ئەمریکیەکانیان لە نێو پەرلەمان دا نیشان دەدا, (حەسەنعەلی مەنسور ڕاستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ (یاتسویچ)ی سەرۆکی تۆڕی (سی ئای ئەی) لە ئێران دا هەبوو کە لە کاری دیبلۆماسی دا سەرەتا لە ژێر ناوی بەڕێوەبەری یەکەمی باڵوێزخانە و دوواتر وەك وەزیری موختاری ئەمریکا لە ئێران دا چالاکی دەکرد, وە هەر ئەویش بوو کە زەمینەی کە زەمینەی بوون بە سەرۆك وەزیرانی (حەسەنعەلی مەنسور) لە واشنگتۆن فەراهەم هێنا.

کاتێك کە خولی (٢١)ەمی پەرلەمان کرایەوە, هێشتا زەمینە بۆ جڵەو گرتنە دەستی مەنسور ڕێك نەخرابوو, هەربۆیە دووبارە (عەلەم) ڕاسپێردرا بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێ, بەڵام (حەسەن ئەرسنجابی) وەزیری کشتوکاڵ و کارگێڕی بەرنامەی چاکسازی زەوی و زاری خستە لاوە, دوومانگ دوواتر, لە (ئازەری ١٣٤٢)دا (ئەحمەد نەفیسی) سەرۆك شارەوانی تاران و سەرۆکی کۆنگرەی (ئازادی ژنان و ئازادی پیاوان) یش لەسەر کار لادرا و دەستگیر کرا, دەربارەی هۆکاری لەکار خستن و دەستگیر کردنی (نەفیسی) دەنگوباسی زۆر لەو کاتانەدا کەوتە سەر زمان, لەوانە پەیوەندی نزیکی ئەو لەگەڵ ئەمریکیەکان دا بوو, لەکاتێکدا کە بابەتەکە بە تەواوی پێچەوانە بوو, نەفیسی ئامادەی هاوکاری کردن نەبوو لەگەڵ گروپەکەی (مەنسور)دا کە لەلایەن ئەمریکاوە پشتیوانی دەکرا, هەر بەو بۆنەیەوە لە تەواوی ماوەی سەرۆك وەزیرانی (مەنسور)یشدا لە زیندان مایەوە, ئەڵبەتە تاکڕەوی نەفیسی و گوێ نەدانی ئەو بە (عەلەم) و ئەو ڕاپۆرتانەی کە (عەلەم) لە دژی ئەو دەیدا بە (شا), هۆکاری بنەڕەتی دڵپیسیەکانی (شا)بوو لەو وە (مەنسور)یش کە ئەوی بە بەهێزترین ڕکابەری خۆی دەزانی هیچ هەنگاوێکی بۆ ئازاد کردنی هەڵنەهێنا.

لەکۆتاییەکانی مانگی (ئازەر ١٣٤٢)هەتاوی دا لەناکاو (حەسەنعەلی مەنسور) حیزبی (ایران نوین/ ئێرانی نوێ)ی ڕاگەیاند و لە ماوەی یەك مانگ دا زۆربەی ئەندمانی پەرلەمان پەیوەندیان پێوە کرد, ڕۆژی (١٧ ئەسفەند) (شا) عەلەم و مەنسوری بۆ لای خۆی بانگ کرد, داوای دەستلەکار کێشانەوەی لە (عەلەم) کرد, (شا) دەستلەکار کێشانەوە ناچارکراوەکەی ئەوی بەو پەڕی ڕێزگرتن لەخزمەتەکانی پەسەند کرد و (مەنسور) وەك ڕێبەری حیزبی زۆرینە ڕاسپێردرا بۆ پێکهینانی کابینەی حکومەت. کاتێك کە (مەنسور) بوو بە سەرۆك وەزیران, ئایەتوڵا (خومەینی)

**لە زیندان ئازاد کراوە بەڵام لە ماڵی یەکێك لە بازرگانەکانی تاران بە نێوی (روغەنی) لە ژێر چاودێری دا بوو، لە ڕۆژانی جەژنی ساڵی ١٣٤٣ دا (د. صدر)ی وەیری داد ی کابینەکەی (مەنسور) ڕۆیشت بۆ سەردانی و دڵدانەوەی کرد، دوواتر (مەنسور) وتارێکی لە بارەی بڵندی پلەو پایەی ڕۆحانیەتەوە پێشکەشکرد و سەرەنجام ڕۆژی (١٧ فەروەردین ١٣٤٣) دوای ئەنجام دانی دوووەمین دیداری (د. صدر) لەگەڵ (ئایەتولڵا خومەینی) دا، چۆنیەتی ئازاد کردن و گەڕانەوەی ئەو بۆ قوم ڕێکخرا، (ئایەتولڵا خومەینی) بە پێشوازی لێکردنێکی گەرمەوە گەیشتەوە شاری قوم و دەستی کردەوە بە وانە وتنەوەی خۆی، بە دوای ئازاد کردنە (ئایەتولڵا خومەینی) ڕۆژنامەکان بە فەرمانی دەوڵەت و لە چوارچێوەی ئەو وتارانەدا کە بە شێوەی یەك ماڵ بۆ چاپکراوەکان نێردرابوو، ئاماژەیان بۆ پشتگیری ڕۆحانیەکان کرد لە (شۆڕشی سپی)، بەڵام ئایەتولڵا خومەینی لە وتارێکی دا لەگەڵ نوێنەرانی خوێندکارانی زانکۆ بازاڕیەکان، ئاماژەی بە یەکێك لەو وتارانەی ڕۆژنامەی (اطلاعات) کردووە و وتویەتی:**

***(لەم ڕۆژنامە پیسەی اگلاعات دا لە ژێر ناوی (اتحاد مقدس) لە سەر وتاردا نوسیبوویان کە لەگەڵ ڕۆحانیەکاندا ڕێك کەوتن کراوە و ڕۆحانیەکان ڕەزامەندیان دەر بڕیوە لەگەڵ شۆڕشی سپی (شا) و گەل دا، کام شۆڕش؟!، کام گەل؟!، ئەم شۆڕشە پەیوەستە بە ڕۆحانیەت و گەلەوە...؟! بەڕێزانی کە لە زانکۆدان بە هەموان بگەیەنن کە ڕۆحانیەکان بەم شۆڕشە ڕازی نین،... ڕۆحانیەکان لەگەڵ ئەم گەنکاریەدا دۆستایەتیان نیە..، گەر بە دار لە خومەینی بدەن واز ناهێنم و ڕازی نابم...، من لەو ئاخوند (مەلا)یانە نیم کە لێرەدا دابنیشم و تەسبیح بگرم بە دەستەوە، من پاپا نیم کە تەنها ڕۆژانی یەك شەممان ڕێوڕەسمێك بە ڕێوە ببەم و کاتەکانی دیکە بۆ خۆم سوڵتانێك بم و پەیوەندیم بە کاری دیکەوە نەبێت)[1].***

**لەگەڵ ئەوەی کە دەوڵەت هەتا مانگی (ئابان ١٣٤٣) خۆی بێدەنگ کردبوو لە ڕەخنەکانی (ئایەتولڵا خومەینی) و هەوڵەکانی خۆی زیاتر بۆ ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوە و چاپکردنی وتارەکانی ئەو چڕ کردبوویەوە، تا ئەوەی کە ڕۆژی (٤ ئابان ١٣٤٣)**

---

[1] **صحیفە نور: سازمان مدارك فرهنگی انقلاب اسلامی، جلد اول، ص ٩٩.**

**هەتاوی, دوای پەسەند کردنی پرۆژە یاسای پارێزگاری (حەصانە) سیاسی بە ڕاوێژکارەسەربازیە ئەمریکیەکان لە پەرلەمان و ئەنجومەنی سەنا دا, ئایەتوڵا خومەینی وتارێکی ئاواز توندی دیکەی پێشکەشکرد, کە یاد هێنەرەوەی وتارەکانی ڕۆژی عاشورای ساڵی پێشوتری بوو, ئایەتوڵا خومەینی بە ئاماژە دان بەچراخانی شارەکان و بەبۆنەی (٤ ئابان) وتی:**

***(ئێمەیان فرۆشت, سەربەخۆیی ئێمەیان فرۆشت و دیسانەوەش چراخانی یان کرد, سەرکوتیان کردین, ئەگەر من لە شوێنی ئەوان بوومایە چراخانیەکانم یاساغ دەکرد, من وتم ئاڵای ڕەش لە سەر سەری بازارەکان هەڵواسن, بەسەر ماڵەکانەوە هەڵواسن, خێوەتی ڕەش ببەنە سەرەوە, دەسەڵاتی ئێمە سەرکوت کرا, گەورەیی ئێران لە نێو چوو, گەورەیی لەشکری ئێرانیان سەرکوت کرد..., گەلی ئێرانییان لە سەگەکانی ئەمریکا سوکتر کرد, ئەگەر بێت و کەسێك بدات لە سەگێکی ئەمریکی لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێت, ئەگەر (شا) ی ئێران بدات لە سەگێکی ئەمریکای ئەوا لێپێچینەوەی لەگەڵ دا دەکرێت, بەڵام ئەگەر چێشت لێنەرێکی ئەمریکی سوکایەتی بە شای ئێران بکات, بە مەرجەعی ئێران بکات, بە گەرورەترین پێگە و پۆستی بکات, هیچکەس مافی ناڕزایی دەربڕینی نیە...بۆچی؟!, بۆ ئەوەی دەتان ویست قەرز لە ئەمریکا وەربگرن, ئەمریکا وتی دەبێت ئەم کارە بکەن...؟!.***

***ئایەتوڵا خومەینی دوواتر ڕوی لە (شا) کرد و وتی:***

***( سەربازانی ئەمریکا و ڕاوێژکارانی سەربازی ئەمریکا چ سودێکی بۆ ئێوە هەیە...؟ ئاغا ئەگەر ئەم وڵاتە داگیرگەی ئەمریکایە ئەی بۆچی ئەوەندە نرکەوناڵە دەکێشیت...؟ ئەی بۆچی ئەوەندە باس لە پێشکەوتن دەکەیت..؟, ئەگەر ئەم ڕاوێژکارانە خزمەتکار و بەکرێگیراوی تۆن...! ئەی بۆچی لە ئەرباب بە بەرزتریان ڕادەگریت,؟...).***

***هەروەها ئایەتوڵا خومەینی هێرشی توندی کردە سەر ئەمریکا و وتی:***

*(سەرۆك كۆماری ئەمریكا باش بزانێت, لەمە تێبگات كە لای گەلی ئێمە نەفرین ترین كەسی دوونیایە... ئەمڕۆ قوران لەو تووڕەیە, گەلی ئێران لەو تووڕەن..)*[1].

سەرباری پێشكەشكردنی ئەو وتارەی كە هەنێكیمان خستە بەر دیدیخوێنەران, (ئایەتوڵا خومەینی) ڕاگەیەندراوێكی توندیشی بۆڕەتكردنەوەی پەسەند كراوی پێدانی پارێزگاری سیاسی بە ڕاوێژكارە ئەمریكیەكان بلاّو كردەوە كە تەنها لە شاری تاران دا چل هەزار دانەی لێ چاپ و بلاّو كرایەوە, لەم ڕاگەیەندراوەدا جەختی لەسەر ئەوە كردبوویەوە كە پارێزگاری ناوبراو دژی ئیسلام و قورئانەو شتێكی بێ بایەخە و داوای لە لەشكری ئێران كرد كە ئەم نەنگیە لە داوێنی خۆیان پاك بكەنەوە.

شەوی (١٣ ئابان ١٣٤٣)هەتاوی, یەك هەفتە دوای بلاّوكرنەوەی ڕاگەیەندراوەكەی كە باسكرا, بۆ دووەمین جار لە شەو دا (ئایتوڵا خومەینی) دستگیر كرا و گواسترایەوە بۆ تاران و لە باتی بەندیخانە گەیەندرایە فڕۆكەخانەی (میهر ئاباد) و پێش هەڵهاتنی خۆر بەو فڕۆكەیەی كە ئامادە كرابوو بۆ فڕین لە ئێران دوور خرایەوە, ئامانجی فڕۆكەكە بەرەو توركیا بوو, كە پێشتر شوێنی مانەوەی (ئایەتوڵا)یان وە كەسێكی دوور خراوە لە توركیا ئامادە كردبوو, دوای دەستگیر كردن و دوور خستنەوەی ئایەتوڵا خومەینی, ژمارەیەكەی زۆریش لە دەوروبەرەكەی و لایەنگرانیشی لە شارەكانی قوم و تاران و مەشهەد شارەكانی دیەكەدا دەستگیر كران, بەڵام لەگەڵ ئەو هەمو ڕیوشوێنە توندەدا پاش تێپەڕینی كەمتر لە سێ مانگ بە سەر دوورخستنەوەی (ئایەتوڵا خومەینی) دا, (حەسەنعەلی مەنسور) بە دەستی گروپێكی مەزهەبی كوژرا, سەرباری ئەوەش بەرنامەیان بۆ كوشتنی (حەمەڕەزاشا و نەسیری (سەرۆكی ساواك) و عەلەم و ئیقباڵ) داڕێژابوو.

لە فەروەردینی (١٣٤٤)هەتاوی بۆ دوومین جار خودی (شا)یش (ئەم جارەیان بە دەستی كەسێكی مەزهەبی) هەوڵی كوشتنی درا, هەوڵی كوشتنەكە لە كۆشكی

---

[1] صحیفه نور: سازمان مدارك فرهنگی انقلاب اسلامی, جلد اول, ص ١٣٩ – ١٤٢..

(مەرمەڕ)ە کاتێك کە (شا) لەکاتی خۆیدا گەیشتە شوێنی کارەکانی خۆی, یەکێك لە سەربازانی گارد بە نێوی (ڕەزا شەمس ئابادی) بە چەکی شەستیر بەرەو ڕوی شا تەقەی کرد, دووکەس لە پارێزەرەکانی کە خۆیان کردە فیدای سەری ئەو, لەم ڕوداوەدا کوژران, بەڵام خودی (شا) بە بێ کێشە رزگاری بوو, جارێکی دیکە (شا) رزگار بوونی لەم هەوڵی کوشتنە بە پەرجوی ئیلاهی و هوشیاری خۆی دەزانی.!.

لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە دوواتر لە باری ئەم ڕوداوە کرا دەرکەوت کە پیلانی کوشتنی (شا) لەلایەن گروپێکی کۆمۆنیست لە قوتابیانی زانکۆ, کە لە زانکۆکانی بەریتانیا دا دەیان خوێند, بەرنامەی بۆ دارێژراوە, ئەم گروپە لە ڕێگەیەکەوە پەیوەندیان بە یەکێك لە سەربازانی گاردەوە بە نێوی( ڕەزاشەمس ئابادی)ەوە کردووە, بە سود وەرگرتن لە هەستە مەزهەبیەکانی ئەو بەرنامەکەی خۆیانیان خستوەتە بوواری جێبەجێکردنەوە, تۆمەتبارەکان کە ژمارەیان (١٤) کەس بوو لە داداگای سەربازی دا دادگایی کران, دوو کەسیان کە سەردەستەی گروپەکە بوون و ناویان: (ئەحمەد مەنسوری و ئەحمەد کامەرانی) بوو سزای لە سێدارەدانیان بۆ دەرکرا, سێ کەسی دیکەیان بە نێوەکانی: (پەرویز نیکخواه, پور کاشانی, فەیروز شیروانلۆ) بە ڕیز ماوەی زیندانی دە ساڵ و هەشت ساڵ و پێنج ساڵ سزا دران, حەوت کەسیشیان بە سزای زیندانی شەش مانگ تا سێ ساڵ سزا دران, دوو کەسیشیان کە بە بێ تاوان دەرچون ئازاد کران.

(ژرار دوو ویلیە)ی نوسەر فەرەنسی کە باسێکی دووروودرێژی دەربارەی ئەم ڕوداوە نوسیوە, دوای باسکردنی هەوڵی کوشتنەکە و دەستگیر کردنی تاوانباران و دادگایی کردنیان دەنووسێت: کاتێك کە فەرمانی داداگای پیاهەڵچونەوە دەرکرا, یەکێك لە سزادراوەکان بە سێدارە (ئەحمەد مەنسوری) لەجێگەی خۆی ڕاپەڕی و وتی: ئێوە ژمارەیەك بێتاوانتان سزا دا, دوواتر داوای لە سەرۆکی داداگا کرد, پێش جێبەجێکردنی سزاکە کاتێکی بۆ دیاری بکات بۆ ئەوەی بچێتە خزمەتی (شا) بۆ ئەوەی بابەتێکی پێ ڕابگەیەنێت, سەرۆکی داداگا وتی: داواکەی ئێوە دەگەیەنمە لایەنی پەیوەندی دار, بەڵام باوەڕ ناکەم پێشنیارەکەتان پەسەند بکرێت, داواکاریەکەی تاوانبار لەگەڵ سزای لەسێدارەکەیدا گەیەنرایە خزمەتی (شا), بە پێچەوانەی هەمو چاوەڕوانیەکانەوە, لە ڕقان دا و بە ئومێدی ئەوەی کە سزا دراو

دەیەویٚت نهێنیەك لای ئەو ئاشكرا بكات, ڕزامەنی لەسەر بینینی (ئەحمەد مەنسوری) دەربڕی, مەنسوری لە ژێر چاودێری و بە كەلەپچە كراوی لەگەڵ یەكێك لە ژەنەراڵەكانی لەشكردا ڕۆیشت بۆ كۆشكی سەڵتەنەتی, (شا) بە تەنیا لە یەكێك لە هۆڵەكانی پێشوازی دا چاوی بەو كەوت, پێش بینینی فەرمانی دا كەلەپچەكانی لەدەست بكەنەوە, ئەم چاو پێكەوتنە (٥٥) دەقیقە درێژەی كێشا, كاتێك كە (ئەحمەد مەنسوری) بە ڕێگەی خۆیدا گەڕایەوە, (شا) سزای لە سێدارە دانی ئەوو (ئەحمەد كامەرانی) گۆڕی بە زیندانیی هەتاهەتایی.

(ژرار دوو ویلیە) دەنووسێت: لە ڕۆژی (١٧ ژانویە ١٩٧٥ز) لە چاوپێكەوتنێكی تایبەتی لەگەڵ (شا) دا لە وڵاتی سویسرا, لێم پرسی: دوای تێپەڕینی چەندین ساڵ لەم ڕوداوە, دەتوانیت بڵێیت لەو دیدارە دوورودرێژەدا چی ڕویدا لە نێوان تۆ و ئەو كەسەی كە هەوڵی كوشتنی تۆی دا؟ (شا) زەردەخەنەیەكی كرد و وتی: (هیچ..! ئەو تەنها بۆ ڕاكێشانی سۆزی من داوای لێخۆشبوون بۆ لای من هاتبوو, كاتێك كە ئەو ویستی لە هۆڵەكە بێتە دەرەوە (شاژن) هاتە ژورەوە, مەنسوری گەڕایەوە و بە جۆرە نیگایەكی سەرنج ڕاكێشانەوە سەیری (شاژنی) كرد كە فرمێسك لە چاوەكانی ئەو قەتارەی بەست, منیش لە هەمان ئەو ساتەی كە چاوم بە چاوەكانی (شاژن) كەوت, بڕیام دا كە ئەو (مەنسوری) ببەخشم..!..), سەرجەم سزادراوانیش ڕۆژی (٢ ژانویە ١٩٧١ز, ١٢ دی ١٣٤٩هەتاوی) لە زیندان ئازاد كران....)[1].

بەلاَم ئەوەی كە (شا) ڕاستیەكەی بە نوسەرە فەرەنسیەكە گوتبێت, جێگای گومانكردنی هەیە, ئەگەر (مەنسوری) تەنها بۆ ڕاكێشانی سۆزی (شا) و داوای لێخۆشبوون ڕۆیشتبوو, ئەوا ئەوە نابێتە هۆكارێك بۆ ئەوەی كە (شا) بۆ ماوەی (٥٥) دەقیقە ئەو لای خۆی بهێڵێتەوە, لەوانەیە (مەنسوری) نهێنیەكی لە پیلانی هەوڵی كوشتنەكەدا ئاشكرا كردبێت و خۆ بوواردنی (شا)یش لە ئاشكرا كردنی ئەو بابەتە, گومانی هەبوونی دەستوەردانی وڵاتێكی بیانی لە پشتی ئەم ڕوداوە وە بەهێز دەكات, لە ڕاستیدا (فەرەح)یش زیاتر لەوەی كە (شا) باسی دەكات كە ڕۆڵێكی دیاری هەبووە لە لێخۆشبوون و ئازاد كردنی ئەم گروپە, دوواتر بە ڕاسپاردنی (فەرەح) بەشێكی

---

[1] - Gerard de Villiers... PP. 317 – 318.

زۆری ئەم سزا دراوانە لە دەزگا هەستیارەکانی وەك ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی دەوڵەتی دا, وە تەنانەت لە دیوانی تایبەتی خودی (فەرەح)یش دا سەرقاڵی کارکردن بوون.[١]

** ** **

دوای مەرگی (حەسەنعەلی مەنسور) لە ڕۆژی (٦ بەهمەن ١٣٤٣)هەتاوی, شا (ئەمیر عەبباسی هوەیدا)ی وەزیری دارایی کابینەکەی ئەوی ڕاسپارد بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێی حکومەت, هەڵبژاردنی (هوەیدا) بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی ئێران لەو کاتانەدا وا لێکدرایەوە کە (شا) دەیەوێت وەك هەڵوێستێك لە بەرامبەر کوشتنی (حەسەنعەلی مەنسور)دا, یەکێك لە نزیکترین کەسەکانی ئەو بکات بە سەرۆك وەزیران, کەم کەس باوەڕی دەکرد کە (هوەیدا) بە یازدە مانگ پێشینەی وەزارەتەوە بتوانێت چەند مانگێك زیاتر لە پۆستی سەرۆك وەزیری دا بمێنێتەوە, بەلاّم (هوەیدا) سالاّنی سەرۆك وەزیرانی خۆی یەك لە دوای یەك تێدەپەڕاند و نزیکەی (١٣) ساڵ, واتە زیاتر لە سەرجەم سەرۆك وەزیرەکانی سەردەمی مەشروتە خوازی (دەستور خوازی) ئێران لەو پۆستەدا مایەوە, دەربارەی هۆکاری درێژەکێشانی مانەوەی (هوەیدا) لە پۆستی سەرۆك وەزیر دا بابەتگەلێکی زۆر وتراون و نوسراون, کە زیاتر پشت ئەستورە بە پەیوەندیەکانی (هوەیدا) لەگەڵ بیانیەکان یان وابەستە بوونی ئەو بە (فراماسونری)[٢]ە وە, بە بۆچونی نوسەر ڕاست نیە, بە بەڵگەی ئەوەی کە زۆرێك لە سەرۆك وەزیرەکانی دیکە پەیوەندی زیاتر و ڕیشەدار تر و بەهێزتر لە (هوەیدا) یان لەگەڵ بیانیەکان دا و پلەی بەرزتریشیان لە (فراماسونری)دا هەبوو, زیاتر لە چەند مانگ یا چەند ساڵێك لە پۆستەکانیان دا نەدەمانەوە و تەنانەت خودی (شا) بە هۆی ئەو پەیوەندیانەیانەوە

---

[1] دیارترین کەسی نێو گروپەکە (پەرویز نیکخواه) بو, کە لە کۆتاییەکانی ڕژێمی (شا) دا بە (کرۆکی بیرکردنەوە)ی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕاوێژکار و ڕێ نیشاندەری (قوطبی) کوڕەخاڵی (فەرەح) دەهاتە هەژمار, نیکخواه لە حیزبی (رستاخیز/ هەستانەوە, ڕاپەڕین)شدا ڕۆڵی هەستیاری هەبو, ئەو دوای شۆڕشی ئیسلامی ئێران, بە تۆمەتی نوسینی وتارێکی سوکایەتی ئامێز بە (ئیمام خومەینی), (وتارەکە لە ڕۆژنامەی اطلاعات بلاّو کرایەوە و تروسکەی شۆڕشی داگیرساند) سزای لەسێدارە دانی بە سەردا درا و گوللە باران کرا.

[2] دەوترێت ڕێکخراوێکی وابەستەیە بە ئینگلستانەوە.

دەکەوتە پیلان گێڕان لە دژیان, بە بڕوای نوسەر هۆکاری درێژەکێشانی (هوەیدا) لە پۆستەکەیدا, بە هۆی ئەم هۆکارانەی خوارەوەیە:

١- هوەیدا لە یەکەم ڕۆژی وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری دا ملکەچی و گوێڕایەڵی لە بەرامبەر (شا) دا پەیڕەو دەکرد, ئەمە هەمان ئەو شتە بوو کە (شا) لە سەرۆك وەزیرەکانی خۆیی دەویست, (شا) تەنانەت (هوەیدا)ی دەخستە پێش (عەلەم), لە کاتێکدا کە (عەلەم) خۆی بە نۆکەر و خزمەتکاری ڕاستەقینەی (شا) ناو دەبرد, لەبەر ئەوەی کە (عەلەم) هەروەکو لە یاداشتەکانی دا بەدی دەکرێت, هەندێك جار زاتی ئەوەی کردووە کە باس لە هەندێك بابەت بکات کە پێچەوانەی بۆچونەکانی (شا) بێت و جێگای ڕەزامەنی ئەو نەبووبێت, بەڵام (هوەیدا) هەرگیز ڕێگەی وەها کارێکی بە خۆی نەدەدا کە قسانێك پێچەوانەی ویست و ئارەزوی (شا) بەسەر زمانیدا بهێنێت, بە پێچەوانەشەوە هەندێك جاریش بۆ پاساو هێنانەوەی بۆچونە ناعەقڵانی و نەگونجاوەکانی (شا), هۆکاری عەقڵانی و گونجاوی دەتاشی, نوسەر لەهەمان ساڵانی یەکەمی سەرۆکایەتی (هوەیدا)دا لە زمانی یەکێك لە نزیکەکانی ئەوە وە بیستم, کاتێك کە (هوەیدا) دەچێتە خزمەتی (شا), سەرجەم فەرمانەکانی (شا) لە سەرجەم بابەتە جۆراو جۆرەکان دا بە بێ چۆن و بۆچی دەنوسێت و بۆ خزمەتکردنی زیاتری (شا) دەست بەجێ لە ڕێگەی نێوان کۆشکی (نیاوەران) تا سەرۆکایەتی وەزیران, بەشێکی زۆری فەرمانە شاهانەییەکان بە تەلەفۆنی نێو ئۆتۆمبێلی سەرۆك وەزیران بە لایەنی پەیوەندی دار ڕادەگەیەنێت و یەك دوو کاتژمێر دوواتر جێبەجێکردنی سەرجەم فرمانە شاهانەییەکان بە خزمەتی (شا) دەگەیەنێت, (شا)یش جێبەجێکردنی فەرمانەکانی بەو خێراییە لە هیچ سەرۆك وەزیرانێك نەدیتبوو.

٢- شا بە هۆی لاوازیە دەرونیەکانی خۆیەوە, ئێرەیی بە کەسانی خاوەن کەسایەتی و ڕیشەدار دەبرد کە لە نێو کۆمەڵگەدا پێگەیەکی بەهێزیان هەبوو, هەرگیز ئامادە نەدەبوو کە هێز و دەسەڵاتی خۆی لەگەڵ هیچکەسێکدا دابەش بکات, هوەیدا هەمان کەسایەتی بێ ڕیشە و کەم بایەخ بوو کە (شا) هەرگیز ئێرەیی ئەوی لە دڵ نەدەگرت و دەیزانی کە هەرگیز سەڵتەنەت لەلایەن ئەوە وە ڕووبەڕوی مەترسی ناتبێتەوە, بە هەبوونی (هوەیدا) لە سەرۆکایەتی دەوڵەت دا, (شا) بە خەیاڵێکی بێخەمەوە ساڵانە چەند مانگێکی لە دەرەوەی وڵات بەسەر دەبرد, لەگەڵ ئەو ناکۆکی و

دژایەتیەی کە لە نێوان (عەلەم)ی وەزیری دەربار و (هوەیدا)ی سەرۆك وەزیران دا هەبوو (خودی شا ئاگری ئەم ناکۆکیەی بەتین تر دەکرد), (شا) هەستی بە هیچ مەترسیەك لەلایەن ئەوانەوە نەدەکرد.

٣- بە پێچەوانەی سەرجەم ئەو دەنگۆیانەی کە دەربارەی پەیوەندی (هوەیدا) لەگەڵ بیانیەکان و وابەستەیی ئەو بەم ریکا و بەریتانیا وە بلاو بووەتەوە, پەیوەندی هوەیدا لەگەڵ بیانیەکان دا زۆر ڕوکەشانە و ڕادەی ئاسایی ناساندنی دیبلۆماسیانە بووە, هەمان (نەبوونی پەیوەندی)ە بە یەکێك لە هۆکارەکانی مانەوەی ئەو لە پۆستی سەرۆك وەزیری دا دێتە هەژمار,لەبەر ئەوە (شا) هەمیشە دەیویست کە خۆی پەیوەندی لەگەڵ بێگانەکان دا بە تایبەت سێ زلهێزی ئەمریکا وئینگلستان و سۆڤیەت ببەستێت, هەبوونی کەسێکی لەو نێوەندەدا پەسەند نەدەکرد, (شا) تەنها لە هەندێك کات دا (عەلەم)ی وەك نێوەندگیر بۆ هەندێك لە پەیوەندیەکان دەنارد, ئەویش زیاتر بۆ ئەو بابەتانەی کە جیاوازیان هەبوو لەگەڵ ئەمریکا یان بەریتانیا و نەیدەویست ڕاستەوخۆ خۆی ڕوبەڕویان ببێتەوە, چاوخشاندنێك بە یاداشتەکانی (عەلەم)دا ئەم بابەتە بەڕونی دەر دەکەوێت, کە ئەو زیاتر پەیامە نەرێکان و گلەییەکانی (شا)ی لەگەڵ باڵوێزە بیانیەکان دا باسکردووە, کە ساغکردنەوە و گەڕاندنەوەی ئەم پرس و مامەڵانە تایبەت بوو بە پۆستی سەڵتەنەتیەوە..!.

٤- چوارەمین هۆکاری مانەوەی (هوەیدا) لە پۆستی سەرۆك وەزیری کە لە چاو هۆکارەکانی پێشودا زۆر گرنگ نیە, بە ئەنقەستی (شا) لە دروستکردنی ڕواڵەتی (سەقامگیری سیاسی) ئێران بوو لە چاوی بیانیەکانەوە, لە کاتێکدا کە لە زۆرێك لە وڵاتانی دوونیا دا تەمەنی ناوەندی دەوڵەتەکانیان کەمتر بوو لە ساڵێك, (شا) بە بوونی حکومەتێك کە لە سەروبەندی دەیەی ١٣٥٠ هەتاوی دەیەمین ساڵی خۆی تێپەڕاند شانازی بە خۆیەوە دەکرد, وە بەکار هێنانی زاراوەی (دوورگەی سەقامگیر) کە بۆ یەکەمین جار (نیکسۆن) لە بارەی ئێرانەوە بەکاری هێنا, زۆر خۆشحاڵ بوو.

لەگەڵ هەبوونی سەرجەمی ئەو هۆکارانەی کە لە سەرەوە ئاماژەی بۆ کراوە, (شا) لە ناوەڕاستی حکومەتەکەی (هوەیدا) دا, لە ژێر کاریگەری بە گوێدا دانەکانی (عەلەم) دەربارەی فراماسون بوونی (هوەیدا) و هەبوونی چەندین دۆست و هاوڕێی جۆراوجۆر و بە دەسەڵاتی لەو ڕێکخستنەدا هۆشداری بە (شا) دەدا, (شا) کەوتە بیری

لاواز کردنی فراماسونری و (هوەیدا)، لە هەمان کات دا (کۆتاییەکانی ساڵی ١٣٤٧هەتاوی) کتێبی ناسراوی (اسماعیل رائین) دەربارەی فراماسونری لە ئێران و بە پاڵپشتی (عەلەم) چاپ و بڵاو کرایەوە، لەم کتێبەدا ناوی هوەیدا (بە بێ هێنانی ناوی بچوکی ئەو { ئەمیر عەبباس}) لە نێو لیستی ئەندامانی کۆنترین شانەکانی فراماسونری ئێران (شانەی فەڕوغی) هاتبوو، بەڵام ئامانجەکە تەنها خودی (هوەیدا) نەبوو، (عەلەم) بە وەرگرتنی ڕەزامەندی پێشتری (شا)، دەیویست زۆرێك لە پیاوە کۆنەکانی ئێران کە پۆستی بەرزی وەك سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی ئەنجومەنی سەنا و باڵوێز و سیناتۆر و پەرلەمانتاری یان هەبوو، ناوبانگی ئەوان بە بیانوی ئەندام بوونیان لە فراماسونری دا لاواز بکات و لە نێو ئەوانیشدا ڕێگە لە ڕیشەدار کردنی (هوەیدا) لە نێو ئەو ڕێکخراوەدا بگرێت[1].

عەلەم لەگەڵ ئەو وابەستەییەو سەر سپاردنەی بە ئینگلیزەکان، ئەندامی فراماسونری کە دەوترا ڕێکخراوێکی وابەستەی ئینگلیستانە، نەبوو، وە لە ئامادە کردنی هەندێك لە سەرچاوەکانی کتێبەکەی (ئیسماعیل رائین) و بەدەستهێنانی مافی چاپکردنی هاوکاری زۆری (رائین)ی کردووە، خاڵی سەرنج ڕاکێشی دیکەئەوەیە کە لەگەڵ ئەوەی شاژنە (فەرەح) پەیوەندیەکی باشی لەگەڵ (عەلەم) دا نەبووە و ئەم ناکۆکیەش بە تەواوی لە لە یاداشتەکانی (عەلەم)دا ڕەنگی داوەتەوە، لە دژایەتی کردنی فراماسۆنەکان دا لەگەڵ (عەلەم) هاودەست بوو، لەبەر ئەوەی کە کۆمۆنیستەکان لە نەیارە سەرسەختەکانی فراماسونری بوون و (فەرەح)یش بە هۆی هۆکارگەلێکەوە کە پێشتر باسکرا بیری کۆمۆنیستی هەبوو، (عەلەم) لە یاداشتەکانی دا خۆی بوواردووە لە باسکردنی پرس و بابەتەکانی پەیوەست بە فراماسۆنەکان، بەڵام لە شوێنێك دا لە میانەی باسکردنی گفتوگۆکانی خۆی لەگەڵ (فەرح)دا، لە

---

[1] روداوی بڵاو کردنەوەی کتێبی سێ بەرگی (فراماسونری در ایران/ فراماسونری لە ئێران) و دابەشکردنی بە تیراژێکی زۆر، لە بارودۆخێکدا کە لەو کاتەدا وەزارەتی ئاگاهی و ئاسایش ڕێگری دەکرد لە چاپکردن و بڵاو کردنەوەی یەك لاپەڕەی ڕۆژنامەکان یان یەك پارچە هۆنراوە کە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو وەزارەتە بوایە، داستانێکی دووروودرێژی هەیە، ئەگەر ڕۆژێك زەمینەی لەبار بۆ بڵاوکردنەوەی (تەواوی ڕاستیەکان) فەراهەم هات، دەینوسم.

یاداشتەکانی پەیوەست بە ڕۆژی شەممە (١٤ ئۆردیبەهەشت ١٣٤٩)هەتاوی, بەم شێوەیە دەنووسێت:

*شاژن بەهرەو لێهاتوییەکی نامۆی هەیە بۆ ئەوەی هەمیشە پەنجەی بخاتە خاڵی هەستیاری کار..... لەنێو قسان دا ئاماژەی بە ڕەوشی ناسکی پروپاگەندە و ڕاگەیاندنەکانی دەوڵەت کرد, ئەوەی کە گوێ نەدان بەبیروڕای شەقام و زۆرێك لەو کارانەی کە دەوڵەت ئەنجامی دەدات, جگە لە ڕوکەش هیچی دیکە نیە, بە وتەی ئەو ئەم کارانە تەنها متمانەی خەڵك بەرامبەر بە دەوڵەت لاواز دەکات و دایدەماڵێت...*

*دوواتر ئاماژەی بەو کتێبە کرد کە بەم دووایییە کە دەربارەی فراماسۆنەکان چاپ و بڵاو کرایەوە, کە تیایدا جگە لە من ناوی تەواوی پیاوانی وڵات لە سەرۆك وەزیر, شەریف ئیمامی, د. ئیقبال, ریاچی, هاتوە, خاوەن شکۆ وەتی: ڕێگە چارەیەکی ئەوەیە کە بێباکانە بە فراماسونری ڕازی بین, بەڵام بە بۆچونی من دەبێت ئەو بە کارێکی ناپەسەند بدەینە قەڵەم, واتای چیە کە ئامێری دەستی هێزە بیانیەکان بین..؟, ئەوانەی کە چارەنوسیان لەگەڵ فراماسونری تێکەڵاو بووە دەبێت لە کارەکانیان دوور بخرێنەوە, هەمویان..!.*

*هەڵەنەبم هەستم وایە کە شاژن لە ئاینده دەترسێت, ئەمەش هەروا لەخۆیەوە نیە, لەوانەیە ڕۆژێك کوڕەکەی لەسەر تەختی پاشایی دابنیشێت, هە ر شتێك کە ڕژێمی ئێستا لاواز بکات مەترسی دەبێت بۆ سەر جێنشینی ئەویش...*

کاتێك کە ئەو کتێبە لە قۆناغی ڕێکخستن دا بوو, نوسخەی ئەسڵی دەستنوسەکانی (عەلەم)یش لە تاران دا بڵاو بوویەوە, کە تیایدا یەك دوو جاری دیکەش ئاماژە بە بابەتی فراماسونری کراوەتەوە و پەیوەندیەکانی (عەلەم) بە بڵاو بوونەوەی کتێبەکەی (رائین) دەردەخات, لە یاداشتەکانی (عەلەم)دا بە مێژوی (٤ ئەسفەند ١٣٤٧)هەتاوی هاتوە:

(کتێبێك بە پێنوسی (ئسماعیل رائین) نوسراوە بە نێوی فراماسونری و پێشینەی کاری ئەوان لە ئێران, زۆرینەی پیاوانی ئێستا کە خاوەن پلەن وەك:

شەریف ئیمامی سەرۆکی ئەنجومەنی سەنا و عەلا ی وەزیری پێشوی دەربار و گروپێکی حەوت سەد کەسی فراماسۆنن, خودا لە باوکی خۆش ببێت لە بارەی منەوە ڕاستی نوسیوە, من ئەم چیرۆکەم بۆ خوالێخۆشبوو (خان مەلەك ساسانی) کە خەزوری ڕائین و لە نەیارە سەرسەختەکانی فراماسونری بوو گێڕابوویەوە, کە کاتێك فراماسۆنەکان هاتبوونە لای من و بە پێداگرییەوە بانگهێشتیان کردم, وتم: شانازی من ئەوەیە کە دەستی شای ئێران ماچ دەکەم, بەڵام ئامادە نیم دەستی کەسێکی دیکە, ئەگەر ئیمپراتۆری بەریتانیاش بێت ماچ بکەم..).

عەلەم دیسانەوە لە یاداشتەکانی ڕۆژی (٦ ئەسفەند ١٣٤٧)هەتاوی دا دەنووسێت: (ئەمشەو نامەیەکی دوورودرێژم تایبەت بە دانوستانەکان لەگەڵ (ئۆبراین)ی سەرۆکی (کنسرسیۆمی نەوت)[1] و کتێبی فراماسونری گەیاندە خزمەتی شا), ڕونکردنەوەی زیاتر نادات دەربارەی ئەوەی کە لەو نامەیەدا چی نوسراوە.

شیاوی وتنە کە لە کتێبە سێ بەرگیەکەی (ڕائین)دا دەربارەی فراماسونری لە ئێران ناوی خودی (شا)یش بە ئاماژە وەك ئەندامی ڕێکخراوی فراماسونری هاتووە, لەگەڵ ئەوەی کە لەم کتێبەدا دەخوێنرێتەوە پیشتر گەورەترین شانەی ڕێکخستنی فراماسونری لە ئێران بە ناوی (شانەی پەهلەوی) ناسراوە, کە دوواتر گۆڕیان بۆ (شانەی همایون), بە خوێندنەوەی ئەوەی کە (فەرەح) دەڵێت دەبێت هەمو فراماسۆنەکان لەکارەکانیان لابدرێن و (عەلەم)یش لە شیکردنەوەی وتەکانی (فەرەح) دا فراماسونری بە مەترسی بۆ سەر ڕژێم دادەنێت, ئەمە خۆی مەتەڵێکە کە بابەت و پرسی فراماسونری لە ئێران دا ئاڵوزتر دەکات, وە ئەم کتێبە شوێنی لێکۆڵینەوە و ڕاڤەکردنی ئەوە نیە,,.

** ** **

لە ماوەی نزیکەی سیازدە ساڵی سەرۆك وەزیرانی (هوەیدا) دا, (شا) پایەکانی دیکتاتۆری خۆی بەهێزتر کرد, لە هەندێك یابەتدا زیاتر لە بەرەی خۆی پێی

---

[1] کنسرسیۆم: کۆمپانیایەکی گەورەیەو لە چەند کۆمپانیایەك پێك دێت, بۆ پاوانکردنی شمەکێك یان بەرهەمێکی کانزایی پێکدەهێنرێت. وەك کنسرسیۆمی پەمو, کنسرسیۆمی خەڵوزی بەردین, کنسرسیۆمی نەوت...هتد. بڕوانە: د. محمد معین: فەرهەنگی فارسی معین. (وەرگێڕ)

رادەكێشا, ڕێوڕەسمی تاج لە سەرنان و جەژنەكانی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵەی شاهنشاهی كە دوای ڕێوڕەسمی تاج لەسەرنان ساز كرا, بە پێچەوانەی بۆچون و چاوەڕوانیەكانی (شا), ڕەنگدانەوەیەكی باشی لە ئێران و دوونیاشدا نەبوو,بەڵام ئەوەی كە بوویە هۆی ڕوبەڕو بوونەوەی ئەو لەگەڵ ڕۆژئاوا دا و لەرزۆك بوونی پایەكانی ڕژێمەكەی, پرسی نەوت و سیاسەتی گشتی (شا) بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا.

لە كۆتاییەكانی ساڵی ١٩٧٣ز و سەرەتاكانی ساڵی ١٩٧٤ز, (نیوەی دووەمی ١٣٥٢ هەتاوی), (شا) سەرۆكایەتی بزوتنەوەیەكی كرد كە لە لایەن (ئۆپیك)[1]ە وە ئەنجام درا, تیایدا بە شێوەیەكی لەناكاو لە ماوەی سێ مانگ دا نرخی نەوت نزیكەی چوار بەرامبەر زیادی كرد, زیاد بوونی لەناكاوی نرخی نەوت, ئەویش بە بڕی چوار ئەوەندە, دوونیای پیشەسازی ڕۆژئاوا لە ئەمریكاو ئەورووپاوە بگرە تا یابان, ڕوبەڕوی قەیرانێكی توند و سەخت كردەوە, ئەڵبەتە ئەو زیانەی كە لەم ماوەیەدا توشی وڵاتانی پیشەسازی بوویەوە وەك یەك نەبوو, ئەمریكا لە هەموان كەمتر و یابان لە هەموان زیاتر دووچاری زیان بوونەوە, بەڵام وەها بزوتنەوەیەك لەلایەن وڵاتانی بەرهەم هێنەری نەوت و پەیدا بوونی دێوێكی نوێی ئابووری بە نێوی (ئۆپیك), ڕۆژئاوای پیشەسازی كۆكردەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك بۆ ڕوبووڕوبوونەوەی ئەم مەترسییە.

دوووەمین جوڵانەوەی (شا) لە سیاسەتی دەرەو دا, كە ڕۆژئاوای ڕوبووڕوی خۆی كردەوە, ڕیككەوتنی (شا و سەدام حسەین) بوو لە (مارس ١٩٧٥ز , ئەسفەند ١٣٥٣)هەتاوی, لە كۆنفرانسی سەرانی وڵاتانی ئەندامی ڕێكخراوی (ئۆپێك) لە (ئەلجەزائیر)ی پایتەختی وڵاتی جەزائیر, كە بەرنامە و پیلانە درێژخایەنەكانی ئەمریكا و ئیسرائیلی بۆ دروستكردنی شەڕ لە نێوان (عێراق و ئێران) و لاواز كردنی ڕژێمی عێراقی هەڵوەشاندەوە و زەمینەی بۆ یەكیەتی وڵاتانی ئیسلامی دژی ڕژێمی ئیسرائیل فەراهەم هێنا, زەمینەی پێكدادانی ڕژێمی ( عێراق و ئێران) دوای گرتنی هەرسێ دوورگەی (ئەبوو موسا و تونبی گەورە و تونبی بچوك) لە ساڵی (١٣٥٠)

---

[1] ئۆپیك: ڕێكخراوێكە وڵاتانی هەنارده كردنی نەوت پێكەوە دروستیان كردوووە.

هەتاوی دا لەلایەن هێزە سەربازیەکانی ئێرانەوە ساز کرابوو, لەگەڵ ئەوەی کە ئەو سێ دوورگەیە بە پێی ڕێککەوتنێك لە نێوان ئێران و ئەو وڵاتە شێخ نشینانەی کە بانگەشەی خاوەندارێتی ئەو دوورگانەیان دەکرد کەوتبووە دەست وڵاتی ئێران, عێراق بەتوندی دژی ئەم ڕێککەوتنە وەستایەوە و پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ وڵاتی ئێران دا بڕی, بڕینی پەیوەندی لە نێوان ئەم دووو وڵاتەدا جەنگی ڕاگەیاندن و کۆمەڵێك پێکدادانی سنوری بە دوای خۆی دا هێنا, سەرەنجام بەهۆی شۆڕشی کوردەکانی باکوری عێراق کە لەلایەن وڵاتی ئێرانەوە هاوکاری و پارێزگاری یان لێدەکرا, وڵاتی عێراقی لاواز کردبوو, ئەو هاوکاریانەی کە لە ڕێگەی ئێرانەوە دەنێردرا بۆ کوردەکانی باکوری عێراق, لەلایەن ئەمریکا و ئیسرائیلەوە دابین دەکرا, وە ئامانجی سەرەکی ئەم هاوکاری و پیلانەی ئەمریکا و ئیسرائیل بۆ لاواز کردنی دەوڵەتی عێراق و پاراستنی سنوری ڕۆژهەڵاتیی وڵاتی ئیسرائیل بوو, ڕێککەوتن نامەی نێوان وڵاتانی (عێراق و ئێران) کە بەبێ ئاگادار کردنەوەی پێشوەخت و وەرگرتنی ڕەزامەندی ئەمریکا ئەنجام درابوو, پیلانی ئەو وڵاتەی تێکدا, چاپەمەنی و ناوەندە هەاڵگریەکانی ئەمریکاش کە لە دەستی یەهودیەکان دا بوون, لەم بەروارە بەدوواوە کەوتنە سەرنگەری دژایەتی کردنی (شا)ی ئێران.

ئەو شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنەی کە پرۆفیسۆر (باری روبین)ی توێژەری بەناوبانگی ئەمریکی و شارەزایی کاروبارەکانی تایبەت بە ئێران و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست, لە بارەی حکومەتی (شا) و ڕەوتی گۆڕانکاری پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکا و ئێران لە ناوەڕاستی دەیەی (١٩٦٠ن) بە دوواوە ئەنجامی دا, بەتەواوی جێگەی سەرنجە, (باری روبین) لەم بارەیەوە دەنووسێت:

هەرچی دەسەڵاتی (شا) بەهێزتر دەبێت, ئارەزومەندی ئەو بەرەو حکومەتێکی تاکڕەوی زیاتر دەبێت, ئەو کەسایەتیە سیاسیانەی کە زاتی وتنی ڕاستیەکانیان بەو هەیە, وردەوردە دەردەکرێن, ڕاوێژکارە راستگۆکان خەریکە شوێنەکانی خۆیان بە ماستاوچیە (بەڵێ قربان گیان)ە کان دەسپێرن, زۆرینەی خەڵکیی, ئەمریکا بە پارێزەری (شا) و تەنانەت (شا)ش بە داردەستی ئەمریکا دەزانن, هەڵەکانی پێشوی (شا) بە پێدانی مافی پارێزگاری سیاسی (حەصانە) بە ڕاوێژکارە سەربازیەکانی ئەمریکا لە ئێران, ئەم بۆچونە بەهێز دەکات,,,,,.

ڕاستیەك كە ناتوانرێت حاشای لێ بكرێت ئەوەیە كە سیاسەتی ئەمریكا لە ئێران دا لە ناوەڕاستی دەیەی (١٩٦٠ان) زیاتر لە جاران, ڕووبەڕووی خودی (شا) دەبێتەوە, ئەزمونی ڕابردووی ئەمریكا ئەوە نیشان دەدات كە (شا) پاڵپشتێكی دڵنیاكەرەوە نیە, بەڵام ئەلتەرناتیڤێك یان كەسێكی باوەڕ پێكراوی دیكەش بۆ ئەمریكیەكان نیە, (شا) كە وردە وردە تەمەنی دەچێتە سەرەوە و خەیاڵاتی دووور و درێژی هەیە و بە دروشمی (هەرچی زوتر باشتر) دەیەوێت یەك لە دوای یەك ئارەزووەكانی خۆی بەدی بهێنێت, بە بۆچونی ئەو زیندوو كردنەوەی ناسیۆنالیستی ئێرانی تەنها ڕێگای گەیشتنە بە مەزنایەتی ڕابردووو, وە هێزی سەربازی و بە شكۆیی سەڵتەنەت بە یەكەمین هەنگاوی ئەم ڕێگەیە دەزانێت, بۆچونەكانی ئەو دەربارەی ئاینده زیاتر لە خەیاڵ دا دەمێنێتەوە, بۆنمونە لە ساڵی (١٩٦٥ان) دا لە كاتێكدا كە هێشتا دەرامەتی نەوتی ئێران لە ڕادەی مام ناوەندی دایە, بەڵێن دەدات كە بیست ساڵی دیكە ئێرانیەكان دەگەنە باڵاترین ڕەوشی ژیان و خۆشگوزەرانی ئابووری لە دوونیادا.

كوشتنی (كەنەدی) لە نۆڤەمبەری (١٩٦٣ان) دا و دەستپێكردنی سەرۆك كۆماریی (جانسۆن) كە پێنج ساڵ درێژەی كێشا, خاڵی وەرچەرخانە لە پەیوەندیەكانی نێوان (ئەمریكا و ئێران) دا, (جانسۆن) بە گرفتاریەكانی جەنگی (ڤێتنام) كە لە تەواوی ماوەی سەرۆك كۆمای دا یەخەی ئەوی گرتبوو, وە ئەو گەلاڵانەی كە بۆ ئەنجام دانی چاكسازی لە ئەمریكا دا هەیبوو, كاتی زۆری بۆ چاودێری كردنی كارەكانی (شا)ی ئێران نەبوو, فشارەكانی ئەمریكا بۆ ئەنجام دانی ڕیفۆرمی سیاسی و بەرنامەی فراوانخوازی ئابووری بۆ سەر (شا) كەم دەبوونەوە, وردەوردە (شا) لە كارەكانی خۆیدا ئازاد دەبێت و لە كۆتاییەكانی حكومەتەكەی (جانسۆن) دا پلانەكانی خۆی بۆ گۆڕینی ئێران بە گەورەترین وڵاتی خاوەن هێزی سەربازی لە كەنداوی فارس دا بەسەر واشنگتۆن دا دەسەپێنێت.

دەستپێكردنی سەرۆكایەتی (نیكسۆن) لە ساڵی (١٩٦٩ان) و ئەو ڕۆڵە كاریگەرەی كە (هینری كیسنجەر) سەرتا وەك ڕاوێژكاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆك كۆمار و دوواتر وەك وەزیری دەرەوەی ئەمریكا, دەیگێڕا, بە خاڵێكی وەرچەرخانی دیكە لە مێژوی پەیوەندیەكانی ئەمریكا و ئێران دێتە هەژمار, لە ماوەی حكومەتی

(نیكسۆن) دا, ئێران كه هەتا ناوەڕاستی دەیەی (١٩٦٠ن) پلەی دوووەمی له سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا هەبوو, گۆڕدرا بۆ یەكێك له پایه سەرەكیەكای سیاسەتی نێوچەكه, لەسەرەتاكانی دەیەی (١٩٧٠ن) یەكێك بوو له پایەكانی پاراستنی بەرژەوەندیەكانی ئەمریكا لەم نێوچه هەستیارەی دوونیا دا, ئەم گۆڕانكاریه پێش ئەوەی وەك سەركەوتنی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریكا له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا ناوببرێت, پێویسته وەك سەركەوتنی (شا) باسبكرێت, لەبەر ئەوه له ڕاستیدا ئەوه (شا) بوو كه تامەزرۆی گرتنه ئەستۆی وەها كارێك بوو له سیاسەتی نێوچەكەدا, وه نزیكەی بیست ساڵ هەمو كارێكی لەگەڵ حكومەته پێشوەكانی ئەمریكا دەكرد بۆ گەیشتن بەو ئامانجه.

له ژانویەی (١٩٧٣ن) دا (شا) له وتارێكی دا به بۆنەی دەیەمین ساڵیادی (سۆڕشی سپی) خۆیەوه, ڕایگەیاند كه ئێران بڕیاری داوه كه كۆنترۆڵی تەواوی پیشەسازیه نەوتیەكانی خۆی به دەستەوه بگرێت, وه له كارگێڕی پیشەسازی نەوت دا ڕۆڵی (كنسرسیۆمی نەوت) سنور دار بكات, ئەم بڕیاره ڕوبەڕوی نەیاری كردن و دژایەتی ئەمریكا و كۆمپانیا نەوتیەكانی كردەوه, بەڵام تاران گوێی بەم ناڕەزایی دەربڕینانه نەدا, دیسانەوه ئێران له كۆتاییەكانی ساڵی (١٩٧٣ن) و سەرەتاكانی (١٩٧٤ن) دا ڕۆڵێكی بەرچاوی گێڕا له بەرزبوونەوەی چەندین بەرامبەری نرخی نەوت لەلایەن ڕێكخراوی (ئۆپێك) و هەوڵەكانی ئەمریكاش بۆ ڕاوەستاندنی زیاد كردنی نرخی نەوت به بێ ئەنجام مایەوه, دەستپێكردنه سیاسی و ڕاگەیاندنەكانی (شا) له (ئۆپێك) و وتاره چڕ دار و پڕ توانج و تەشەر و هەست بزوێنەكانی كه دەیدان, پەرچەكرداری له ئەمریكا دا دروستكرد, له نێویشیان دا (ویلیام سایمۆن)ی وەزیری خەزنەداری ئەمریكا به بەكار هێنانی وشەی توند و سوكایەتی ئامێز له بەرامبەر (شا) دا قەیرانی له پەیوەندیەكانی (ئێران و ئەمریكا)دا دروستكرد, بەڵام (كیسنجەر) ئەو بابەتەی ئاسایی كردەوه و پێشنیارەكەی (سایمۆن)ی دەربارەی سنوردار كردنی فرۆشتنی چەك و تەقەمەنی به ئێران و وابەسته كردنی به گۆڕینی سیاسەتی نەوتی ئێرانەوه, نەخسته بوواری جێبەجێكردنەوه, (كیسنجەر) نەیارێكی توندی ئەم پێشنیارەی (سایمۆن) بوو, دەیوت: (شا بۆ كڕینی چەك له ئەمریكا, پاره دەدات, وه ئەگەر ئێمه چەكی پێ نەدەین, ئەوا (شا) ئەو بڕەچەكەی كه پێویستیەتی لای

فرۆشیارانی دیکەی چەك (کە بۆ هەلێك دەگەڕێن بۆ ڕفاندنی ئەم بازاڕە لە دەستی ئەمریکا) ئامادە دەکات).

زیادکردنی بەرهەمی نەوتی ئێران بە ڕادەی چوار تا پێنج ئەوەندە و پێویست بوونی زیاتری ئەمریکا بە نەوتی هاوردە, کە هێدی هێدی نرخی تەواوی بەرهەمە نێوخۆییەکانی ئەمریکای زیاد دەکرد, پێگەیەکی بە (شا) بەخشی کە ئیدی دەیتوانی لە ڕوانگەی هێزەوە قسان بکات, وتارەکان و چاوپێکەوتنەکانی (شا) ئیدی هاوتا بوو لەگەڵ چز و توانج و تەشەر دان لە ولاّتانی پیشەسازی و پەند و ئامۆژگاری بوو بۆ سەرۆکەکانی ئەو ولاّتانە بۆ ڕێگرتن لە بەهەدەر دانی (کەرەستەی خاو)ی نەوت و کۆنترۆڵ و چاودێری کردنی سودی لە ڕادە بەدەری کۆمپانیا نەوتیەکان, ڕوداوی (واتەر گیت) و لەکار خستنی (نیکسۆن) لە پۆستی سەرۆك کۆماری گۆڕانکاریەکی بەرچاوی لەم پەیوەندیانەدا بەدی نەهێنا, وە کاتێکیش (جراڵد فۆرد)ی سەرۆك کۆماری نویێ داوای لە (شا) کرد کە نرخی نەوت کەم بکەنەوە, (شا) وەلاّمی دایەوە کە دەبێت سەرەتا ولاّتە پیشەشازیەکان نرخی کالاّ هەنارده کراوەکانی خۆیان کەم بکەنەوە و گەلاّڵە نامەیەك بۆ جێگیر کردنی نرخی نەوت و کەرەستە خاوەکان و کالاّ پیشەسازیەکان بە پێی پەیوەندی یان بە یەکترەوە ئامادە بکەن.

بەلاّم هاوکات لەگەڵ زۆر بوونی دەرامەتی نەوت و چاوتێبڕینی زیاتری ڕۆژانەی (شا) بۆ بەهێز کردنی لایەنی سەربازی ئێران, قەیرانێکی نێوخۆیی لە ئێران دا دروستکرد, زۆر بوونی دەرامەتی نەوت کە گەندەڵی و شپرزەیی ئابووری لەگەڵ خۆیدا هێنا یەکێك بوو لە هۆکارەکانی دروستکردنی ئەم قەیرانە, لەگەڵ ئەو بەهەدەر دانەی پارەی نەوت دا, بەگشتی ئاستی گوزەرانی خەڵکی بەرز کردەوە, بەلاّم دادپەروەرانە دابەش نەکردنی ئەم دەرامەتە و سود وەرگرتنی خراپی زۆربەی ئەوانەی کە کاری بازرگانی یان جێبەجێکاری کارە ئاوەدان کاریەکان بوون, چینێکی نوێی سەرمایەداری لە ئێران دا دروستکرد, کە دەبوو بۆ ژماردنی سەرمایەی ئەو کەسانە داوای هاوکاریت لە ژمارەی هەسارەکانی ئاسمان بکردایە, جیاوازی چینەکان لە ئێران دا مەودایەکی زۆری پەیدا کرد, لە هەموی خراپ تر, لە ئەنجامی ئەو هەولاّنەی کە بۆ بە پیشەسازی کردنی ولاّت ئەنجام دەدرا, دەستکەوتنی کار و هەوڵی شارنشینی بە خێرایی پەرەی سەند و لافاوی کۆچی گوند نشینەکان بەرەوە شارەکان

بەرێکەوت، ئەو گوند نشینانەی کە لە گوندە دوورەدەست و دوواکەوتوەکانەوە دەهاتنە نێو شارەکان، وەك ئەو کەسانە بوون کە لە ناکاو لە ژیانی سەدەکانی ناوەڕاستەوە بێنە نێو ژیانی سەدەی بیستەمەوە، ئەوانە خۆیانیان لە دوونیایەکی نامۆوە بە خەیاڵی گەیشتن بە خۆشگوزەرانی و تام و چێژەکانی ژیان هاتبوون، لەکاتێکدا کە بەشێکی کەمیان نەبێت کاری دەست نەدەکەوت، سەختی کێشان و نارەزاییەکانی ئەم کۆمەڵەیە کە ژمارەیان بە خێرایی لە زیاد بوون دا بوو، لەگەڵ بیرو باوەڕە مەزهەبیەکەیان دا دەستیان دایە دەستی یەکتری، ئەمەش ئەو هێزە بزوتنە ڕاستەقینەیەی دروستکرد کە لە ساڵی (١٩٧٨ز) دا دژی (شا) دەستی پێکرد.[1] ....

---

[1] جنگ قدرتها در ایران: ص ٩٨ – ١١٥.

## ڕووخانی ڕژێمی شاهنشاهی ئێران

**سالآنی گەشەسەندن و پەشێوی، گەلآلەی کودەتایەکی ئەمریکی بەسەر (شا) دا، نهێنی مەرگی ئەرتەشبەند (خاتەمی)، ڕاپۆرتی نهێنی (سی ئای ئەی) دەربارەی بنەماڵەی سەڵتەنەتی، حکومەتی ئاموزگار و (ڕەوشی کرانەوەی سیاسی)، ڕۆڵی ئەمیر عەبباسی هوەیدا لە داگیرساندنی ئاگری شۆڕش دا، بۆچی (شا) شەریف ئیمامی هەڵبژارد بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران....؟، فەرەح داوای دەستلەکار کێشانەوە لە (شا) دەکات,,,,!، ڕوداوەکانی شۆڕش و ڕوخانی ڕژێم...,,**

زەمینەی ئەو شۆڕشەی کە لە ساڵی (١٣٥٧)هەتاوی دا کۆتایی بە تەمەنی ڕژێمی سەڵتەنەتی شاهنشاهی لە ئێران دا هێنا، سالآنی پێشو لە لوتکەی بەهێزی دەسەلآتی (شا) دا ئامادە سازی بۆ دەکرا، هەندێك لە توێژەرە سیاسیە بیانیەکان ساڵی (١٩٧٥ز) واتە کۆتاییەکانی (١٣٥٣) هەتاوی و نۆ مانگی یەکەمی ساڵی (١٣٥٤)هەتاوی بە خاڵی دەستپێکردنی گەیشتنە لوتکەی بەهێزی دەسەلآتی (شا) دەزانن لە ئێران دا، سەرجەمی ئەو ڕوداوانەی کە لەئێران دا ڕویان دەدا باسیان لە بەهێزتر بوونی پێگەی (شا) و ڕژێمی سەڵتەنەتی دەکرد لە وڵآتی ئێران دا داهای نەوت دوای گەیشتنی نرخی نەوت بە چوار ئەوەندە لە سالآنی (١٩٧٣ تا ١٩٧٤)هەتاوی سالآنە گەیشتبووە سنوری بیست ملیاد دۆلار، کە بە پێی نرخی دۆلار لەو ڕۆژگارانە دا بە ژمارەیەکی زۆر دەهاتە هەژمار، (شا) بە ڕاگەیاندنی ڕژێمی تاك حیزبی لە مانگی ئەسفەند (١٣٥٣)هەتاوی دا، حکومەتی ڕەهایی خۆی بەسەر وڵآت

دا سەپاندبوو, بەستنی پەیماننامەی ئاشتی لەگەڵ (عێراق) دا و واژۆ کردنی پەیماننامەی چارەسەر کردنی کێشەکانی نێوان (ئێران و عێراق) کە لەسەر بنەمای ڕاگەیەندراوی (شا و سەدام حسەین) لە ئەلجەزائیر ی پایتەختی وڵاتی جەزائیر ڕێکخرابوو, کۆتایی بەنیگەرانیەکانی ئێران هێنا لە بارەی سنورەکانی ڕۆژئاوای وڵاتەکەیەوە, پەیوەندیەکانی ئێران لەگەڵ سەرجەم وڵاتان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا فراوانی بە خۆیەوە بینی و لافاوی کەسایەتی و پیاوانی دەوڵەتی وڵاتانی بیانی بۆ بەدەستکەوتنی سودی زیاتر لەو سفرە پڕ بەرەکەتەی کە بەهۆی بەرز بوونەوەی لە ناکاوی نرخی نەوتەوە لە ئێران دا ڕاخرابوو, سەرەو ژور کردەوە, لەم نێوەندەدا ئامادەکار و ئەنجام دەرانی ڕێوڕەسمی جەژنی (٢٥٠٠) ساڵەی شاهنشاهیی, کە تام و چێژی خراپ سود وەرگرتنی زۆرێکیان لە گێڕانی ئەم جۆرە بۆنە و جەژنانەیە هێشتا لەبن ددانیان دا مابوویەوە, کەوتنە بیری ڕێکخستن و ئەنجامدانی جەژنی دیکە, ئەمجارەیان پەنجاهەمین ساڵیادی سەڵتەنەتی بنەماڵەی پەهلەوی لە مانگی (ئابان ١٣٠٤)هەتاوی دا کرا بە بیانو بۆ بەهەدەر دان و پەشێوییەکی نوێ, (عەلەم) یەکێك لە یاریدەدەرەکانی خۆی بەنێوی (د. باهری) کە پێشینەیەکی (تودەیی) هەبوو, هەڵبژارد بۆ سەرپەرشتی کردنی بەرنامەکانی ڕاگەیاندنی ئەم بۆنەیە و دەیان کتێبی دەربارەی پیاهەڵدانی بنەماڵەی پەهلەوی, کە هەریەکەیان بە پێشەکیەك کە بە واژۆی (عەلەم) دەستی پێدەکرد, بلاو کرایەوە[1]..

بەلام دونیا لەم ساڵانی (گەشەسەندن و خۆشگوزەرانی)ە دا بە جۆرێکی دیکە دەربارەی ئێران داوەری دەکرد و بانگەشەکانی (شا) دەربارەی ئەوەی کە ئێران بەم زووانە دەگۆڕێت بۆ پێنجەیەمین هێزی دونیا, بە گاڵتە دەزانرا, تەنها باسکردنی

---

[1] زۆرێك لە نوسەرانی ئەم کتێبانە دوای شۆڕشی ئیسلامی لە سەرکۆنەکردن و لۆمە کردنی بنەماڵەی پەهلەوی چونە ڕیزی شۆڕشگێڕانەوە, یەکێك لەوانە بەڕێوەبەر و سەرپەرشتی کاری بلاوکراوەکانی پەنجاهەمین ساڵیادی بنەماڵەی پەهلەوی لە ئەستۆ دا بوو, بە بلاو کردنەوەی گۆڤارێك کوشندەترین بابەتی دەربارەی گەندەڵیەکانی بنەماڵەی پەهلەوی چاپ و بلاو کردەوە, ئەم گۆڤارە بەڕادەیەك لەم کارەیدا زیادەڕەوی کرد کە وەزارەتی ئیرشادی ئیسلامی بەهۆی چاپکردنی وێنەیەکی ناشیرین لە بارەی بنەماڵەی پەهلەویەوە ڕێگری لە بلاو کردنەوەی کرد, لە ڕاستیدا یەکێك لەو وێنە ناشیرینانە دانانی سەری فەرەح بوو لە شوێنی سەری ژنێکی نیوە ڕووتی بیانی..!.

نمونەیەك بەسە بۆ نیشان دانی ئەم شێوە بیرکردنەوەیەی (شا)، نوسەرێکی ناسراوی ئینگلیزی بە نێوی (ئاندرو دانکن) لە ساڵی (١٩٧٨ز) دا لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (هێرش بەرەو پارە/Money Rush) توێژینەوەیەکی لە بارەی ئێران و وڵاتە خاوەن نەوتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە بەهۆی داهاتی زۆری نەوتەوە نوقمی پارە بووبوون، ئەنجام داوە، لە بەشی تایبەت بە ئێران دا، دوای باسکردنی کورتە مێژوویەك دەربارەی هاتنە سەرکاری (ڕەزاشا) و سەردەمی سەڵتەنەتی ئەو و کوڕەکەی، ئاماژەی بە خەیاڵ پڵاویەکانی (حەمەڕەزاشا) لە کۆتاییەکانی سەڵتەنەتدارییەکەیدا کردووە و بەم شێوە یە دەنووسێت:

.....بەڵام لەم سەردەمەدا (شا) خەیاڵاتی دیکەش دابووی لە سەری، هەمیشە جەختی لەسەر ئیمپراتۆریەتی کۆنی ئێران دەکردەوە کە لە یۆنانەوە تاهیندستانی لە ژێر دەستدا بووە و شانازی بە ڕابردووی ئیمپراتۆریەتەوە دەکرد و دەیوت: (شارستانیەتی ئێمە جگە لە وڵاتی (چین) کۆنترین شارستانیەتی پایەداری دونیایە، ئیمپراتۆریەتی ئێمە چەندین ساڵ بەر لە ئیمپراتۆریەتی (ڕۆم) لە لوتکەی شکۆ و گەشەسەندن دا بووە، لە ڕاستیدا ئێمە جیهانییانمان فێرکرد کە چۆنچۆنی ئیدارەی سەرزەوی فراوان بکەن)، دوای ئەوە ئاماژەی بە چەندین جۆر لەو شتانە دەکرد کە ئێرانیەکان دایان هێناوە، لە ساڵیادی جەژنی (٢٥٠٠) ساڵەی شاهنشاهی ئێران دا، سەرباری (پرنس فیلیپ) و (شابان دلماس)، نۆ پادشا و پێنج شاژن و بیست ویەك شازادە و شازدەی سەرۆك کۆمار و سێ سەرۆك وەزیر و دوو فەرماندەی گشتی و دوو وەزیری دەرەوە و نۆ شێخ و دوو سوڵتان، بەشدارییان کردبوو، (فەرەح) لەم بارەیەوە دەیووت: (ئێمە دەمانەوێت خەڵکی ئێرانی ئەمڕۆ ببینن، وڵاتانی دیکە ئەو هەمو پارە بۆ پەیوەندیە گشتیەکان و ڕاگەیاندن خەرج دەکەن، ئێمە ئەوەمان بە مفت و خۆڕایی تەواو کردووە..!).

نابێت لەوە زیاتر چاوەڕوانی لە کەسێك بکرێت کە لە ماوەیەکی کورت دا داهاتی وڵاتەکەی لە (٤/٨) ملیارد دۆلارەوە زیاد بکات بۆ (١٨/٥) ملیارد دۆلار، تەنانەت یەکێك لە کەسە نزیك و جێ بایەخەکانی (شا) دەیووت: (ڕێك وەك ئەوە وایە کە کەسێك بروسکەیەکی بۆ بێت و ببینێت کە تەنها مامێکی هەبێت، ئەو مامەشی

بڕی بیست ملیۆن لیرەی وەك میرات بۆ بەجێ بهێڵێت, چ چاوەڕوانییەکت لەو هەیە..؟).

سەرباری هەناردەی مەزنی سەربازی بۆ وڵاتە جیاوازەکانی دونیا, (شا) قەرزیشی پێ دەدان: (١/٢) ملیارد دۆلار بۆ ڕێکخراوی ئاوی ئینگلستان, یەك ملیارد دۆلار بۆ فەڕەنسا بە نێوی پێشەکی قیستی کلاوە ئەتۆمیەکان, یەك ملیارد دۆلار بۆ بانکی جیهانی, سێ ملیارد بۆ ئیتالیا بۆ پرۆژە هاوبەشەکان, حەوت ملیارد دۆلار بۆ ولاتە تازە پیشکەوتوەکانی کیشوەرەکانی ئەفریقا و ئاسیا, سێ ملیارد دۆلار بۆ ڕێکەوتننامەی بازرگانی لەگەڵ سۆڤیەت دا, (شا) شەش هەوڵی دا کە بە بەخشینی (٣٠٠) ملیۆن دۆلار لە کۆمپانیای (پان ئەمریکن)دا شەریك ببێت, (٧٥) ملیۆن دۆلار وەك ئیعتبار دایە کۆمپانیای گرومان (ئەم کۆمپانیایە شەڕکەری ئێف چواردەی بۆ وڵاتی ئێران دروست دەکرد), سێ فرۆکەی (جامبووجت)ی کڕی کە هەر یەکەیان بە (١٦/٦) ملیۆن دۆلار بوون و یەکێکیان لە ساڵی (١٩٧٧ز) دا پێش ئەوەی بهێنرێتە وڵاتی ئێران, دوبارە فرۆشتیەوەبە کۆمپانیای (تی دەبلیو ئەی) و (١٠٠) ملیۆن دۆلاری خەرجکرد بۆ کڕینی (٢٥٪)ی پشکی کۆمپانیای (کروپ), لە ڕونکردنەوەیەکیشیدا لەم بارەیەوە وتی: (ئەمریکیەکان پشکی گەورەی کۆمپانیا ئەوروپیەکان دەکڕن, هیچ کەس نقەی لێوە نایەت, بەڵام کاتێك ئێمە ئەم (٢٥٪) پشکەکان دەکڕین, هەمو لیبڕاڵەکان هەرایان لێ بەرز دەبێتەوە..).

حەمەڕەزاشا هەمو ئەم کارانەی بۆ ئەوە دەکرد کە بە بۆچونی خۆی ئێران لە ماوەی تەمەنی جیلێك دا بگاتە پلەی پێنجەمین بەهێزترین وڵاتانی دونیا لە دوای (ئەمریکا و سۆڤیەت ویابان و چین), ڕۆژێك لە مانگی (ئوت ١٩٧٤ز)دا لە ناکاو ئەندامانی کابینەکەی بانگهێشت کرد و ڕایگەیاند کە دەیەوێت بوودجەی بەرنامەی پێنجەمی ئاوەدانکردنەوەی ساڵی (١٩٧٣ – ١٩٧٨ز) بکات بە دوو ئەوەندە, واتە لە ٣٥( ملیارد و ٥٠٠ ملیۆنەوە زیاد بکات بە ٦٨ ملیارد و ٢٠٠ ملیۆن) دۆلار, ئەمە لە کاتێکدا کە بە ڕادەی پێویست کەسی پسپۆڕ و شارەزای بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیەی لە بەردەستدا نەبوو, بۆ (شا) جیاوازی نەبوو, ئەو پێشتر داوای بیست کلاوەی ئەتۆمی کردبوو, لە کاتێکدا ئێران تەنها چوار تەکنیککاری کلاوەی ئەتۆمی هەبوو, (شا) وا بیری دەکردەوە کە هەمو کارێك بە پارە دەکرێت, بۆ نمونە ڕایگەیاند

که دەبێت هەمو منداڵێك بخرێتە قوتابخانە بەڵام ئەوەی لە بیر کردبوو کە بەلانی کەمەوە پێویستی بە (٣٠) هەزار مامۆستای دیکە هەیە، وە (هوەیدا) دەیووت کێشە نیە، لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە وانە بە هەموان دەڵێینەوە، ئەوەیش لە بیری کردبوو کە نزیکەی (٦٥) هەزار گوندی ئێران کارەبایان نیە، دواتریش ئەگەر کەسێك پێی وتبا کە کارەبا نیە، دەیووت هیچ نیگەرانی ناوێت چەندین ملیارد باتری دەکڕین..!.

لە ڕوی سیاسیشەوە هەوڵ و جوڵانەوەکانی دیکەی (شا) شیاوی پێشبینی نەبوون، لە ناکاو ساڵی (١٩٧٥ز) ڕایگەیاند کە لە ئێران دا دەبێت تەنها یەك حیزب هەبێت، ئەمەش هیچ گۆڕانکاریەکی دروست نەدەکرد لەبەر ئەوەی ئەو دوو حیزبەی کە پێشتر هەبوون، هەردوکیان لە نۆکەر و خزمەتکارەکانی ڕژێم پێکهاتبوون، ئەم هەنگاوەی (شا) بەلای هوەیدا وە سەخت بوو، ئەمجارەیان چۆنچۆنی ئەم بابەتە بۆ (شا) ڕون بکاتەوە، لەبەر ئەوە خودی (شا) چەندین جار دژایەتی خۆی بۆ سیستمی تاك حیزبی ڕاگەیاندبوو، لە ساڵی داهاتوو دا ڕۆژ ژمێری مەزهەبی ئێرانی گۆڕی بە ڕۆژ ژمێری شاهنشاهی، بەڵام لە هاوینی ساڵی (١٩٧٨ز، ١٣٥٧هەتاوی) ناچار بوو دوبارە بیگۆڕێتەوە، یەکێك لە کارە سەیرەکانی دیکەی (شا) ئەوەبوو کە ویستی تەواوی (١٧٪) پشکی کۆمپانیای (بی پی) کە کۆمپانیایەکی نەوتی ئینگلیستان بوو بکڕێت، ئەمە لە کاتێکدا کە چەندین جار دەوڵەتی بەریتانیا ئەوەی ڕاگەیاندبوو کە ئەم (١٧٪) ی پشکی کۆمپانیایە بە تاکە کەسێك نافرۆشێت، بەڵام شەوێ پێش کاتی دیاری کراو، فەرمانی دابوو کە کۆمپانیای نیشتیمانی نەوتی ئێران داواکاریەك لەگەڵ چەکێکی (٢٠٠) ملیۆن دۆلاری دا بنێرێت، یەکێك لە سەرۆکە پێشوەکانی کۆمپانیای (بی پی) دەیووت: (بەمە دەڵێن گەمژەیی تەواو، هیچ شێتێك وەها کارێك ناکات، چەندە خۆ ویست و لە خۆ بایبە، لە نێو کۆشکەکەیدا بەندەو هیچ ئاگادارییەکی دەربارەی دونیای دەرەوە نیە، مەگەر ئەوانە نەبێت کە لە ڕێگەی ئەوانەوە پێی بگات کە دەچن بۆ سەردانی، هەڵبەتە هیچ کەسێکیش ڕاستیەکان بەو ناڵێت..).

بە هەر حاڵ بە هەڵە خەرج کردن و دەست بڵاویەکانی (شا) سەری گەیاندبووە هەسارەکان، لەماوە پێنج ساڵ دا بایی (٩٣) ملیارد دۆلار شمەکی بیانی کڕیبوو، کەشتیەکان بۆ خاڵی کردنی بارەکانیان نزیکەی (٢٥٠) ڕۆژ لە بەندەرەکانی ئێران دا چاوەڕوانییان دەکرد، دەوڵەتی ئێران ساڵانە یەك ملیارد دۆلار بۆ قەرەبووی ئەم

دواکەوتنە دەدا, میوە بەسەر چووەکانیان لە کەنداوی فارس دا دادەگرت, بارە برنجەکان هێدی هێدی لە گەرمای باشوردا دەگۆڕدران بۆ پلاو, دیسانەوە دوای داگرتنی ئەو بارانە بڕی پێویست ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر بۆ گواستنەوەی کالاکان نەبوو, ئەوکات چوار هەزار ئۆتۆمبێلی بارهەڵگر کە هەر یەکەیان نرخەکەی شەش هەزار دۆلار بوو لە ئەمریکا کڕی, بەلام شەقامەکانی ئێران بۆ ئەو ئۆتۆمبێلانە نەدەگونجا و تەسك بوون, لەگەڵ ئەوەشدا شۆفێری پێویست نەبوو, ئەو ئۆتۆمبێلانە هێشتا لە ساڵی (١٩٧٨ن)یشدا لە شوێنێکدا وەستێنراون و خەریکن زەنگ لێدەدەن.[1]

** ** **

باسکردنی سەرجەمی ئەو ڕوداوانەی کە بە ئەنجامدانی شۆڕش و ڕوخانی ڕژێمی (شا) کۆتایی هات, خۆی بابەتی کتێبێکی جودایە, کە پێشتر نوسەر لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (داستان انقلاب) باسی لێوە کردووە, بەلام لەکاتی نوسینی ئەو کتێبەدا لە ساڵی (١٣٧٠)هەتاوی دا چەندین بابەتی زۆر گرنگ بە نەنوسراوی مایەوە کە نوسەر بە هۆی هۆکارگەلێکەوە کە هاتنە پێش لەو کاتەدا مۆڵەتی ئاشکرا کردنی نەبوو.

ئەو داستانە نەوتراوانە, کە ئێستا بۆ یەکەمین جارە بلاو دەکرێنەوە, هەبوونی (پلانی ناچاری, گەلاڵەنامەی لەناکاوی) کە لەلایەن ئەمریکیەکانەوە بۆ جێنشینی (شا) بوو, کە سالانێك پێش ڕوخانی ڕژێمی سەڵتەنەتی لە سەرەتاکانی ساڵی (١٩٧٥ن) ئامادە کرابوو, بۆ یەکەمین جار نوسەر دوای مەرگی نهێنی ئامێزی ئەرتەشبەند (خاتەمی) فەرماندەی هێزی ئاسمانی سەردەمی (شا), لەبارەی ئەو پلانەوە زانیاریم دەستکەوت, (مورتەزا طلوعی)برام سەرهەنگی هێزی ئاسمانی, لە ئاماژەیەکی دا لەبارەی ئەوەی کە مەرگی فەرماندەی هێزی ئاسمانی (بە ئاسایی نازانێت) پێی وتم: پێدەچوو پلانی کودەتایەك لە بەرنامە دا هەبوویێت, بەلام زۆر

---

[1] ئاندرو دانکن: غارت ایران (بخشی از کتاب یورش بسوی پول), ت. فەزلولا نیك ئائین, انتشارات امیر کبیر, ١٣٥٨.

داوای لەمن کرد کە لەم بارەیەوە دەم نەکەمەوە, چونکە ئاشکرا کردنی ئەو بابەتە زۆر قورس بۆی تەواو دەبێت.[1]..

لەو کاتەدا لەسەر داوای براکەم, کە مافی باوکایەتیشی لەسەرم هەبوو, دەمم داخست و تەنانەت لەگەڵ نزیکترین دۆستانیشم دا لەو بارەیەوە نەدەدوام, تا ئەوەی کە دوای شۆڕشی ئیسلامی ئاو لە ئاش کەوتبوو, ئەویش خانە نشین بووبوو, دیسانەوە بەدوای ئەم بابەتەدا ڕۆیشتم, براکەم وتی:

(من وای بۆ دەچوم کە پلانی کودەتایەك لەلایەن (خاتەمی)ەوە هەبوو, چونکە پینج شەش مانگ پێش مردنی ڕەفتارەکانی ئەو بە تەواوی گۆڕدرابوو, مەرگی ئەویش وەك ئەوەی ڕایانگەیاند بەڕێکەوت نەبوو, وە لە ئەنجامی خرابکارییەکی دەستی ئەنقەست لە (کایت)[2]ەکەی دا کیانی لەدەست دا...., دواتر ئەوەم زانی کە ئەمریکیەکان پلانی کودەتایەکی ناچارییان بۆ جێگرتنەوەی (شا) هەبوو کە (خاتەمی) ڕێکخەری بوو, بە پێی ئەوپلانە لە کاتی تیرۆر کردن یان مەرگی لەناکاوی (شا) دا, خاتەمی دەسەلاتی بەدەستەوە دەگرت و ئەمریکیەکانیش بە پێی ئەو دەسەلاتەی کە لە بەشە جیاوازەکانی لەشکردا هەیان بوو تەواوی لەشکریان ڕادەسپارد کە پارێزگاری و گوێڕایەڵی ئەو بکەن, ئەم بابەتە لە ڕێگەیەکەوە کە من نازانم دەگاتەوە بە (شا), ئەویش گومان لە (خاتەمی) دەکات و بڕوای وا دەبێت کە ئەمریکیەکان نیازی لادانی ئەویان هەیە و (خاتمی) یان لەبەرچاو گرتووە بۆ جێگرتنەوەی ئەو, بەم پێشینەی کارەوە ناتوانرێت مەرگی (خاتەمی) بە ئاسایی سەیر بکرێت ئەویش لە کاتی ئەنجام دانی وەرزشێك دا کە (خاتەمی) زۆر تیایدا لێهاتوو بووە..), براکەم بە سروشتی ئەو پارێزکارییەی کە هەیبوو, سەرچاوەی هەمو ئەم ڕوداوانەی کە بۆی گێڕامەوە پێ نەوتم, وە دوبارەش داوای لێکردم کە ئەم بابەتە لە شوێنێك نەنوسم...!.

لە سەرەتاکانی ساڵی (١٣٧٠)هەتاوی کە سەرقاڵی نوسینی کتێبی (داستان انقلاب) بووم, بۆ نوسینی ئەم ڕوداوە و ئەو شیکردنەوانەی کە خۆم هەمبوو لە سەر

---

1 لەو کاتەدا سەرهەنگ مورتەزا طلوعی سەرۆکی بلاوکراوەکانی هێزی ئاسمانی بوو.

2 ئامێرێکە بۆ هەڵفڕینی کەسێك بە بێ ماتۆڕ, بریتیە لە دوو باڵی گەورە کە کەسێك بە خۆیەوە دەبەستێت و لە بەرزییەوە خۆی هەڵدەداتە خوارەوە بە مەبەستی فڕین.

ئەم ڕوداوانە، مۆڵەتی نوسینم لە براکەم کە لە ئەنجامی نەخۆشی دا کەوتبوو وەرگرت و وتی: (باوەڕ ناکەم چەند مانگێك زیاتر بمێنم، دوای مردنی من هەرچی کە دەتەوێت بینوسە..)، ئیدی زۆر لەسەری نەچووم و بە ئومێدی سەلامەتی ئەو و ئەوەی کە هەرگیز هەڵی نوسینی ئەو بابەتەم نەبێت، ماڵئاواییم لێ کرد، لە دیدارەکانی دواتریش دا هەتا مردنی ئەو لە مانگی موردادی (١٣٧١)هەتاوی دا ئیدی باسی ئەم بابەتەم لەگەڵدا نەکردەوە.

شیکردنەوەی من بۆ ئەم ڕوداوە، بە سەرنج دان لەکاتی ڕودانەکەی، ئەوەیە کە ئەمریکا دوای هەڵەشەیی و پەلەکردنەکانی (شا) لە ڕێکخراوی (ئۆپیك) لە ساڵانی (١٩٧٣ – ١٩٧٤ز) دا و واژۆ کردنی ڕێکەوتننامەی (ئەلجەزائیر) لە نێوان (شا و سەدام حسەین) دا لە مانگی (مارس ١٩٧٥ز، ئەسفەند ١٣٥٣هەتاوی)، پێوشوێنی پلانی جێگرتنەوەی ئەویان بە ڕژێمێکی سەربازی گرتووە، پێدەچێت ئەم پیلانە زەمینەی پێشتری هەبووبێت، واتە هەر بەو شێوەیەی کە وترا ئەم پیلانە بۆ کاتی ناچاری یان کاتێك کە بەهۆی مردنی (شا) وە ڕەوشەکە خەریك بێت کە لەدەست دەربچێت، لەبەر چاو گیرابوو، بەڵام کاتێك ئەمریکیەکان هەست بەوە دەکەن کە خەریکە خودی (شا) لە دەست دەردەچێت، بە وردی پێوشوێنی بابەتەکە دەگرن، پیدەچێت سیخوڕەکانی (شا) بە دەستکەوتنی نوسین و نامە ئاڵوگۆر پێکراوەکان لە نێوان دەزگای ڕاوێژکاری ئەمریکا و پنتاگۆن دا، (شا) یان لەم پیلانە ئاگادار کردبێتەوە.

کاتێك کە کاری وشەچنی ئەم کتێبە کۆتایی پێهات و ئامادەی چاپ بوو، نوسخەی ڕاستەقینەی یاداشتەکانی (عەلەم) بە هاوکاری دەزگای (کتاب سرا) بلاّو کرایەوە، ئەم کتێبە بەرگی یەکەمی یاداشتەکانە کە ڕوداوەکانی ساڵانی (١٣٤٧ – ١٣٤٨)هەتاوی باسدەکات، بەڵام لە پێشەکەیەکەیدا هەندێك بابەت کە ئاخنراوەتە نێو یاداشتەکانی (عەلەم) لە ساڵانی دواتردا، وەك ئاماژە بۆ گفتوگۆکانی (شا و عەلەم) دەربارەی مەرگی (خاتەمی) کراوە، کەپاڵپشتی بابەتەکانی سەرەوەیە، لە پێشەکی کتێبەکەدا کە لەلایەن یەکێك لە نزیکەکانی (عەلەم)ەوە نوسراوە، هاتووە:

(لە یاداشتەکانی (عەلەم) دا بە بۆنەی مەرگی ئەرتەشبەند (خاتەمی)ەوە، بابەتگەلێك کە هەرچەندە ڕون نین خراوەتە ڕوو، کە خوێنەر بە سەرسامیەکی زۆرەوە

دەخاتە نێو چەندین پرسیارەوە, ڕۆژی هەینی (٢١ شەهریوەر ١٣٢٥ هەتاوی), کە چەند ساڵێك بوو خاتەمی لە ڕۆژانی پشو دا بۆ خلیسکانی سەر ئاو دەڕۆیشت بۆ دەریاچەی (بەنداوی دن), لەکاتی فڕینی بە گلایدر[1], لە ناکاو چەند جارێك بەر تاوێرەکانی کەناری دەریاچەکە کەوت و گیانی سپارد, (خاتەمی) بە کەسە نزیکەکان و سەر فیداکارەکانی (شا) دەهاتە هەژمار, لە مانگی موردادی (١٣٣٢)هەتاوی دا بە فڕۆکەوانی ئەو فڕۆکەیەی کە (شا)ی گەیاندە بەغداد, وەفاداری ڕاستەقینەی خۆی بۆ (شا) سەلماندبوو, عەلەم دڵنیا بوو لەوەی کە ئەم ڕوداوە زۆر (شا)ی نیگەران کردووە, ڕۆژی دواتر پێشنیاری بۆ (شا) کرد کە لیژنەیەك لەلایەن لەشکرەوە بۆ هۆکاری ڕودانی ئەم کارە پێك بهێنرێت, بە تایبەت کە گێڕانەوەی دژبەیەك و جۆراو جۆر لەم بارەیەوە بڵاو بووەتەوە, لەلایەکەوە دەوترا کە هێزی ڕەشەبا ئەوی داوە بەو تاوێرە بەردانەدا, لەلایەکی دیکەوە هەندێکی دیکە دەیانووت لەوکاتەدا هیچ ڕەشەبایەك نەبووە, باڵەکانی (گلایدر)ەکە لەناکاو لێبووەتەوە و (خاتەمی) وەك بەرد کەوتووەتە خوارەوە, لەوانەیە شتێکی (گلایدر)ەکەیان خراپ کردبێت, (شا) پێشنیارەکەی (عەلەم) پەسەند دەکات و فەرمان دەدات لیژنەیەك لە لەشکر دا ڕاسپێردرێت بۆ بەدواداچونی ئەم ڕوداوە[2], بەڵام (شا) زیاتر لەسەر دەڕوات و دەڵێت: (ئەگەر خۆی بە بێ باڵ کەوتوەتە خوارەوە و ڕەشەبا هۆکاری ڕودانی ئەو ڕوداوە نەبووبێت, ئەوا خۆی باڵەکانی خۆی کردوەتەوە و مەبەستی خۆ کوشتنی هەبووە, من لە خزمەتیدا وتم: خۆ ئەو لە هیچ شتێك نیگەران نەبووە, فەرمویان بۆچی! لەم یەك دوو مانگەی کۆتاییدا نیگەران بوو...).

لە یاداشتی ڕۆژی (شەممە ٢٢ شەهریوەر ١٣٥٤)هەتاوی, عەلەم سەرسام بوو کە بۆچی (شا) هیچ جۆرە نیگەرانییەك لە ڕوخساریدا نابینرێت, چەند شەوێك دواتریش لە کاتی نانی ئێوارەدا شازنە (فەرەح),(شا)ی وە ئاگا هێنایەوە لە قایمکاری نەکردنی (شا) لە لێخوڕینی فڕۆکە و هەلی کۆپتەر دا و چارەنوسی (خاتەمی) خستە

---

1 جۆرە فڕۆکەیەکە.

2 سەر لەشکر (ئاقاخانی) لە هێزی ئاسمانی کە ڕاسپێردرابوو بۆ بەدوادا چوونی ئەم ڕوداوە, لە ڕاپۆرتەکەیدا ڕایگەیاند کە ڕوداوەکە بە ڕێکەوت ڕوی داوە.

بەر چاوی، مایەی سەرسامیە کە دیسانەوە (شا) دوبارەی کردەوە و فەرمویان: (خاتەمی لەم دواییانەدا بارێکی دەروونی هاوسەنگی نەبووە).

لە یاداشتی ڕۆژی (٢٦ شەهریوەری ١٣٥٤)هەتاوی، هەفتەیەك دواتر (شا) ڕازی دڵی خۆی بۆ (عەلەم) ئاشكرا دەكات: (... دەربارەی لەشكر و هەروەها خوالێخۆشبوو ئەرتەشبەند (خاتەمی)ەوە بابەتێكی فەرموو كە ئیدی بە بۆچونی من زۆر نهێنیە و دەبێت لەگەڵ من دا بچێتە نێو خاكەوە... ئەڵبەتە شاهنشا زۆر حساب بۆ لەشكر دەكات و وردەكاریەكانی كاروباری لەشكر و بەرپرسەكانی لەشكر و هەمو شتێك بەدڵی خۆیی دەزانێت، كە لە ڕاستیدا مایەی سەرسامییە.

لە یاداشتی ڕۆژی (٣ میهر ١٣٥٤)هەتاوی دا، چەند مانگێك دواتر (شا) پرسی داراییەكەی (خاتەمی) كە دەوترا نزیكەی (١٠٠) ملیۆ دۆلارە، هێنایە بەرباس، بەلأم (عەلەم) ئەو ژمارەیەی بە زۆر دەزانی، لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرە دا خودی (عەلەم)یش دڵەڕاوكێی هەبوو، چونكە (شا) زۆربەی جار بەبێ ئاگاداری و لێوردبوونەوە هیچ شیتێك ناڵێت، بەلأم بڕوایان وا بوو كە ئەگەر بەڵگەیەكی بڕواپێكراو لەبەردەستدا هەبێت بۆ خراپ سود وەرگرتنەكانی (خاتەمی)، ئەوا دەبێت داراییەكەی ئەو بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت بەند بكرێت.

یاداشتەكانی ڕۆژی (١١ دی ١٣٥٤) هەتاوی، (شا زۆر گرنگی بە خراپ سود وەرگرتنی دەوروبەرەكەی نەدەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەشی بۆ دەست كەوتنی ئەوجۆرە كەسانە بە سودمەند دەزانی... ئێستا ڕوون نیە، چ هۆكارێك بووەتە هۆی ئەوەی كە بە پێداگرییەوە لە بارەی (خاتەمی)ەوە ئەم پرسە پێوشوێن دەگرێت، بەلأم بەهەر شێوەیەك بێت، بێگومان بە نیگەرانیەكانی (خاتەمی) لە دوایین مانگەكانی تەمەنی خۆیدا و لە دڵەوە باوەڕ نەكردنی (شا) بە (عەلەم) دەربارەی لەشكر، بێ پەیوەندی و مەلأمەت نییە، لەگەڵ ئەوەی كە (عەلەم) لەم بارەیەوە زۆر بە شاراوەیی و سەر بەستراوی قسان دەكات، بەلأم ڕستەی: ( ئەگەر ئەم دەسەلأتەی (شا) بەسەر كاروباری نێو خۆیی ئەم ولأتە و ئەم وردەكاریانەوە نەدەبوو، نازانم ئەمڕۆ ولأتی ئێمە

**له كوێدا دەبوو...)، زۆر واتا دارە و پڕپەتی لە ڕوداوی زۆر گرنگ (بەلانی کەمەوە لە لای شا) کە پێدەچێت هەرگیز نەزانرێت...)[1].**

**دواتر خودی نوسەری پێشەکی یاداشتەکانی (عەلەم) ئاماژە بە دودڵی هەبوونی پلانێکی تایبەت لەلایەن ئەمریکاوە بۆ سەر ئێران دەکات، کە ئەوی بە (پلانی نەوەك ڕۆژێك) ناو بردووە،تیایدا ئاماژە بە ڕۆڵی (خاتەمی)ش دەکات لەم پلانەدا، کە پێشبینی کرابوو لە کاتی پێویستدا لەشکری ئێران جڵەوی وڵات بگرێتە دەست، بەڵام بە ئیحتیمالێکی زۆرەوە کە خودی خاتەمیش بە ڕونی ئاگای لەم پیلانە نهێنیە نەبووە، ئەگەر نا خۆی بابەتەکەی بە (شا) ڕادەگەیاند.[2]..**

**هۆکاری هەڵبژاردنی (خاتەمی) بۆ ڕێکخستنی (پلانی ناچاری)، یان ئەو زاراوەیەی کە نوسەری پێشەکی یاداشتەکانی (عەلەم) بەکاری هێناوە (پلانی نەوەك ڕۆژێك)، سەرباری سەر فیداکردنی خاتەمی لە ڕێگەی ئەمریکیەکان دا و زات و توانایی ئەو لە ڕێکخستن و جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەیە، نزیکی ئەویش بوو لە (شا)، ئەمریکیەکانیش لەو باوەڕەدا بوون کە شا هەرگیز گومانی خراپ بە مێردی خوشکی خۆی و ئەو کەسەی کە لەنێو کەسە سەربازیەکان دا لە هەموان زیاتر لێیەوە نزیکە، نابات، وە ئەگەر نا خاتەمی لە ڕوی گەندەڵی دارایی و ئەخلاقییەوە (کە بە ڕواڵەت ئەمریکیەکان لە هەمو شتێك زیاتر گرنگی پێدەدەن) دەستی هەموانی لە پشتەوە بەستبوو، خراپ سود وەرگرتن و بەکارهێنانە داراییەکانی ئەو تەنها بچوك نەکرابوویەوە لە وەرگرتنی مافی کارکردن لە کۆمپانیاکانی دروستکردنی فڕۆکەدا، بەڵکو خاتەمی لەم ساڵانەی دواییدا کەوتبووە زەوی خواردن، بەو واتایەی کە زەوی فراوانی لە دەوروبەری تاران و شارە گەورەکان دا زەوت و داگیر دەکرد و دواتر بە نێوی دروستکردنی فڕۆکەخانەی نوێی سەربازییەوە ئەم زەویانەی لەسەر بوودجەی هێزی ئاسمانی دەکڕی و دواتر لە بانکەکانی دەرەوەدا دەیخستە حیسابی تایبەتی خۆیەوە، دوای مردنی ئەو سەرمایەکەی درا بە (فاتمە)ی هاوسەری و خوشکی**

---

[1] **امیر اسدالله علم: یاداشتهای علم، انتشارات کتاب سرا، جلد اول، ص٨٩ –٩٠.**

2 **یاداشتهای علم: ص ٩٢.**

بچوکی شا, که ئەویش لە ساڵی (١٣٦٧)هەتاوی  بە نەخۆشی سەرەتان گیانی لەدەست دا.[1]

** ** **

ڕوداوی مردنی خاتەمی, لە لوتکەی سەرکەوتنە سیاسیەکانی (شا) دا, گورزێکی توندی دەرونی بوو بەر ئەو کەوت, خاتەمی مرد, بەڵام زیانی گەورەی گەیاند بە بڕوابوونی (شا) بە ئەمریکیەکان, کەئەوانی بە گەورەترین پشتیوانی خۆی دەزانی, ئەم نیگەرانیانەش لە قوڵایی دەرونی ئەودا مایەوە, کە دوای خاتەمی چ کەسێك دابنێت لە جێگەی ئەو دا, هەڵبژاردنی (کارتەر) بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە ساڵی (١٩٧٦ز)دا ئەم نیگەرانیانەی (شا)ی دوو ئەوەندە کردەوە, لەبەر ئەوەی کاتێك باشترین دۆستەکانی ئەو (نیکسۆن و فۆرد) ویستیان گورزی لێبدەن, ئەوا ئارەزومەندی دوژمنێکی وەك کارتەر بە تەواوی ڕون بوو....!!.

دوای شۆڕشی گەلانی ئێران, ئەو بیرو بۆچونە لەنێو خەڵکی ئێران دا بڵاو بوویەوە کە ئەگەر (کارتەر) هەڵنەبژێردرایە بۆ سەرۆك کۆماری ئەمریکا و (شا) لە ژێر فشاری ئەو دا ڕەزامەندی لەسەر (کەش و هەوای سیاسەتی کراوە) دەرنەبڕیایە, لەوانە بوو سەڵتەنەکەی زیاتر درێژەی بکێشایە و کوڕەکەشی دەگەیشتە پۆستی سەڵتەنەتی ئێران, بە بۆچونی نوسەر, پایەکانی سەڵتەنەتی پەهلەوی, تەنانەت پێش هاتنە سەر کاری (کارتەر)یش, کەوتبوونە لەرزین, ئەو بەڵگەو مەدرەکانەی کە دوای سەرکەوتنی شۆڕش بڵاو کرانەوە, نیشانی دەدەن کە ئەمریکیەکان لە هەمان ساڵی (١٩٧٥ز) دا, کە (شا) چەندین هەنگاوی چاوەڕوان نەکراو و بێ مۆڵەتی ئەمریکیەکان لە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوەیدا هەڵهێنا, زەمینەی گۆڕینی ڕژێمەکەی ئەویان بە

---

[1] سەرمایەی فاتمە لە کاتی مردنی دا لە هەندێك لە سەرچاوە بیانیەکان دا بە مەزەندە کراوی گەیشتووەتە (٥٠٠) ملیۆن دۆلار,!! ئەمیر طاهیریش لە کتێبەکەیدا بەنێوی (زندگی ناشناختە شا/ ژیانی نەناسراوی شا) لە ص ٢٥٣ دا هەمان ژمارەی نوسیووە, ئەڵبەتە ئەویش وەك سەرجەم ئەندامانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی تۆزقاڵێکی بەکەس نەدەدا و هەتا لێواری مەرگیش یەك دۆلار لەم سەرمایە با هاوردەیەی وەك هاوکاری بە هاوولاتییەکی خۆی نەدا, تەنانەت دەڵێن فاتمە بە هەبوونی ئەو سەرمایەش هاوکاری دایکیشی نەدەکرد کە بە دژواری ژیانی دەگوزەراند.

ڕژێمێکی ملکەچ تر و گوێڕایەڵ تر فەراهەم دەهێنا, پیلانی یەکەم: جێگرتنەوەی گۆڕینی ڕژێمی سەڵتەنەتی بە ڕژێمێکی سەربازی بوو, کە بە کوشتنی (خاتەمی) وەستێنرا, وە بەڕواڵەت هەلێکی گونجاو بۆ دیاری کردنی کەسێکی گونجاو تر بۆ ڕێکخستن و جێبەجێکردنی ئەم پیلانە پەیدا نەکرا, دوای ئەم ڕوداوە, (شا) کە لە مەبەستی ئەمریکیەکان نیگەران بوو بوو, کەوتە بیری دروستکردنی پەیوەندیەکی نزیکتر لەگەڵ دەوڵەتی سۆڤیەت و وڵاتە کۆمۆنیستەکان دا, تەنانەت دەست پێشخەری کرد بە کڕینی چەك لە وڵاتی سۆڤیەت و وڵاتانی کۆمۆنیست, کە جار لەدوای جار گومان خراپی ئەمریکیەکانی لە بەرامبەر خۆیدا زیاتر دەکرد, ڕیکەوتننامەی (شا و سەدام حسەین) لە (ئەلجەوائیر)یش کە بە بەستنی پەیماننامەی چارەسەر کردنی کێشە سنوریەکانی ئێران و عێراق کۆتایی هات, بوویە هۆی نزیك بوونەوەی وڵاتی ئێران لە وڵاتە عەرەبیەکان, کە مایەی ڕەزامەندی ئیسرائیل نەبوو, وە بە هەبوونی دەسەڵاتی زۆری ئیسرائیل لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و سەرجەم ناوەندەکانی بڕیاردان لە ئەمریکا, بەتەواری ڕەوشێکی نەیار و دژی ئێران لە ئەمریکادا پەرەی سەند.

لە فەبریوەری ساڵی (١٩٨٦ز) دا, واتە لە سەردەمی حکومەتی (فورد) دا, وە یازدە مانگ بەر لەوەی کە (کارتەر) پێ بخاتە نێو کۆشکی سپییەوە, لیژنەیەکی لێوڵینەوە لەلایەن (سی ئای ئەی)ەوە بە سەرپەرشتی (ئێرنست ئۆنی/ Earnest Oney) ڕاپۆرتێکی دەربارەی بنەماڵەی سەڵتەنەتی و دروستکردنی حکومەت لە ئێران دا ئامادە کرد, بە تیراژێکی دیاری کراو و لە کۆمەڵەی بڵاوکراوە نهێنیەکانی (سی ئای ئەی) دا چاپ کرا و لە نێوان بەرپرسەکانی (سی ئای ئەی) و هەندێك لە خاوەن پۆستە باڵاکانی ئەمریکا دا دابەشکرا, لەم ڕاپۆرتەدا بنەماڵەی سەڵتەنەتی ئێران بە (کوانوی ڕەگەزی گەندەڵ و هەرزە و شەهوەتباز) ناساندوە, بەر لە هەمو ئەندامانی بنەماڵەی سەڵتەنەتیش سەرەتا باس لە (ئەشرەف پەهلەوی) وەك بەدەسەڵات ترین و لە هەمان کاتیشدا دەبەنگ ترین ئەندامی بنەماڵە کراوە, لە ڕەوشی ژیانی (ئەشرف پەهلەوی) دا کە نزیکەی دوو لاپەڕەی تەواوی ئەم ڕاپۆرتەی داگیر کردووە, دوای باسکردنی کاروباری پەیوەست بە ژیانی تایبەتی (ئەشرەف)ە وە و پەیوەندی ئەو لەگەڵ ئەو پیاوە لاوانەی کە بە دەست لە پشتدانی ئەو گەیشتونەتە

پۆستی گرنگ و بەرزی دەوڵەتی, ئاماژە بە گەندەڵی دارایی و دەنگۆی بەشداری کردنی ئەو لە قاچاخچییەتی مادە هۆشبەرەکان دا کراوە, وە لە کۆتاییدا دەنووسێت (شەهرام)ی کوڕی ئەشرەفیش لە گەندەڵی دارایی دا لە دایکی کەمتر نیە, پشکداری نزیکەی بیست کۆمپانیای بازرگانی و چەند یانەیەکی شەوانەیە, هەروەها (شەهرام) لە ڕێگەی قاچاخی کردنی چەندین جۆری مەواد و شمەکە مێژوییەکانەوە خراپەکاری زۆری بۆ بەرژەوەندی خۆی کردووە, وەك زۆرێك لە بەرهەمە هونەریە لە مێژینەکان و شمەکە کۆنەکان کە لە گردی (مارلیك) دۆزرانەوە, بە شێوەیەکی نایاسایی لە ئێران دا بردنیە دەرەوە.

ڕاپۆرتەکەی (سی ئای ئەی) دەربارەی ئەندامانی دیکەی بنەماڵەی سەڵتەنەتی, جگە لە (فەرەح و عەبدولڕەزا) بە باشی باسی کەسی دیکەیانی نەکردووە, لە نێو ئەوانەدا دەنووسێت: (شەمس)ی خوشکە گەورەی (شا), هەرچەندە لە چاو ئەشرەفی خوشکی دا کەسێکی باشترە, سەرقاڵی کاری بیناکاری و بازرگانییە, شارۆچکەیەکی گەورەی لە ڕۆژئاوای شاری تارانەوە دروست کردووە و کۆشکە تایبەتیەکەی خۆشی هەر دەکەوێتە ئەو ناوچەیەوە, (غولامڕەزا)ی تاقە کوڕی سێیەم ژنی (ڕەزاشا) کە دوای مردنی (عەلیڕەزا) لە کارەساتێکی هەواییدا, بە گەورەترین برای (حەمە ڕەزا شا) دێتە هەژمار, کەسێکی پارە خۆشەویست و خاوەن تایبەتمەندی خراپ و بێ شەخسیەتە, (عەبدولڕەزا) برایەکی دیکەی (شا) کە لە چاو ئەوانی دیکەدا ناوبانگێکی باشتری هەیە, خۆی لە دەرباری شاهنشاهی دور خستوەتەوە و لە وتەکانیەوە بابەتگەلێکی ڕەخنە گرانە لە (شا) و بنەماڵەی سەڵتەنەتی بلاو کراوەتەوە, (فاتمە) خوشکی بچوکتری (شا)یش چەندین کارەساتی عاشقانەی تێپەڕاندووە: لە تەمەنی (١٨) ساڵی دا عاشقی (خەسرەو قەشقائی) بووە, دواتر هاوسەرگیری لەگەڵ لاوێکی ئەمریکی دا بە ناوی (وینسنت هیلر) ئەنجام داوە, دوای وەرگرتنی تەلاق لە (هیلر) ماوەیەك عاشقی (ئەردەشێر زاهیدی) بووە, سەرەنجام لەگەڵ ژەنەڕاڵ (خاتەمی) فەرماندەی هێزی ئاسمانی ئێران دا هاوسەرگیری ئەنجام دەدات.

ڕاپۆرتەکەی (سی ئای ئەی) لەبارەی شیکردنەوەی کەسایەتی (شا) دا, ئەوی بە شایەکی خۆویست ناو بردووە, کە جگە لە ئەندامانی بنەماڵەکەی خۆی تەنها لەگەڵ دە دوازدە کەسی دیکە, کە (ئەمیر ئەسەدولای عەلەم)ی وەزیری دەرباری

شاهنشاهی له سەرو هەموویانەوەیە, کۆدەبێتەوە, ڕاپۆرتەکە لەم بارەیەوە درێژەی پێ دەدات کە: (ئەو زانیاری و هەواڵ تەنها لەو کەسانەوە وەردەگرێت, ئەو ڕاوێژ لەگەڵ کەسدا ناکات, کەمتر کەسێك زاتی ئەوە دەکات کە بۆچونێك بەپێچەوانەی بۆچونی ئەوە وە بڵێت, ئەو بڕیار دەدات و دەورووبەرەکەی تەنها جێبەجێکاری بڕیارەکانی ئەون...).

ڕاپۆرتەکەی (سی, ئای, ئەی) دەربارەی پەیکەری حکومەتی ئێران جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە وڵاتی ئێران بەشێوەیەکی ڕاستەقینە لە دەستی (٤٠) خێزان دایە, کە پۆستە باڵاکانی دەوڵەت و کارە بازرگانیەکانیان پاوەن کردووە, دوای ئەوانیش (١٥٠ تا ١٦٠) خێزانی دیکە هەن کە لە پلەی دووەمی بە دەستەوە بوونی کارەکان دان, کە پلەی دووەمی پۆستە سیاسی و کاروبارە بازرگانیەکانیان خستووەتە ژێر دەستی خۆیان, سەرجەمی ئەم خێزانانە نزیکە ی (٢٠٠) خێزان دەبێت, کە جێگەی هێز و دەسەڵاتی هەزار خێزان یان گرتوەتەوە, لە ڕابردوودا ئەمریکا ئەمانەی بە خێزانانی فەرمانڕەوا بەسەر ئێرانەوە ناو دەبرد, دواتر ڕاپۆرتەکەی (سیا) باس لە دام و دەزگاکانی حکومەتی ئێران دەکات و دەنووسێت: (دەوڵەت و پەرلەمان لە ئێران دا ئەو تواناو دەسەڵاتەیان نیە کە ئەو دام و دەزگایانە لە وڵاتانی دیموکراسی دا هەیانە, وە لە ڕاستیدا جگە لە بەڵێ کردن بۆ بڕیارەکانی (شا) و جێبەجێکردنی ئەو بڕیارانە هیچ ڕۆڵێك لە نێو کایە سیاسیەکانی ئێران دا نابینن), هەر لەم ڕاپۆرتەدا گرنگترین هۆکارێك بۆ مانەوەی (هوەیدا) لە پۆ ستی سەرۆك وەزیری دا: (توانایی ئەوە لە خۆپاراستن لە کەمتەرخەمی یان هەڵەیەك لە جێبەجێکردنی فەرمانە شاهانەییەکان و خۆ خستنە پەنای (شا) وە), باسکراوە.[1]

** ** **

حەمەڕەزا شا کەم تا زۆرێك ئاگای لە ناڕەزاییەکانی ئەمریکیەکان لە حکومەتەکەی خۆیی هەبوو, هەر لەبەر ئەوە دوای هاتنە سەر کاری (کارتەر) شێلگیرانە کەوتە بیری قەرەبوو کردنەوەی هەڵوێستەکانی ڕابردوی و ڕاکێشانی

---

[1] ئەو بابەتانەی کە لەم ڕاپۆرتە نهێنیەی (سیا) وە وەرگیراوە, لە دەقە ئینگلیزیەکەی ئەم ڕاپۆرتە لە بەڵگەنامەکانی لانەی جاسوسی (ژمارە ٧)ە وە وەرگێڕدراوە و پوخت کراوەتەوە.

سەرنجی ئەمریکیەکان بەلای خۆیدا: سەرەتا حکومەتە سیازدە ساڵیەکەی (هوەیدا)ی گۆڕی و (جەمشیدی ئاموزگار)ی پیاوی دەوڵەت و خاوەن بڕوانامەی ئەمریکی و ناسراو بە کەسێکی پاك و ڕاستگۆی ڕاسپارد بۆ پێکهێنانی حکومەت, بۆ ڕەچاو کردنی پێوەرەکانی مافی مرۆڤ, کە سەنگەری سەرەکی بانگەشەی نەیارەکانی ئێران بوو لە ئەمریکا دا, (ڕەوشی کرانەوەی سیاسی) ڕاگەیاند, دوای ئەوانەش بۆ جێبەجێکردنی ویستەکانی دیکەی ئەمریکا, بەرەو ئەو وڵاتە کەوتە ڕێ, خۆپیشاندانی فراوانی نەیاران لە کاتی گەیشتنی (شا) بە کۆشکی سپی, کە بوویە هۆی تەقاندنی گازی فرمێسك ڕێژ لەلایەن پۆلیسەوە بە مەبەستی بڵاوە پێکردنی خۆپیشاندەران, کە تەنانەت فرمێسك لە چاوی (کارتەر) و میوانەکانیش هات, دەستپێکێکی ناخۆش بوو بۆ ئەم سەفەرەی شا, بەڵام (شا) لە هەمان یەکەمین دیداری دا لەگەڵ سەرۆك کۆماری نوێی ئەمریکا دا سەری خۆ بەدەستەوە دانی شۆڕ کرد و بەڵێنی دا کاربکات بۆ ڕێگرتن لە بەرز بوونەوەی نرخی نەوت, لەم دیدارەدا, (شا) هیچ شوێنێکی بۆ سکاڵا و گلەییەکانی ئەمریکا لە ئێران نەهێشتەوە, ئەمجارەش لە کاتی گەڕانەوەی دا (شا) کەمێك بڕوا بە خۆبوونی بە بەردا هاتەوە و جارێکی دیکە بە خەیاڵی پڵاو پاڵی بە پایەی سەڵتەنەتەوە دا, بەڵام کێشەکانی دارایی و بێسەروبەریەکان و پەشێویەکانی ڕابردوو لە لایەك و زیانەکانی (ڕەوشی کرانەوەی سیاسی) کە بوویە هۆی واڵا کردنی زارەکان و هەستانەوەی قەڵەمەکان بۆ ڕەخنەگرتن لە حکومەتی خۆپەسەند, کە تایبەتمەندیەکانی بریتی بوون لە پڕ کێشەیی و گەندەڵی, هێدی هێدی بزوتنەوەیەکی لە کۆمەڵگەدا دروستکرد, کە ڕۆژ بە ڕۆژ کپکردنەوەی دژوارتر دەبوو.

لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵە شەوورۆژانەیە و نیەت پاکیەی کە (ئاموزگار) هەیبوو لە کارەکانیدا, دەستەوسان مایەوە: لەلایەك کەمکردنەوە لە خەرجیەکانی دەوڵەت دوای سالانێك لە بەتاڵان بردن, ژمارەیەکی زۆر خەڵکی کە لەم سفری ڕاخراوە سودمەند دەبوون, ناڕازی کرد و بەرەو ڕیزی نەیارانی حکومەت تاویان دا, وە لەلایەکی دیکەشەوە کەم کردنی داهاتی نەختی دەوڵەت و هەڵهاتنی سەرمایەدارەکان بۆ دەرەوەی وڵات, گەشەی ئابووری وەستاند, ناڕەزاییەکانی شەقام کە لە رابردودا شارابوونەوە, بە هۆی (ڕەوشی کرانەوەی سیاسی)یەوە لە لاپەڕەی چاپکراوەکان و

تەنانەت ڕادیۆو تەلەفزیۆنیشدا کە بووبوونە کوانوی چەپگەراکان, ڕەنگی دایەوە, سەرسامی ئەو ڕوداوانە و خودی (شا) یش کە بە دامەزراندنی (لیژنەی شاهنشاهی) و پەلکێشانی وەزیر و کەسانی پۆست بالاّ بۆ بەردەم دادگاکان و دادگایکردنیان لەبەردەم کامێرای تەلەفزیۆنەکان دا, پەرەی دا بە لافاوی ناڕەزایی و پەشێویەکانی شەقام, وەکو هەمیشە ئامانجی (شا) ئەوە بوو کە بەرپرسیارێتیەکان لە کۆڵی خۆی بکاتەوە و هەمو تاوان و نەنگی و خراپەکاریەکان بخاتە ئەستۆی خەڵکانی دیکە, بەلاّم ئەگەر لە ڕابردوو دا ئەم کارانە بەنهێنی و لە پشتی دەرگا داخراوەکانەوە دەمانەوە, ئەمجارەیان وەزیران و پۆستدارەکانی حکومەت بە شەرمەزاری و عارەق ڕژان دەخرانە بەرامبەر کامێرای تەلەفزیۆنەکان و باسی بێسەروبەری و خراپ بەکار هێنانی پۆست و بەر پرسیارێتیەکانیان دەکرد, کە نەك تاوانبار کردنی دەوڵەت بەڵکو ڕژێمی تاوانبار دەرکرد..!.

حەمەڕەزاشا لەم ڕەوشە قەیراناویەی ئێران دا سیاسەتە کۆنەکەی خۆیشی (پەرتکە و زاڵ بە, ناکۆکی بنێرەوە و حکومەتداری خۆت بکە)ی واز لێنەهێنا: تەنانەت ئەم سیاسەتە دوای ڕوداوی کوشتنی (خاتەمی)ش لە نێو لەشکردا توند بوویەوە و (شا) بۆ ڕێگرتن لە هەر جوڵانەوەیەك دژی خۆی, سەرجەم فەرماندەی هێزەکان و تەنانەت ژێردەستەکانیشیانی خستە سەنگەری دژایەتیکردنی یەکترییەوە, کە دەرەنجامەکەی پاشەکشەی سوپا بوو لە ڕۆژانی شۆڕشی گەلانی ئێران دا, لەکاروباری حکومەتیشدا جگە لەچەند وەزیرێکی کابینەکە, ئەوانی دیکە هاوکاری سیاسەتی گشتی دەوڵەت و خودی سەرۆك وەزیر نە بوون و فەرمانیان لە (شا) وە وەردەگرت, هوەیدای سەرۆك وەزیری پێشوو کە باتی (عەلەم) کرابوو بە وەزیری دەرباری شاهنشاهی, هەرگیز کەمتەر خەمی لە نانەوەی ئاشوب و سەرپێچی لە کارەکانی دەوڵەت دا نەدەکرد, نمونە ئەوەش خۆمان لە نزیکەوە بینەری ئەوە بووین کە لە چاپکراوەکان دا دەیکرد.

سەرنجام (هوەیدا) بە ڕێکخستن و بلاّو کردنەوەی وتارە ناسراوە سوکایەتی ئامێزەکەی بە (ئایەتولاّ خومەینی) لە ڕۆژنامەی (اطلاعات) دا, کاریگەرترین ژەهری خۆی بە حکومەتەکەی (ئاموزگار) ڕێژا, بێئاگا لەوەی کە ئەگەر (ئاموزگار) بەم کارە حکومەتەکەی لەدەست بدات, ئەوا ئەو لەسەر ئەم کارە گیانی لەدەست دەدات, وتاری

ناوبراو بە داڕشتنی (هوەیدا) لە دەرباری شاهنشاهی دا ئامادە کرا و (شا)یش کە دوای سەفەرەکەی (کارتەر) بۆ ئێران و پێدا هەڵدان و سوپاسکردنی (شا)، ئەوی زیاتر لە خۆی لە خۆبایی کردبوو، ڕەزامەندی لەسەر بڵاو کردنەوەی ئەم وتارە دەربڕی و تەنانەت ئاوازەکەشی توندتر کرد، وتارەکەش ڕێگەی (داریوش همایون)ی وەزیری ئاگاهی کابینەکەی (ئاموزگار) بە بێ ئەوەی کە سەرۆك وەزیران ئاگای لە ناوەڕۆکی ئەو وتارە بێت ناردی بۆ ڕۆژنامەی (اطلاعات)، دوای بڵاو کردنەوەشی، (هوەیدا) لە ڕێگەی یەکێك لە بەکرێگیراوەکانییەوە بە نێوی (هیدایەتوڵا ئیسلامی نیا) ڕۆڵی کاریگەری بینی لە تەشەنەدانی ئەو ناڕەزایەتی لە نێو ڕۆحانیەکان دا ڕەنگی دایەوە.

ئایەتوڵا خومەینی لە هەمان ساڵی (١٣٥٤) هەتاوی، دوای ئاسایی بوونەوەی پەیوەندیەکانی (ئێران و عێراق) و هاتوچۆی زیارەتکارانی ئێرانی بۆ کەربەلا و نەجەف، چالاکیەکانی خۆی دژی ڕژێمی ئێران توند کردەوە و پەیوەندی و دۆستایەتییەکی نزیکی لەگەڵ ڕۆحانیە نەیارەکانی ڕژێمی ئێران لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات دا بەست، دوای ئاهەنگ گێرانی جەژنی ئابڕوبەری هونەری شیراز، کە تیایدا کاری ناشەرعی لەبەردەم کۆمەڵانی خەڵك دا پێشکەش کرابوو، شریتی وتاری (ئایەتوڵا خومەینی) لە نەجەف کە تیایدا ئاماژەی بە ئابڕوچونەکانی جەژنی هونەری شیراز کردبوو، لە ئێران دا بە شێوەیەکی زۆر بڵاو بوویەوە، لە مانگی ئابانی هەمان ساڵ دا ئامادە بوونی خەڵکانێکی زۆر لە ڕێوڕەسمی پرسەی (سەید مستەفا)ی کوڕی (ئایەتوڵا خومەینی)دا کە لە تاران و قوم شارەکانی دیکەدا ئەنجام درا، قوڵایی بەهێزی ئەو بزوتنەوەیەی کە خەریك بوو لە نێو شەقام دا دەنگی دەدایەوە دەرخست، هەر دوای ئەوەش شریتی وتاری نوێی (ئایەتوڵا خومەینی) کە لە ڕۆژی (١٠ ئابان) دا لەنەجەف پێشکەشی خەڵکی کردبوو، وەك فەرمانی کارکردن بوو بۆ پێکەوەنانی هێزی خەڵك لە ململانێکانی دژی ڕژێم دا، لەم وتارەدا کە شریتەکەی بە شێوەیەکی فراوان لە تاران و شارەکانی دیکەدا بڵاو بوویەوە، (ئایەتوڵا خومەینی) زیاتر ڕوی لە چینی ڕۆشنبیر و خوێندکارانی زانکۆ کردبوو، داوای لێکردبوون دەست بدەنە دەستی ڕۆحانیەکان و بکەونە دژایەتیکردنی ڕژێم، لە وەها ڕەوشێکدا، بڵاو کردنەوەی وتارێکی سوکایەتی ئامێز دەربارەی (ئایەتوڵا خومەینی)، ئەو تروسکاییە بوو کە ئاگری شۆڕشی داگیرساند، بە هۆی ئەو توندوتیژیەی کە دەوڵەت لە ڕۆژی (١٩ دی

١٣٥٦) هەتاوی دا دژی ئەو خۆپیشاندەرانەی لە شاری قوم وەك دەربڕینی ناڕەزایی دژی بڵاو کردنەوەی ئەو وتارە ڕژابوونە سەر شەقامەکان, ژمارەیەك لە خۆپیشاندەران کوژران و بریندار بوون, ئەمەش زەمینەی زیاتری بۆ خۆپیشاندان و گردبوونەوەی فراوانتری جەماوەر ڕەخساند کە لە یادی چلەی شەهیدانی خۆپیشاندانەکانی پێشودا شەهید کرابوون, هەربەو بۆنەیەشەوە هەمو چل ڕۆژ جارێك بە بۆنەی چلەی شەهیدانی پێشووەوە خۆپیشاندان ساز دەکرا.

دوای ڕوداوەکەی شاری قوم, (ئایەتوڵا خومەینی) لە وتارێکیدا کە وتارە توندەکانی ساڵانی (١٣٤٢, ١٣٤٣) هەتاوی وەبیر دەهێنایەوە, سەڵتەنەتی (شا)ی بە (ستەمگەر) دانا و وتی: (کارتەر و سەرجەم تاڵانچیانی گەنجینەی وڵاتانی ستەم لێکراو دەبێت ئەوە بزانن, محەمەدڕەزا ناپاك و یاخییە و پێویستە لە سەڵتەنەت لادرێت), دوای ئەم پەیامە و بانگ کردنی خەڵکی بۆ بەردەوامی بزوتنەوە و خۆپیشاندانی زیاتر دژی ڕژێم, خۆپیشاندانی زیاتر و فراوانتر بە هۆی چلەی شەهیدانی شاری (قوم)ەوە لە سەرانسەری وڵاتدا ئەنجام درا, ئەم خۆپیشان دانانە لە تەورێز تێکەڵی خاك و خوێن کرا, ئەنجامەکەشی بەردەوامی گرژی و پەشێویەکان بوو, لە تاران و شارەکانی دیکە و خۆپیشاندان لە زانکۆ و ناوەندەکانی باڵای فێرکردن تا کۆتایی ساڵی (١٣٥٦) هەتاوی بەردەوام بوو.

بەردەوامی گرژی و ئاڵۆزی و خۆپیشاندانەکان لە نیوەی یەکەمی ساڵی (١٣٥٧)هەتاوی و ڕوداوی ئاگر کەوتنەوە لە (سینەما رکس)ی ئابادان لە ڕۆژی (٢٨ مورداد ١٣٥٧)هەتاوی و سوتانی سەدان کەس بە زیندوویی, بە دەستلەکار کێشانەوەی حکومەتی (ئاموزگار) کۆتایی هات, (شا) کە هەراسان بووبوو لە فراوان بوونی خۆپیشاندانەکان و گەیشتنە لوتکەی نەیارێتی ڕژێم, لە پاشەکشەیەکی لەناکاو دا, دەستی دەوڵەتی نوێی کردەوە لە پێدانی ئازادی سیاسی و جیاوکی زیاتر بە نەیارانی حکومەت.

دەبێت ئەوە بووترێت کە (شا) لەم قۆناغەدا, زیاتر لە ئینگلیزەکان نیگەران بوو تا لەمریکیەکان, ئەویش بەهۆی گواستنەوەی هەواڵی زۆری تایبەت بە فراوانی خۆپیشاندانەکانی دژی ڕژێم و وتارەکانی نەیارانی شاهنشاهی لە بەشی فارسی کەناڵی (بی بی سی) ڕادیۆی لەندەن, ئەم ترسەی (شا)ی دروستکردبوو,

ئینگلیزەکانیش بەهۆی هەندێك لە هەنگاوە سیاسیەکانی (شا) لە ڕابردوودا کە دژی سیاسەتی ئینگلیستان بوو، تۆڵەی خۆیان لێ دەکردەوە، دیاریکردنی (شەریف ئیمامی)ش بۆ پێکهێنانی کابینەی نوێی حکومەت لە هەمان ترسەوە سەرچاوەی گرتبوو کە (شا) ئەوی بە بڕبڕەیەکی ئێنگلیزەکان دەزانی، لەو باوەڕەدا بوو کە بە دیاری کردنی (ئیمامی) بۆ پۆستی سەرۆك وەزیری، ئینگلیزەکان کۆڵ لە دژایەتی کردنی ڕژێمی ئێران دەدەن و ڕادیۆی لەندەن یش مۆری بێدەنگی دەدات لە دەمی.

بەلاّم هەڵبژاردنی (شەریف ئیمامی) هیچکام لە چاوەڕوانیەکانی (شا)ی بەدی نەهێنا: پاشەکشەی لەناکاوی ڕژێم لە بەرامبەر نەیارانی دا و ئازادی زیاتری چاپەمەنی و کۆبوونەوەکان، بوویە هۆی زیاتر بوونی چالاکیەکانی نەیارانی ڕژێم، هەنگاوی بەپەلەی ڕژێم لە ڕاگەیاندنی حکومەتی سەربازی دا کارەساتی (مەیدانی ژالە/ مەیدانی ئینقلابی ئێستا) ی هێنایە بوون، ڕەنگدانەوە جیهانی ئەم ڕوداوە، ڕژێمی سورتر کرد لەسەر جێبەجێکردنی یاساکانی حکومەتی سەربازی توندوتیژی نواندنی زیاتر و دەستگیر کردنی خۆپیشاندەران، کە مانگرتنی زیاتر و نوێتری خەڵکی بەدوادا هات، گرنگترین مانگرتن کە بوویە هۆی بڕینی داهاتی وڵات و ئیفلیج کردنی ڕژێم، مانگرتنی کریکارانی کۆمپانیای نەوت بوو، لەم نێوەندەش دا حکومەتی (شەریف ئیمامی) دوچاری هەڵەیەکی گەورەتر بوویەوە، کە ئەویش داواکردنی بوو لە دەوڵەتی عێراق بە دەرکردنی (ئایەتوڵا خومەینی) کە لەو وڵاتەدا بوو، (ئایەتوڵا خومەینی) لە ژینگەی داخراوی عێراقەوە ڕۆیشت بۆ وڵاتێکی ئازاد و گرنگترین ناوەندی هەواڵی جیهانی وەکو فەڕەنسا، واتە پاریسی بۆ بڵاو کردنەوەی بیر و باوەڕەکانی خۆی هەڵبژارد، کەناڵی (بی بی سی)ش بە هەڵبژاردنی سەرۆکی فراماسونری ئێران بۆ سەرۆك وەزیری، نەك وازی لە هاندان و ڕاگەیاندنەکانی خۆی دژی ئێران نەهێنا، بەڵکو دوو ئەوەندەش زیادی کرد، لاوێکی بێ ئەزمونیش کە تەنها لەبەر پەیوەنی لەگەڵ (ئەشرەف پەهلەوی)دا لە پۆستێکی گرنگی وەك باڵوێزی ئێران لە فەرەنسا دا دیاری کرابوو، بچوکترین سەرکەوتنی لە گۆڕینی ئەو ڕەوشە دوژمنکارانەیەی کەناڵی (بی بی سی)دا بەدەست نەهێنا.

لەم نێوەندەدا چاپەمەنیە نێوخۆییەکانیش، لەگەڵ ڕاگەیاندنی باری نائاسایی و حکومەتی سەربازی دا، لە کۆتوبەند و سانسۆر خستنە سەریان ئازاد بووبوون، وە

تەنانەت ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیش بە شێوەیەکی کرداری لە دەستی گروپە چەپگەراکان دا بوو, گۆردرابوو بە بڵندگۆی نەیارانی ڕژێمی ئێران, لە گواستنەوەی وێنەی فراوانیی خۆپیشاندانەکانی دژی ڕژێم, بە تایبەت وێنەی ڕاپۆرتە هەواڵیی جەرگ بڕی تەقەکردن لە خوێندکارانی زانکۆی تاران لە ڕۆژی (١٣ ئابان ١٣٥٧)هەتاوی دا, کە خۆپیشاندانی کەم وێنەی (١٤ ئابان) و سوتاندنی بانك و سینەما و دوکانی مەیی و عارەق فرۆشەکان و هەندێك لە گەورە کۆمپانیا تایبەتی و دەوڵەتیەکان و هوتێلەکانی تارانی بە دوادا هات, لە هەمان ڕۆژ دا (شا) بە هەلیکۆپتەر ئاسمانی شار گەڕا و دوای بینینی ئەو هەمو ئاگرە کە لە سەدان جێگای شاردا بەرز بووبوونەوە, گەڕایەوە بۆ کۆشکی (نیاوەران) و باڵوێزانی ئەمریکا و بەریتانیای بانگ کرد.

لەم ڕۆژە قەیراناویانەدا دیداری (شا) لەگەڵ (ویلیام سۆلیوان و ئەنتۆنی پارسۆنز) باڵوێزانی ئەمریکا و بەریتانیا لە تاران بە یەکێك لە بەرنامەی کاری ڕۆژانەی (شا) هەژمار دەکرا, (شا) لە نێو کارەکانیدا حەپەسا بوو, بە شێوەیەکی گشتی نەیدەویست بەرپرسیارێتی توندەتیژیەکان و کوشتن و خوێن ڕێژی بگرێتە گەردنی خۆی, هەمیشە داوای لە باڵوێزانی ئەمریکا و بەریتانیا دەکرد کە لە کارەکانیدا ڕێنمایی بکەن, وە بە شێوەیەکی دیکە بە فەرمی مۆڵەتی ئەنجامدانی توندوتیژی دژی خۆپیشاندەران بدەن, تا دواتر ئەو توندوتیژیانە نەکەنە بیانوو دژی ئەو, هەندێك لە بەرپرسە فەرمیەکانی ئەمریکا, وەك (برژینسکی) ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا لە تەلەفۆن دا (شا)ی هان دابوو بۆ نواندنی توندوتیژی دژی نەیارەکانی, بەلاّم باڵوێزی ئەمریکا هەرگیز ئامادەی گرتنە ئەستۆی ئەو بەرپرسیارێتیە و دەربڕینی ڕەزامەندی فەرمی  ئەمریکا نەبوو لە نواندنی توندوتیژی دا, وە هەروەها باڵوێزی بەریتانیاش بە گشتی ڕەزامەندی بۆ ئەنجام دانی توندوتیژی دەرنەدەبڕی, جارێکی دیکە (شا) هەردوو باڵوێزی بانگهێشت کرد بوو هەتا بڕیاری کۆتایی خۆی بە پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربازی, بەوان ڕابگەیەنێت, وە هەروەها ئەرتەشبەند (ئێزهاری) سەرۆکی هێزە هاوبەشە چەکدارەکانیش کە لەبەرچاو گیرابوو بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری, عەسری هەمان ڕۆژ بانگ کرابوو بۆ کۆشکی نیاوەران.

باڵوێزی ئەمریکا دوای بیستنی وتەکانی (شا) وتی: لەبەر ئەوەی کە پێشتر چاوەڕوانی وەها بڕیارێکی لەلایەن (شا) وە کردووە,, لەم بارەیەوە بۆچونی

وەزارەتیدەرەوەی ئەمریکای بەیان کردووە, کە واشنگتۆن ڕەزامەندی خۆی لەسەر جێگیر کردنی دەوڵەتێکی سەربازی دەربڕیوە, بەڵام باڵوێزی بەریتانیا بۆچونی یەکلاکەرەوەی خۆی لەم بارەیەوە ڕانەگەیاند و ووتی: دەوڵەتی ئینگلیستان پاڵپشتی ئەو کارە دەکات کە خاوەن شکۆ بۆ بەرژەوەندی وڵاتەکەی خۆی دەیگرێتە بەر, (شا) دوای ئەم دیدارە فەرمانی بوون بە سەرۆك وەزیری (ئیزهاری) واژۆ کرد و بەیانی ڕۆژی دواتر لەکاتی ڕاگەیاندنی پێکهێنانی دەوڵەتی سەربازی دا ووتی: دەنگی ناڕەزاییەکانی شەقامی بیستووە و بڕیار دەدات کە هەڵەو کەمتەرخەمیەکانی ڕابردوو قەرەبوو بکاتەوە, وتارەکەی (شا) ئاوازێکی تکاکردن و پاڕانەوەی هەبوو وە بە ڕادەیەکی زۆر ئەو ترسەی کە لەپێکهێنانی دەوڵەتی سەربازی دا هەبوو, ڕەواندەوە.

لە هەمان ئەو چەند ڕۆژانەی سەرەتایی دا, حکومەتی سەربازی بێ توانایی خۆی لە ئێدارە کردنی کاروبارەکانی وڵات دا نیشان دا, بزوتنەوەیخۆپیشاندان و مانگرتنەکان دوای چەند ڕۆژێك وەستان دەستی پێکردەوە, حکومەتی سەربازیش بە شێوەیەکی کرداری کارەکانی خۆیی لە دەست دابوو, لەبەر ئەوە بڕیار و فەرمانەکانی حکومەتی سەربازی دەربارەی گردبوونەکانی خەڵك جێبەجێنەدەکرا, سوپا مافی تەقەکردنی لە خەڵك نەبوو, ئەم حکومەتە سەربازیەی لەسەردەمی (ئیزهاری)دا بوو تەنها لە بارەی چاپکراوەکانەوە سەختگیری دەکرد, بەڵام نوسەرانی ئەو چاپخانانە بڕیارەکانیان جێبەجێ نەدەکرد و دەستیان دایە مانگرتن و خۆپیشاندان, خەڵکیش بۆ ئەوەی ئاگاداری ڕەوتی ڕوداوەکانی نێو وڵاتەکەیان و ئەوەی کە لەو وڵاتەدا تێدەپەڕێت ڕویان کردە گوێگرتن لە ڕادیۆ بیانیەکان, فراوانبوونی بزوتنەوەی مانگرتن و خۆپیشاندانەکان لە سەرانسەری وڵات دا, بەتایبەت مانگرتنی پیشەسازی نەوت, کاروباری وڵاتی ئیفلیج کرد و داهاتی وڵاتی سفر کردەوە.

حەمەڕەزاشا بۆ دەرچونی لەو گرفتارییەی کە تێی کەوتبوو, پەنای هێنا بۆلای ڕێبەرانی (جەبهەی میللی), بەر لە هەمو شتێك پیشنیاری بۆ (د. سدیقی) کرد بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران, (سدیقی)ش دوای هەفتەیەك لێکۆڵینەوە و ڕاوێژ کردن پێشنیارەکەی (شا)ی ڕەتکردەوە, ئەمجار (شاپور بەختیار) لەلایەن (شا)وە بانگهێشت کرا بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیری, (بەختیار)یش بە مەرجی وەرگرتنی دەسەڵاتی تەواو و دەرچونی (شا) لە وڵات دوای متمانە بەخشینی

پەرلەمان و ئەجومەنی سەنا بە کابینەی دەوڵەتەکەی, بە پێشنیارەکە ڕازی بوو, ئیدی (شا) هیچ ئومێدێکی بۆ مانەوەی خۆی نەمابوو, بەسەرجەم مەرجەکان ڕازی بوو, ئەوەش بڵێین کە ئیدی ئەمریکیەکانیش جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە هەرچی زوترە ش(شا) لە وڵات دەربچێت, ژەنەڕاڵ (هایزەر)ی ئەمریکی بۆ ئەو بەرپرسیارێتیە تایبەتە گەیشتبوویە ئێران, کە فەرماندەیی لەشکر بگرێتە دەست و (شا) ڕەاونەی دەرەوە بکات.

لە کۆتا ڕۆژەکان دا, (فەرەح) هەوڵی زۆری دا کە (شا) ڕازی بکات بە پێی دەستور دەست لە سەڵتەنەتی ئێران بکێشێتەوە و ئەو وەك نائیبی سەڵتەنەت دابنێت, (شا) نەچویە ژێرباری ئەو کارەوە وتی: ئەم کارە هیچ کێشەیەك چارەسەر ناکات, ڕون نیە پلانی (فەرەح) بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات بە بێ (شا) چی بوو, بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لەو ڕەوشە قەیراناویە دا (فەرەح) نەیدەتوانی هیچ کارێك بەرەو پێشەوە ببات, ئەگەر (شا) بەو کارەش ڕازی ببووایا ئەوا ئەمریکیەکان ڕازی نەدەبوون.

شا ڕۆژی (٢٦ دی ١٣٥٧)هەتاوی بە چاوی گریانەوە شاری گەورەی تارانی بە سەفەرێکی بێ گەڕانەوە بەجێهێشت, لە نێو ئەندامانی بنەماڵی سالتەنەتی دا تەنها (فەرەح) لە ئێران دا مابوویەوە کە لەگەڵ هاوسەرەکەی دا ئێرانی بەجێهێشت, لە تەواوی کاتە خەفەتباری و ڕیسواییەکان دا مێردەکەیی بەجێ نەهێشت, ڕژێمی سەڵتەنەتی بە کەمتر لە مانگێك دوای ڕۆیشتنی (شا) ڕووخا و تۆماری تەمەنی (٢٥٠٠) ساڵەی ڕژێمی شاهنشاهی ئێران لە ڕۆژی (٢٢ بەهمەن ١٣٥٧) هەتاوی دا پێچرایەوە.

# دەربەدەری و مەرگ

**تەنها ئینگلیزەکان ئاگایان لە نەخۆشی سەرەتانی (شا) هەیە.!، مەلیك حەسەن بە تەماحی سەرمایە ئەفسانەییەکەی (شا) ئەوی بۆ مەراکیش دەعوەت کرد، شکاندنی بەڵێنی کارتەر و تاچر، لە باهاماوە تا مەکسیك، پێشبینی سەرسوڕهێنەری کارتەر، دەردەدڵیەکانی (شا) بۆ نێردراوەکەی کارتەر، پیلان لە پەنەما، کارتەر بە مەرجی دەستلەکار کێشانەوەی (شا) لە پۆستی سەڵتەنەت داری ئێران ڕازی دەبێت بە پەنا دانی لەئەمریکا دا.!!، کۆتا چاوپێکەوتنی (شا) و دەربڕینی پەشیمای کە بۆچی دەستی نەدایە کوشتنی نەیارانی.!، دواین ڕۆژەکانی ژیانی (شا)..........،**

**لە تەواوی ئەو کتێبانەی کە دوای شۆڕشی گەلانی ئێران دەربارەی (شا) لە دەرەوەی وڵات چاپ و بڵاو کراونەتەوە، وای دەردەخەن کە (شا) ئاگاداری تووش بوونی خۆی بە نەخۆشی سەرەتان بووە، خودی خۆشی داوای لە پزیشکە فەڕەنسیەکان کردبوو کە ئەم بابەتە بشارنەوە، لەبەر ئەوە ڕەنگ دانەوەکانی ئەم بابەتە لە نێوخۆو دەرەوەی وڵات و تەنانەت لە نێو ئەندامانی بنەماڵەی ساڵتەنەتیشدا مەترسی دار بوو، لە هەندێك لە سەرچاوەکانی دیکەشدا ئاماژە بەوە کراوە کە هۆکاری نەچوونی (شا) بۆلای پزیشکە بەریتانی و ئەمریکیەکان، کە شارەزاییەکی باشیان دەربارەی نەخۆشیەکەی ئەو هەبوو، ئەوە بوو کە لەوە دەترسا پزیشکە بەریتانی و ئەمریکیەکان بابەتی نەخۆشی ئەو بە دەزگا سیخوڕیەکانی وڵاتانی خۆیان (سی ئای ئەی، ئەنتلیجنس) بگەیەنن، ئەم هەواڵەش ئەوان بخاتە بیری دیاریکردنی کەسێك بۆ جێگرتنەوەی ئەو..!!.**

له یاداشتەکانی (عەلەم) دا کە بەم دواییانە بلاو کراوەتەوە, وا دەردەکەوێت کە (شا) تا ساڵی (١٣٥٦)هەتاوی ئاگاداری نەخۆش بوونی خۆی بە سەرەتان نەبووە, یان بەلانی کەمەوە کە ئەو بابەتەی لە (عەلەم) کە خۆی بە هاوڕازی (شا) دەزانێت شاردووەتەوە, (فەرەح)ی هاوسەری (شا)یش لە چاو پێکەوتنێکیدا دوای مەرگی (شا) ووتی: بۆ یەکەمجار پزیشکە فەڕەنسیەکان دوای دەرچوونی (شا) لە ئێران, لە (ژانویەی ١٩٧٩ز, دی ١٣٥٧)هەتاوی, ئەویان لە نەخۆشیەکەی ئاگادار کردووەتەوە, لەکاتێکدا کە نەخۆشیەکە گەیشتبووە پلەیەکی مەترسی دار.

توش بوونی (شا) بە جۆرێك لە سەرەتان (لوی سەرەتانی) کە خێرایی گەشەکردنی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیازازە, بۆ یەکەمجار ئەم نەخۆشیەی (شا) لە ساڵی (١٩٧٤ز) سەرەتاکانی ساڵی (١٣٥٣)هەتاوی دا دەرکەوتووە و پێی زانراوە, پزیشکە فەرەنسیەکان کە بۆ پشکنینی تەندروستی (شا) هاتبوونە تاران, دەرکەوتنی ئەم نەخۆشیەیان لەگەڵ (د. ئەیادی) دوکتۆری تایبەتی (شا) دا باسکردووە, بەلأم (د. ئەیادی) داوای لێکردن کە لە خزمەتی (شا) دا خۆیان بەدوور بگرن لە بەکار هێنانی زاراوەی سەرەتان, ناوێکی دیکەی تایبەت بە نیشانەکانی (لوی سەرەتانی) بەکار بهێنن, بەلأم پرۆفیسۆر (مارڤین زونیس / Marvin Zonis)ی ئەمریکی کە توێژینەوەیەکی گشتی دەربارەی (شا) ئەنجام داوە لەو باوەڕەدایە کە پزیشکە فەڕەنسیەکان بە هۆی چارەسەر کردنی نەخۆشیەکەیەوە ناچار بوون کە (شا) لە نەخۆشیەکەی ئاگادار بکەنەوە, لەگەڵ ئەوەشدا ئومێدەواریان کردووە کە دەتوانن بە بەکارهێنانی دەرمانی پێشکەوتوو ئەو نەخۆشیە لە لاشەی ئەودا بنبڕ بکەن, (شا) لەناخی دڵەوە داوای لە پزیشکەکان کرد کە ئەو بابەتە لای پلەدارەکانی فەرەنسا و خزمانی خۆشی و تەنانەت شاژنە (فەرەح)یشدا نەدرکێنن, بەلأم لە ساڵی (١٩٧٧ز, ١٣٥٦)هەتاوی دا کە نەخۆشییەکەی (شا) گەیشتبوویە ڕادەی مەترسیدار, بڕیاری دا ئەم بابەتە لای هاوسەرەکەی باس بکات, بەلأم ئەم کارە دژوارەی خستە ئەستۆی پزیشکە فەڕەنسیەکانی خۆیەوە, ئەوانیش (فەرەح) یان لە تەواوی ڕاستیەکان ئاگادار کردەوە و لەگەڵ ئەوەشدا وتیان کە: ئەوان هەموشتێکیان بە بێ بەکارهێنانی زاراوەی سەرەتان بە خودی (شا) وتووە, خودی (فەرەح)یش لە چاوپێکەوتنێکدا دوای مردنی (شا) ووتی: لە ساڵی ١٣٥٦ هەتاوی لە جۆری نەخۆشی هاوسەرەکەی و ئەوەی کە

زیاتر لە چەند ساڵێکی دیکە زیندوو نابێت, ئاگادار کراوەتەوە, بەڵام هەرگیز نەیتوانیوە تەواوی ڕاستیەکان دەربارەی نەخۆشیەکە لەگەڵ (شا) دا باس بکات.

لەگەڵ هەبوونی ئەو نەخۆشیەدا وا دەردەکەوێت کە خودی (شا) بە سەرنج دان بە دەرکەوتە و نیشانەکانی نەخۆشیەکەی (عەلەم) کە هاوشێوەی نەخۆشیەکەی خودی خۆی بوو, کە سەرەنجامەکەی مردنی (عەلەم) لە سەرەتاکانی (١٣٥٧)هەتاوی بوو, بە تەواوی پەی بە جۆری نەخۆشی و نزیك بوونەوەی مەرگی خۆی بردبوو, دووچار بوون بە نەخۆشی سەرەتان و ئاگاداربوون لە نزیك بوونەوەی کاتی مردن, دەتوانێت هاوسەنگی دەرونی هەموو کەسێك تێك بدات, بەڵام بە بڕوای (زونیس) ئەم نەخۆشییە گاریگەری زیاتری لە (شا) کردبوو, لەبەر ئەوە (شا) تا ئەم بەرواره خۆی بە چاودێری کراوو و پارێزراوی دەستێکی غەیبی دەزانی و ڕزگار بوونی پەرجو ئاسایی لە چەندین ڕوداوی پیلانگێڕی و هەوڵی کوشتن دا بە دەرەنجامی میهرەبانی و چاودێری تایبەتی ئیلاهی بۆ سەر خۆی دەزانی, ئەم باوەڕەی (شا) یەکێك بوو لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی ئەو بەسەر لاوازیە دەرونیەکانی خۆی دا و ئاڕاستە کردنی بۆ هەندێك کاری بێباکانە کە لەگەڵ کاراکتەر و ئاکاری تایبەتی ئەودا پێك نەدەهاتەوە, لەم کاتەدا توش بوونی بە نەخۆشییەکی کوشندە, بنەمای باوەڕەکانی ئەوی بە میهرەبانی و سەرنجی تایبەتی ئیلاهی هەژاند و ئەوی لە بەرامبەر بزوتنەوە شۆڕشگێڕیەکان دا بێ توانا و دەرمان هێشتەوە, شۆڕش بۆچونی خۆشەویست بوونی ئەوی لە نێو خەڵکیش دا هەڵوەشاندەوە, (شا)ی بێچارە خۆی دایە دەستی قەزا و قەدەر, وازی لە خۆی هێنا و لە بەرامبەر ڕوداوەکان دا ڕێگەی خۆبەدەستەوەدان و ڕەزامەندی گرتە بەر.

لە نوسین و یاداشتی کەسایەتیە بیانیەکان دا دەربارەی شۆڕشی گەلانی ئێران, ئەم بابەتە دووبارە بووەتەوە کە هیچکام لە دەوڵەتە بیانیەکان, لەگەڵ هەبوونی دەزگا سیخوڕیە بەتواناکانی خۆیان دا, هەتا مانگەکانی کۆتایی شۆڕش ئاگایان لە بابەتی نەخۆشی سەرەتانی (شا) نەبووە, پزیشکە فەرەنسیەکانیش کە سەرقاڵی چارەسەر کردنی (شا) بوون, بە پشت بەستوو بە بانگەشەکانی (ژیسکار دستن)ی سەرۆك کۆماری پێشوی فەرەنسا, ئەویان لەم بابەتە ئاگادار نەکردبوویەوە, بەڵام پرۆفیسۆر (مارڤین زونیس) بۆ یەکەم جار پەردە لەسەر ئەم ڕازە لادەبات کە دەوڵەتی ئینگلیز

هەر لە سەرەتاكانی دەركەوتنی دەركەوتەكانی نەخۆشی سەرەتانی (شا)، ئاگاداری ئەم بابەتە بوون و سەرچاوەی هەواڵەكەش (شاپور ریپورتر)[1]ی دۆستی نزیكی (شا) بووە، سەرچاوەی زانیاری (زونیس)یش، چاوپێكەوتنێكیەتی تایبەتیەتی كە لەگەڵ خودی (شاپور ریپورتر) دا ئەنجامی داوە، لەم چاوپێكەوتنەدا (شاپور ریپورتر) بە (مارڤین زونیس)ی وتووە: لەگەڵ ئەوەی كە لە بابەتی نەخۆشی (شا) ئاگادار بووە بابەتەكەی بە (سردا گلاس هیوم)ی وەزیری دەرەوەی ئەوكاتی بەریتانیا وتووە، زونیس لەم بارەیەوە ڕونكردنەوەی زیاتر نادات، بەڵام ئەگەر ئەم بابەتە ڕاستیش بێت، ئەوا زۆر بە دوور دەزانریت كە خودی (شا) بابەتی نەخۆشیەكەی لەگەڵ كەسێكدا باس بكات كە ئاگای لە پەیوەندی ئەو لەگەڵ ئینگلیزەكان دا هەبووبێت، بەدڵنیاییەوە ڕازی نەخۆشی (شا)، دوكتۆر ئەیادی لە ڕێگەی (شاپور)ەوە گەیانوویەتی بە ئینگلیزەكان، لە هەمان كاتیشدا ئینگلیزەكان بە بێ ئەوەی ئەمریكیەكان لە بابەتی نەخۆشی (شا) ئاگادار بكەنەوە، پلانیان داڕشتووە بۆ سەردەمی دوای (حەمە ڕەزاشا) لە ئێران دا.[2]

** ** **

ڕۆژی شێ شەممە (٢٦ دی ١٣٥٧)هەتاوی كاتژمێر یەكی دوای نیوەڕۆ، كاتێك كە فڕۆكەی تایبەتی سەڵتەنەتی كە ئامادەی دوایین فرینی خۆی بوو، (شا) بە چاوی

---

[1] شاپور ریپورتر: كوڕی (ئەردەشێر جی ریپورتر)ی هیندییە، كە بە (دەرخەر و ئاشكراكەر)ی ڕەزاخان و ناساندنی ڕاستەقینەی ئەو بە ژەنەڕاڵ (ئایرۆنساید)ی ئینگلیزی ناسراوە، یەكێك بوو لە بەكرێگیراوە سیخوڕیەكانی ئینگلیز لە ئێران دا، كوڕەكەشی (شاپور ریپورتر) كە خۆی گەیاندبووە دەرباری (حەمە ڕەزا شا) هەمان ڕۆڵی لە ئێران دا دەگێڕا.

[2] دوكتۆر ئەیادی پزیشكی تایبەتی (شا) بوو، كە پزیشكێكی مام ناوەند بووە، لە ڕوخسارە دیارەكانی دەرباری حەمە ڕەزاشا بوو، كە بە ناپاكی ڕەوشتی و گەندەڵی دارایی بەناوبانگ بوو، حسەین فیردوست كە ئەوی بە (ڕاسپۆتینی ئێران) ناو دەبرد، لەو باوەڕەدایە كە ئەو سیخوڕی بەكرێگیراوی ڕاستەقینەی ئینگلیزەكان بوو لە ئێران دا، وە ئینگلیزەكان ڕاستەوخۆ لە ڕێگەی ئەوە وە یان لە ڕێگەی (شاپور ریپورتر)ە وە ئاگاداری وردەكاریەكانی ئەو شتانە دەبوون كە لە دەربار دا ڕویان دەدا، دوای شۆڕش وترا كە (د. ئەیادی) بە پێدانی دەرمانی گێژكردن بە (شا)، ڕەوشی پەشێوی و بێ بڕیاری ئەوی لە گەرمەی شۆڕش دا توندتر كردووە.

گریانەوە ماڵئاوایی لەو خەڵکە دەکرد کە بۆ خوداحافیزی هاتبوونە فڕۆکەخانە, لە شوێنی تایبەتی خۆیدا لە کەناری (فەرەح)ەوە دانیشتبوو, لە پڕێکدا بڕیاری دا کە خۆی فڕۆکەکە لێخوڕێت, (فەرەح) بە بینینی بارودۆخی پەرێشانی میردەکەی ویستی ڕێگری لەو کارەی مێردەکەی بکات, بەڵام (شا) ووتی: هیچ شتێك جگە لە فڕۆکەوانی ناتوانێت دەرونی ئەو ئارام و بەهێز بکات, کەس نازانێت لەو کاتەدا (شا) بۆ بەهێز کردنی لایەنی دەرونی خۆی فڕۆکەوانی کرد, یان گومانیشی لە فڕۆکەوانی تایبەتی سەڵتەنەتیش کردبوو, وە لەوە دەترسا کە فڕۆکەکە بەروە شوێنێکی دیکە, بۆنمونە سۆڤیەت, ببات.!, ئەگەر (شا) گومانی لەو بابەتەش بکردایە, گومانەکەی بێجێ نەبوو, لەبەر ئەوە سەرهەنگ (موعیزی) فڕۆکەوانە تایبەتیەکەی (شا), دوای سەرکەوتنی شۆڕشلە ئێران دا, لەو کاتەی کە (شا) لە ولأتی مەراکیش بوو, لەگەڵ چەند کەسێك لە ئەفسەرە خزمەتکارەکانی خۆیدا چوونە لای (شا) و ووتی: ئێمە ئەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ ئێران, (شا) وەك بڵێی چاوەڕوانی ئەو داواکاریەی دەکرد, بە بێ بچوکترین بەرگری و دەربڕینی ناڕەزایی داواکاریەکەیانی پەسەند کرد و ووتی: دەتوانن فڕۆکە تایبەتیەکەی سەڵتەنەتیش لەگەڵ خۆیان دا ببەنەوە بۆ ئێران, (موعیزی) دوای گەڕانەوەی بۆ ئێران, بە ڕێکخراوی (موجاهیدینی خەلق)ەوە پەیوەست بوو (لەوانەشە لەکاتێکدا کە بەر پرسیارێتی فڕۆکەوانی تایبەتی (شا)شی لە ئەستۆدا بوو, ئەندامی ئەم گروپە بووبێت), وە لە ساڵی (١٣٦٠)هەتاوی بە فڕاندنی فڕۆکەیەکی سەربازی, (ئەبوولحەسەن بەنی سەدر و مەسعود ڕەجەوی) لەگەڵ خۆیدا لە ئێرانەوە گەیاندە دەرەوەی ولأت.

ئامانجی کۆتایی (شا) لەم سەفەرەیدا ولأتی ئەمریکا بوو, ئەگەر بە بێ وەستان لە ڕێگە دا, یان دوای پێنج ڕۆژ مانەوەکەی لە ولأتی میسر, بگەیشتایەتە ئەمریکا, ئەوا دووچاری گرفتاریەکانی دواتر نەدەهات, لەبەر ئەوە ئەمریکیەکان لەو کاتەدا بەڵێنی پێشوازی کردنیان بە (شا) دابوو, پێشتریش شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی بنەماڵەکەشی لە ویلایەتی کالیفۆڕنیا ئامادە کرابوو, بەڵام (شا) دوای مانەوەیەکی کورت لە ئەسوانی میسر, بانگهێشتێکی لەلایەن (مەلیك حەسەنی دووەم)ی پاشای (مەراکیش)ە وە پێگەیشت, بە گومانی ئەوەی کە ئەم بانگهێشتەی مەلیك (حەسەن) لەوانەیە بە ڕاسپاردەی ئەمریکیەکان و بە ئومێدی گۆڕانکاری ڕەوشەکە و گەڕانەوەی

ئەو بۆ وڵاتەکەی ڕێکخرابێت, (شا) بانگهێشتەکەی پەسەند کرد, هەڵبەت (کارتەر) ئارەزوی ڕۆیشتنی (شا)ی بۆ ئەمریکا نەبوو, بەڵام مەلیك (حەسەن) بە ڕاسپاردەی ئەمریکیەکان ئەم (شا)ی بۆ مەراکیش بانگهێشت نەکردبوو, مەبەستی ڕاستەقینەی پادشای مەراکیش لە دەعوەتکردنی (شا) دا, تەمای ئەو بوو بۆ ئەو سەرمایە ئەفسانەییەی کە دەوترا (شا) لە بانکەکانی دەرەوە دا هەیەتی, لەبەر ئەوە لەو کاتانەدا نەیارەکانی (شا) سەرمایەکەی ئەویان لە بانکە بیانیەکان دا بە زیاتر لە (٥٠) ملیارد دۆلار مەزەندە کردبوو, کە پێدانی (دە یەکی) ئەو بڕە پارەیەش بۆ مەلیك (حەسەن) سەرسوڕهێنەر بوو, بەڵام کاتێك کە (شا) بە میواندارەکەی خۆیی ووت: تەواوی سەرمایەکەی ئەو لە دەرەوەی ئێران ناگاتە (١٠٠) ملیۆن دۆلار, مەلیك (حەسەن) پەشیمان بوویەوە لە بانگهێشتکردنی وەها میوانێکی هەژار, هەر بۆیە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران بە ڕێزەوە داوای لێبووردنی لێکرد..!!!.

(گاری سیك/ Gary Sick) ئەندامی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا لە سەردەمی حکومەتەکەی (کارتەر) دا, کە بەرپرسی بەشی ئێران بوو لە تەوای سەردەمی شۆڕشی ئێران دا, ئاگای لە وردەکاریەکانی تایبەت بە ئێران بووە, دەنووسێت: (شا) دوای دەرچونی لە ئێران, لە دروستکردنی هەر جۆرە پەیوەندییەکی لەگەڵ ئەمریکیەکان دا, ناچار بوو, وە لەگەڵ ئەوەی کە بڕیار بوو فڕۆکەکەی ڕاستەوخۆ بەرەو ئەمریکا هەڵفڕێت, دوای چەند ڕۆژێك مانەوەی لە میسر, بەبێ ئەوەی هیچ پرس و ڕاوێژێك بە ئەمریکیەکان بکات, بانگهێشتی پاشای مەراکیشی بۆ سەفەر کردن بۆ ئەو وڵاتە پەسەند کرد, لە ماوەی مانەوەشیدا لە وڵاتی مەراکیش پەیوەندی بە باڵوێزخانەی ئەمریکا لەو وڵاتە یان بەرپرسانی ئەمریکا لە واشنگتۆن, نەکرد, لە سەرەتاکانی مانگی فەبریوەر دا شاندێکی باڵای هەواڵگری ئەمریکا بەمەبەستی ئەنجامدانی دیدار و گفتوگۆ لەگەڵ (شا) دا گەیشتنە وڵاتی مەراکیش, بۆ ئەوەی زانیاری دەربارەی مەبەستی ئەو لە مانەوەی لە مەراکیش و نیازی سەفەری دواتری بۆ ئەمریکا وەربگرن, شاندی ناوبراو ڕێك لە هەمان ڕۆژی (١١ی فەبریوەر, ٢٢ بەهمەن ١٣٥٧)هەتاوی, کە ڕژێمی سەڵتەنەتی لە ئێران دا ڕوخابوو, لەگەڵ (شا) دا دیداریان ئەنجام دا.

دیداری شاندی (سی ئای ئەی) لەگەڵ (شا) دا دوو کاژێر درێژەی کێشا, ئەو (شا)ی بە کەسێکی تەواو پەرێشان و شکستخواردوو دادەنا, لەو دیدارەدا (شا) ووتی کە: دوایی دەرچوونی لە ئێران خۆی بوواردووە لە هەر جۆرەپەیوەندی گرتنێك لەگەڵ فەرماندە سەربازیەکان دا بۆ ئەوەی رێگری بکات لە ڕژاندنی گۆمێك خوێن و ئێستاش هیچ جۆرە پەیوەندیەکی لەگەڵ دەرەوەی ئێران دا نییە, وا دەردەکەوت کە (شا) بە هۆی خێرایی ڕەوتی ڕوداوەکان و ڕوخانی ڕژێمی سەڵتەنەتی لە ئێران دا گێژبووە و چاوەڕوانی ئەوەی نەکردووە کە لەشکرەکەی بەو جۆرە لێك هەڵبووەشێت, ئەو هیچ بەرنامەیەکی دەربارەی ئایندەش نەبوو, هەروەها دەربارەی سەفەریشی بۆ ئەمریکا بە بڕیاردەر نەدەهاتە پیش چاو.

شا هەتا دە ڕۆژ دوای سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران و ڕوخانی ڕژێمی سەڵتەنەتی لە دۆخی دوودڵی و بێ بڕیاری دا بوو, تا ئەوەی بە هۆی ئارەزومەند نەبوونی پادشای مەراکیش بۆ مانەوەی زیاتری (شا) لە وڵاتەکەی دا, کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێی ڕاگەیەندرابوو, بڕیاری دا مەراکیش بەرەو ئەمریکا بەجێ بهێڵێت, لە ڕۆژی (٢٢ فەبریوەر, ٣ ئەسفەند ١٣٥٧)هەتاوی, نوێنەرێك لەلایەن (شا) وە نێردرا بۆ دیدار لەگەل (ریچارد پارکەر/ Richard parker)ی باڵوێزی ئەمریکا لە مەراکیش, لەگەڵ ڕاگەیاندنی بڕیاری (شا) بۆ سەفەر کردنی بۆ وڵاتی ئەمریکا, داوای لێکرد کە لە ماوەی هەفتەی ئایندەدا پێداویستیەکانی سەفەری ئەو و دارودەستەکەی ڕێك بخات, باڵوێزی ئەمریکا داواکەی (شا)ی گەیاندە واشنگتۆن, بەڵام ئەم داوایە کاتێك گەیشتە واشنگتۆن, کە بە هۆی گرتنی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران[1] دا, دڵەڕاوکێی دەربارەی پیشوازی کردن لە (شا)ی ئێران, دروستکردبوو, ئەم بابەتە گەیەندرایە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکا و بڕیار درا کە جارێکی دیکە ڕاسپێردراوی باڵای ئاگاهی ئەمریکا بڕوات بۆ مەراکیش, لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئەو بابەتە کە هەڵوێستی بانگهێشت کردنی (شا) بۆ ئەمریکا وەك خۆی بەهێزە و داوای لێ بکات کە ئەنجام دانی ئەم سەفەرەی بۆ کاتێکی دیکە دوابخات.

---

[1] مەبەستی گرتنی باڵوێزخانەی ئەمریکایە بۆ ماوەیەکی کەم دوای سەرکەوتنی شۆڕش, کە بە هەوڵەکانی دەوڵەتی کاتی لابرا, باڵوێزخانەی ئەمریکا تا هەشت مانگ دوای ئەوەش گەمارۆ درابوو.

لەم نێوەندە دا بە هۆی تەلەفونی بەردەوامی (ئەردەشێر زاهیدی) باڵوێزی پێشوی ئێران لە ئەمریکا بۆ (برژینسکی) ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆك کۆمار, خودی (برژینسکی) ڕۆیشت بۆ دیداری سەرۆك کۆمار و داوای لێکرد کە ڕەزامەندی لەسەر داوای سەفەر کردنی (شا) بۆ ئەمریکا دەربب‌ڕێت, (کارتەر) پێچەوانەی ڕەوتی خۆی بە توڕەیی و بە توندییەوە بە (برژینسکی) ووت کە: ئەو ناتوانێت ببینێت (شا) لە ئەمریکا خەریکی یاری تێنس کردن بێت, لە کاتێکدا کە گیانی ئەمریکیەکان لە بەر خاتری ئەو کەوتوەتە مەترسی یەوە, (برژینسکی) لەم وەڵامە توندەی (کارتەر) توشی شۆك بوو, بە بێ ئەوەی کە درێژە بە بابەتەکە بدات ژوری تایبەتی سەرۆك کۆمار بە جێدەهێڵێت.

بەدرێژایی مانگی (مارس ١٩٧٩ز, ١٠ ئەسفەند ١٣٥٧ هەتا ١٠ فەروەردینی ١٣٥٨) هەتاوی, (شا) و دارودەستەکەی لە هەوڵی بەردەوامدا بوون بۆ دۆزینەوەی پەناگایەك لە ئەوروپا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا, بەڵام هیچ ولاتێك وەڵامی ئەرێی بەوان نەدا, لە نێو ئەو ولاتانەشدا سویسرا و بەریتانیا هەبوون کە (شا) لە هەردوو ولاتەکەدا موڵکی تایبەتی خۆیی هەبوو, تەنانەت فەڕەنسا کە لە سەردەمی حکومەتی ئەودا پێشوازی لە (ئایەتولاَ خومەینی) کردبوو, ئامادە نەبوو لە سەردەمی حکومەتی (ئایەتولاَ خومەینی) دا پەنای (شا) بدات, هەروەها (مەلیك حسەین)ی پادشای ئەردەنیش کە لە هەموان زیاتر سودی لە هاوکاریەکانی (شا) وەرگرتبوو, ڕویەکی باشی نیشان نەدا.

سەرەنجام لە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی مارس دا, دۆستە ئەمریکیەکانی (شا), (راکفلر و کیسنجەر), دوورگەکانی (باهاما), کە کەوتوەتە ڕۆژئاوای ئۆقیانوسی ئەتلەسی و مەودایەکی نەك زۆر دوور لە کەنارەکانی ویلایەتی فلۆریدای ئەمریکا, پەیدا کرد بۆ مانەوەی کاتی (شا) لەو دوورگانە, (باهاما) ولاتێکی سەربەخۆ بەلاَم ئەندامی کۆمەڵەی بەرژەوەندیە هاوبەشەکانی ئینگلیستانە, کۆی دوورگەکانی ئەم ولاتە نزیکەی (٧٠٠) دوورگەیە, کە داهاتی سەرەکی خەڵکی ئەو ناوچەیە لە بوواری گەشتیارییەوەیە, وە بەڕواڵەتیش زەمینەی ڕەزامەندی دەربڕینی بەرپرسەکانی ئەو وولاتە بۆ پێشوازی کردن لە (شا), بە پێدانی بڕێکی بەرچاوی سەرمایەی (شا) لە بانکی (راکفلر) بەو ولاتە فراهەم هێنرابوو.

شا و فەرەح و ئەوانەی لەگەڵیان مابوونەوە, کە چەند ئەفسەرێکی گارد و چێشت لێنەر و خزمەتکاریشیان تێدا بوو, ڕۆژی (٣٠ مارس ١٩٧٩ز, ١٠ فەروەردین ١٣٥٨)هەتاوی بە فڕۆکەی سەڵتەنەتیی مەراکیش گەیشتنە (باهاما), ئەو شوێنەی کە بۆ مانەوەی (شا) لە باهاما دیاریکرابوو زۆر خۆش نەبوو, سەرباری ئەوەش کەناراوێکی گشتی بوو لە ڕوی ئاسایشەوە بە شوێنێکی ئارام نەدەهاتە پێش چاو, (راکفلر) پسپۆڕێکی لاوی پەیوەندیە گشتیەکانی بە نێوی (رۆبێرت ئارمائۆ/ Robert Armao) کە پێشتر بۆ (نلسۆن راکفلر)ی برای ئیشی دەکرد, لەگەڵ چەند گاردێکی پارێزگاری ئەمریکی نارد بۆ لای (شا), (ئارمائۆ) کە ئەوەندەی (شا) ڕقی لە کارتەر بوو, زۆر زوو لەگەڵ (شا) تێکەڵ بوو, لە تەواوی تەمەنی ماوەی (شا)و ئەو ڕوداوە تەڵخانەی کە بەسەریدا هات لەگەڵ شا دا مایەوە.[1]

شا لە ڕەفتاری بەرپرسانی (باهاما) ڕازی نەبوو, سەرباری ئەوەش خەرجییەکی زۆریشیان دەدا بە سەری دا, تەنانەت بۆ کەسێکی سەرمایەداری وەك ئەویش سەخت بوو, (شا) دووبارە لە مانگی (مەی, ئۆردیبەهەشت و خورداد ١٣٥٨)هەتاوی لە ڕێگەی دۆستە ئەمریکیەکانی خۆیەوە, کەوتە بیری وەرگرتنی مۆڵەت بۆ سەفەر کردنی بۆ ئەمریکا, لەنێو ئەو دانوستانانەی کە لەم قۆناغەدا ئەنجام درا, بابەتی دەستلەکار کێشانەوەی ئەو لە پۆستی سەڵتەنەتداری و ڕاگەیاندنی وازهێنانی لە هەر جۆرە بانگەشەیەك بۆ تەخت و تاجی ئێران, وەك مەرجی پێشینە بۆ پێدانی مافی پەناهەندەیی بە شا هاتە ئاراوە, بەڵام (شا) کە هێشتا ئومێدەوار بوو کی ڕۆژێك کوڕەکەی تەخت و تاجی سەڵتەنەتی ئێران بگرێتە دەست, بەو مەرجە ڕازی نەبوو, تەنانەت دەوڵەتی ئەمریکا بە داواکەی (فەرەح)یش بۆ سەفەر کردن بۆ ئەو وڵاتە ڕازی نەبوو, لەبەر ئەوە بەرپرسانی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێران هوشیاریان دابوویە

[1] گاری سیك ڕونکردنەوەی زیاتر دەدات دەربارەی (ئارمائۆ) و ڕۆڵی ئەو لە ڕوداوەکانی دیکەی ژیانی (شا) دا, لەو ڕونکردنەوانەشدا بە بەکارهێنانی زاراوەی لە (لە خودی شا, شاپەرست تر) باسی دەکات و دەنووسێت: (ئارمائۆ) لە بابەتەکانی پەیوەست بە (شا) وە زیاتر لە خودی ئەو سەرسەختی دەنواند و دەمارگیری بەخەرج دەدا.

ئەمریکیەکان کە: (لەکاتی پیشوازی کردن لە شا یان ژنەکەی بۆ هاتنە نێو ئەمریکا, پرسی گرنگ لە پەیوەندیەکانی هەردوو وڵات دا دێتە پێشەوە..).

بە سەرکەوتنی پارێزگاران لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئینگلیستان دا و هاتنە سەر کاری (خانم تاچر), ئومێد گەلێکی نوێ بۆ (شا) دەربارەی گونجانی سەفەر و نیشتەجێبوونی لە ئینگلیستان دا دروست بوو, لە بەر ئەوە (خانم تاچر) پێش هاتنە سەرکاری لەو بارەیەوە چەندین بەڵێنی دابوو, (شا) بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئارەزومەند بوونی خۆی بۆ سەفەر کردن بۆ ئەو وڵاتە و نیشتەجێبوونی لەو موڵکە تایبەتیەی خۆیدا کە هەیبوو, گەیاندە بەرپرسانی ئینگلیستان, بەڵام وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا بە وەڵامدانەوەی ڕاپۆرتێکی نەرێ دەربارەی دەرەنجامەکانی سەرفەری (شا) بۆ ئینگلیستان, (خانم تاچر) یان لە بەڵێنەکەی ڕابردووی خۆی پەشیمان کردەوە, ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کە لە ئامادە کردنی ئەو ڕاپۆرتەی وەزارەتی دەرەوە دا دوو باڵوێزی پێشوی بەریتانیا لە ئێران (سر دنیس رایت وسر ئانتۆنی پارسۆنز) ڕۆڵی دیاریان هەبوو, (پارسۆنز) کۆتا باڵوێزی ئینگلیز لە دەرباری (شا) دا, بۆ سڕینەوەی ئەو کارەی کە (خانم تاچر) گرفتاری بووبوو, پیشنیاری کرد بە هۆی ئەو پەیوەندی و دۆستایەتیە لە پێشینەی کە (دنیس رایت) لەگەڵ (شا) دا هەیەتی, بەمەبەستی دیداری (شا) و دانوستان لەگەڵی دا بڕوات بۆ (باهاما), بۆ ئەوەی بڕوا بە (شا) بهێنێت کە سەرفەر کردنی ئەو بۆ ئینگلیستان لەلایەکەوە بە هۆی مەترسی لەسەر گیانی خۆی و (کە ژمارەیەکی زۆر خوێندکاری ئێرانی نەیاری (شا) لە زانکۆکانی ئەو وڵاتەدا دەخوێنن), لەلایەکی دیکەشەوە بە هۆی ئەوەی لەوانەیە لەکاتی گەیشتنی (شا) بۆ ئەو وڵاتە ئینگلیزەکان لە ئێران دا بە بارمتە بگیردرێن, لە بەرژەوەندی هیچ لایەکدا نییە, (دنیس رایت) لەبەر ئەوەی لەکاتی سەفەر کردنیدا بۆ (باهاما) جەنجاڵی دەزگاکانی ڕاگەیاندن ڕوو نەدات, بە ناوی خوازراوی (ئیدوارد ویڵسۆن) ڕۆیشت بۆ (باهاما), (شا) لە سەردانی (دنیس رایت) ئەویش بە ناوی خوازراوە وە توشی شۆك بوو, بەڵام زۆر خێرا لە بابەتەکە تێگەیشت, بەبێ هیچ بەرەنگار بوونەوەیەك, تەنها بە مەرجی ئەوەی کە دەوڵەتی ئینگلیز بە فەرمی ڕایبگەیەنێت کە هەرگیز (شا) داوای پەناهەندەیی لەو وڵاتە نەکردووە, خۆی بووارد لە بەدوادا چونی ئەو داوا ناراستەوخۆیەی کە بۆ سەفەری ئینگلیستان کردبووی.

لە سەرەتاكانی مانگی (ژوئین, ناوەڕاستی خورداد ۱۳۵۸)هەتاوی دا دەوڵەتی (باهاما) خۆی بووارد لە پێدانی درێژكردنەوە ڤیزەی نیشتەجێبوون بە (شا) و ئەویش دووبارە بۆ دەستكەوتنەوەی پەناگایەك پەیوەندی بە دۆستە ئەمریكیەكانی خۆی (راكفلر و كیسنجەر) كردەوە, ئەوان توانییان ڕەزامەندی سەرۆك كۆماری مەكسیك بۆ مانەوەی كاتی (شا) لەو ولآتە بەدەست بهێنن, (رۆبەرت ئارمائۆ) بەر لە سەفەری (شا) بۆ مەكسیك گەیشتە ئەو ولآتە و شوێنێكی گونجاوی لە شاری گەشتیاری (كورناڤاكا/ Cuernavaca) لە نزیك مەكسیكۆ سیتی بۆ (شا) ئامادە كرد, شا و فەرەح و هاوڕێكانیان ڕۆژی (۱۰ ژوئین, ۲۰ خورداد ۱۳۵۸)هەتاوی گەیشتنە مەكسیك و لە شوێنی نیشتەجێبوونی نویٚ و فراوانی خۆیان بە بەراورد بە ڤێلا بچوك و ناخۆشەكەی باهاما, زۆر ڕازی بوون.

لە هاوینی ساڵی (۱۹۷۹ز, ۱۳۵۸)هەتاوی دا نیكسۆنی سەرۆك كۆماری پێشوو كیسنجەری وەزیری دەرەوەی پێشووی ئەمریكا لە شوێنی حەوانەوەی خۆی لە مەكسیك سەردانی (شا) یان كرد, چەند بەرپرسێكی پێشوی ئێرانیش لە مەكسیك سەردانی (شا) یان كرد, یەكێك لەوانە (هۆشەنگ نەهاوەندی) سەرۆكی پێشوی زانكۆی تاران و كۆتا سەرۆكی دیوانی تایبەتی (فەرەح) بوو, كە هاوكاری (شا)ی كرد لە نوسینی كتێبێكدا كە دەیویست لەو كتێبەدا بەرگری لەخۆی بكات, چاپی یەكەمی ئەم كتێبەی (شا) بەزمانی فەرەنسی و لە شاری پاریس بلآو كرایەوە, كە دواتر چاپە فرسیەكەی بە نێوی (پاسخ بە تاریخ / وەلآم بۆ مێژوو) بلآو كراوەتەوە, ئەم كتێبە لە بەرواری (١٦ سێبتەمبەر ۱۹۷۹ز, ۲٥ شەهریوەر ۱۳۵۸ هەتاوی) لە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی لە (كورناواكا) واژۆ كراوە.

لە كۆتاییەكانی مانگی (سیبتەمبەر, سەرتای پاییزی ۱۳۵۸)هەتاوی دووبارە نەخۆشیەكەی (شا) توند بوویەوە, (ئارمائۆ) یەكێك لە پزیشكە ناسراوەكانی نیۆیۆركی بە نێوی دوكتۆر (بنجامین كین / Benjamin Kean)ی بانگ كرد بۆ لای پێخەفەكەی (شا), دوكتۆر (فلاندرن / Flndrin)ی فەرەنسیش لە مانگی (ئۆكتۆبەر, میهر ۱۳۵۸) لای پێخەفی (شا) ئامادە بوو, وە (ئارمائۆ) بۆ یەكەمین جار ئەوەی زانی كە (شا) دووچاری نەخۆشی سەرەتان بووە, دوكتۆر (كین) دوای ڕاوێژ كردنی بە

دوکتۆر (فلاندرن) گەیشتنە ئەو بڕوایەی کە دەبێت (شا) لە ناوەندێکی پزیشکی پێشکەوتوو دا دەرمان بکرێت و خودی ئەویش پێشنیاری نیۆیۆرکی کرد.

ڕاپۆرتی خراپیی ڕەوشی تەرندروستی (شا) و داوای سەفەرکردنی ئەو بۆ ئەمریکا بە مەبەستی چارەسەر کردن، بەیانی ڕۆژی (١٩ ئۆکتۆبەر، ٢٧ میهر ١٣٥٨)هەتاوی لە کۆشکی سپی خرایە بەردەستی کاتەر و برژینسکی و ونس (وەزیری دەرەوە)، تا ئەو کات (ونس) لە نەیارە سەرسەختەکانی پێشوازی کردن بوو لە هاتنی بۆ ئەمریکا، دوای بینینی ڕاپۆرتی پزیشکیی پەیوەست بە ڕەوشی تەندروستی (شا) ووتی: لەم بارودۆخەدا ناتوانێت نەیاری هاتنی (شا) بکات بۆ ئەمریکا، تەواوی ئامادە بووانیش ڕازی بوون بە پێشوازی کردن لە (شا) بە مەبەستی چارەسەری نەخۆشیەکەی، تەنها خودی کارتەر بوو کە بە دەنگی بەرز ووتی: (ئەگەر دوای هاتنی (شا) بۆ ئەمریکا باڵوێزخانەی ئەمریکایان لە ئێران گرت و دیپلۆماتکارەکانی ئێمەیان بە بارمتە دەستگیر کرد، بەڕێزان لە بیرتان بێت کە خۆتان ئەم ئامۆژگاریەی منتان کردووە.[1]!!).

ڕۆژی (٢١ ئۆکتۆبەر، ٢٩ میهر ١٣٥٨)هەتاوی، کارتەر مۆڵەتی سەفەری (شا و هاوسەرەکەی) کە بە ڤیزای گەشتیارییەوە بۆئەمریکا دەرکرد، پێش ئەوەش (شا) ئاگادار کرایەوە کە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی لە مەکسیك لەدەست نەدات، لەبەر ئەوە مانەوەی ئەو لە ئەمریکا دا کاتی یەو تەنها بە مەبەستی چارەسەر کردنی نەخۆشیەکەیەتی، لەم بارەیەوە ڕاوێژ لەگەڵ سەرۆك کۆماری مەکسیك دا کرا و ئەویش بەڵێنی دا کە نەیاری لەگەڵ گەڕانەوەی (شا) بۆ مەکسیك و درێژکردنەوەی ماوەی مانەوەی لەو وڵاتەدا نەکات.

شا و فەرەح ڕویشتن بۆ ئەمریکا، لەماوەی دوو هەفتەدا (شا) دووجار نەشتەرگەری بۆ کرا، لە کۆتایی هەفتەی دووەمدا تەندروستی (شا) کەمێك باش بووبوو، بەڕادەیەك کە پێشوازی لە ژمارەیەك لە دۆستەئەمریکی و ئێرانیەکانی

---

[1] ئەم پێشبینی یەی کارتەر زۆر سەیر دێتە بەر چاوو، بەڵام گاری سیك بە دڵنیاییەوە ئەو بابەتە لە برژینسکی یەوە دەگوازێتەوە ( All Fall Down, Pemguin Books, London, 1986, PP Gary Sick: 215 – 216)

دانیشتووی ئەو وڵاتە کرد, لە نێو ئەوانەی کە سەردانیا کرد(ڕیچارد هڵمن)ی باڵوێزی پێشوی ئەمریکا لە ئێران و هاوسەرەکەی بەدی دەکران, (خانمی هڵمن) لە یاداشتەکانی خۆیدا دەربارەی ئەو دیدارە دەنووسێت: (لەگەڵ ئەوەی کە (شا) بە مۆڵەتی کارتەر و ئەنجامدانی کارێکی مەترسیدار لەلایەن کارتەرەوە, ڕەزامەندی لەسەر هاتنی ئەو بۆ ئەمریکا درابوو, کەچی هەر ڕەخنەی لە کارتەر دەگرت و دەیووت: لە ژێر فشاری کارتەر دا ڕەزامەندی لەسەر پێدانی ئازادی بێجێ و لەوڕادە بەدەر دەربڕیووە, بە واتایەکی دیکە شۆڕشی ئێرانی بە دەستکەوتی هەڵەکانی کارتەر دەزانی, ئەو بەوەش وازی نەدەهێنا و بەرپرسیارێتی ژەنەڕاڵ (هویزەر)ی لە ئێران دا بە پیلانێك بۆ لاوازکردن و هەڵوەشاندنەوەی لەشکر و ڕوخانی ڕژێمی سەڵتەنەتی دەزانی..).

ڕۆژی (١ نۆڤەمبەر ١٩٧٩ز, ١٠ ئابان ١٣٥٨)هەتاوی, لە کاتێکدا کە هێشتا (شا) کاتی نەخۆشی خۆی لە نەخۆشخانەی نیۆیۆرك تێدەپەڕاند, بۆ یەکەم جار دیدار لە نێوان بەرپرسە یەکەمینەکانی ئەمریکا و کۆماری ئیسلامی ئێران دا ئەنجام درا, ئەم دیدارە لە بۆنەکانی ساڵیادی سەربەخۆیی وڵاتی جەزائیر دا ڕویدا, تیایدا دانوستان لە نێوان (برژینسکی) ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی سەرۆك کارتەر لەگەڵ (مەهدی بازرگان) سەرۆك وەزیری ئێران و (ئیبراهیم یەزدی و مستەفا چەمران) وەزیرانی دەرەوە و ناوخۆی کۆماری ئیسلامی ئێران, ئەنجام درا[1], (برژینسکی) بە ڕەزامەندییەکی زۆرەوە لەم دانیشتنە گەڕایەوە بۆ واشنگتۆن, لەگەڵ (کارتەر) دا باسی لە فراوانکردنی پەیوەندیەکانی ئەمریکای لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران کرد, بەڵام ڕۆژی (٤ نۆڤەمبەر ,١٣ ئابان ١٣٥٨)هەتاوی تەواوی ئەوەی کە لە جەزائیر دا چنرابوو کرایەوە بە خوری و بە گرتنی باڵوێزخانەی ئەمریکا و بە بارمتە گرتنی

---

[1] گاری سیك دەنوسێت پێشەکی زەمینە سازی دیداری جەزائیر لە ئەنجامی دانوستانەکانی بەرپرسی باڵوێزخانەی ئەمریکا لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەتی کاتی لە تاران دا فەراهەم هێنرابوو, وە ئەنجام دانی ئەم دیدارەش لە سەر داوای شاندی نوێنەرانی ئێران بوو لە بۆنەی ساڵیادی سەربەخۆیی جەزائیر دا, دواتر بازرگان بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە ئەم دیدارە لەسەر داوای برژینسکی ئەنجام دراوە.

ئەندامان و کارمەندانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران دا, سەردەمێکی نوێی قەیراناوی لە پەیوەندیەکانی نێوان ئەمریکا و کۆماری ئیسلامی ئێران دا دەستی پێکرد.

هێرشکردنە سەر باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران و دەستگیر کردنی ئەندامانی ئەو باڵوێزخانەیە, بەڕواڵەت بەهۆی دەربڕینی ناڕەزایی بووە لە بەرامبەر پێشوازی کردنی ئەمریکا لە (شا) و بە مەبەستی ڕادەستکردنەوەی (شا) بە ئێران ئەنجام دراوە, بەڵام مەبەستی ڕاستەقینەی ئەم کارە بۆ لەبار بردنی هەوڵەکانی دەوڵەتەکەی (بازرگان) بوو لە چارەسەر کردنی کێشەکانی نێوان هەردوو وڵات و نزیك بوونەوەی زیاتریان لە یەکتری, هەربۆیە دەوڵەتەکەی (بازرگان) وەك دەبڕینی ناڕەزاییەك بۆ ئەم کارە دەستی لەکار کێشایەوە و باڵی توند ڕەو بە ئامانجی خۆی گەیشت, بەڵام بیانووی هێرش کردنە سەر باڵوێزخانەی ئەمریکا کە بوونی (شا) لە وڵاتی ئەمریکا بوو, لە شوێنی خۆیدا مایەوە, (ئایەتوڵا خومەینی)ش کە کینەی دێرینەی (شا)ی لە دڵدا بوو, ئازاد کردنی بارمتە کراوەکانی پەیوەست کرد بە ڕادەستکردنەوەی (شا) بە ئێران لەلایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە.

** ** **

ئەو بابەتگەلەی کە تا ئێستا خرایە بەر دیدی خوێنەران لە کتێبی (همە سقوط می کنند / هەمووان دەڕوخێن)[1]ی (گاری سیك) ی سەرۆکی بەشی ئێرانە لە ئەنجومەنی ڕاوێژکاری نەتەوەیی ئەمریکای سەردەمی سەرۆك کۆماری (کارتەر)دا, کە لەلایەن نوسەرەوە پوخت کراوەتەوە و وەرگێڕدراوە, ئیدی پاشماوەی داستانەکە هەتا گواستنەوەی (شا) بۆ (پەنەما) لە زمانی (هامڵتۆن جۆردن / Hamilton Jordan) سەرۆکی گاردی کۆشگی سپی لەسەردەمی حکومەتەکەی (کارتەر) دا, کە ڕاستەوخۆ لە نێو ئەم کارەدا بووە, وەردەگرین:

هامڵتۆ جۆردن لەکتێبەکەی خۆیدا بە نێوی (بحران / قەیران / Crisis) کە بە شێوەی یاداشتی ڕۆژانە ڕێکخراوە, لێکۆڵینەوەی لەسەر ڕوداوەکانی پەیوەندیدار بە

---

[1] Gary Sick: All Fall Down, Penguin Books, London,1986, PP. 203 – 227.

گرتنی ئەندامانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە ئێران و پەیامەکانی ئەو ڕوداوە ئەنجام داوە , کتێبەکە لە ڕۆژی (٤ نۆڤەمبەر, ١٣ ئابان ١٣٥٨)هەتاوی چۆنیەتی گرتنی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران و بە بارمتەگرتنی فەرمانبەرانی باڵوێزخانە دەست پێدەکات و تا کۆتاییەکانی نۆڤەمبەر و هەنگاوە بێ ئەنجامەکان بۆ ڕزگار کردنی بارمتە گیراوەکان باسدەکات, سەرەنجام (کارتەر) دەگاتە ئەو بڕوایەی کە هەرچی زووترە دەبێت (شا) لە ئەمریکا دەربچێت, تا ئەوەی بەڵکو لەم ڕێگەیەوە کرانەوەیەك دەست بکەوێت, (شا) ئامادەیی خۆی بۆ گەڕانەوە بۆ وڵاتی مەکسیك دەردەبڕێت, بەڵام حکومەتی مەکسیك بە پێچەوانەی بەڵێن و بڕیارەکانی پێشووی, خۆی لە پێشوازیکردن لە (شا) دەدزێتەوە, (هاملتۆن جۆردن) لە یاداشتەکانی ڕۆژی (٣٠ نۆڤەمبەر, ١٩ ئازەر ١٣٥٨)هەتاوی خۆیدا, دەربارەی هەڵوێستی کارتەر لە بەرامبەر ئەم هەواڵەدا بەم شێوەیە دەنووسێت:

(شا چارەسەر و سەلامەتی خۆیی وەرگرتوو ئامادەی گەڕانەوە بوو بۆ مەکسیك کە هەواڵێکی هەژێنەرمان لە مەکسیکەوە پێگەیشت: وەزارەتی دەرەوەی مەکسیك خۆی دزیبوویەوە لە پێدانی ڤیزەی سەفەر بە (شا) بۆ ئەو وڵاتە..!!.

کارتەر بە بیستنی ئەم هەواڵە خراپ پەشۆکا و ووتی: (لوپێز پورتیلۆ)ی سەرۆك کۆماری مەکسیك یەك درۆزنە..!, ئەمە یەکەمین جار بوو کە لە زمانی کارتەرەوە دەربارەی سەرۆکی دەوڵەتێکی بیانی دۆستی ئەمریکا ووشەیەکی لەو جۆرەم دەبیست).

کارتەر درێژەی دایەو ووتی: (نازانم ئەم کارەی ئەوان چ هۆکارێکی جگە لە نیگەران کردنی ئێمە هەیە... لەوانەشە دەیانەوێت بە خۆ دزینەوە لە پێشوازیکردن لە (شا), پێگەیەکی باشتر لە نێو وڵاتانی جیهانی سێ دا بەدەست بهێنن..!!), دواتر سەرۆك کۆمار ڕوی کردە (ونس) و ووتی: (هەرچی زووترە پەیوەندی بە وڵاتانی دۆستمانەوە بکە و لە ئێستا دا هەموو کاتی خۆت بۆ دۆزینەوەی پەناگایەك بۆ (شا) بەسەر ببە.!!).

ونس دەستبەجێ بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی سەرۆك کۆمار گەڕایەوە بۆ وەزارەتی دەرەوە و تا نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە چەندین بروسکەی جۆراوجۆری بۆ پایتەختی وڵاتانی دۆستی ئەمریکا لە سەرانسەری دوونیا دا نارد, داواش لە

باڵوێزەکانی ئەمریکا لەو وڵاتانە کرابوو، کە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتی شوێنی کاری خۆیان دا بگرن و لێیان بپرسن: (ئایا ئەو میهرەبانیە لە بەرامبەر ئەمریکادا دەکەن کە بە پێشوازی کردن لە شای پێشووی ئێران بۆ وڵاتەکەتان، هاوکاری ڕزگار کردنی بە بارمتە گیراوەکانی ئەمریکا بکەن..؟؟!!).

دوای دوو ڕۆژ هەوڵدان و پێوشوێن گرتن، (ونس) ڕاپۆرتی خۆیی پێشکەشکرد، کە تیایدا زۆربەی وڵاتانی دوونیا بە ڕاشکاوانە ئەم داوایەیان ڕەت کردبوویەوە، هەندێکیشیان وەڵامی دووفاقەییان داوەتەوە کە لە ڕاستیدا ڕەتکردنەوەیەکی ڕێزدارانەیە. تەنها وڵاتی میسر ئامادەیە پێشوازی لە (شا) بکات، (سادات) ئامادەیی خۆی نیشان داوە کە بە تایبەتی (شا) بۆ وڵاتەکەی بانگهێشت بکات.

وا بڕیار بوو (شا) ڕۆژی یەك شەممە دووی دیسامبەر لە نەخۆشخانە دەر بچێت، کارتەریش بە مەبەستی ڕێگەچارەیەکی کاتی پێشنیاری کرد کە (شا) بگوێزرێتەوە بۆ ناوەندی سەربازی ئەمریکا لە لاکلند (تەکساس) و هەوڵەکانیش دۆزینەوەی پەناگایەك بەردەوام بێت، کارتەر ڕاوێژکاری یاسایی خۆیی (کاتلەر) ڕاسپارد کە بڕوات بۆ سەردانی (شا) لە نەخۆشخانە و لەگەڵ بانگهێشت کردنی بۆ (لاکلند) دڵنیای بکاتەوە کە لەوێ پێداویستی پێویست بۆ بەردەوامی چارەسەر کردنی خۆیی پێدەگات، (شا) هیچ چارەیەکی جگە لە پەسەند کردنی ئەو بانگهێشتە نەبوو وە لە ڕۆژی دووی دیسامبەر دا لەگەڵ داروودەستەکەیدا گەیشتنە لاکلند...

دواتر هاملتۆن جۆردن بە نامەیەکی تایبەتی کارتەرەوە دەگاتە (پەنەما) بۆ ئەوەی ژەنەڕاڵ (عومەر تۆریخۆس /Omar Torrijos)ی ڕێبەری سەربازی پەنەما ڕازی بکات بە پێدانی مافی پەناهەندەیی بە (شا)ی ئێران، تۆریخۆس دوای دیدارێکی کورت لەگەڵ نێردراوەکەی کارتەر دا، ڕەزامەندی لەسەر داواکەی سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەردەبڕێت و لەسەر داوای جۆردن بانگهێشتنامەیەکیش بۆ (شا) دەنووسێت، جۆردن بەمەبەستی خێرا گەیاندنی ئەم هەواڵە خۆشە نزیکەی نیوەشەو تەلەفۆن بۆ واشنگتۆن دەکات، لە بارەی گفتوگۆی خۆی لەگەڵ کارتەر دا دەنووسێت:

ئێشکگری کۆشکی سپی تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و کاتێك وتم دەمەوێت لەگەڵ سەرۆك کارتەر دا قسان بکەم، ووتی: سەرۆك کۆما خەوتووە، وتم: خەبەری بکەرەوە

دەبێت لە بابەتێکی گرنگ ئاگاداری بکەمەوە, چەند چرکەیەك دواتر کارتەر تەلەفۆنەکەی هەڵگرت, دوای داوای لێبووردن لەوەی کە خەبەرم کردووەتەوە, وتم: (ئاغای سەرۆك کۆمار, من لە باشور لەماڵی دۆستەکەمانەوە قسەت لەگەڵ دەکەم, خۆشحاڵم ئاگادارتان بکەمەوە کە ئەو دیارییەکەی ئێمەی پەسەند کردووە.!!), کارتەر بە دەنگێکی خرۆشاوە وە ووتی: (سوپاس بۆ خودا, ئیستراحەتم کرد, من تەواوی ڕۆژ لە بیری ئەوەدا بووم کە ئەگەر وەڵامی ئەوو نەخێر بێت, ئەبێت چی بکەم.؟!).

وتم: (منیش زۆر خۆشحاڵم, بەڵام هێشتا کارمان تەواو نەبووە, ئێمە دبێت بڕوا بە دۆستەکەی دیکەمان بهێنین کە بێت بۆ ئێرە, دەزانی کە ئەو تێبینی لەسەر شوێنەکانی دیکە هەیە و ئێرە باش ناناسێت, من وای بۆ دەچم کە پێویستە خۆم بڕۆم بۆ تەکساس و ئەو ڕازی بکەم کە بانگهێشتی ئەم دۆستەمان پەسەند بکات, باشترە لەم بارەیەوە کات بە فیڕۆ نەدەین, چونکە بابەتەکە هەرچەندە درێژە بکێشێت مەترسی گەیشتنی ئەو بە چاپەمەنیەکان و ئاژانسەکانی هەواڵ زیاترە).

کارتەر پیشنیارەکەی منی پەسەند کرد و ووتی: هەرچی زووترە بەرەو تەکساس بجوڵێم و پرسی: ئایا هاوکارییەکی پێدەکرێت بۆ خێرا کردنی ئەو پرسە, یان نا.

وتم: (باشترین هاوکارییەك کە دەتوانیت بە منی بکەیت ئەوەیە کە (کاتلەر)ی ڕاوێژکاری یاسایی خۆت بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر بنێریت بۆ تەکساس, تا لەگەڵ ئەودا بچینە دیداری کەسی ناوبراو), لە ڕونکردنەوەی ئەو داوایەدا ووتم: (لەوانەیە ئەو (شا) بە قسەی لاوێکی سی و چوار ساڵە کە بە باشی نایناسێت ڕازی نەکرێت, باشترە پیاوێکی دامەزراو کە پێشینەیەکی ناسراویی لەگەڵ ئەودا هەیە, لەم گفتوگۆیەدا بەشداری بکات).

کارتەر ووتی: (بیرێکی باشە, من هەر ئێستا تەلەفۆن بۆ (کاتلەر) دەکەم و پێی دەڵێم سبەی زوو خۆی بگەیەنێتە تەکساس, ئێستا تەلەفۆنەکە بدە بە ژەنەراڵ (تۆریخۆس) تا خۆم سوپاسی بکەم).

ژەنەراڵم لە ژوورەکەی دیکە بانگ کرد و وتم: سەرۆك کارتەر دەیەوێت قسەت لەگەڵ بکات, گفتوگۆکەیان کورت بوو,لە وەڵامەکانی ژەنەراڵەوە دەردەکەوت کە کارتەر زۆر بە گەرمی سوپاسی دەکات.

کاتێك گفتوگۆی کارتەر و تۆریخۆس تەواو بوو داوای مۆڵەتی ماڵئاواییم لە ژەنەراڵ کرد و ووتم: دەمەوێت هەر ئەمشەوە بەرەو تەکساس بڕۆم.

جۆردن لە یاداشتەکانی ڕۆژی (١١ و ١٢ دیسامبەر, ٢١ و ٢٢ ئازەر ١٣٥٨)هەتاوی خۆیدا, ڕونکردنەوەیەکی تێروتەسەلی دەربارەی دیداری خۆیی و (کاتلەر) ڕاوێژکاری یاسایی کۆشکی سپی لەگەڵ (شا) دا داوە, کە بە هۆی ئاگادار بوون لە باری دەرونی (شا) لەو ڕۆژگارانە دا شیاوی خوێندنەوەیە, جۆردن دوای پێشەکیەك دەربارەی دیداری لەگەڵ (ئارمائۆ)ی وتەبێژی ئەمریکی (شا), کە بڕیار بوو ئەو ئێمە ببات بۆ خزمەتی (شا), دەنووسێت: لە ڕێگەدا (ئارمائۆ) ووتی: (من گومانم هەیە کە خاوەن شکۆ پێشنیاری سەفەر کردن بۆ پەنەما پەسەند بکات, ئەو لەو ڕۆژەوەی کە وڵاتی خۆیانی بە جێهێشتووە, ڕوبەڕوی کێشە و گرفتاری زۆر بووەتەوە لە سەر زەوییە نەناسراوەکان دا.... هەوڵەکانی ئێوە بۆ دۆزینەوەی شوێنێك بۆ نیشتەجێبوونی خاوەن شکۆ, جێگەی ڕێزە, بەڵام ئەو نە ژەنەراڵ تۆریخۆس دەناسێت وە نە زیانیاری پێویستیشی دەربارەی ئەو وڵاتە هەیە..).

دوای ئەوەی کە گەیشتینە بینای شوێنی نیشەجێبوونی شا,(ئارمائۆ) وەك ئەوەی بیەوێت ئاداب و شێوازی قسەکردن لەگەڵ گەورەکان دا فێری منداڵێك بکات, بە گوێمدا چرپاندی: (ئاگات لە خۆت بێت لەکاتی قسەکردن لەگەڵ (شا) دا, ئەو بە نازناوی فەرمی (خاوەن شکۆ) ناو ببە..), ووتم: دڵنیا بەو ئادابە دەزانم.

شا و هاوسەرەکەی لە خانوویەکدا کە سێ ژوری خەوتنی هەبوو لە بەشی ئەفسەرانی بنکەی هەوایی (لاکلند) نیشتەجێ بووبوون, ئەو ژورەی کە (شا) تیایدا پێشوازی لە من و کاتلەر کرد, ڕەوشێکی نائاسایی و پەشێوی هەبوو, ڕەنگی شین و سەوزی پەردەکان و تەختی ژوورەکە ئەو ڕەوشە ماندووکەرەی زیاتر دەکرد, (شا)ی پێشووی ئێران ماوەیەك پێشتر خۆی بە شای شاهان و نوری نەژادی ئاریایی و میراتگری تەخت و تاجی (کۆرشی مەزن) دەزانی, لەم ژووره ناشیرینەدا لە سەر لەتێك پلاستیك دانیشتبوو.

کاتێك کە ئێمە چووینە ژورەکە, (شا) بۆ تەوقە کردن لەگەڵ ئێمە دا لە شوێنی خۆی هەستایەوە, ئەو لەڕ و لاواز دەهاتە پێش چاوو, نەیدەتوانی هاوسەنگی خۆیی ڕابگرێت.

پێشتر (شا) لەگەڵ (کاتلەر) دا ئاشنایی هەبوو, لەبەر ئەوە ئارمائۆ تەنها منی بەو ناساند و ووتی: (خاوەن شکۆ, ئەو بەڕێز جۆردنی سەرۆکی گاردی کۆشکی سپییە, وای بۆ دەچم ناوەکەییت بیستبێت).

شا بە دەنگێکی نیگەران و لاوازەوە ووتی: (هەڵبەتە, پێشتریش بە دیداری بەڕێزیان لە کۆشکی سپی لە ساڵی (١٩٧٧ز)دا, گەیشتووم).

ئەو دیدارەی کە (شا) ئاماژەی بۆ کرد بە باشی لە بیرمە, سەرۆك کارتەر لە ساڵی یەکەمی سەرۆك کۆماری خۆیدا دیداری لەگەڵ زیاتر لە سەرۆکی چل ولاّتی دوونیا لە کۆشکی سپی ئەنجام دا, کە دیداری (شا) یەکێك لە دیدارە لە بیرنەکراوەکان بوو, دیداری فەرمی (شا) لە ئەمریکا لە ساڵی (١٩٧٧ز) نەك بە هۆی ڕودانی خۆپیشاندانی توند وبیٚ پێشینەی لە بەرامبەر کۆشکی سپی دا و ڕوداوی تەقاندنی گازی فرمێسك ڕێژ لەلایەن پۆلیسەوە, کە فرمێسکی لە چاوی هەموان هێنا, بەڵکو بە هۆی چۆنیەتی ڕوبەڕو بوونەوەی (شا) بوو لەگەڵ (کارتەر) و ئەو قسانەی کە لە دانیشتنی یەکەمین دیداری فەرمی ئەوان دا دەکرا, مایەی سەرسوڕمان و لە یاد نەکردن بوو, لەم دانیشتنەدا (شا) نزیکەی کاژێرێك بە بیٚ ئەوەی سەیری نوسین بکات, دەربارەی پرسە نێو دەوڵەتیەکان و گرنگی ئابووری و لەشکری ئێران بۆ ئەمریکا و دوونیا، قسەی کرد کە لە شێوەی خۆیدا بە شاکارێك دەهاتە هەژمار.

وتەکانی (شا) لەم دانیشتنەدا بەشێوەیەك (کارتەر)ی خستە ژێر کاریگەری خۆیەوە کە، سەرۆك کۆماری ئەمریکا نەیویست بۆچوونەکانی خۆی دەربارەی ڕەچاوکردنی مافی مرۆۋ و ئازادیە تاکەکەسیەکان لە ئێراندا، لەو دانیشتن و دانوساندنە فەرمیەدا لەگەڵ (شا)دا باس بکات، هەر لەبەرئەوە دانیشتنی دانوساندنی نێوان سەرۆکەکانی هەردوو ولاّت لە ژوورێکدا لە ژینگەیەکی دۆستانە و ئارامدا کۆتایی هات، لە کۆتایی ئەم دانیشتنەدا (کارتەر) داوای لە (شا) کرد کە پێکەوە بڕۆن بۆ ژوری تایبەتی خۆی کە لەتەنیشت ژووری دانوستنەکەیاندا بوو.

لەم دانیشتنە تایبەتی و دوو قۆڵیەدا بوو کە (کارتەر) نیگەرانیەکانی خۆی لەبارەی ڕەچاونەکردنی مافی مرۆۋ لە ئێراندا لەگەڵ (شا)دا باسکردبوو، داوای لیٚ کرد کە هەنگاو بۆ جێگیرکردنی دیموکراسی و دابینکردنی ئازادیە تاکەکەسیەکان هەڵبگرێت، لەم دانیشتنەدا جگە لە (کارتەر و شا) هیچکەس ئامادە نەبوو، بەلاّم

دواتر (کارتە) بابەتی گفتوگۆکانی خۆی لەگەڵ شادا بۆ باسکردم و ووتی: خۆشبەختانە (شا) ئامادەیی زۆری بۆ جێبەجێکردنی داواکاریەکانی ئەو دەربڕیوە و خودی خۆیشی لەبیری جێبەجێکردنی بەرنامە گەلێکە لەبارەی جێگیرکردنی دیموکراسی لە ئێراندا و دەربارەی مافی مرۆڤ و ئازادیە تاکەکەسیەکانیش کاری زۆرتر دەکات:

بەشێوەیەکی گشتی بینیی فەرمی (شا) لە ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٧ ز دا سەرباری ناخۆشی سەرتاکەی بەڵام کۆتاییەکی خۆشی هەبوو، هیوا و دڵنیایەکی بە ئێمە بەخشی کە بەهرەمەندین بە هاوپەیمانی بوونمان لەگەڵ هێزێکی جێگیر و پتە و لەیەکێك لە هەستیاریترین شوێنە جوگرافیەکانی جیهاندا، بەڵام کەمتر لە دوو ساڵ لەدوای ئەو بەروارە، ئەو پیاوەی کە بەبۆچونی ئێمە ڕابەرێکی بەهێز و هاوپەیمانێکی پتەو و جێگەی بایەخی ئێمە بوو، بە حاڵێکی پەشۆکاوەو ڕۆخسارێکی زەرد لەبەرامبەر مندا دانیشتبوو، لەگەڵ یەکەم دیتنیدا وا هەست دەکرا کە نەخۆشی ئەوی بەو ڕەوشە گەیاندووە, بەڵام بەکەمێك گفتوگۆ دەردەکەوت کە ئاسودەیی دەرونی و هێز و ئیرادەی خۆی لەدەستداوە، (شا) پۆشاکێکی درێژ و دەڵپی شین باوی تایەبەت بە ئەفسەرانی هێزی ئەمریکای پۆشیبوو, لەپشتیەوە هیمای (U, S, A) پێوە بوو، من نازانم کە خودی شا ئاگای لەوە هەبووە یان نا.......! من قسەکانی خۆمم بەم شێوەیە دەستپێکرد: (خاوەن شکۆ.... من زۆر خۆشحاڵم دووبارە بەخزمەتی ئێوە گەیشتم، وە لەبەرئەوەی کە بەزووی دیتنی ئێمەتان پەسەندکرد، سوپاستا دەکەم).

کاتێك من قسەم دەکرد (شا) لەچاوەکانم تێڕامابوو، لەوکاتەدا بیرم کردەوە کە تەنها شتێك لەو ماوەیەدا لەقیافەی دا گۆڕانی بەسەدا نەهاتووە هەمان چاوەڕەش و کاریگەریەکانیەتی، بەو تێڕامانیەوە دەتگوت چاوەڕێی بیستنی قسەی نوێیم لێ دەکات، کە لەسەرەتادا نەمدرکراندبوو، هەتا ئەوەی کە شا ئارامی نەما و ووتی: (واباشترە بچینە ناو ناوەڕۆکی بابەتەکە، چ شتێك بووەتە هۆکاری سەفەرکردنی ئێوە بۆ تەکساس و بینینی من...؟ لەم ڕۆژانەدا هەرکاتێك نوێنەری لەلایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە سەردانی من دەکات، داوای ئەنجامدانی کارێکم لێ دەکات....!).

وتم: (خاوەن شکۆ، ئێمە بۆ داواکردنی ئەنجامدانی کارێك نەهاتووین بۆ لای تۆ، ئێمە هاتووین باسی ئەو کێشەیەت بۆ بکەین کە لە کاری بەبارمتە گیراوە ئەمریکیەکان

له ئێراندا ڕووبەڕووی ئێمە بووەتەوە، ئەگەری ئەنجامدانی سەفەری ئێوە بۆ وڵاتێکی دیکە لە خزمەت بەڕێزتاندا باس بکەین....).

شا ووتی: (زۆرباشە، من پێشتریش وتومە بۆ ئازادکردنی بەبارمتە گیراوەکان هەرچیم پێ بکرێت ئەنجامی دەدەم، من نامەوێت لە مێژوودا بەنێوی بەرپرسی ئەم ڕوداوە ترسناکە بناسرێم.....!).

وتم: (خاوەن شکۆدەمەوێت بە ڕاشکاوانە بڵێم کە بە بۆچوونی ئێمە هەتا ئەو کاتەی کە ئێوە لە ئەمریکا بن، ئازادی بارمتەکان لە تارن ئاسان نابێت.....).

شا ووتی: (ئەم بابەتە دەگونجێت ڕاست یان ناڕاست بێت بەڵام ئەوەی کە دەبێت تۆ (ئاغای جۆردن) و سەرۆك کۆمارەکەتان هەستی پێ بکەن ئەوەیە کە: ئەو کەسانەی باڵوێزخانەی ئەمریکایان لە ئێراندا گرتوە و فەرمانبەرەکانیان بە بارمتە دەستگیرکردووە کۆمۆنیستن، سەرئەنجام لەگەڵ خومەینیشدا دەکەونە ململانێ کردن, من لەماوەی سی و حەوت ساڵی سەردەمی شاهنشاهی خۆمدا هەمیشە دۆستی گەلی ئەمریکا بووم، ئێستاش ئامادەم بۆ ئازادبوونی بارمتە ئەمریکیەکان فیداکاری بە گیانیش بکەم، بەڵام ئاغای جۆردن دیسانەوە بەبیری بەڕێزتان دەهێنمەوە کە ئێوە لەگەڵ ڕووداوێکی گونجاو و مەنتیقیدا ڕووبەڕوونەبوونەتەوە، ئەم پرسەش ناتوانن بە ستانداری لەبەرچاوگیراوی خۆتان چارەسەر بکەن.

شا بەبێ ئەوەی ڕاستەوخۆ وەڵامی قسەکەی من دەربارەی پێویستی سەفەرکردنی لە ئەمریکا بۆ چارەسەرکردنی پرسی بەبارمتە گیراوەکان بداتەوە، دەیویست وای نیشابدات کە ڕۆیشتنی ئەو لە وڵاتی ئەمریکا هیچ هاوکاری چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە ناکات، بەڵام من لەبەردەم جێبەجێکردنی بەپرسیاریەتەکەی خۆمدا پێویست بوو کە کاری گواستنەوەی ئەو لە تەکساسەوە بۆ پەنەما ڕێك بخەم، لەبەرئەوە پێداگیرم لەسەر بەڵگەکانی خۆم کرد و وتم: (خاوەن شکۆ من نامەوێت دەربارەی ئەم بابەتە و ڕووداوەکانی پشتی پەردەی کەبوونەتە هۆی بەبارمتەگرتنی فەرمانبەرانی باڵوێزخانەی ئەمریکا لە تاران لەگەڵ ئێوەدا باس بکەم، بەڵام ئەوەی کە هەیە ئەگەر تۆ لە ئەمریکا بڕۆیت کۆمۆنیستەکان یان هەر گروپێکی دیکە کە دەستیان لەم کارەدا هەیە, ئیدی ناتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئێمە

پەنای ئێوەمان داوە لە ئەمریکا، هەتا ئامادە سازی بۆگەڕانەوەی ئێوە و بەدەستگرتنەوەی سەڵتەنەت بکەین.).

لەتەواوی ماوەی قسەکردنی ئێمەدا بۆ یەکەمجار زەردەخەنەیەك کەوتە سەر لێوانی شا و ووتی: (ئاغای جۆردن بە دڵنیاییەوە خۆتان ئەوە باشتر دەزانن کە ئەمریکا خەیاڵی وەها کارێکی نیە.......!).

وتم: (نەخێر خاوەن شکۆ، ئەمریکا لە بیری وەها کارێکدا نیە.....!).

دوای ئەم گفتوگۆیە قسەکانی ئێمە جدیتر بوون، سەرەئەنجام شا ووتی: (زۆر باشە، من ئامادەم لە ئەمریکا بڕۆم بەڵام دەتوانم بۆ کوێ بڕۆم؟).

لێرەدا (کاتلەر) درێژەی قسەی لەدەم گرت و ووتی: (خاوەن شکۆ، لە دوازدە ڕۆژی ڕابردوودا سەرۆك کۆمار و وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بۆ دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوونی ئێوە پەیوەندییان بە زۆر وڵاتەوە کردووە، بەڵام بەداخەوە وەڵامی زۆربەی ئەو وڵاتانە نەرێ بووە، توانای ئێمەش بۆ دیاریکردنی ئەو وڵاتەی کە دەبێت بەڕێزتان سەفەری بۆ بکەن دیاریکراوە).

شا پرسی: (ئایا داوا لە لە سویسرا و نەمساش کراوە.....؟).

کاتلەر وەڵامی دایەوە و تی: (بەڵێ، بەڵام هیچکامیان لەم ڕەوشەی ئێستادا ئامادەی پێشوازیکردن لە ئێوەیان نەبوو.

شا بە ناباوەڕیەوە ووتی: (ئایا لەو بابەتە دڵنیاییت؟).

کاتلەر ووتی: (بەڵی خاوەن شکۆ باڵوێزەکانی ئێمە، لە هەردوو وڵاتەکەدا لەماوەی ٤٨ کاتژمێری ڕابردوودا دیداریان لەگەڵ وەزیرانی دەرەوەی سویسر و نەمسادا ئەنجامدا وە وەڵامی نەرێیان وەرگرتوە).

شا بەدەنگێکی هێواش و خەفەتباریەوە ووتی: دەبێت ئەوە بڵێم کە ئەم ڕووداوە منی توشی شۆك و نائومیدی کردووە، ئەڵێی هیچ وڵاتێك لەم دنیا گەورەیەدا ئامادەی پێشوازی کردن و پەنادانی منی نیە......!).

لێردا سەرەی قسەی من بوو کە وتم: (نا خاوەن شکۆ، بەو شێوەیە نیە, من هەر ئەمرۆ لە پەنەماوە گەڕاومەتەوە و لەسەفەرەکەمدا بۆ ئەو وڵاتە دەربارەی مانەوەی ئێوە لەو وڵاتەدا گفتوگۆم لەگەڵ ژەنراڵ (تۆریخۆس)ی ڕێبەری پەنەمادا کردووە، ئەو بەو پەڕی خۆشحاڵیەوە ئامادەیی دەربڕیوە بۆ پێشوازیکردن لەئێوە......).

شا ووتی: (ئاغای جۆردن لەناخی دڵەوە سوپاسی ئەرك و ماندووبوونەکانت دەکەم، بەڵام من زانیارێکی کەمم دەربارەی ئەمریکای لاتین و پەنەما و ئەو پیاوە (تۆریخۆس) هەیە، من ئارەزوومەندم بۆ وڵاتێکی ئەورووپی بڕۆم).

وتم: (خاوەن شکۆ ئێمەش وامان بەباش دەزانی کە تۆ بڕۆیت بۆ وڵاتێکی ئەورووپی، بەڵام بەداخەوە هیچ وڵاتێکی ئەورووپی ئامادەی پێشوازیکردن لە ئێوە نین، من وای بۆ دەچم پەنەما تاکە وڵات بێت کە لەم هەلومەرجەی ئێستادا بۆ مانەوەی ئێوە گونجاو بێت، هەڵبەت میسریش ئامادەیە کە پێشوازیتان لێ بکات، بەڵام دەوڵەتی ئەمریکا نیگەرانە لەوەی کە بوونی ئێوە لە وڵاتی میسردا کێشە بۆ (ئەنوەر سادات) دروست بکات......!).

شا ووتی: (نەخێر، خۆشم نامەوێت کێشە بۆ ئەنوەرساداتی دۆستم دروست بکەم).

وتم: (خاوەن شکۆ، داوای لێبووردن دەکەم لە ڕاشکاوی و ڕاست وتنەکانی خۆم، بەڵام دەمەوێت ئەوە بڵێم لە ئێستادا پەنەما تاکە وڵاتە کە ئێوە دەتوان سەفەری بۆ بکەن..).

لەم ساتە بەدواوە ئاوازی قسەکانی ئێمە گۆڕدرا، لە بەرئەوە (شا) دوای ئەم وتە ڕاشکاو و بێ پەردەیەی من، ئیدی وازی لە سەرسەختی و بە ڕگری هێنا و بە دەنگێکی خۆشەویستانەوە ووتی: (ئاغای جۆردن، تۆ کەسێکی لاویت و دەتەوێت کاری خۆت ئەنجام بدەیت، لەبارەی ڕاشکاوی ڕاستی وتنەکانی خۆتەوە نیگەرانی مەبە، دوای ئەوەی کە بەسەر من و بنەماڵەکەمدا هاتووە، ئیدی هیچ شتێك لای من مایەی سەرسوڕمان و چاوەڕوان نەکراو نیە...!).

من نەمدەزانی چ وەڵامێك بدەمەوە، ئیمە قسەی خۆمانمان کردبوو، ئیدی لە ئێستادا ئەوە (شا) یە کە دەبێت بڕیار بدات، چەند خولەکێك بێدەنگ بوو, لەکاتێکدا کە دەیویست بەسەر شڵەژاوی و ئارەزووە دەرونیەکانیدا زاڵ ببێت و بڕیار بدات، سەرئەنجام دوای چەند خولەکێك وەڵامی دایەوە و ووتی: (زۆر باشە من دەبێت ڕووبەڕووی ڕاستیەکان ببمەوە، من هەڵبژاردنێکی دیکەم نیە، ئێستا کەمێك زانیاری دەربارەی پەنەما و ئەو پیاوە (تۆرنینخۆس) بەمن بدەن).

سەرئەنجام بەهۆی ئەوەی کە شا وازی لە بەرگریکردن هێنا و ئامادەی سەفەرکردنی بوو بۆ پەنەما، هەناسەیەکی ئاسودەیم هەڵکێشا و دەستبەجی دەربارەی پەنەما و جوانیەکان و تەنانەت مێژووی ئەو وڵاتە و ڕووداوەکانی ئەم دواییەی پەنەما و پێگەی ئەمریکا لەو وڵاتە و نۆکەندی پەنەما و خودی (توریخۆس)ی ڕێبەری سەربازی پەنەماش، زانیاری و ئاگاهی پێویستم بە شادا، وە کتێبەکەی (ئەفیسی) دەربارەی پەنەما کە پێش دەرچونم لەو وڵاتە لە (ئامبلرموس)ی باڵیۆزی ئەمریکا لەو وڵاتە وەرگرتبوو، بەخشیم بە شا.

شا لەکاتێکدا کە پەڕەی کتێبەکەی هەڵدەدایەوە وتی، زۆر سوپاست دەکەم. بۆ پێدانی ئەو زانیاریەت، بەڵام من بیستومە، ئەم ژەنراڵ تۆریخۆسە یەکێکە لە دیکتاتۆرە توندڕەوەکانی ئەمریکای لاتین.

لە بەکارهێنانی وشەی دیکتاتۆر دەربارەی تۆریخۆس، ئەویش لەلایەن شا وە، سەرسام بووم، ئەمە هەمان ئەو نازناوە بوو کە نەیارانی شا لەماوەی دەسەڵاتی سەڵتەنیدا لە دژی خۆی بەکاریان دەهێنا.، ئەویش ئەمڕۆ بەبێ ئەوەی کە سەرنج لەو بابەتە بدات, هەمان نازناو دەربارەی ڕابەری وڵاتێکی دیکە بەکاردەهێنێت، من بەبێ ئەوەی گاڵتە یان ئاماژەیەك بەو خاڵە بدەم کەوتمە باسکردنی تایبەتمەندیەکانی تۆریخۆس و وتم: (خاوەن شکۆ، ژەنراڵ تۆریخۆس دوای سەرۆك سادات سەرنجڕاکێشترین ڕووخسارە کە ئێمە لە ماوەی سەرۆك کۆماری کارتەردا ڕووبەڕوی بووینەتەوە، ئەو لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتەکەیدا لێهاتووییەکی لە ڕادەبەدەری نیشانداوە، لەگەڵ ئەوەی بەپشت ئەستور بە سوپا وەفادارەکەی, ئەگەری بەردەوامی دەسەڵاتی حکومی ڕەهای خۆی بەسەر وڵاتەکەیەوە هەیە, بەڵام هێدی هێدی زەمینەی گواستنەوەی  دەسەڵاتی لەکەسە سەربازیەکانەوە بۆ کەسە مەدەنیەکان فەراهەم هێناوە و لەگەڵ ئەوەی کە خۆی پیاوی ڕاستەقینە و بەهێزی پەنەمایە سەرۆك وەزیرێکی مەدەنی داناوە و هەوڵ دەدات کە کەمترین دەستوەردانی لەکاروباری وڵاتەکەیدا هەبێت.).

شا بەوردی گوێی لەو بابەتانە دەگرت کە من دەربارەی (تۆریخۆس) باسم دەکرد، لەوانەشە لای خۆیەوە بیری لەوە دەکردەوە ئەگەر ئەویش بەهەمان شێوە کاری بکردایە بۆ بەردەوامی حکومە ڕەهاکەی خۆی دەستی لە وردەکاریەکانی

کاروباری وڵاتەکەی وەرنەدایە، ئەوا دووچاری ئەم چارەنوسە نەبوویەوە، دوای ئەوەی کە ڕوونکردنەوەکانی من دەربارەی وڵاتی پەنەما و تۆریخۆس تەواو بوو, دیسانەوە شا نیگەرانی دەربڕی لەوەی کە ناچارە سەفەر بکات بۆ وڵاتێکی نەناسراو و ژینگەیەکی نائاشنا، ڕووی کردە (ئارمائۆ)ی ڕاوێژکارە ئەمریکیەکەی و ووتی: (بۆچوونی تۆ چیە؟ دەبێت دەربارەی پاراستنی ئاسایش و بەردەوامی چارەسەرەکانم و دابینکردنی ئاسایشی خێزان و یاوەرانم چی بکەم...).

ئارمائۆ ووتی: (خاوەن شکۆ، چەند کارێك هەیە دەبێت ئەنجامیان بدەین، یەکەم دەبێت ڕاوێژ لەگەڵ پزیشکەکانی بەڕێزتدا بکەم، بۆ ئەوەی بزانم توانای بەردەوامی چارەسەرکردنی ئێوە و چاودێریە پزیشکیەکان لەوڵاتی پەنەمادا تاوەکو چ ڕادەیەك فەراهەم هێنراوە، دووەم دەبێت لەگەڵ چەند بەرپرسێکی پارێزەری بەڕێزتاندا بڕۆین بۆ پەنەما و بزانین دەوڵەتی پەنەما چ شوێنێکی بۆ نیشتەتجێ بوونی بەڕێزتان دیاری کردووە, وە چ ئامادەسازییەکی لەبارەی پاراستنی ئاسایشی ئەو ناوچەیەوە کردووە. بەڵام خاڵی سێیەم کە پەیوەستە بەئاغای جۆردنەوە کە دەمەوێت بزانم: ئایا دەوڵەتی ئەمریکا ئەو گرنتیە بە ئێمە دەدات کە لە کاتی پێویستبوونی پزیشکی بتوانین سەردانی ئەمریکا بکەین....؟).

لە بەرئەوەی کێشەی نوێ دروست نەبێت، لەسەر بەرپرسیاریەتی خۆم وتم: (دڵنیام کە دەوڵەتی ئەمریکا لەکاتی پێویستی پزیشکیدا، دژایەتی گەڕانەوەی (شا) بۆ ئەمریکا ناکات، بەڵام دەبێت بزانم ڕاوێژکردن لەگەڵ پزیشکەکان و بەدواداچوونی پرسی ئاسایش ماوەی چەند درێژە دەکێشێت..؟).

ئارمائۆ ووتی: (ئایا دەتەوێت کاتێك بۆ ئەم کارە دیاری بکەیت؟ وە خاوەن شکۆ ناچارن کە ئەمریکا بەجێبهێڵن؟).

لەم پرسیارە بێجێیەی ئارمائۆ، توڕە بووم بەڵام ڕقی خۆمم شاردەوە و وتم: (نەخێر، بەو شێوەیە نیە، ئێمە دەمانەوێت کە خاوەن شکۆ بەسەلامەتی و بەبێ دووچاربوونی بە کێشەی نوێ ئەم سەفەرەی ئەنجان بدات، پەلەکردنی ئێمە تەنها لەبەر ئەوەیە کە هەرکاتژمێرێك دەگوزەرێت، مەترسی ئاشکرابوونی ئەم پرسە لەڕێگەی هۆکارەکانی پەیوەندی کردنەوە زیاتر دەبێت، پێ دەچێت کێشەی نوێ دروستبکات........).

ئارمائۆ ووتی: (ئەگەر خاوەن شکۆ ڕەزامەندی دەربڕن من هەر ئەمڕۆ پرسی چاودیریە پزیشکیەکان پێی و شوێن دەگرم و ئەگەر وەلأمی پزیشکەکان ئەرێ بوو، ئەوا لەبەر بابەتی ئاسایش دەستبەکار دەبین..........).

شا ڕووی کردە ئارمائۆ و ووتی: (زۆر باشە، زوتر دەست بەکارەکان بکە)، دواتر ڕوی لە من کرد و لە درێژەی قسەکاندا ووتی: (دەبێت ئێستا لەگەڵ (شاژن دا) قسان بکەم، لەوانەیە ئەوانیش پرسیاریان هەبێت....).

بەڕواڵەت (شا) ئارەزوومەندبوو درێژە بە قسەکانمان بدەین منیش پەلەم نەبوو، چونکە گفتوگۆی ئێمە دەربارەی سەفەرکردن بۆ پەنەما تەواو بووبوو، ویستم گوێم لە وتەکانی دڵی شا بێت، لێم پرسی: (خاوەن شکۆ) بەڕێزتان گۆڕانکارەیەکانی ئێران چۆن هەڵدەسەنگێنێت...؟).

شا ووتی: (ئاغای جۆردن، دڵم خوازیاری ئەوە بوو کە ئاغای سەرۆك کۆمار یان بەپرسێکی باڵای دیکەی وڵاتەکەتان، شەش مانگ پێشتر ئەم پرسیاریەی لە من بکردایە......).

من نەمدەزانی چ وەڵامێك بە شا بدەمەوە بیرم کردەوە کە کەمێك ئارام بگرم تا ئەو درێژە بە قسەکانی بدات.

دوای بێدەنگیەکی کەم، شا دەستی بە قسان کردو ووتی: (وڵاتەکەی من دووچاری ڕەوشێکی هەرکە و بۆخۆی و پەشێوییەکی بێ پێشینە بووە، تۆ ناتوانێت هەست بکەیت، کە من کاتێك لە باهاما ڕۆژنامەکانی ڕۆژم دەخوێندەوە هەواڵی لە سێدارەدانی ئەو کەسانەی کە ساڵەهای ساڵە لەسەردەمی سەڵتەنەتی مندا خزمەتیان کردووە دەخوێندەوە، چ ڕەنجێکم دەکێشا)، دواتر بەشێوەیەکی توانج ئامیز ووتی: (من نازانم کە ئەم بابەتە، لە ڕاپۆرتەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئێوەدا دەربارەی مافی مرۆڤ دەنوسن یان نا......!).

من بابەتی گفتوگۆکانم گێڕایەوە بۆ ڕابردوو و وتم: (خاوەن شکۆ، بە بۆچونی ئێوە، بۆچی ئەم ڕەوشە لە ئێراندا هاتە پێش........؟).

شا ووتی: (ئاغای جۆردن، ڕاستی بابەتەکە ئەوەیە کە خودی خۆشم ناتوانم ئەوەی کە لەئێراندا هاتوەتە پێش بە ڕاستی سەری لێ دەربکەم و شیکاری بۆ بکەم...!، من چەندین جار لەم بارەیەوە بیرم کردووەتەوە، کە ئایا دەکرا، من

بەشێوەیەکی دیکە کارم بکردایە، وەیان ئەگەر دەوڵەتی ئێوە بەشێوەیەکی دیکە کارێکی دەکرد، چ پێشهاتێك ڕووی دەدا...؟، یەکێك لە کێشەکانی من کە بڕیاردانی لەلام دژوار کردبوو ئەوە بوو کە هەڵوێستی ڕاستەقینەی دەوڵەتی ئەمریکا و خودی سەرۆك کۆمارەکەی ئێوەم بەرامبەر ئێران نەدەزانی، کاتێك من دیدارم لەگەڵ (سۆلیوان)ی باڵوێزی ئێوە لە ئێراندا ئەنجامدەدا, منی بۆ نەرمونیانی و لەسەرخۆیی هان دەدا, تەنانەت پێشنیاریشی دەکرد کە لەگەڵ سەرسەختترینی دووژمنەکانمدا ڕێك بکەوم، بەڵام هەر هەمان ڕۆژ پەیامێکم لە (د. بژرنسکی) ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەی سەرۆك کۆمارەوە پێ دەگەیشت, کە منی هان دەدا بۆ توندووتیژی نواندن و سەرکوتکردنی نەیاران، تەنانەت وتەکانی خودی سەرۆك (کارتەریش) بۆ پشتیوانی کردن لە من ڕاڕایانە بوو, هاوکار نەبوو...).

(شا) کەمێك ئارامی گرت و دواتر ووتی: (هەڵبەتە ئێستا بەجۆرێکی دیکە بیر دەکەمەوە، ئەگەر لەو ڕۆژگارە قەیراناویانەدا وەك ئێستا بیرم بکردایەتەوە بەهێزو تواناوە دەوەستام و دەجەنگیم و دەمامەوە....، ئەگەر بەهێزەوە کارم کردبا ئەمڕۆش لە سەڵتەنەتدا دەبووم وەك تۆبەکارێك کون و قوژبنی جیهانێکی بێ پەناگا بۆ خۆم و بنەماڵەکەم نەدەگەڕام....!).

شا بەشێوەیەك لە نائومێدی و بێ دەرەتانی قسانی دەکرد، دڵم بۆی سوتا، ئەو وا هەستی دەکرد کەسێکی دەستکەوتوە کە گوێ لە خەمەکانی بگرێت، هەناسەیەکی نوێی هەڵکێشا و بەم شێوەیە درێژەی بە قسەکانی خۆی دا: (ڕاستت بووێت، خودی خۆشم نازانم کە بۆچی ڕەوشی وڵاتەکەم بەم شێوەیە تێکچوو، هەتا چەند مانگێك بەر لە دروستبوونی ئەم قەیرانە، سەدان هەزارکەس بەهۆی بۆنە جۆراوجۆرەکانەوە بۆ دەربڕینی پشتگیری لە من خۆپیشاندانیا دەکرد، لەکاتی تێپەڕینیان بە شەقامەکاندا لێشاوی کۆمەڵانی خەڵك کە لەدەوری شەقامەکاندا گرد بووبوونەوە، هەستی خۆیانیان بۆ دەردەبڕیم, بەڵام لە پڕێکدا و لەماوەی دوو مانگدا، لافاوەکە پێچەوانە بوویەوە و هەمان ئەو کەسانەی کە هەستی خۆشەویستیان بۆمن دەردەبڕی.... دروشمی (مەرگ بۆ شا) یان بەرز دەردەکردەوە، بەڕاستی من نازانم کە بۆچی وای لێ هات...!).

ئیدی شا قسەیەکی بۆ وتن نەبوو تەنها ووتی: تەنها ئەشرەفی خوشکی هاتوە بۆ هاتووە بۆ نیۆیۆرك بۆ بینینی و چەند وشەیەکی دەربارەی ئازایەتی و لەخۆبووردووی ئەو باسکرد، کاتی ماڵ ئاوایی بوو لە شوێنی خۆمان هەستاین، لەکاتێکدا کە شا بە سەختی لەسەر پێی خۆی وەستابوو دەستی دایە و ئێمە و ووتی: (هیوادارم کە جارێکی دیکەش دیدار لەگەڵ ئێوە ئەنجام بدەم).

کاتێك بەرەو دەرگای بیناکەی دەرەوە دەڕۆیشتین ڕووبەڕووی شازادە خانم ئەشرەفی خوشکی شا بووینەوە، من ئەوم دەناسی، سەلامم لێ کرد و دەستم برد تەوقەی لەگەڵ بکەم, بەڵام ئەشرەف نیگایەکی توندی منی کرد و بەبێ ئەوەی دەستم بداتی بەلامدا تێپەڕی.[1] ....!.

** ** **

دواتر (هاملتۆن جۆردن) باسی لە دووبارەی سەفەری خۆی بۆ پەنەما لەگەڵ ئارمائۆ و سەرهەنگ (جەهانبینی) سەرۆکی گاردی پارێزەرانی شا دەکات و دەنووسێت: دوای هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێبوونی شا لە دوورگەی جوان و ڕازاوی (کۆنتادوورا) و بینینی ڕەوشی ئاسایشی ئەو دوورگەیە, گەڕاینەوە بۆ تەکساس و بانگهێشتنامە فەرمیەکەی (تۆرینخۆس)م دایە دەستی شا، جۆردن درێژەی دەداتێ کە: (شا) زۆر خۆشی لە ناوەرۆکی نامەکەی (تۆریخۆس) هات، چەند جارێك بەخۆشحاڵییەوە ئەم ڕستەیەی دووبارە دەکردەوە کە: (سەرئەنجام دەعوەتنامەیەکم بەدەست گەیشت........!).

سەرەنجام شا ئامادەی خۆی بۆ سەفەرکردنی بۆ (پەنەما) دەربڕی و بەیانی ڕۆژی (١٥ دیسەمبەر، ٣ ئازەری ١٣٥٨) هەتاوی، بە فڕۆکەیەکی سەربازی لە فرۆکەخانەی (لاکلند)ەوە بەرەو (پەنەما) بەڕێکەوت، دیسانەوە (جۆردن) دەربارەی ڕووداوی سەفەرکردنی (شا) بۆ (پەنەما) و ماوی مانەوەی ئەو لەو وڵاتە, باسێکی تیرو تەسەلی نوسیوە و تیایدا هاتووە:

(ڕۆژی ١٥ دیسەمبەری ١٩٧٩) کاتێك لە (شا) گەیشتە فرۆکەخانەی (پەنەما) ڕووخسارێکی لاواز و بێ ڕەنگ و ڕەوشێکی بەشێوەی هەبوو، پۆشاکەکانی بەری

---

[1] هاملتۆن جۆردن: بحران، ت. محمود طلوعی, انتشارات هفته, ص ٦٨– ٧٦.

بەهۆی لاوازی و زەعیفی لاشەیەوە داچۆڕابوو، زۆر بەدژواریش چەند ڕەستەیەکی لە وەڵامی ئەو کەسانەی کە بۆ پێشوازی کردنی هاتبوون، بەسەر زماندا هات، لەم سەفەرەدا یاوەرەکانی (شا) جگە لە (فەرەح)ی ژنی, چەند کەسێکی ئێرانی و ئەمریکی و سەگە گەورە و خۆشەویستەکەی (شا) و (پودل)ە بچوکە فەڕەنسیەکەی فەرەحیش بوون, ژەنراڵ (عومەر توریخۆس) ڕێبەری سەربازی پەنەما کە لەبارەی شای ئێرانەوە بۆچون و چاوەڕوانییەکی دیکەی هەبوو، دواتر لەبارەی ڕووداوی سەفەری شا بۆ پەنەما پێی وتم: (ئەفسانەی گەورەیی دووهەزاروپێنج سەد ساڵەی شاهنشاهی و زرق و برقی بنەماڵەی پەهلەوی, کەم بووەتەوە بۆ ١٢ کەس و چەند جانتایەك و دوو سەگ.......!).

شا بە زەردەخەنەیەکی دەستکردەوە تەوقەی لەگەڵ ئەو کەسانە کرد کەبە مەبەستی پێشوازی کردنی هاتبوون بۆ فڕۆکەخانە, دواتر لەگەڵ هاوسەرەکەی سواری هەلیکۆبتەرێکی سەربازی ئەمریکی بوو بۆ ئەوەی بڕوات بۆ دوورگەی ئارامی (کونتادوورا) کە بۆ نیشتەجێبوون و مانەوەی ئەو ئامادە کردابوو, کاتی سوار بوونی هەلیکۆبتەرەکە ڕوخساری (شا) زۆر خەمناك بوو, وەك بڵێی لە چارەنوسی نادیاری خۆی لە دوورگەیەکی نەناسراو و نائاشنا کە لە کەناری ئۆقیانوسی گەورە دا چاوەڕوانی ئەو دەکات, پەشۆکاو و خەیاڵاوی دەهاتەبەر چاوو.

شا و یاوەرانی دوای نیشتنەوەیان لە فڕۆکەخانەی (کونتادوورا) ڕێنمایی کران بۆ ماڵی (گابرێل لویس) کە پێشتر بۆیان ئامادە کرابوو, لویس شوێنی تازەی نیشتەجێبوونی ئەوان, کە خانوویەکی داری نیوە تاریك بوو, لە لایەکەوە بە درەختی گەورەی جەنگەڵ دەورە درابوو, لەلایەکی دیکەوە دیدەنییەکی سەرسامکەری ئاوی شینی ئۆقیانوسی هەبوو, نیشانی (شا و هاوسەرەکەی) دا, فەرەح ڕازی و خۆشحاڵ دەهاتە پێش چاوو, بەلاّم بە سوپاسگوزارییەکی سادە کۆتایی بە قسەکانی هێناو درێژەی نەدایە.

شا و یاوەرانی بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ ڕۆیشتن بۆ ئوتێلێك کە کەمتر لە نیو کیلۆمەتر لە شوێنی نیشتەجێبوونەکەیانەوە دوور بوو, پێشتر هەواڵی هاتنی شای ئێران و هاوسەرەکەی بۆ دوورگەی (کۆنتادوورا) بە گەشتیار و ڕێبووارانی تاکە ئوتێلی دوورگەکە گەیشتبوو, هەر بۆیە کاتێك کە شا و هاوسەرەکەی گەیشتنە

ئوتێلەکە خەڵك دەوری دان و لێیان کۆ بوونەوە، هێزەکانی ئاسایش کە بۆ چاودێری کردنی (شا) نێردرابوون بۆ ئەو دوورگەیە، ناچار بوون دەستبەکار بن، نواندنی توندووتیژی لە بەرامبەر حەڵك و گەشتیارانی ئەو دوورگەیە بۆ دانیشتوانی ڕەسەنی ئەو دوورگەیە نائاسایی بوو، یادگارییەکی ناخۆشی لە دەرونی ئەوان دا دەربارەی میوانە نوێیەکان بە جێهێشت.

(ئامبلرموس)ی باڵوێزی ئەمریکا لە پەنەما کە ڕێنمایی (شا)ی کرد هەتا شوێنی تازەی نیشتەجێبوونی لە دوورگەی (کونتادوورا)، یەکەمین جاری بوو لەگەڵ ئەودا بکەوێتە گفتوگۆ، لە باسێکی یاداشتەکانی خۆیدا دەربارەی ئەم دیدارە دەنووسێت: (شا زۆر هەوڵی دەدا کە خۆی ئارام نیشان بدات، نیگەرانی و فشارە دەرونیەکانی خۆی بشارێتەوە، کاتێك لەسەر مێزی نانی نیوەڕۆ دەربارەی پێشکەوتنی پەنەما لە سەردەمی حکومەتی ژەنەڕاڵ (تۆریخۆس) قسەم بۆ دەکرد، بە تایبەتی دەربارەی پێشکەوتنەکانی تۆریخۆس لە بواری پەروەردەو فێر کردن و فراوانکردنی خزمەتگوزاریەکان بۆ ئەو مەبەستە و بەرەنگار بوونەوەی نەخوێندەواری، شا هەتا ئەو کاتە جگە لە چەند ڕستەیەکی کورت هیچی نەوتبوو، لە پڕێکدا زمانی کرایەوە و ووتی: (منیش هەوڵی زۆرم دا بۆ ڕیشەکێشکردنی نەخوێندەواری لە ولاتەکەم دا، دوایین پلانیشم ئەوە بوو کەسیستەمی فێرکردن لە ڕێگەی کەناڵی ئاسمانییەوە بگەیەنم بەسەرانسەری ولات، بە شێوەیەك کە لە سەرجەم گوندە بچوکەکانیشدا خەڵکی بتوانن بە بێ پێویست بوون بە مامۆستا و لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە وانە بخوێنن و فێریخوێندواری بن، دواتر (شا) ئاهێکی هەڵکێشا و ووتی: (بەداخەوە (خومەینی) ئەم هەمووە ئارەزووەی دا بە با دا، ئیدی دەبێت خەڵکی ئێران بۆ گەیشتن بەو ئارەزووانە لە چاوەڕوانی شایەکی دیکە دا بن..........!!).

ئامبلرموس دەیووت: من نەمدەویست لەو دانیشتنەدا لە زەوقی (شا) بدەم و ئەو پیاوە نەخۆشە نیگەران بکەم، بەلاّم ئەو زانیارە کەمەی کە دەربارەی فراوانی ئێران و پەڕاگەندەیی و دواکەوتووی گوندەکانی ئەو ولاّتە هەمبوو، سەرنەگرتنی ئەو بەرنامەیەی کە شا لە بارەیەوە دەدوا، بۆ من زۆر ڕۆشن بوو، ئەو شتانەی کە

دەربارەی بەرزفڕین و خەیاڵ پلاّویەکانی (شا) بیستبووم, لە بە تێڕامان بەم وتانە هەستم بە یەکێك لە هۆکارەکانی ڕوخانی ئەو کرد.

لە هەفتەکانی یەکەمی نیشتەجێبوونیان لە (کۆنتادوورا), شا و فەرەح هۆگری ژینگەی نوێی ژیانی خۆیان بوون, کەش و هەوای گەرم و مام ناوەندی دوورگەکە لەو وەرزەی ساڵ دا و جوان و پڕاوەیی سرشتی دەورروبەر و میهرەبانی خەڵکی دوورگەکە, شا و فەرەحی کەیف خۆش کردبوو, بەڕادەیەك کە لە ماوەی هەفتەی دووەمی نیشتەجێبوونیان دا لەو دوورگەیە, (شا) بە یەکێك لە میواندارە پەنەماییەکانی خۆیی وتبوو : ئێرە دوورگەی بەهەشتە..!,

شا هێدی هێدی لە دوورگەی (کۆنتادوورا) لەش شاغی خۆیی دەست دەکەوتەوە و ئەو کەسانەی کە لە دووەمین مانگی مانەوەی دا لەو دوورگەیە دیبوویان دەیان ووت: ڕەنگ و ڕوی شا باشتر بووە و چەند کیلۆیەکیش زیادی کردووە و بیر و هۆشی دامەزراوتر بووە, ژەنەراڵ تۆریخۆس یش چێشت لێنەری تایبەتی و چەند خزمەتکارێکی بۆ میوانەکانی خۆیی تەرخان کردبوو, خانمێکی نوسەریشی بۆ شا دانابوو, کە لە وەرگێڕان و وەڵاّم دانەوەی نامە و تەلەفۆنەکانی دا هاوکاری دەکرد, هەفتانە سەدان نامە بۆ شا و ژنەکەی دەهات, یەکێك لە خۆشگوزەرانیە ڕۆژانەکانی شا خوێندنەوەی ئەم نامانەو قسەکردن بوو لەگەڵ نوسەرە جوان و لاوەکەی دا, تۆریخۆس وای ڕێکخستبوو کە ڕۆژنامە ئەمریکیەکان بە شێوەیەکی بەردەوام بنێردرێن بۆ شا, ڕۆژنامەی (میامی هراڵد)لە هەمان ڕۆژی دەرچونیدا دەگەیشتە دەستی شا, بەڵاّم ڕۆژنامەی (نیوێۆرك تایمز) و ڕۆژنامەکانی دیکەی ئەمریکا ڕۆژێك دواتر دەگەیشتنە دوورگەکە و شایش چەندین کاتژمێری لە کاتی خۆیی بە خوێندنەوەی ئەو ڕۆژنامانە یان ئەو کتێبە نوێیانەی کە بۆی دەهات بەسەر دەبرد.

شا و فەرەح لە کۆتایی دووەمین مانگی نیشتەجێبوونیان لەو دوورگەیە بە تەواوی خویان بە ژیانی ئەو دوورگەیەوە گرتبوو, لەو پشودان و ئارامیەی کە لێی بەهرەمەند بوو بوون, بەکەسانێکی ڕازی دەهاتنە پێش چاوو, ڕۆژانە تا درەنگانێك دەخەوتن, دوای خواردنی نانی بەیانی ماوەیەك لە نێو جەنگەڵ و کەناری ۆقیانوس دا دەگەڕان, شا بە مەبەستی خوێندنەوەی ڕۆژنامە و کتێب و بە دواداچوونی نامەکانی ڕۆژانەی دەگەڕایەوە بۆ ماڵ, بەڵاّم (فەرەح) وای بە باش دەزانی کە سود لە

تیشکی خۆر و هەوای دەرەوە وەربگرێت و سەرقاڵی مەلە کردن و یاری خلیسکانی سەر ئاو ببێت, یەکێك لە کاتە خۆشەکانی ڕۆژانەی ڕاسپێردراوانی ئاسایش و پیاوە قورپۆقیەکانی چاودێری کەناری نۆقیانوسیش, سەیرکردنی یاری خلیسکانێی سەر دەریا و خەوانچەکانی (خۆهەڵدانە ناو ئاو لە شوێنی بەرزەوە) شاژنی پێشوی ئێران بوون.

ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە دوورگەی (کۆنتادوورا) دەچوون بۆ سەردانی شاو فەرەحی هاوسەری زۆر کەم بوو, ئەوان زۆربەی کاتەکانی ژیانیان بە تەنیایی بەسەر دەبرد, (گابریل لویس) خاوەنی ئەو ڤێلایەی کە شای تیدا نیشتەجێ بوو بوو, هەفتانە یەك دوو جار سەردانی دەکردن, (ڕالف– تورس)ی بەڕێوەبەری تاکە ئوتێلی دوورگەکەش جارجارێك سەردانی دەکردن, کەسێکی دیکە کە بەردەوام سەردانی ڤێلاکەی شا و فەرەحی دەکرد (تونی– می) مامۆستای یاری تێنسی فەرەح بوو, کە پەیوەندی و خۆشەویستی فەرەحی بۆلای خۆی ڕاکێشابوو , بە ڕادەیەك کە ئەم پەیوەندییە بووەتە هۆی دروست بوونی گومان و جولأنی غیرەتی شا, هەربۆیە چەند جارێك (تۆنی) لەلایەن شاوە ئاگادار کراوەتەوە کە لە کاتی یاری کردن دا زۆر خۆیی لە شاژن نزیك نەکاتەوە.

شا زۆرترین کاتی شەوانەی بە سەیر کردنی بەرنامە تەلەفزیۆنیەکان بە تایبەتی ڕاپۆرتەهەواڵیەکانی تەلەفزیۆن بەسەر دەبرد و چەندین کاتژمێریش بەلای ڕادیۆ وە دادەنیشت و گوێی لە بەرنامە هەواڵیەکانی ڕادیۆ دەگرت, ئەو زیاتر هەوڵی دەدا بەرنامە فارسیەکانی ڕادیۆ بگرێت, بەتایبەتی ئێزگەی (بی بی سی) فارسی ڕادیۆی لەندەن, ئەمەش بۆ ئەوەی زیاتر ئاگای لە ڕەوشی وڵاتی ئێران بێت, کاتێك کە ڕادیۆ ئێرانی دەدۆزییەوە بە تاسەوە بانگی هاوسەرەکەی دەکرد بۆ ئەوەی کە ئەویش گوێ لەو دەنگە بگرێت کە لە ئێرانەوە دەهات.

ئەو ماوەیەی کە شا خۆی بە گوێگرتن لە ڕادیۆ سەرقاڵ دەکرد, فەرەحیش بە تەلەفۆن پەیوەندی بە دۆست و ئاشناکانی خۆیەوە دەکرد و ڕێگەی دووری نێوانیانی نزیك دەکردەوە, ماوەیەك لەگەڵ (خانم جەهان سادات)ی ژنی ئەنوەر سادات), یان مەلیك (حسەین)ی پادشای ئەردەن, قسانی دەکرد, بەڵام زۆربەی پەیوەندییەکانی

لەگەڵ ئەمریکا و ئەورووپا دا بوو، ماوەیەکیش شای لە گوێگرتن لە ڕادیۆ دوور دەخستەوە و بانگی دەکرد بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ دۆستان و ئاشنایانی خۆیان.

بەو هەموو گونجاوی و بۆ لوانەوە شا بە گشتی خەفەتبار بوو، تەنها دڵخۆشی ئەو لەو دوورگەیە کاتێك بوو کە منداڵەکانی دەهاتن بۆ بینینی، کچەکانی شا کە لە ئەمریکا دەیانخوێند، دوای نیشتەجێبوونی دایك و باوکیان ولاّتی پەنەما دەیانویست بڕۆن بۆ ئەو ووڵاتەو لەوێ درێژە بە خوێندنەکەیان بدەن، بەڵام شا دژایەتی مانەوە و خوێندنی ئەوانی کرد لە ولاّتی پەنەما دا، کوڕە گەورەکەی شا واتە (شازادەی جێنشین) کە لە ولاّتی ئەمریکا دەیخوێند، بڕیاری دەربارەی ئایندەی خوێندن و ژیانی تایبەتی خۆیی خستبوویە دەستی باوکی و خودی خۆشی ئارەزومەندی نیشان نەدابوو بۆ سەفەر کردن بۆ پەنەما و مانەوەی لەو ووڵاتەدا.

کاتێك منداڵەکانی شا بۆ بەسەر بردنی ڕۆژانی پشوو دەڕۆیشتن بۆ پەنەما، شاو فەرەح وایان نیشان دەدا کە ژیانی ئەوان لەو دوورگەیە کاتییە و لە کاتێکی زوو یان درەنگ دا دەگەڕێنەوە بۆ ولاّتی خۆیان، بە تایبەتی شا لە کاتی قسەکردنی لەگەڵ کوڕە گەورەکەی دا، لەوە دڵنیای دەکردەوە کە ڕۆژێك دێت ئەو لەسەر تەختی سەڵتەنەتی ئێران دابنیشێت و لەو بارەیەوە ئامۆژگاری دەکرد و باسی لە ئەزمونە تەڵخەکانی سەردەمی سەڵتەنەتی خۆی بۆ دەکرد.

دواتر ئەو کەسانەی کە لەگەڵ شا دا پەیوەنییانە هەبوو پێیان ووتم: (بەڕاستی شا ئومێدەوار بووە کە ڕۆژێك بگەڕێتەوە بۆ ئێران و کوڕەکەی بەسەر تەختی سەڵتەنەتی ئێرانەوە ببینێت، ئەم هیوایەی شا بە بیستنی هەواڵی تایبەت بە دەرکەوتنی کێشە نێوخۆییەکانی ئێران و کەم بوونی ماددە خۆراکیەکان و دابەزینی داهاتە نەوتیەکان و قەیرانی ئابووری، زیادی دەکرد، بابەتی بە بارمتە گیراوە ئەمریکیەکانیش بە هەموو ئەو گرفتاریانەی کە بۆ ئێمە و خودی شا یشی دروست کردبوو، ئەم ئومێدەوارییەی شای بەهێزتر دەکرد، کە سەرەنجام ڕۆژێك کاسەی سەبری ئێمە لێوانلێو ببێت و دەست بدەینە کار کردن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ڕژێمی ئیسلامی ئێران.

ژیانی ئارامی (شا و فەرەح) لە دوورگەی بەهەشت (کەشا ناوی نابوو)، لە ناوەڕاستی مانگی فەبریوەر و مانگی سێیەمی مانەوەیان دا لەو دوورگەیە، لەگەڵ بلاو

بوونەوەی هەواڵ گەلێك دەربارەی هەوڵکانی دەوڵەتی ئێران بۆ ڕادەستکردنەوەی (شا) و ئەو پەیوەندییانەی کە لەو بارەیەوە لە نێوان دەوڵەتی (ئێران و پەنەما) دا دروست بوو بوو، تێکچوو، دوای بڵاو بوونەوەی ئەم هەواڵە نیگەران کەرانە، ناکۆکی لە نێوان یاوەرانی شا و بەرپرسانی پەنەما دا دروست کرد، ئارمائۆی وتەبێژە ئەمریکیەکەی شا، پەنەماییەکانی تاوانبار کرد بەوەی کە سەرمایە ئەفسانەییەکەی شا ئەوانی خستووەتە بیری فێڵکردن بۆ تالاَن کردنی، وە هەروەها پسولەی خەرجی زۆر و زەبەندەو ناڕاست دەنێرن بۆ شا، هەڵبەتە ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە دواتر بەندە لەو بارەیەوە ئەنجامم دا، بانگەشەکانی (ئارمائۆ)ی پشت ڕاست نەدەکردەوە، لەبەر ئەوە پەنەماییەکان هەرچۆنێك بێت بە هۆی پێشوازی کردنیان لە شا و یاوەرانی دووچاری دەردیسەری زۆر بوونەوە، ئەمە و سەرباری ئەو خەرجیە زۆرەی کە دەوڵەتی پەنەما لە شوێنی مانەوەی شا و خزمەتکار و یاوەرانی ئەودا دەیکرد، دەوڵەتی پەنەما تەنها دووسەد پارێزەری ئاسایش و پیاوانی قوربۆقی بۆ چاودێری کردنی شا لە دوورگەی (کونتادوورا)دا جێگیر کردبوو، دەیانویست موچەو خەرجیەکانی ئەو کەسانە لە سەر سەرمایە ئەفسانەییەکەی شا خەرج بکرێت.

سەرەڕای ئەوەش بەهۆی نیشتەجێبوونی شا لەو دوورگەیە کە یەکێك بوو لە ناوچە گەشتیارییە گرنگەکانی وڵاتی پەنەما و گرتنە بەری ڕێوشوێنی ئەمنی توند بۆ پاراستنی ئاسایشی ئەو دوورگەیە، بوو بوویە هۆی ڕێگری لە ئازادی هاتوچۆی گەشتیارەکانی ئەو ناوچەیە، ژمارەی گەشتیارانی تاکە ئوتێلی ئەو دوورگەیە کەم بوو بوویەوە بۆ کەمتر لە نیوەی ژمارەی گەشتیارەکانی پێشوو، ئەمەش نزیکەی یەك ملیۆن دۆلار زیانی بەو ئوتێلە گەیاندبوو کە هی دەوڵەت بوو، دواتر کە تۆریخۆس ئەم بابەتەی پێ وتم، نیگەران بوو لەوەی کە گرفتاری و زیانە داراییەکانی پەنەما کە بە هۆی (شا) وە دووچاری بوو بوو لە بەرچاو نەگیرابوو، لە قسەکانی دا دەربارەی (ئارمائۆ)ی ڕاوێژکاری ئەمریکی شا دەیووت: (دەتوت ئەم کوڕە زوڵف دارە، هەرجارێك کەم و کوڕی یان هەڵەیەکی لە پسولەی خەرجیەکان دا نیشانی (شا)ی بدایە، خەلاَتی وەردەگرت..!!).

شا کە خۆی کەسێکی گوماناوی و نیگەران بوو، کاتێك کە وتەکانی (ئارمائۆ)ی دەربارەی فێڵبازی و مەبەستی سودی خراپ وەرگرتنی پەنەماییەکانی دەبیست، ئەم

بابەتەی لەگەڵ ڕاپۆرتە هەواڵیەکانی پەیوەست بە هەوڵەکانی حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێرانی بۆ ڕادەستکردنەوەی لە لایەن پەنەماوە بەو وولاّتە ڕێکدەخست و ئەمەش نیگەرانیەکانی شا ی بەهێزتر دەکرد, کە نەوەکا پەنەماییە پولەکیەکان بۆ ڕادەستکردنەوەی ئەو تەماح بیانگرێت, یان ئەو کارە نەکەن و (کارتەر) یش بە مەبەستی ئازاد کردنی بارمتە ئەمریکیەکان بەنهێنی لەگەڵ ئێران دا ڕێك بکەوێت و هانی پەنەماییەکان بدات بۆ ڕادەستکردنەوەی ئەو بە دەوڵەتی ئیسلامی ئێران..!!, بەمەبستی ڕزگار کردنی شا لەم نیگەرانیانە, کە زۆر بە جدی و ڕاستی دەهاتە پێش چاوو, بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش گەیشتبوویەوە بە بەرپرسانی پەنەمایی, خودی سەرۆك (ڕیو)ی سەرۆك کۆماری پەنەما سەردانی (شا)ی کرد و لەوە دڵنیای کردەوە کە یاساکانی پەنەما مۆڵەتی ڕادەستکردنەوەی ئەو بە دەوڵەتی ئێران نادەن, لەگەڵ ئەوەی کە گومان و نیگەرانیەکانی شا لەوەی کە پلانێکی دیکە بۆ ڕادەستکردنەوەی ئەو بە حکومەتی ئیسلامی ئێران جێبەجێبکرێت, کۆتایی پێنەهاتبوو, دەشگونجێت هەمان ئەو ترس و نیگەرانیەی خودی (شا) یەکێك بووبێت لە هۆکارە کاریگەرەکانی بێئەنجامی چارەسەرەکانی پێشووی و دووبارە سەرهەڵدانەوەی نەخۆشیەکەی.[1]..

** ** **

هەتائێرەی داستانەکەتان لە زمانی (هامڵتۆن جۆردن) ی هاوکاری (کارتەر) و سەرۆکی گاردی کۆشکی سپی یەوە خوێندەوە,ئێستاش پاشماوەی داستانەکە لە زمانی خودی (شا) وە دەخوێنینەوە, ئەم بابەتانەش لە دەقە ئینگلیزیەکەی دوایین چاپی کتێبەکەی (شا) لە ئەمریکا, وەرگێڕدراوە و وەرگیراوە.[2]

شا دوای ڕوداوی ڕۆیشتنی بۆ ئەمریکا و خەواندنی لە نەخۆشخانەی نیوێۆرك و خۆدزینەوەی ولاّتی مەکسیك لە پێشوازیکردنەوەی بۆ ولاّتەکەی, باس لە

---

[1] هامڵتۆن جۆردن: بحران, ت. محمود طلوعی, انتشارات هفته, ص ١٣٦- ١٤٠.

[2] شا دوای بلاّوکردنەوەی کتێبی (پاسخ بە تاریخ) بە زمانی فەرەنسی, کە دواتریش بە زمانی ئینگلیزی چاپ و بلاّو کرایەوە, بەشێکی دیکەی دەربارەی ڕوداوەکانی دوای دەرچونی ئەو لە مەکسیك ڕویان دا بۆی زیاد کرد, ئەم بەشە لە کتێبە ئینگلیزیەکەدا بە ناونیشانی ( The Shahs Story) نوسراوە.

سەفەرەکەی بۆ پەنەما دەکات و دەنووسێت: (پێش ڕۆیشتنم بۆ پەنەما، سەرۆك (کارتەر) تەلەفۆنی بۆ کردم و دوای هیواخوازی لەش ساغیم ووتی: ئەگەر ڕەوشێکی گونجاو هاتە پێش دەتوانیت بە مەبەستی بەردەوام وەرگرتنی چارەسەرکان سەردانی ئەمریکا بکەمەوە، ئەمە یەکەم و دوایین جار بوو کە دوایماڵئاوایی کردنم لە سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە تاران لە ساڵی (١٩٧٨)، گفتوگۆ لەگەڵ ئەودا ئەنجام بدەم.[١]

شا دوای باسکردنی هەفتەی یەکەمی نیشتەجێبوونی لە وڵاتی پەنەما دا، ئاماژەی بەو هەوڵانەی ئێران داوە کە بۆ ڕادەستکردنەوەی ئەو دابوویان، لەو بارەیەوە دەنووسێت: (ڕۆژی (١٢ ژنویە، ٢٢ دی ١٣٥٨)هەتاوی فەرمانڕەوایانی نوێی ئێران داوایان لە دەوڵەتی پەنەما کرد کە منیان ڕادەست بکەنەوە، داواکاریەکەی ئەوان لای من سەرسوڕهێنەر نەبوو، ئەوەی منی توشی شۆك کرد دوودڵیەکانی دەوڵەتی پەنەما بوو لە وەڵام دانەوەی داواکەی ئێران دا....، (قوتب زادە)ی وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئێران، بەردەوام بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە من بە شێوەیەکی ورد و بەردەوام لە پەنەما دا چاودێری دەکرێم، هەتا هەنگاوە یاساییەکانی ڕادەستکردنەوەکە بە ڕێکوپێکی ئەنجام دەدرێن، دەوڵەتی پەنەما ڕۆژی (٢٤ ژانویە) ئەم بانگەشەیەی ئێرانی بە درۆ خستەوە، بەڵام هێشتا چاپەمەنیەکانی ئەمریکا باسیان لە ئەگەری ڕادەستکردنەوەی من دەکرد بە دەوڵەتی ئێران، ئەم یاریە بێ بەزەییانە لە مانگی فەبریوەر دابەردەوام بوو، ڕۆژی (٧ فەبریوەر، ١٨ بەهمەن ١٣٥٨) هەتاوی، وەزیری دەرەوەی پەنەما لە چاوپێکەوتنێك دا ووتی کە: بەڕاستی من (شا) بەشێوەیەکی کرداری لە وڵاتی پەنەما دا زیندانیم، لەبەر ئەوە بەبێ مۆڵەتی دەوڵەتی پەنەما ناتوام بڕۆم بۆ هیچ دەوڵەتێکی بیانی دیکە..!.

لەنزیکەی (٢٥ فەبریوەر، سەرەتاکانی مانگی ئەسفەندی ١٣٥٨ هەتاوی) دا، هەستم کرد کە فەرمانبەرانی ئاسایشی پەنەما لە جیاتی ڕۆڵی پاراستنی ئێمە ببینن،

---

[1] شا بە دەستی ئەنقەست یان بە هۆی لاوازی مێشکیەوە بوبێت لە کاتی نووسینی کتێبەکەیدا، لەم بارەیەوە بە هەڵەدا چووە، لەبەر ئەوە (کارتەر) دوای سەفەرەکەی بۆ تاران لە زستانی ساڵی (١٣٥٦)هەتاوی دا، بەلای کەمەوە جارێك دوای ڕوداوی ١٧ شەهریوەری ١٣٥٧ هەتاوی لەگەڵ شا دا قسەی کردبوو.

به شێوەیەکی کرداری ئێمەیان زیندانی کردووە, تەلەفۆنەکانمان کۆنترۆڵ و ڕێکدەخرا, هێدی هێدی ئەم هەستە وای لێکردم کە ئەوان خەریکە پەیوەندی ئێمە بە دوونیاری دەرەوە دەبڕن...., لەلایەکی دیکەشەوە هێشتا دەوڵەتی پەنەما درێژەی بە یاری ڕادەستکردنەوەی من دەدا, دوو پارێزەر کە یەکێکیان فەڕەنسی و ئەوی دیکەیان ئەرجەنتینی کە لەلایەن حکومەتی ئێرانەوە ڕاسپێردرابوون, دەوری دوونیا دەگەڕان بۆ کۆکردنەوەی بەڵگەی پێویست دژی من, دەنگۆیەکیش لەسەر زاران هەبوو کە ئەگەر دەوڵەتی ئێران بەڵێن بدات کە ئێمە لە سێدارە نەدات, ئەوا ڕادەستکردنەوەی من بە دەوڵەتی ئێران بخرێتە بوواری جێبەجێکردنەوە.[1]

دواتر شا درێژەی پێدەدات کە: لە سەرەتاکانی مانگی مارس (ناوەڕاستی مانگی ئەسفەندی ١٣٥٨) هەتاوی هەستی بە ئاسایشی خۆیی نەکردووە و توندی نەخۆشیەکەی و ئەو کێشانەی کە وڵاتی پەنەما بۆ نەشتەرگەری نەخۆشیەکەی لەلایەن پزیشکە ئەمریکیەکانەوە بۆ (شا) یان دروست کردبوو, ئیدی هیچ دوودڵیەکی بۆ ئەو نەهێشتبوویەوە کە دەبێت هەرچی زووترە وڵاتی پەنەما بە جێ بهێڵێت, ووڵاتی میسر تەنها شوێنێك بوو کە شا دەیتوانی بە دڵی ئارامەوە سەفەری بۆ بکات, بەڵام خۆی ئامادە نەبوو ئەو داوایە لە ئەنوەرساداتی سەرۆکی ئەو وڵاتە بکات, هەربۆیە ئەم کارەی خستە ئەستۆی فەرەحی هاوسەری کە لەگەڵ (جهان سادات)ی هاوسەری (ئەنوەر) دا لەو بارەیەوە قسان بکات و بزانێت کە ئایا (سادات) لەسەر بانگهێشتەکەی پێشووی خۆی ماوە یان نا...؟, فەرەح تەلەفۆنی بۆ (جهان سادات) کردوو هاوسەری سادات ووتی: بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە لە میسر پێشوازییان لێدەکرێت, دوای ئەم گفتوگۆیە خودی (سادات) تەلەفونی بۆ وڵاتی پەنەما کرد و قسەی هاوسەرەکەی پشت ڕاست کردەوە.

شا ڕونکردنەوەی زیاتری دەربارەی دوایین هەوڵی (کارتەر) بۆ ڕێگرتن لەو سەفەرەی بۆ وڵاتی میسر نەداوە, لەبەر ئەوە بۆ دەستخستنی زانیاری لەو بارەیەوە دەبێت بگەڕێینەوە بۆ یاداشتەکانی (هاملتۆن جۆردن), ئەو دەنووسێت: ڕۆژی (٢

[1] Mohammad Reza Pahlhavy: The Shahs Story, London Michael Goseph,1980, pp.223- 225.

مارس, ١ فەروەردین ١٣٥٩)هەتاوی, کارتەر ئەوی نارد بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو بەرپرسیارێتیە, ئەگەر شا پێداگری لەسەر جێهێشتنی پەنەما بکاتەوە, ئەوا لە باتی ڕۆیشتنی بۆ میسر ئەو بگەڕێنێتەوە بۆ ئەمریکا, سەرباری جۆردن, کاتلەر ڕاوێژکاری یاسایی کۆشکی سپی و (ئارنی ڕافل)ی یەکێك لە هاوکارە نزیکەکانی (ونس)ی وەزیری دەرەوەش ڕۆیشتبوون بۆ پەنەما بۆ ئەوەی کە شا ڕازی بکەن بە مانەوەی لەو وڵاتە دا و بە گرەنتی تەواو لەلایەن دەوڵەتی ئەمریکاوە, یان گەڕانەوەی بۆئەمریکا بە چەند مەرجێك, دواتر جۆردن دەنووسێت: ئەو بەرپرسیارێتی دانوستانی لەگەڵ ژەنەراڵ تۆریخۆس دا بۆ فەراهەم هێنانی ئاسانکاری زیاتر بۆ مانەوەی شا لە وڵاتی پەنەما گرتە ئەستۆ, وە گفتوگۆشی لەگەڵ شادا سپارد بەدەستی (کاتلەر و ئارنی).

جۆردن دوای باسکردنی دیدار و دانوستانەکانی لەگەڵ ژەنەراڵ تۆریخۆس دا دەنووسێت: کاتێك کە گەڕاینەوە بۆ باڵوێزخانە پێش ڕۆیشتنی کاتلەر و ئارنی بۆ بینینی شا, بڕیارمان دا دووبارە پەیوەندی بکەینەوە بە سەرۆك کۆمارەوە, دیسانەوە کارتەر سور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەگەر نەمانتوانی شا ڕازی بکەین بە مانەوەی لە وڵاتی پەنەما دا, ئەوا لە سەفەر کردن بۆ میسر پەشیمانی بکەینەوە, وەك کۆتا چارەسەرێکیش پێشنیاری گەڕانەوەی بۆ وولاتی ئەمریکا بۆ بکەین.

دوای سەرۆکایەتی کۆمار (ونس)ی وەزیری دەرەوە قسەی لەگەڵمان کرد, ئەو زۆر نیگەران بوو لە ئەگەری گەڕانەوەی شا بۆ وڵاتی ئەمریکا و ووتی: ئەگەر شا بیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا ئەوا دەبێت ئێمە جەخت لەسەر دەستلەکار کێشانەوەی ئەو بکەین لە پۆستی سەڵتەنەتی ئێران و بە تەمای تەخت و تاجی ئێران نەبێت, لە ڕاستی دا (ونس) ئاگای لە هەستیاری شا نەبوو لە قسەکردن لەو بارەیەوە.

کاتێك کە کاتلەر و ئارنی ڕۆیشتن بۆ دیتنی شا لە دوورگەی کونتادوورا, نەمدەزانی چ ئامۆژگاریەکیان بکەم , تەنها ووتم: هەرچەندە کە دەتوانن پێداگری بکەن بۆ بەدەست هێنانی ڕەزامەنی شا دەربارەی مانەوەی لە پەنەما و ئەنجام دانی نەشتەرگەری لەو وولاتەدا لە ژێر چاودێری دوکتۆر (دووبیکی) سەرپەرشتیاری ئەو تیمە پزیشکیەی کە لە ئەمریکاوە هاتبوون بۆ پەنەما, چونکە بابەتی ناڕازی بوونی سەرۆك کارتەر بۆ سەفەرکردنی شا بۆ میسر, دەبێتە هۆی ئەوەی کە دووبارە سەرۆك بابەتی بەرپرسیارێتی ئێمە بۆ پێشوازیکردنەوەی شا لە ئەمریکا دا, بێنێتە پێشەوە.

(کاتلەر و ئارنی ڕافل) کاتژمێر ٩ ی شەو بەرەو دوورگەی کونتادوورا بە ڕێکەوتن و کاتژمێر و نیوێك دواتر گەڕانەوە, من بەپەلە چووم بۆ پێشوازییان, کاتلەر ووتی: (خەیاڵتان بە تەواوی ئاسودە بێت, شا دەچێت بۆ میسر).

بە نیگەرانیەوە پرسیم: (چی ڕوی داوە..؟, وردەکاری گفتوگۆکەتانم بۆ باس بکەن), ئارنی ڕافل دەستی بە قسان کرد و ووتی: (کاتێك کە ئێمە گەیشتینە شوێنی نیشتەجێ بوونی شا, شا و هاوسەرەکەی و ئارمائۆ چاوەڕوانی ئێمە بوون, خۆشحاڵی خۆی بۆ بینینی کاتلەر دەربڕی, کاتلەر لەگەڵ سوپاسکردنی دا ووتی: دەیەوێت تەنها لەگەڵ شا و شاژن دا قسان بکات, ئارمائۆ ڕۆیشتە دەرەوە, کاتلەر بابەتی چارەسەر کردنی لە پەنەما و ئامادە بوونی دوکتۆر (بیکی) بۆ سەرپەرشتی کردنی نەشتەرگەرییەکەو کێشەکانی سەفەر کردنی بۆ میسر ڕونکردەوە بۆ شا و هاوسەرەکەی, ئەوانیش بە قیافەیەکی پەشۆکاوە وە بەلاّم بە وردی گوێیان بۆ وتەکانی کاتلەر گرت, دواتر شا دەستی بە قسان کرد و بەوپەڕی نیگەرانیەوە ووتی: من هەست دەکەم مەرگم نزیك بووەتەوە و لەم بارودۆخەشدا تەنها بیر لە ولاّت و بنەماڵەکەم دەکەمەوە, ئینجا دوای ماوەیەك بێدەنگی دیسانەوە ووتی: من دەزانم بەم نزیکانە دەمرم, بەلاّم دەمەوێت بە شانازییەوە بمرم نەك لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە و لە ولاّتێکی دوورە دەست, ئەویش لە دەرەنجامی هەڵەیەك یان بەرتیل وەرگرتنێك.

ئەم وتەیەی شا لەو کاتەدا بۆمن نا ڕون بوو, بەلاّم بەو توێژینەوانەی کە دواتر ئەنجامم دا بۆم ڕون بوویەوە کە دوای بلاّو بوونەوەی هەواڵی پەیوەست بە ئەنجام دانی ئەو چالاکیانەی کە بۆ ڕادەستکردنەوەی شا ئەنجام درابوو, ئەوی تەواو نیگەران کردبوولەوەی کە هەندێك لە بەرپرسەبالاّکانی پەنەما تەماحیان وەبەر بخرێت, یان بە پێدانی دەرمانی خراپ و ژەهراوی زەمینەسازی مەرگی ئەو لە نەخۆشخانەی پەنەما دا بکەن, دەوترا پێشنیاری یەك ملیۆن دۆلار وەك بەرتیل بۆ یەکێك لە دوکتۆرەکانی ئەو نەخۆشخانەیەی کە بڕیار بوو شای تێدا نەشتەرگەری بکرێت, بە نێوی (د. پاتیلا) کرابوو, ئەو دوکتۆرەی ئەم پیلانەی ئاشکرا کردبوو دەیووت: ئەو پێشنیاری بەرتیل وەرگرتنەکەی ڕەت کردووەتەوە, هەڵبەتە بەندە گومانم لە ڕاست و دروستی ئەو کارە هەیە, بەلاّم بەهەر حاڵ گەیشتنی هەواڵێکی لەو شێوەیە بە گوێی شا بەس بوو بۆ

ئەوەی کە شا پەشیمان بکاتەوە لە خەوتنی لەسەر قەرەویڵەی نەخۆشخانەکانی وڵاتی پەنەما ,

دوای ئەوەی کە (شا) ئەنجام دانی نەشتەرگەری لە وڵاتی پەنەما تەنانەت بە بەرپرسیارێتی (د. دووبیکی)شی ڕەتکردەوە, ئیدی چارەیەك جگە لە پێشنیاری گەڕانەوە بۆ ئەمریکا نەمابوو, هەڵبەتە (کاتلەر)یش ئەم پێشنیارەی بە مەرجی دەستلەکار کێشانەوەی (شا) لە پۆستی سەڵتەنەتداری ئێران پێشکەش کردبوو.

ئارنی ڕافل کە ماوەیەك لە ئێران دا خزمەتی کردووە و کەم تا زۆرێك زمانی فارسی دەزانی, دەڵێت: کاتێك کە (کاتلەر) پێشنیاری دەستلەکار کێشانەوەی خستە ڕوو, شاژن ڕوی کردە مێردەکەی و بە زمانی فارسی ووتی: (نەوەك بەم پێشنیارە ڕازی ببیت, ئەم کارە نەنگی و نیگەرانییەکی گەورە بۆ ئێمە دروست دەکات, بیر لە کوڕەکەمان و ئایندەی وڵاتەکەمان بکەرەوە....!), شا وەك ئەو پیاوانەی کە مل کەچ و گوێ لە مشتی ژنەکانیانن گوێی بۆ وتەکانی ژنەکەی دەگرت, بەڵام وەڵامێکی یەکلاکەرەوەی بۆ ئەم پێشنیارە نەدایەوە و ووتی: (من هێشتا سورم لەسەر بڕیاری خۆم لە بەدەمەوە چوونی بانگهێشتی (ئەنوەر سادات)ی دۆستم و ڕۆیشتنم بۆ وڵاتی میسر, وە ئەگەر گۆڕانکاریەکم لە بڕیارەکەی خۆم دا کرد, هەتا سبەی بەیانی ئێوە ئاگادار دەکەمەوە).

ئەو شەوە دوای ڕۆژێکی پڕ لەڕوداو و ماندووکەر چووم بۆ ژوری نوستن و کەمتر لە شەوەکانی پێشوتر نیگەران بووم, لەبەر ئەوەی کە شا بڕیاری خۆیی دابوو, هەرچۆنێك بێت ئەو کێشانەی کە لەوانە بوو پێش بێن لە ڕۆیشتنی شا بۆ میسر, کەمتر بوو لەو کێشانەی کە ئەگەر بگەڕایەتەوە بۆ ئەمریکا, پێژەی پەسەند کردنی دەستلەکار کێشانەوەش وەك مەرجی گەڕانەوەی بۆ وڵاتی ئەمریکا تا ڕادەیەك لە سەدا سفر بوو, بەڵام هێشتا مەترسییەك بوونی هەبوو, ئەویش ئەوە بوو کە سەرۆك (کارتەر) مەرجی دەستلەکار کێشانەوەکەی (شا) لاببات و خودی خۆی ئەو بۆ ئەمریکا دەعوەت بکات...!!.

جۆردن لە یاداشتەکانی ڕۆژی دواتر (شەممە ٢٢ مارس ١٩٨٠ز, ٢ فەروەردین ١٣٥٩ هەتاوی) بەم شێوەیە دەنووسێت:

بەیانی زوو لە خەو هەستام لەبەر ئەوەی کە هێشتا نیگەرانی بڕیاری سەرۆکایەتی کۆمار بووم بۆ ڕێگری کردن لە سەفەری شا بۆ میسر, سەرەتا تەلەفونم بۆ (والتەر ماندیل)ی یاریدەدەری سەرۆك کۆمار و دواتر بۆ (ونس)ی وەزیری دەرەوە کرد, داوام لێکردن کە بۆچونی کارتەر لەبارەی سەفەری (شا)وە بۆ میسر بگۆڕن, (ماندیل و ونس) هەردووکیان لەگەڵ مندا هاوڕا بوون, لە هەر کاتێکدا ڕۆیشتنی (شا) بۆ میسر باشتر بوو لە گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا.

دواتر من و کاتلەر پێکەوە تەلەفۆنمان بۆ سەرۆك کارتەر کرد کە لە کەمپی (دیوید) بوو, کاتلەر سەربارى ڕاپۆرتی دیداری خۆی لەگەڵ (شا) دا ووتی: (شا سورە لەسەر ئەوەی کە ولاتی پەنەما بە جێ بهێڵێت, تاکە بابەتیش ئەوەیە کە دەبێت بۆ کوێ بڕوات, خۆی بڕیاری داوە کە بۆ ولاتی میسر بڕوات, وە گۆڕینی ئەو بڕیارەش بە دژوار دێتە بەر چاو), (کارتەر) ووتی: چۆن چۆنی لە بارەی سەفەر کردنی بۆ ئەمریکا لەگەڵی دواون, من لەو باوەڕەدام کە ئەگەر کەمێك پێداگری بکەن ئەوا ئەو ڕازی دەبێت بە گەڕانەوەی بۆ ئەمریکا.

من لە ترسی ئەوەی کە کارتەر بەبێ هیچ مەرجێك پێشنیاری سەفەری شا بکات بۆ ئەمریکا, داوام لە کاتلەر کرد کە درێژەی گفتوگۆکە بە من بسپێرێت, بۆ من زۆر دژوار بوو کە بۆ گۆڕنی بڕیاری سەرۆکایەتی کۆمار بکەومە قسەو بەڵگە بخەمە ڕوو, بەلام بە داوای لێبووردن کردنەوە لەم کارەم ووتم: جەنابی سەرۆك کۆمار من دەمەویت داواتان لێبکەم دەربارەی ئەم بابەتە ڕاوێژیش لەگەڵ سەرۆك سادات دا بکەن, لە ڕاستی دا لەوانەیە سەفەری شا بۆ میسر بەو شێوەیەی کە ئێمە بیری لێدەکەینەوە مەترسی بۆ سەر ئەو نەبێت...., ئایا وا نازانیت کە سادات باشتر لە ئێمە بەرژەوەندیەکانی خۆی و ولاتەکەی دیاری دەکات....؟).

کارتەر بە پێچەوانەی گفتوگۆکانی ڕابردووە وە چەندوچونی لەگەڵم دا نەکرد و ووتی: (زۆر باشە, من لەگەڵ ئەنوەر قسان دەکەم و ئێوە لە ئەنجامەکەی ئاگادار دەکەمەوە).

دە خولەك دواتر زەنگی تەلەفون لێدرا, کارتەر بوو, کە بە خۆشحاڵیەوە دەیووت: (کوڕینە خەیاڵتان ئاسودە بێت, من ئێستا لەگەڵ سادات قسەم کرد و هۆکاری نیگەرانیەکانی خۆمم لە بارەی سەفەری (شا) وە بۆ ئەو ولاتە ڕون کردەوە,

ئەویش پێکەنینێکی بەرزی کرد و بە زاراوە تایبەتیەکەی خۆی ووتی: (جیمی ئێوە نیگەرانی من و میسر مەبن, ئێوە لە بیری بە بارمتەگیراوەکانی خۆتان دا بن.....!!).[1]

** ** **

شا و فەرەح و یاوەرانیان ڕۆژی یەك شەممە (٣ فەروەردین ١٣٥٩ هەتاوی) بە فڕۆکەیەکی سەربازی ئەمریکی ولاّتی پەنەما یان بەرەو ولاّتی میسر بەجێ هێشت, (کارتەر) دوای گفتوگۆی لەگەلّ سادات دا فەرمانی دابوو کە ئاسانکاری پێویست بکرێت بۆ ئەنجام دانی سەفەری (شا) بۆ میسر, دوای فەرمانەکەش فڕۆکەیەکی سەربازی بۆ ئەو سەفەرەی (شا و یاوەرانی) دیاریکرا, بڕیار وابوو کە فڕۆکەکە لە نێو ڕێگادا لەبنکەی ئاسمانی (ئیزور) دا بنیشێتەوە و دوای وەرگرتنی سوتەمەنی پێویست بەرەو قاهیرەی پایتەختی میسر بەڕێ بکەوێت.

هاملتۆن جۆردن لە کتێبەکەی خۆیدا ئاماژە بەو هەولاّنە دەدات کە لە کۆتا ساتەکانی سەفەری (شا) دا لەلایەن نوێنەری کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە دەدرا بۆ ڕێگری لە فڕینی فڕۆکەکەی (شا) بۆ قاهیرە و دەنووسێت: یەکێك لە نوێنەرەکانی کۆماری ئیسلامی ئێران بە نێوی (بوورگە) لە بەیانی ڕۆژی یەك شەممە دا سات لە دوای سات تەلەفۆنی بۆ دەکردم و دەیووت: بەردەوام لەگەلّ (قوتبزادە) دا لە پەیوەندی دایە لە ئەگەری ڕێگرتن لە فڕینی فڕۆکەکەی (شا) لەوانەیە چەند ساتێکی دیکە کاری ڕادەستکردنەوە بارمتە ئەمریکیەکان بە دەولّەت جێبەجێ بکرێت, (بوورگە) بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە بەلێنەکەی (تۆریخۆس)ی دەربارەی ڕێگری لە دەرچوونی (شا) لە ولاّتەکەی بە تاران ڕاگەیانووە و لە سەر بنەمای هەمان بەلێن پێدەچێت ڕادەستکردنەوەی بارمتەکان بە دەولّەت و دواتر ئازاد کردنیان بخرێتە بوواری جێبەجێ کردنەوە, بەلاّم من نە دەمتوانی باوەڕ بە بەلێنەکانی (بوورگە) بکەم, دەسەلاّتی ئەوەشم نەبوو کە بتوانم ڕێگری لە سەفەری فڕۆکەکەی (شا) بۆ ولاّتی میسر بکەم, لەبەر ئەوە لە وەلاّمی تەلەفونەکانی (بوورگە)دا تەنها دەمووت: هەرکاتێك هەوالّی کۆتایی لە بارەی ڕادەستکردنەوەی بارمتەگیراوە ئەمریکیەکان بە دەولّەت

---

[1] هاملتۆن جۆردن: بحران, ترجمە. محمود طلوعی, انتشارت هفتە, ص ١٤٧- ١٥٠.

پشت ڕاست کرایەوە، ئەوا من دەتوانم دەربارەی ئەم بابەتە لەگەڵ سەرۆك کۆمار دا قسان بکەم.

جۆردن زیاتر لە سەری دەڕوات و دەڵێت: تەنانەت دوای فڕینی فڕۆکەکەی (شا) لە پەنەما، هێشتا تەلەفۆنەکانی (بوورگە) بەردەوام بوو، ئاخرین داواکاری ئەو ئەوە بوو کە ماوەی چەند کاتژمێرێك فڕۆکەکەی (شا) لە بنکەی (ئیزور) ڕابگرین هەتا قۆناغی یەکەمی ئازاد کردنی بارمتە گیراوە ئەمریکیەکان، واتە ڕادەستکردنیان بە وەزارەتی دەرەوەی ئێران، جێبەجێ دەکرێت، لێرەدا (جۆردن) دان بەوەدا دەنێت کە بە هیوای بردنەسەری ئەو بەڵێنە، نزیکەی دوو کاتژمێر فڕۆکەی هەڵگری (شا)ی لە بنکەی (ئیزور) ڕاگرتووە و سەرەنجام مۆڵەتی فڕینی بەرەوە قاهیرە داوە........!!.

لە وڵاتی میسر لە فڕۆکەخانەی قاهیرە (شا و فەرەح) ڕوبەڕوی پێشوازییەکی گەرمی (سادات و هاوسەرەکەی) بوونەوە، دواتر لە کۆشکی (قوبە) کە بەزرۆی پێشوازی لە میوانە پایە بەرزەکانی میسری تێدا دەکرا، نیشتەجێ بوون، چەند ڕۆژێك دواتر گروپێکی پزیشکی ئەمریکی بە سەرۆکایەتی (د. دووبیکی) گەیشتنە قاهیرە و نەشتەرگەری لابردنی سپڵی (شا) کە لە ئەنجامی نەخۆشی سەرەتانەوە لە ڕادەبەدەر گەورە بوو بوو، ڕۆژی (٢٨ مارس، ٨ فەروەردین ١٣٥٩)هەتاوی بە سەرکەوتووی ئەنجام درا.

دوای ئەنجام دای نەشتەرگەرییەکە، هێدی هێدی تەندروستی (شا) ڕوی لە باشی دەکرد، بەڵام هەرگیز لەش ساغی تەواوی دەست نەکەوتەوە، ئەو لەکۆشکی (قوبە) دا ڕۆژگارانی لاوی خۆی وەبیر دەهێنایەوە کە چۆن چۆنی لە هەمان کۆشك دا هاوسەری یەکەمی خۆی (فەوزییە)ی ناسی و سەردەمی شیرینی دەزگیران داری لەگەڵ ئەو دا لە ژینگەی پاك و جوان و ڕازاوەی ئەم کۆشکەدا بەسەر بردبوو، لەو ماوەیەدا شا زیاتر کاتەکانی خۆی بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارە بیانیەکان کە پڕیان بوو لە شیکارە هەواڵی تایبەت بە ئێران و ڕوداوی بە بارمتە گیراوەکان، بەسەر دەبرد، کاتەکانی شەوانەشی بە گوێگرتن لە ئیزگە جۆراوجۆرەکانی ڕادیۆ و بە تایبەت بەشی فارسی ئەو ئێزگانە و دەنگی ئێران کە بە باشی لە قاهیرە وەردەگیرا، بەسەر دەبرد، ڕۆژانە (ئەنوەر سادات) بە تەلەفون پەیوەندی پێوە دەکرد و هەفتانەش دوو سێ جار سەردانی میوانەکانی خۆی لە کۆشکی (قوبە) دا دەکرد.

شا بە پێچەوانەی ڕابردووی کە هەمیشە بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە پێشوازی لە ڕۆژنامە نوس و پەیامنێرە بیانیەکان دەکرد و سفرەی دڵی خۆیی بۆ دەکردنەوە, لە قاهیرە دا خۆی گۆشەگیر کرد و خۆی دەدزییەوە لە بینینی ڕۆژنامەنوس و پەیامنێرە بیانیەکان کە هەمیشە و بەردەوام داوای دیداریان لەگەڵ دا دەکرد, گۆشەگیری (شا) سەرباری ئەو نیگەرانی و ناڕەحەتیانەی کە لە هەواڵەکانەوە ڕۆژانە دەربارەی ڕەوشی ئێران دەیبیست سەرچاوە گرتبوو, وە هەروەها وەك ڕەچاو کردنی ڕەوشی (سادات)ی خاوەن ماڵی میهرەبانیش بوو, لەبەر ئەوە پێی وابوو کە ئەنجام دانی چاوپێکەوتن و دەربڕینی بیرو بۆچوونەکانی خۆی دژی (کارتەر) و سیاسەتی ئەمریکا, لەوانەیە کاریگەری خراپی هەبێت لەسەر پەیوەندییە دۆستانەکانی (سادات) لەگەڵ (کارتەر) دا و سیاسەتی گشتی وڵاتی میسر لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا دا, هەتا ئەوەی لە کۆتاییەکانی مانگی (مەی, سەرەتاکانی فەروەردین ١٣٥٩ هەتاوی) دا, سادات لە کاتی هەواڵ پرسینی ڕۆژانەی (شا) دا بە تەلەفون پێی ووت: خانم (کاترین گراهام / Katharine Graham)ی بەڕێوەبەری دامەزراوەی مەزنی چاپەمەنی (واشنگتۆن پۆست)ی ئەمریکی لە قاهیرەیەو دەیەوێت لەگەڵ یەکێك لە پەیامنێرە دیارەکانی ئەمریکا دا سەردانت بکات و چاو پێکەوتنت لەگەڵدا ئەنجام بدات, (شا) ووتی: (لەوانەیە من قسەی توند لە بارەی (جیمی کارتەر)ی دۆستانەوە بە زمان دا بێت, ئێوە نیگەران نابن..؟, سادات بە پێکەنینێکی بەرزەوە ووتی: هەرچی دڵی تەنگی ئێوە دەیەوێت بیڵێ, نیگەرانی من مەبن...!!).

دیدار و چاو پێکەوتنی خانم (گراهام) و پەیامنێری ناسراوی ئەمریکی (جیم هاگلند / Jim Hogland) لەگەڵ (شا) دا, نزیکەی دوو کاتژمێر و نیوی خایاند, لەم گفتوگۆیەدا کە ئاخرین چاوپێکەوتنی (شا) بوو پێش مردنی, بە توندی و ڕاشکاویەکی بێ پێشینە هێرشی کردە سەر سیاسەتی وڵاتانی ڕۆژئاوا و بە تایبەت ئەمریکا و بەریتانیا لە وڵاتی ئێران دا, کارتەریشی بە بەرپرسی ڕاستەقینەی ڕوخانی سەڵتەنەتی ئێران و پێشهاتە کارەساتبارەکەی بۆ سەر ئەمریکا و ڕۆژئاوا دەزانی, لەم چاوپێکەوتنە دا کە سەرەتا لە ڕۆژنامەی واشنگتۆن پۆست و دواتر لە بڵاوکراوەی نێو دەوڵەتی ئەم ڕۆژنامەیە (ئەنتەر ناشناڵ هراڵد تریبوون) لە بەرواری ٢٨ مەی ١٩٨٠ن) چاپ کرا, شا بۆ یەکەم جار کە لەبەر ئەوەی توندووتیژی بەکار نەهێناوە بۆ

سەرکوتکردنی نەیارەکانی, داخی هەڵدەکێشا و ووتی: ئەگەر وەك ئەمڕۆ بیری دەرکردەوە هیچ دوو دڵی نەدەکرد لە بەکار هێناتی هێزی سەربازی بۆ سەرکوت کردنی نەیاران و خۆپیشاندەران.

پەیامنێرەکەی واشنگتۆن پۆست لە باسی ئەنجام دانی ئەم دیدارەدا دەنووسێت: کاتی دیداری ئێمە لەگەڵ (شا) دا, دوای نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی لە کۆشکی (قوبە) دا, ئەو کۆشکەی کە (سادات) خستبوویە خزمەتی شا و خێزانەکەی, دیاری کردابوو, شا دوای ئەنجام دانی دوایین نەشتەرگەری خۆی زۆر لاواز و پەشۆکاو دەهاتە پێش چاوو[1], پۆشاکێکی جوانی لەبەر دا بوو, بەلاّم بەهۆی کاریگەری زۆر لاوازییەوە دەلّپ و نارێك دەردەکەوت, ئەو چاویلکەیەشی کە کردبوویە چاوی بەردەوام دەهاتە خوارەوە و لە چاو ڕوخسارە ئێسقانی و لاوازەکەی دا زۆر گەورە بوو, لەگەڵ ئەوەشدا (شا) دەیووت: لەچاو هەفتەی ڕابردوو دا حاڵی باشتر بووە و چەند کیلۆیەك کێشی زیادی کردووە.

شا نزیکەی دوو کاتژمێر بەو پەڕی کەیفەوە وەلاّمی پرسیارەکانی خانم (گراهام)ی بەڕێوەبەری دامەزراوەی واشنگتۆن پۆست و من کە یاوەری بەڕیوەبەری ئەو دامەزراوەیە بووم لەو چاوپێکەوتنە بەشداریم کردبوو, دایەوە, ئەو هەوڵی دەدا زۆر بەهێز و بتەو قسان بکات, هیچ دەرکەوتەیەك لە لاوازی و نەخۆشیەکەی دەرنەخات, بەلاّم هەناسە توندەکانی کە لە نێو ڕستەکان دا هەڵیدەکێشان, بەڕونی ئەوەی نیشان دەدا کە هێشتا کاریگەریەکانی نەشتەرگەریەکانی پێشوو تەواو نەبووە و ڕەوشێکی ئاسودەیی دەرونی نییە, ڕوخساری (شا) لە تەواوی ئەو ماوەیەی کە گفتوگۆکەمان درێژەی کێشا زۆر خەفەتبار و نیگەران بوو, لە نێو قسان دا هەستی ئاوارەیی و سەختیەکانی ژیانی خۆی نەدەشاردەوە, بە تایبەت لە کاتێکدا کە لەبارەی ئارەزووە نەبڕاوەکانی و بەرنامە بەرزە فڕییەکانیەوە بۆ ولاّتەکەی دەدوا, بەردەوام ئاخی هەڵدەکێشا و خەفەتی بۆ هەڵەکانی ڕابردووی دەخوارد.

---

[1] شا لە قاهیرە دووجار نەشتەرگەری بۆ ئەنجام درا, ئەوەی دووەم جاریان بۆ لابردنی پاشماوەکانی نەشتەرگەریەکەی یەکەم جار ئەنجام درا.

حەمەڕەزا شای پەهلەوەی لەم چاوپێکەوتنە ماوە درێژەدا, بە نیگەرانییەکی زۆرەوە پەشیمانی لە سیاسەتی نەرم و سازشکارانەی خۆی دەردەبڕی لە بەرامبەر نەیارەکانی داو دەیووت: (ئەمڕۆ زۆر کەسان هەن پێم دەڵێن کە ئەگەر من لەو ڕۆژگارانە دا دەستی دەوڵەت و سوپام والاّ بکردایە بۆ نواندنی هێزی خۆیان, خوێنڕێژی بە سەدان جار کەمتر دەبوو لەوەی کە بە هۆی نەرمی و سازش و بەدەستەوە دانی دەسەلاّت بە نەیارەکان ڕوی دا...!).

شای داماڵراو لە سەڵتەنەتی ئێران لەم چاوپێکەوتنەدا دەستی لە خۆی بەردا و بیر و بۆچوونی خۆی دەربارەی ئەو ڕوداوانەی کە بە ڕوخانی ڕژێمەکەی کۆتایی هات بە شێوەیەکی ڕون دەخستە ڕوو, لەم گفتوگۆیەدا وازی هێنا لەو بەئاگایی و ڕەچاوکردنەی کە لە ڕابردوودا دەیکرد لەگەڵ پەیامنێر و ڕۆژنامە نووسان دا, وە بە توندترین و ڕاشکاوانەترین شێوە هێرشی دەکردە سەر سیاسەتی ئەمریکا و ڕەخنەی لێ دەگرتن, ئەو ئەمریکی و بەریتانیەکانی تاوانبار درکرد بەوەی کە لە ڕۆژانی کۆتایی قەیرانی حکومەتەکەی دا دەستیان لێ بەرداوە و لەگەڵ نەیارەکانی دا ڕێك کەوتوون..!, ئەو بە تایبەت جەختی لەسەر سیاسەتی بەریتانیا و ئەو ڕۆڵەی کە ڕاگەیاندنەکانی ئینگلیز بینییان لە ڕوخاندنی ڕژێمەکەی دا, دەرکردەوە, لە ڕەخنەیەکە گشتی دا لە بارەی ڕەوشی چاپەمەنیەکان و ڕاگەیاندنەکانی ڕۆژئاوا لەسەر هێرش کردنە حکومەتەکەی لە قۆناغەکانی پێش سەرکەوتنی شۆڕش دا وتی: (ئێوە دڵتان بۆ مافی مرۆڤ دەسوتا..!!.؟, ئێوە لە نەبوونی ئازادی سیاسی و دیموکراتی لە ئێران دا نیگەران دەبوون..؟.!, بفەرموون ئەوەش ئەو مافی مرۆڤەی کە دەتان ویست..!!, ئەوەش ئەو ئازادی و دیموکراسیەی کە لە نەبوونی ئەو لەسەردەمی سەڵتەنەتی من دا نیگەران بوو...!!!).

شا لەو چاوپێکەوتنە دا وتی: (بڕیاری داوە ئیدی بێدەنگی یشکێنێت و لە ئێستە بە دواوە بە ڕاشکاوییەکی زیاتر دەربارەی ڕوداوەکانی ڕابردوو ڕەوشی ئێران قسان بکات, ئەو لە هەمان کات دا بڕوای بەو ڕاستیە هێناوە کە چانسی گەڕانەوەی بۆ سەڵتەنەتی ئێران زۆر کەمە, بەلاّم هەموو هیواو ئومێدەکانی خۆی لەدەست نەدابوو, زۆر بە توندی بیری دەستلەکار کێشانەوەی لە سەڵتەنەت داری ئێران ڕەت دەکردەوە, ئەو لە وەلاّمی ئەو پرسیارەی کە ئایا وا بیر ناکاتەوە کە دەستلەکار کێشانەوەی ئەو

لە پۆستی سەڵتەنەتی ئێران و دەست هەڵگرتن لە بانگەشەی تاج و تەختی ئێران, هاوکاری ئازاد کردنی بە بارمتە گیراوە ئەمریکیەکان دەکات, ووتی: نەخێر وابیر ناکەمەوە کە تەنانەت دەستلەکارکێشانەوەم ئەو پرسە چارەسەر بکات, وە درێژەی پێدا و ووتی: هەتا کاتێك ئەمریکیەکان و وڵاتانی ڕۆژئاوا ئامادەبن بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ تیرۆریستەکان دا ڕێك بکەون, هیچ کێشەیەك چارەسەر ناکرێت.!!.

** ** **

لە سەرەتاکانی هاوینی ساڵی ١٣٥٩ هەتاوی دووبارە تەندروستی (شا) تێکچوو, لەگەڵ ئەنجامدانی دوو نەشتەرگەری و بەکارهێنانی درمانی کیمیایی, سەرەتانەکە لە جەستەی (شا) دا زیادی دەکرد, ئەو دەرمانانەشی کە بەکاری دەهێنان جگە لە لاواز کردنی جەستەی و کەم کردنەوەی بەرگری لەنێو لەشی دا هیچ کاریگەرییەکییان نەبوو, (ئارمائۆ) پێداگری دەکرد کە (د. دووبیکی) و گروپەکەی بە مەبەستی چارەسەر کردنی (شا) جارێکی دیکە بانهێشتی قاهیرە بکرێن, بەڵام فەرەح وای بە باش دەزانی کە چارەسەری (شا) لەلایەن پزیشکە فەڕەنسیەکانەوە بکرێت, بە ڕواڵەت واش دەردەکەوت کە ئیدی خودی (شا) یش بڕوای بە پزیشکە ئەمریکیەکان نەمابوو, لەوە دەترسا کە ئەمریکیەکان بۆ چارەسەر کردنی کێشەی بە بارمتەگیراوەکانی خۆیان لە تاران دا مەرگی ئەو پێش بخەن..!!.

حەمەڕەزا شا, دەمەوبەیانی ڕۆژی (٥ مورداد ١٣٥٩) هەتاوی, دوای بیست و چوار کاتژمێر ململانێی لەگەڵ مەرگ دا, کە تایەکی توند و بێهۆشی هەبوو, کۆتایی بە ژیانی هات و لە دوونیا دەرچوو, بۆ دوایین جار کە چاوەکانی کردەوە لە نێو ئەندامانی بنەماڵەکەی دا, تەنها (فەرەح)ی لە کەناری قەرەوێڵەکەی خۆیدا بینی, (ئەردەشێر زاهیدی) و چەند کەسێکی دیکەش لە نێو ژورەکەی دا بوون, بەڵام ئەشرەفی خوشکی بە هۆی خواردنی بڕێکی زۆری دەرمانی خەوە وە لە ژورێکی دیکەی نەخۆشخانەکەدا بێهۆش کەوتبوو, کاتژمێرێك دواتریش (سادات و هاوسەرەکەی) گەیشتن, سادات دوای سەرەخۆشی کردن لە فەرەح و عەلیڕەزای کوڕە گەورەی (شا), کە لە سەر بالیفەکەی باوکیدا ئامادە بوو, فەرمانی دەرکرد کە لە ڕێوڕەسمێکی بە شکۆ دا تەرمەکەی بە خاك بسپێردرێت.

لە ڕێورەسمی بە خاك سپاردنی تەرمەکە دا, لە نێو سەرۆکەکانی وڵاتانی دۆستی (شا) دا, جگە لە (سادات) تەنها (نیکسۆن)ی سەرۆکی پێشوی ئەمریکا و (کنستانتین)ی پاشای پێشوی یۆنان بەشدارییان کرد, تەنانەت مەلیك (حسەین)ی دۆستی دێرینەی (شا), کە زۆریش قەرزداری بوو, زەحمەتی بەشداری کردنی ئەو ڕێورەسمەی نەخستە بەر خۆی, لە نێو دەزگا دیبلۆماسیە بیانیەکانی نێو قاهیرەشدا, ژمارەیەکی کەمیان بەشداری ڕیورەسمی بە خاك سپاردنی تەرمی شای پێشوی ئێران یان کرد, لە نێو ئەو دەستە گوڵانەی کە بۆ ئەم ڕێورەسمە نێردرابوون, دەستە گوڵەکانی دوو هاوسەرە پێشووەکەی شا (فەوزییە و سورەییا) سەرنج ڕاکێشترینیان بوون.

تەرمەکەی شا لە کەناری گۆڕی باوکی دا لە مزگەوتی (الرفاعی) شاری قاهیرە بە خاك سپێردرا, شا پێش مردنی داوای لە (سادات) کردبوو ئەگەر مرد لە کەناری گۆری باوکی دا بە خاکی بسپێرێت, ساداتیش بۆ جێبەجیٚ کردنی ئەم داواکاریەی شا, گۆری ئەوی لە کەناری گۆڕی (ڕەزاشا)ی باوکی دا ئامادە کردبوو.

ساڵێك دوای مردنی شا, سورەییای هاوسەری دووەمی و تاکە عەشقی ڕاستەقینەی شا, لە سەفەرێکی دا بۆ میسر, سەردانی گڵکۆی پیاوێکی کرد کە ماوەی حەوت ساڵ لە کەناری ئەودا ژیانی بەسەر دەبرد, کتێبی (کاخ تنهایی / کۆشکی تەنیایی) سورەییا بەم ڕستانە کۆتایی دێت: ئەو پیرە ژنەی کە ڕێنمایی ئێمەی دەکرد بۆ بینینی شوێنە گەشتیارەکانی میسر, لە کاتی گەڕانمان لە قاهیرە پێی ووتم: گۆڕی هاوسەری پێوی ئێوە (حەمەڕەزاشا) لە نزیك ئێرە یە لە مزگەوتی (الرفاعی), دەتەوێت سەردانی بکەیت و بیبینیت..؟, بە سۆز و خرۆشەوە وەڵامی ئەرێم دایەوە, کاتێك گەیشتینە ڕووبەڕوی گۆڕەکە, ئەو پیرە پیاوەی کە لەویٚ دانیشتبوو ووتی: (بە منیان نەوتبوو کە ئەمرۆ کەسێك دێت بۆ ئێرە, بە گشتی گوڵ و مۆم دادەنێم و دایان دەگیرسێنم..).

بە خێرایی هەستاو دوو مۆمی کوژاوەی داگیرساند, لەبەر ڕۆشنایی مۆمەکان دا لە سەر بەردێکی مەڕمەڕی ڕەشی سادە نوسرابوو: (محەمەدڕەزا), شای ئێران.

